پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

(8)

# چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد

## بەرگی یەکەم

نووسینی: دکتۆر عوسمان عەلی
وەرگێڕانی: کامەران جەمال بابان زادە

چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد
نووسینی: دکتۆر عوسمان عەلی
وەرگێڕانی: کامەران جەمال بابان زادە
1

کەوتنی رژێمی سەدام حوسێن لە عێراق (2003)، جارێکی تر مەسەلەی کوردی هێنایەوە سەر شانۆی رووداوەکان، لەوەتەی دەوڵەتی عێراق دروووست بووە یەکەم جارە کورد قورسایی گەورەی هەیە لە دارشتنی بڕیار و دیاریکردنی ئاییندەی ئەو وڵاتە، لەو حاڵەتەدا ئارەزووی تورکیا بۆ چوونە ناو یەکێتی ئەوروپا و لۆبی کوردیی رێکوپێک لە دەرەوە، رێگە خۆش دەکات کوردانی تورکیاش بتوانن زیاتر دەستکەوتی نەتەوەیی دەست بخەن، هەروەها فیدراڵیەتی کوردان لە عێراق و کەناڵە کوردییە ئاسمانییەکان کاریگەریی بەرچاویان هەیە لەسەر کوردی ئێران، ئاییندەی کێشەی کورد لە دە ساڵی رابردوو دەبێتە جێی بایەخی دارێژەرانی بڕیار و پسپۆڕان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

زۆری ئەو بابەتانەی لە دوای رژێمی سەدام حوسێن هاتنە بەر باس، بەتایبەت رۆڵی کورد، ئەو بابەتانەن، کە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیی و سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لەلای لایەنە پەیوەندییدارەکان جێی بایەخ بوون، ئێمە لە چوار بەشی ئەم کتێبەدا باسمان کردوون.

بۆ تێگەیشتن لە بایەخی کێشەی کورد لە دارشتنەوەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی تازە، ئەم کتێبە دەبێتە جێی بایەخی پسپۆڕان و چاودێران بە کێشەی عێراق و کورد.

پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

(8)

# چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی
# بزاڤی هاوچەرخی کورد

## بەرگی یەکەم


نووسینی:

دکتۆر عوسمان عەلی

وەرگێڕانی:

کامەران جەمال بابان زادە



2010 زایینی 1431 کۆچی

ناوی کتێب: چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد

نووسینی: دکتۆر عوسمان عەلی

وەرگێڕانی: کامەران جەمال بابان زادە

نەخشەسازی ناوەوە: ئیدریس سیوەیلی

نەخشەسازی بەرگ: هاوژین عومەر

تیراژ: **1000**

ژمارەی سپاردن: (**2655**) ساڵی **2009**

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: **2010**

شوێنی چاپ: چاپخانەی چوارچرا

پێوانەی لاپەڕە: **17.5×25**سم

لە بڵاوکراوەکانی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی ژمارە (**8**)

ئیمەیلی پڕۆژە: iiitkurdistan@yahoo.com

# چەند وتەیەکی پێویست

دڵخۆش بووم بە چاپی دووەمی کتێبی (دراسة في الحركة الكردية المعاصرة)، بۆ ئەوەی ئەو ناتەواوییانەی لە چاپی یەکەمدا هەبوو نەیانهێڵێ، ئەو کتێبە زنجیرەیەك توێژینەوەی بە نرخی مێژووی نوێ و هاوچەرخی کوردستانە، بەڵام ئەوەی من لێی ئاگادارم هەمووی بەسەر یەکەوە نەنووسراوە، هەندێکیان نووسەر کاتی خۆی بە پێویستی زانیوەو بەدواداچوونی بۆ کردووە، ئەوەی تری بەشێکە لە نامەی دکتۆراکەی، هەندێك لەو توێژینەوانە لە بنەڕەتەوە بە زمانی ئینگلیزی نووسراون و دوایی کردویەتیە عەرەبی، بۆ من کارێکی قورستر بووە، چونکە تێپەڕبوونی توێژینەوەیەك بە سێ زمانی جیاواز میتۆدی تێگەیشتن زەحمەتتر دەکات.

بەر لەوەی ئەو کتێبە بە زمانی عەرەبی لە ساڵی (2003) بکەوێتە بەر دیدی خوێنەران، کردبوومە کوردی، ویستم کوردیەکەی بە سێ بەش چاپ بکەم، ئەمە پێچەوانەی قەناعەتی خۆم بوو، بەڵام هەموو بەسەریەکەوە بۆ من زۆر زەحمەت بوو، دیارە ئەمەش هۆکاری خۆی هەبووە، لەگەڵ کاك دکتۆر عوسمان عەلی گفتوگۆمان کرد لەسەر لە چاپدانی هەموو ئەم کتێبە بەسەر یەکەوە، بۆ من خواستێکی گەورە و ئەمانەتێکی گەورە بوو.

پێم چاك بوو دکتۆر بەر لە چاپکردنی چاپی دووەمی، کاتی زۆرتری بۆ تەرخان بکردایە، راستە پێی داچۆتەوە، بەڵام هێشتا ماویەتی، منیش لە لای خۆمەوە ویستم لەگەڵ کوردیەکەی وردبم، بە جۆرێك شایستە بەو توێژینەوەیە بێت، هەوڵی خۆم بۆ خستەگەڕ، بەراوردی چاپی دووەم و گۆڕانکارییەکانم کرد، بە زمانی داڕشتن و هەڵەی چاپ و نووسین و پەراوێزەکانیدا چوومەوە، بەلای خۆمەوە کاری باشم لەسەر کردووە، گەرچی هەڵە و سەرنجەکان زیاتر دوای لە چیاپدان و بڵاوکردنەوە بە دیار دەکەون.

ئەم کتێبە دەوڵەمەندە بە سەرچاوە و بەڵگەنامە و بەدواداچوونی زانستیی، بەڵام لە هەڵە و کەم و کوڕییش بەدەر نییە، لەگەڵ ئەوەدا نووسەر میتۆدێکی واقیعی گرتووە لە شیکردنەوەی مێژووی میللەتەکەمان و رێچکەیەکی تایبەتیی هەیە، لە رووی مەبدەئیەوە لەگەڵ زۆر لە تێڕوانین و شیکارەکانی هاوڕام، بەڵام هێشتا لە میتۆدی مامەڵەی دکتۆر لەگەڵ رووداوەکان و جومگە گرنگەکانی مێژووی میللەتی کورد و بزاڤی سیاسییی، هەروەها ئەو ماوەیەی توێژینەوەی لەسەر کردووە خاڵی جیاوازمان هەیە، کە لەوە زیاتر هەڵدەگرێ، لە شوێنی خۆی بۆ هەندێك لەو تێڕوانینە جیاوازانە لە پەراوێزدا سەرنجی

خۆم نووسووه، بەڵام ئەوە کۆی هەموو سەرنجەکانم نییە لەسەر ئەو کتێبە، لە لایەکی ترەوە سەرنجەکانی منیش دەشێ سەرنج هەڵبگرێ، یان نووسەر پاساوی خۆی هەبێت لەسەر تێڕوانینەکانی خۆی، ئەوەی لە لای من لە هەمووومان زیاتر جێی سەرنج بووە، ئەو گوتارەیە کە دکتۆر لە چەند شوێن لە ڕێڕەوی ئەمانەتی مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەکان لای داوە و وەکو لایەنگر بۆ ئاڕاستەیەکی فیکری هاتۆتە ئاخاوتن، ئەوەی زیاتر جێی سەرسوڕمان بوو بۆ من و خوێنەرانی چاپی یەکەم، گۆڕینی ناونیشانی ئەم کتێبە بووە لە چاپی دووەم بە عەرەبی لە (دراسات في الحركة الكردية المعاصرة 1833– 1846) بۆ (الحركة الكردية المعاصرة: دراسة تأريخية الكردية المعاصرة). کە ئەمە هیچ پاساوێك هەڵناگرێ!

هەموو ڕوونکردنەوەیەکی ناو دەقی ئەم کتێبە، کە دراوەتە پاڵ (وەرگێڕ) ئەوە مەبەستی بەڕێز دکتۆر عوسمانە و ئەوەی لە پەراوێز دراوەتە پاڵ وەرگێڕ، ئەوە هی منە و لێی بەرپرسیارم.

لەگەڵ هەموو ئەو سەرنجانەم کتێبی "بزاڤی هاوچەرخی کورد" بە سەرچاوەی باش دەزانم لەسەر مێژووی بزاڤی سیاسیی نوێ و هاوچەرخی کورد، هەروەها زۆربەی بەرهەمە مێژوویییەکانی ئێمە، کە لە ماوەی ئەو چل ساڵەی رابردوو نووسراون لەو لایەنگریەی باسم کرد پشکیان هەیە و ئەو رەخنەیان لێدەگیرێ و نەیاتوانیوە خۆیان لە ئینتیمای سیاسیی، ئاینی، فیکریی، کۆمەڵایەتیی دابڕن.

هیوادارم هەوڵ و شەونخونیم بە دیار وەرگێڕانی ئەم بەرهەمەوە جێی رەزامەندی خوێنەران و رۆشنبیران و عاشقانی مێژووی میللەتەکەم بێت، هەموو رەخنە و سەرنج و رێنومایییەکیش بەو پەڕی سینە فراوانییەوە وەردەگرین.

هەوڵ و کۆششی هاورێ و دۆستانم لە یاد ناچێت، کە لە هاندان و هاوکاری هێنانەدی ئەو بەرهەمە لەگەڵمدا درێغیان نەکردووە، لە پێداچوونەوە و راستکردنەوە و داڕشتنەوەی بەشدار بوون، بەتایبەت مامۆستا (شیروان حوسێن) شارەزا لە زمانی کوردی، سەرەڕایی سەرقاڵی ئەو بە کۆرسی خوێندنی باڵاوە بەشێك لە کاتەکانی بۆ پێداچوونەوەی ئەم بەرهەمە تەرخان کرد و هەڵەی چاپ و هەڵەی زمانی بۆ راستکردوومەتەوە.

**کامەران بابان زادە**

# پێشەکی نووسەر بۆ چاپی دووەم

ئەو بایەخپێدان و گفتوگۆیەی چاپی یەکەمی ئەو کتێبە لە ناوەندە ئەکادیمی و رۆشنبیرییەکان لە ناوخۆی عێراق و دەرەوە درووستی کرد، هانیدام بۆ جاری دووەم چاپی بکەمەوە، سوپاس و رێزم بۆ برایان لە پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، کە بەشدارییان کرد لە ئامادەکردنی چاپی دووەم، بەتایبەت مامۆستایان تۆفیق عەوجی و ریاز یەمانی، هەروەها دەمەوێ رێز لە هەوڵی ئەندامانی دەزگای (تەفسیر) بگرم، کە چاپی یەکەمیان بڵاو کردەوە، لێرە سەرنجی خوێنەرانی بەڕێز رادەکێشم بۆ هەڵەی چاپ و هەڵەی زمان و تێکەڵبوونی هەندێ لە پەراوێزەکان کە لە چاپی یەکەمدا درووست بوو، لەم چاپە تازەیەدا پێداچوونەوەمان کردووە بە هەڵەی دەق و پەراوێز و هەندێ لەو شیکارانەی لە چاپی یەکەمدا هاتوون.

کەوتنی رژێمی سەدام حوسێن لە عێراق (2003)، جارێکی تر مەسەلەی کوردی هێنایەوە سەر شانۆی رووداوەکان، لەوەتەی دەوڵەتی عێراق درووست بووە یەکەم جارە کورد قورسایی گەورەی هەیە لە دارشتنی بڕیار و دیاریکردنی ئاییندەی ئەو وڵاتە، لەو حاڵەتەدا ئارەزووی تورکیا بۆ چوونە ناو یەکێتی ئەوروپا و لۆبی کوردیی رێکوپێك لە دەرەوە، رێگە خۆش دەکات کوردانی تورکیاش بتوانن زیاتر دەستکەوتی نەتەوەیی دەست بخەن، هەروەها فیدراڵیەتی کوردان لە عێراق و کەناڵە کوردییە ئاسمانییەکان کاریگەریی بەرچاویان هەیە لەسەر کوردی ئێران، ئاییندەی کێشەی کورد لە دە ساڵی رابردوو دەبێتە جێی بایەخی دارێژەرانی بڕیار و پسپۆڕان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

زۆری ئەو بابەتانەی لە دوای رژێمی سەدام حوسێن هاتنە بەر باس، بەتایبەت رۆڵی کورد، ئەو بابەتانەن، کە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیی و سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لەلای لایەنە پەیوەندییدارەکان جێی بایەخ بوون، ئێمە لە چوار بەشی ئەم کتێبەدا باسمان کردوون.

بۆ تێگەیشتن لە بایەخی کێشەی کورد لە دارشتنەوەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی تازە، ئەم کتێبە دەبێتە جێی بایەخی پسپۆڕان و چاودێران بە کێشەی عێراق و کورد.

والله من وراء القصد

**د. عوسمان عەلی**
**تۆرینتۆ/ کەنەدا**
2007

# بەشی یەکەم:
# کورد لە ناکۆکیی
# ڕووسیی - عوسمانییدا[1]

[1] - ئەم وتارە بە دوو بەش لە ژمارە (3، 4)ی کانوونی یەکەمی (1996ز) و ژمارە (5)ی ئازاری هەمان ساڵ لە گۆڤاری (ئاڵای ئیسلام) بڵاوکراوەتەوە..

کورد رۆڵی بەرچاوی هەبووە لە ململانێی نێوان دەوڵەتی عوسمانیی و ڕووسیی لە سەدەی نۆزدە، تێگەیشتن لە ڕۆڵی ئەو کاتەی کورد گرنگە بۆ تێگەیشتن لە ڕۆڵی کورد لە ململانێ هەرێمیەکانی ئەمڕۆ، بۆ ئەو مەبەستە ئەم لێکۆڵینەوەیە تایبەتە بە ڕۆڵی کورد لە ناکۆکییەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانیی و ڕووسیای قەیسەریی کە بە درێژایی ماوەی ململانێی نێوانیان لە هەوڵی ئەوەدا بوون کورد بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، کوردەکانیش بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتی میرنشینە سەربەخۆکانیان کە سوڵتان مەحموودی دووەم لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم لە ناوی بردبوون، لە هەوڵی ئەوەدابوون سوود لەو ناکۆکییە وەربگرن.

بۆ زیاتر تێگەیشتن لە ڕۆڵی کورد لەو ناکۆکیانە، جەخت لەسەر هۆکارە کاریگەرەکانی کۆمەڵگای کوردی دەکەین، لە سەدەی نۆزدەدا بەریتانیا وەك هێزی سێیەم رۆڵی بەرچاوی لە ناکۆکیی عوسمانیی ـ ڕووسیی دا بینی، بۆیە لە سەرەتاوە پێویستمان بە باسکردنی رۆڵی بەریتانیایە لە دواین ناکۆکیی لەگەڵ ڕووسیا و هەوڵەکانی دەوڵەتی عوسمانیی بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکانی کورد بە لایەنگری بەریتانیا، دوایی دەچینە سەر لێکۆڵینەوە لە ڕۆڵی کورد لە شەڕەکانی ڕووسیی ـ عوسمانیی بەتایبەتی شەڕەکانی سالآنی (1827ـ 1828) و شەڕی قەرمی (1854)و شەڕەکانی سالآنی (1877 و 1878).

## ناکۆکیی ڕووسیی - بەریتانیی لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی

ناکۆکیی ڕووسیی ـ بەریتانیی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم چووە قۆناغێکی هەستیارەوە، ئەو دەستکەوتانەی رووسیای قەیسەریی لە شەڕەکانی لەگەڵ هەریەك لە ئێران و دەوڵەتی عوسمانیی بەدەستی هێنابوو، مەترسیی لەسەر بەریتانیا درووست کردبوو، ئەویش بە گومانەوە دەیڕوانییە چاوتێبڕینی ڕووسیا لە گەیشتن بە ئاوە گەرمەکان لە کەنداوی فارسی (کەنداوی عەرەبیی).

بەریتانیا پێیوابووە فراوانخوازیی ڕووسیی بەرەو باشوور، هەڕەشە دەبوو بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ئەو لە کەنداو، پێیوابووە دوا ئامانجی ڕووس کەنداو نابێت، بەڵکو کۆنترۆڵکردنی ئەو ڕێڕەوە ستراتیژییە ئاویەیە کە بەریتانیای گەیاندۆتە بەرژەوەندییە گرنگەکانی لە نیوە دوورگەی هیند، ئەوەی شایانی باسە ئێران بە هۆی تێکشکانی لە

بەرانبەر ڕووسیا، ناچاری مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی گوڵستانی ساڵی (1813) ببوو، بە پێی ئەو ڕێکەوتننامەیە وازی لە هەرێمەکانی دەربەند و قەرەباغ هێنابوو، ڕێکەوتننامەی (تورکمانچای) ساڵی (1827)یش کە دوای شەڕی ڕووسیی - عوسمانیی واژۆ کراوە، پێگەی دەستکەوتەکانی ڕووسیای لە قەوقاز بەهێز کرد و هەرێمەکانی یەریڤان و نەخچەوانیشی بۆ زیاد بوو[2].

ئەو دەستکەوتە گرینگانەی ڕووسیا لەناو دەوڵەتی عوسمانیی بەدەستی هێنا بوو، کەمتر نەبوو لەو دەستکەوتانەی لە هەرێمەکانی ئێران دەستی کەوتبوون، لە دوای تێکشکانی گەورەی هێزەکانی عوسمانیی لە بەرانبەر هێزەکانی موحەممەد عەلی پاشا (1805–1848) کە بووە هۆی لە دەستدانی زۆربەی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆل، سوڵتانی عوسمانیی هەستی کرد دەسەڵاتی لە ئەستەمبوڵ لە مەترسییدایە، بۆیە ناچار کرابوو ڕێکەوتننامەی (ئەنکیار سکیلسی) ساڵی (1833ز) واژۆ بکات، بە پێی ئەو ڕێکەوتننامەیە دەوڵەتی عوسمانیی پارێزەری بەرژەوەندییەکانی رووسیا دەبێت، ئەوە کاریگەریی گەورەی هەبووە لەسەر پێشبڕکێی بەریتانیی - ڕووسیی بۆ گەیشتن بە دەسەڵاتی زیاتر لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی، بۆیە هەریەك لە (بالمرسۆن) سەرۆکی وەزیرانی بەریتانیی و (ستافۆرد کانتیگ)ی باڵیۆزی بەریتانیی لە دەوڵەتی عوسمانیی کە بوونە ناحەزترین کەسی دژ بە ڕووسیا[3].

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ناکۆکیی ڕووسیی - بەریتانیی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پەیوەست بووە بە ڕاگرتنی هاوسەنگیی هاوکێشەی گۆڕەپانی ئەوروپی، بەریتانیا هەستی کرد زیادبوونی دەسەڵاتی ڕووسیا و پەیدابوونی بەرژەوەندییەکانی لە دەرەوەی ئەوروپا، دەسەڵاتی بەسەر گۆڕەپانی ئەوروپی بەهێز کردووە، کە بەریتانیا خۆی بە پارێزەری زانیوە و توانای خۆی لە مانەوەی داگیرگەکانی دا دەبینێتەوە، بۆیە بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم پاراستنی دەوڵەتی عوسمانیی و ڕێگرتن لە خزینی ڕووسیا بە ئاڕاستەی ئاوە گەرمەکان (کەنداو و ئۆقیانووس) لە پێشینەی بایەخی سیاسییی بەریتانیا بووە.

---

2 - G. lenczowski The Middle East in World Politics (Cornell University Press,19800),P.38-39

3 -England And the Near East the Crimea (Landon;frank Cass and Company Ltd. 1964) p. 74

## کۆمەڵگای کوردیی لە سەدەی نۆزدەیەمدا

جوگرافیای سیاسیی و سروشتی کۆمەڵگای کوردیی ڕێگر بووە لە بەردەم کورد تا ڕۆڵی گرنگ بگێڕێ لە ناکۆکیی ڕووسیی - عوسمانیی، ئەو ناکۆکییەی کوردستانی کردبووە پێگەی زۆربەی شەڕەکان، پێش ئەوەی بچینە ناو بابەتەکەوە، ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرنگە دیاریکردنی هەرێمە کوردییەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانییە.

توێژەرەوانی ڕۆژئاوا دەمارگیرانە ناوی هەرێمە کوردییەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانیی دێنن، لەوەی ئاماژەیان بە (ئەرمینیا) یان (کوردستان) کردووە، ئەویش ئاماژە بووە بۆ ئەو دەڤەرانەی زۆرینەی کوردن لە ولایەتەکانی ئەنادۆڵ، وەکو: وان، بەدلیس، مەئموریەی ئەلئەزیز، ئەرزڕۆم، سیواس، دیاربەکر، پێش شەڕی یەکەمی جیهانی دەبینین یەکەمیان زۆرتر بەکار هاتووە، بەڵام لە زۆربەی ئاماژەکان زاراوەی کوردستان بۆ هەردوو ویلایەتی وان و دیاربەکر لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ و ویلایەتی موسڵ (باکووری عێراق) بەکار هاتووە. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم دەوڵەتی عوسمانیی ویلایەتێکی تازەی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ (کوردستانی تورکیا) پێکهێنا بە ناوی (کوردستان)، کە ئەو هەرێمانەی گرتبۆوە زۆرینەی کوردن.

کوردستان لە چیای تۆرۆسەوە بە درێژایی (ئەدەنە) درێژ دەبۆوە هەتا دەگەیشتە سنووری تورکیا و ئێران لە ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی ورمێ، بە ڕێکی و بە درێژایی سنووری تورکیا بە خەتێکی باریك دەچووە نێوان هەردوو دەوڵەتی ئازەربایجان و ئەرمینیا، زۆربەی ئەو شار و شارۆچکانەی گرتبۆوە کە دەکەوتنە ڕۆژهەڵاتی ئەرزڕۆم [4].

لێرەوە بە دیار دەکەوێ کە کورد زۆرینەی دانیشتوانی ناوچە سنووریەکانی تورکیا لەگەڵ ئێران و تورکیا لەگەڵ ڕووسیای پێکهێناوە، ئەم هەڵکەوتنە جوگرافیەش گرنگی سیاسیی هەبووە لە ناکۆکیی دەوڵەتی عوسمانیی لەگەڵ هەریەك لە ڕووسیا و ئێران.

لە تایبەتمەندییەکانی دەسەڵاتی عوسمانیی لە ماوەی نێوان سەدەی شازدەهەم بۆ هەژدەهەم، سەربەخۆیی میرنشینە کوردییەکان بووە.[5] ئەو میرنشینانەی لە لایەن میرە

---

[4] -7.Foreign Office Historical Sec. Armenia And Kurdistan (London ; HMO , 1920).

[5] – هەتا نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم دەسەڵاتی میرنشینە کوردییەکان مابوو، دوا میرنشین بۆتان و بابان بوون کە یەکەمیان لە ساڵی (1847)و دووەمیان لە ساڵی (1850) لە ئاکامی هێرشی عوسمانییەکان لەناوچوون. "وەرگێڕ".

کوردەکانەوە پشتاوپشت کاروباری خۆیان بە سەربەخۆیی بەڕێوەبردوە،[6] بەڵام سوڵتان مەحمودی دووەم لە ژێر کاریگەریی راوێژکارە غەربزادەکانی و لە چوارچێوەی نەخشەی چاکسازیی، دەستی بەسەر ئەو میرنشینانەدا گرت، لە جێگەی ئەوە بەڕێوەبەرایەتی ناوەندیی ـ کە زۆربەی کاربەدەستەکانی تورك بوون ـ دانا. هەروەها تەنزیمات "چاکسازیی لەسەر شێوازی رۆژئاوا" لە سالآنی (1839– 1876) کۆمەڵە هەنگاوێکی تری دەوڵەتی عوسمانیی بووە بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی ناوەند، بەمەش دەستی گرت بەسەر سەرکردە تەقلیدیەکانی کورد.

بە هۆی بڵاوبوونەوەی گەندەڵیی لە ناو فەرمانبەر و جەندرمە (هێزی پۆلیسی عوسمانیی)و بێئاگایی ئەوان لە حاڵەتی ئیداریی و سیاسیی کورد، ئاکامێکی باشی لێنەکەوتەوە، کوردستانیش هەرگیز کارگێڕی ناوەندیی بەخۆوە نەدیبوو، بۆیە کار گەیشتە درووستبوونی بۆشاییەکی ئۆقرەیی لە ناوچەکەدا، دزیی و دەستبەسەراگرتن و شەڕی نێوان هۆزەکان پەیدا بوو، هەروەها بووە هۆی سەرهەڵدانی شەڕی کورد و ئەرمەن، هەر لەو ماوەیەدا ئەرمەن بەبێ ماندوبوون دەستیان گرتبوو بەسەر بازرگانیی ناوچەکە، لە لایەکی ترەوە چینی ئاغاکان (سەرۆك خێڵەکان) هاوشان لەگەڵ ئەرمەن ئەمەیان بە دەرفەت زانی بۆ چەوساندنەوەی جوتیاران و توێژەکانی تری کۆمەڵگا.

---

[6] – لەبەر ئەوەی دکتۆر عوسمان نووسینەکانی بەشێکی بە وتاری جیاواز لە ژمارەکانی گۆڤاری (ئاڵای ئیسلام) بڵاو کردۆتەوە، لە هەر بابەتێك پێویستی کردبێت ئاماژەی بەو رێکەوتننامەیە داوە، بۆ شوێنی ئەویش پێویست بووە، ئێمە لێرەدا خۆمان لە ئەمە دەبوێرین. بەم روونکردنەوەیە لەسەر رێکەوتننامەکە خوێنەر باشتر حاڵیی دەبێت، ئەوەی دووبارەیە لام بردووە، لە ساڵی (1514ز) سوڵتان سەلیم بۆ سوود وەرگرتن لە کورد و بێلایەنکردنی لە شەڕی دەوڵەتی سەفەوی، هەوڵیدا خۆی لە کورد نزیك بکاتەوە، مەلا ئیدریسی بەدلیسی لە دوای راوێژ بە ژمارەیەك لە سەرۆك و میری سەرانسەری کوردستان، بە ناوی هەمووانەوە لەگەڵ سوڵتان سەلیم رێککەوت کوردستان بەبێ شەڕ ببێتە بەشێك لە دەوڵەتی عوسمانیی و میر و سەرداره کوردەکان دان بنێن بە دەسەڵاتی سوڵتان، لە وتاری هەینی دوعا بۆ سوڵتانی عوسمانیی بکرێت و ساڵانە ئەندازەیەك باج بدەن بە ئەستەنبوڵ، لە کاتی پێوست بە ژمارەیەك سوارە بەشداریی جەنگە دەرەکییەکان بکەن، لە بەرانبەردا دەوڵەتی عوسمانی دەست لە کاروباری ئەو میرنشینانە وەرنەدات و کاروباری خۆیان لە لایەن خۆیانەوە بەڕێوە ببەن و بە پشتاوپشت دەسەڵاتی لامەرکەزییان بۆ بمێنێتەوە، ئەم کارەی مەلا ئیدریس چۆن هەڵدەسەنگێنرێت، کارێکی باشی کرد یان نا؟ ئەمە هەندێك مشتومڕی لەسەرە، بەڵام هەر چۆن بێت کوردستانی لە شەڕێکی وێرانکەر رزگار کرد و ئاکام میر و میرنشینە کوردییەکان لەم رێککەوتنامەیە سوودمەند بوون. "وەرگێڕ".

به گشتیی لەو بارودۆخە گرانەدا کۆمەڵگای کوردیی هیچ دەرەتان و ڕێگەچارەیەکی نەبوو پەنای بۆ ببات بێجگە لە شێخەکانی تەریقەت کە لە کوردستان زۆر بڵاوببوونەوە و پەرەیان سەندبوو، بەتایبەتی هەردوو تەریقەتی نەقشبەندیی و قادریی، ئەمانە دەسەڵاتی سیاسییان پەیدا کرد، هەتا سەرۆك خێڵەکان ئیرەییان پێدەبردن، سەرەڕای پەیدابوونی دەسەڵاتی روحیی تەکیە (مەڵبەندی بانگەوازی سۆفیگەریی)، شێخەکان بەرگرییان لە بەرژەوەندیی جوتیاران دەکرد و هەوڵیان دەدا سنوورێك بۆ هەڵپەرستیی و خۆسەپاندنی ئاغاکانی کورد دابنێن، لەلایەکی ترەوە ببوونە جێی ئومێدی کورد بۆ پارێزگاریی لە بەرژەوەندییەکانیان لە لای حکومەتی عوسمانیی و لە لای بەڕێوەبەرایەتی هەرێمەکانی کورد لە بەرامبەر سەپاندنی باج، سەرەڕای خۆسەپاندن و خزمەتی بە بێگار و بەکارهێنانی زەبر و زەنگ لەسەر شانی جوتیاری کورد، ئەو باج و سەرانەیەی هیچی بۆ جوتیاری کورد نەدەهێشتبۆوە[7].

بەم پوختە باسەی کۆمەڵگای کوردی لە سەدەی نۆزدەهەم، دوو راستی بنەڕەتییمان بۆ بە دیار دەکەوێ:

یەکەمیان: زۆربەی کوردەکان و سەرکردە کلاسیکیەکانی ناڕازی بوون لە دەسەڵاتی عوسمانیی، چونکە دەستی گرتبوو بەسەر ئەو ڕژێمە تایبەتیەی کە چەند سەدەی رابردوو لە کوردستان باو بووە، لە جیاتی ئەمە، دەسەڵاتی تورکی سەپاندبوو کە دەستپاك نەبوون و بە زەبری هێز حوکمڕانی کوردانیان دەکرد.

دووەمیان: لاوازیی بەڕێوەبردنی عوسمانیی و نەمانی ئاسایش و ئۆقرەیی و بڵاوبوونەوەی زوڵم و زۆرداریی بە شێوەیەکی بەرفراوانی کاربەدەستانی تورك، یان ئاغاکانی کورد، ئەمە زەمینەی لەباری خۆشکرد بۆ سەرهەڵدانی شێخایەتی و سۆفیگەریی وەك ڕژێمێکی چالاك لە ناو کورد.

ئەم دوو هۆکارە رۆڵی گەورەیان هەبووە لەسەر هەڵوێستی کورد لە ماوەی ناکۆکیی دەوڵەتی عوسمانیی لەگەڵ ڕووسیا کە لەمەودوا روونی دەکەینەوە.

[7]- David McDowell, A, Modern History of the Kurds (London; I.B. Tours ,1996) pp 6-9

## کورد لە شەڕی عوسمانیی - ڕووسیی 1828- 1880.

بایەخی ڕووسیا بە کورد دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم، بۆ ئەمەش کۆمەڵێك هۆکار هەبوون، لەوانە فراوانخوازیی قەیسەرەکانی ڕووس لەناو خاکی دەوڵەتی عوسمانیی کە بەسەرهاتی ئەم گرنگیی پێدانە بە درێژی لە کتێبی (کوردستان لە سالآنی شەڕی یەکەمی جیهانی دا)ی (د. کەمال مەزهەر) و کتێبی (گەڕۆکی ڕووس)ی د. مارف خەزنەدار باس کراوە. ئەوەی شایانی باسە گەڕۆك و دیبلۆماس و نووسەرانی ڕووسی کۆمەڵیك لێکۆڵینەوەیان بۆ بەجێهێشتووین لەسەر حاڵەتی کۆمەلآیەتیی و سیاسییی ئەو سەردەمە، لە پێشەوەی بایەخداران بەو مەسەلەیە (فلادمێر مینۆڕسکی) و توێژەرەوەی ڕووسیی بە ئایین جولەکە (لازاریف) و (ئیڤانۆڤ)ە کە بایەخیان بە دیراساتی کوردیی داوە و بە شێخی ڕۆژهەلآتناسان ناسراون.

ڕووسەکان لە سەرەتای سەدەی بیستەم بۆ مەبەستی بەدەستهێنانی دەستکەوتی ئیمپریالیستی لە ناو خاکی هەردوو دەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانی، زیاتر بایەخیان بە کورد داوە. بەمەش سنووری ڕووسیا لە دەوڵەتی عوسمانیی و بەتایبەتی لە ئەنادۆڵی خۆرهەلآت، ڕاستەوخۆ بە یەکگەیشتن، کە ئەو هەرێمە کوردیانەی دەگرتەوە کە زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن.

سوڵتان مەحمودی دووەم لەساڵی (1826) بە ئامۆژگاری ڕاوێژکارە ڕۆژئاواییەکانی، لە باڵەخانەی عوسمانیی قەسابخانەی بۆ سوپای ئینکشاری (سوپای تەقلیدی عوسمانیی) دانا، ئەم کارەی ئاکامی باشی نەبوو، پێش ئەوەی کاتی خۆی بێت ئەنجام درا، سوڵتان سوپای جێگرەوەی هاوچەرخی بۆ ئامادە نەکردبوو. ئەمەش بۆشاییەکی سەربازیی لە سنوورەکانی ڕووسیی - عوسمانیی درووست کرد، لە شەڕەکانی (نیڤاریا) لە یۆنان لە ساڵی (1827) کە کەشتیگەلی بەریتانیی و فەڕەنسیی و کەشتیگەلی عوسمانیی کەشتیگەلی موحەممەد عەلی پاشای میسریان تێکشکاند، ڕێگە کرایەوە لەبەردەم هێزەکانی ڕووسیی پێشڕەوی بکەن بۆ ناو دەوڵەتی عوسمانیی، لە سالآنی (1827–1828ز) بەبێ هیچ بەرگرییەك زاڵ بوون بەسەر زۆربەی شارە گرنگەکانی ڕۆژهەلآتی ئەنادۆڵ، بەتایبەتی شاری قارس و بایەزید و ئەرزڕۆم.

ئەو هێزە بچووکەی ڕووس بە هۆی هەڵوێستی بێلایەنیی کورد، بەبێ هیچ بەرگرییەکی هۆزە کوردەکان، هاتە ناو هەرێمە شاخاویە سەخت و دۆڵە قوڵەکان،

توێژەرەوان ئەم هەڵوێستەی کورد دەگەڕێننەوە بۆ هەوڵی میر (گراف باسکۆفیچ)ی جێگری مەلیکی قەوقاز و فەرماندەی باڵای هێزەکانی ڕووس، باسکۆفیچ بۆ گرێدانی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات بە ئیمپراتۆریەتەکەی، نەخشەی داگیرکردنی ئەو هەرێمانەی داڕشتبوو، ئەمەش لە چوارچێوەی نەخشەی بایەخدان بە هۆزە کوردەکانی سەر سنوور لە دیراسەکردنی لایەنی کۆمەڵایەتیی و سیاسییی و دابینکردنی دۆستایەتی لە ڕێگەی بەستنی هاوپەیمانێتی هاوبەش و بەخشینی پلە و پایەی شانازیی و دیاریی و پارەدان بە سەرۆك هۆزە چالاکەکان، هەندێکجاریش سزای توندی گوندیەکانی دەدا بە سووتاندن و سەروەت و سامان بەتاڵان بردن و زەوتکردن، هەتا ببێتە ترس و تۆقاندن بۆ ئەوانی تر، باسکۆفیچ باش شارەزا بوو لە کۆمەڵگای خێڵایەتی کورد و هەوڵی دابوو سوود لە ناکۆکییەکان وەبگرێ بۆ بەرژەوەندیی خۆی. لە برووسکەیەکی تشرینی یەکەمی (1829ز) بەم شێویە نووسیویەتی: (هەموو دەسکەوتەکانمان تووشی مەترسی دەبن ئەگەر نەمانتوانی سەرنجی کورد بەلای خۆماندا رابکێشین، چونکە گەلێکی نەبەرد و ئازاترین چەکداری ڕۆژهەڵاتیان هەیە، دەتوانن رێگای پەیوەندیی هێزەکانمان ببڕن و لە هەموو لایەکەوە هێرشمان بۆ بهێنن و گەورەترین زیان بە هێزەکانمان بگەیەنن)[8].

سیاسەتی سوڵتان مەحموودی دووەم هۆکارێکی گەورە بوو بۆ یارمەتیدانی باسکۆفیچ تا بتوانێ تۆڕێکی پەیوەندیی پتەو لەگەڵ سەرۆك هۆزە چالاکەکانی سەرسنوور دابمەزرێنی، چونکە وەك باسمان کرد سوڵتان زۆربەی میرنشینە کوردییەکانی لەناوبرد "ژمارەیان هەژدە میرنشین دەبوو"، باسکۆفیچ توانی پەیوەندیی لەگەڵ ئەوانەدا درووست بکات و بەڵێنی پێدابوون لە حاڵەتی هەڵگەڕانەوە لە دەوڵەتی عوسمانیی و رازی بوون بە دەسەڵاتی رووسیی هەموو ئیمتیازاتێکی رابردوویان بۆ بگەڕێنێتەوە[9].

باسکۆفیچ متمانەی هەبووە بە پەیوەندییە بەهێزەکانی لەگەڵ سەرۆك هۆزەکانی سەر سنوور، بۆیە لە ساڵی (1828ز) واتە دوای ساڵێك لە دەستپێکردنی چالاکیە

[8] - M.van Businesses , Agha, Saikh and State: On the Social and Political Organization of Kurdistan (Utrect ,1978), pp 293 –234.

[9]-Wadi Jwaideh ,,The Kurdish Nationalist Movement: Its Origins and Development,, unpublished ph.D. Dissertation, Syracuse Univ, 1860 pt,1 pp.213-214.

جەنگیەکانی، ویستبووی هێزێك تەشکیل بکات لە کوردە بەکرێگیراوەکان کە لە (100) هەزار سوارە پێکهاتبوو، ئەمەی بۆ قەیسەری رووسیی پێشنیار کرد و ئەویش رەزامەندیی دەربڕی لەسەر پێکهێنانی ئەو هێزەو سەد هەزار پارچە زێری بۆ دابینکردنی خەرجیەکانی بەخشی بە باسکۆفیچ[10]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر چەند هۆیەك پێکهێنانی ئەو هێزە کوردیەی دۆستی رووسیا بە ئاکام نەگەیشت، یەکەم هۆکاری هەرەسهێنانی ئەو پڕۆژەیە دەگەڕێتەوە بۆ ناکردەیی و نابابەتیبوونی ئەندازەی پیشتیوانی رووسیا لە باسکۆفیچ و سەرۆك هۆزەکانی کورد، لە لایەکی ترەوە بێ جورئەتیی سەرۆکە کوردەکان لە بەرامبەر بەو بەڵێنانەی بە باسکۆفیچیان دابوو لەسەر هەڵگەڕانەوەیان لە دەوڵەتی عوسمانیی، ئەمەیان ئاشکرا نەکرد و زۆربەیان دەیانویست دۆستایەتی هەردوولا مسۆگەر بکەن، بە کورتیی هەڵوێستی سەرۆك هۆزە کوردەکان لە ماوەی شەڕ ـ هەروەك لەمەودوا باسی دەکەین ـ هەڵوێستێکی براگماتیی بووە، لە سەرەتاوە سەیری بارودۆخەکەیان کردووە و دوایی بەلای سەرکەوتوودا دایان شکاندۆتەوە[11].

ئەم هەڵوێستە براگماتیەی کورد فێری بووە بەرهەمی ئەزموونی تاڵی سەدەکانی ڕابردووی شەڕەکانی ئێرانی و عوسمانییە، باسکۆفیچ هۆکارێکی تری باس کردووە لە هەرەسهێنانی پرۆژەی دامەزراندنی هێزێکی کوردی دۆستی رووسیا، ئەو قەناعەتی وایە سیخوڕیەتی رۆژئاواییەکان، بەتایبەتی ئینگلیز و فەڕەنسا، وای کرد کورد جورئەت نەکات پەیوەندیی بە هێزەکانی رووسەوە بکات، باسکۆفیچ باسی لە هەوڵی چڕی ئەو دیبلۆماسانە کردووە بۆ قەناعەت پێهێنانی کورد بەوەی رووسیا دەکشێتەوە و دەسەڵاتدارانی عوسمانیی دووبارە دەگەڕێنەوە هەرێمەکە، سزای توندی ئەوانە دەدرێ کە هاوکاریی دەوڵەتی رووسیایان کردووە[12].

---

[10] - خالفين: الصراع على كردستان، بغداد، مطبعة الشعب،1963 ،ص42-43

[11] - د. كمال مظهر احمد: كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ترجمة محمد الملا عبدالكريم، بغداد ،ص 43-44

[12] P. Aviarov, Osmanli –Russ Ve Iran Savalarda Kurtler trs. From Russian. Mohamed Varli, (Ankara; Sipan, 1995) pp, 172-173.

ناتوانین بلێین هەوڵەکانی باسکۆفیچ هێندە بێبەرهەم بووە، بەڵکو رووسیا توانیبووی لە کوردانی یەزیدی ناحەز بە عوسمانیی و دۆستی رووسیا لە یەریڤان هێزێك پێکبهێنێ لە شەڕەکانی سەر سنوور ڕۆڵیان هەبێت، هەروەها رووس لە بێلایەنکردنی زۆربەی زۆری هۆزە کوردەکان سەرکەوتوو بوو، سەرەڕای بانگەوازی چەندین جارەی سوڵتان بۆ بەرەنگاربوونەوەی رووس، بەو ئەندازەیە نەبزاوتن و بەشداریی چالاکییە سەربازییەکانی دژ بە ڕووسیایان نەکرد[13] .

لێرەدا ئەوەندە ئاماژە بەسە کە هێزێکی بچووکی رووس لە تەمووزی ساڵی (1828ز) ژمارەیان لە هەزار سوارە تێنەدەپەڕی لەبەر چاوی کورد هاتنە ناو شاری بایەزید، بێئەوەی کەس بەرهەڵستی بێت، ئەمە لە زۆربەی ناوچەکان دووبارە بۆوە، ئان– ت– والت و ب– مۆلتیف هەڵوێستی کورد لە شەڕەکانی (1827–1829ز) بەم شێوەیە پوخت کردۆتەوە:

"سەرەڕای ئەوەی کورد وەکو هۆکارێکی متمانە پێ نەکراو مایەوە، بەڵام ئەم بێلایەنییە بە درێژایی شەڕ سوودی بە باسکۆفیچ گەیاند، وەکو سوود پێگەیاندنەکەی (نابیر) بەدەستی هێنا لە داگیر کردنی حەبەشە لە دوای چل ساڵ، لە هەردوو حاڵەتدا لە دوای مسۆگەرکردنی بێلایەنیی هۆزەکان، هێزی داگیرکەر توانی بچێتە ناو قوڵایی خاکی دوژمن کە دەیانتوانی لە بەرامبەردا مەترسی گەورە درووست بکەن"[14] .

## راپەڕینەکانی کورد و ململانێی عوسمانیی - ئینگلیزیی

ڕاپەڕینەکانی کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم، لایەنێکی تری ململانێی عوسمانیی - رووسییمان بۆ روون دەکاتەوە کە چۆن ئەو ململانێیە کاریگەریی خراپی لەسەر ڕاپەڕینەکان بەجێهێشتووە.

راپەڕینی میری گەورە (1832ـ1836ز) لە کوردستانی عێراق بەرەنگاربوونەوەی گەورە بوو بە رووی دەوڵەتی عوسمانیی، میری سۆران ویستویەتی لە ژێر

---

[13]-P.Wallen,Caucasian Battlefields (Cambridge University Press,1937)pp,36-37.

[14] – عبدلعزيز نوار: تاريخ العراق الحديث، القاهرة، دار الكتب، 1968، ص201

فەرمانڕەوایەتی خۆی هەموو کوردەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانی یەکبخات، میری گەورە پیاوێکی سیاسیی و عەسکەریی و چاکسازیی نموونەیی سەدەی نۆزدەهەم بووە، ڕاپەڕینەکانی بە یەکەم ڕاپەڕینی نوێی کورد دەژمێردرێ کە ئامانجی یەکخستنی هەموو کورد بووە لە کوردستانێکی سەربەخۆدا، چەندین لێکۆڵینەوە لەسەر لایەنە جیاجیاکانی ئەو ڕاپەڕینە و هۆکارەکانی لە ناوچوونی هەیە، بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا مەبەستمانە بە تەنیا خستنەڕووی هەوڵە چڕەکانی بەریتانیایە لە هاوکارییکردنی دەوڵەتی عوسمانیی لە بەرانبەر ئەو ڕاپەڕینە، هەر لەگەڵ دەستپێکردنی ڕاپەڕین دەوڵەتی ئینگلیز لە چەندان ئاستی جیا جیا هەوڵی دیبلۆماسی گەرم و گوڕی دەستپێکرد بۆ دواییهێنان بەو ڕاپەڕینە، بە جۆری (دیبلۆ تایلەر) موقیمی بەریتانی لە بەغدا و (ئا. بۆنسیۆ) باڵوێز لە ئەستەنبوڵ چەندان برووسکەیان نارد بۆ قونسوڵیەکانی بەریتانیا، هەتا پەیوەندیی بکەن بە سەرکردە کوردەکانەوە پشتگیریی لە هەوڵەکانی میری گەورە نەکەن لە بەدەستهێنانی سەربەخۆیی کوردستان، هەروەها داوا لە کابتن (شیل) قونسوڵی بەریتانی لە ورمێ کرا ئەرکی لێکنزیکخستنەوەی هێزەکانی عوسمانیی و ئێرانیی بگرێتە ئەستۆ هەتا پێکەوە و بە ئاڕاستەی هاوبەش لە هێزەکانی میری کۆرە بدەن و ناچاری بکەن لە بەرامبەر وەرگرتنی زەمانەتی گیانیی خۆی بداتە دەست هێزەکانی عوسمانی، میری گەورە ئەم داوایەی قبوڵ کرد و خۆی دا بە دەست هێزەکانی ڕەشید پاشای سەرۆکی هێزەکانی عوسمانیی کە ئامادەکرا بوو بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی کورد[15].

لێرەدا پێویستمان بەو ڕوونکردنەوەیە هەیە، بۆچی بەریتانیا پشتیوانی لە دەوڵەتی عوسمانیی کرد بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی کورد؟ دیبلۆماسەکانی ئینگلیز هەموو لەسەر ئەوە کۆك بوون کە مەترسییان هەبووە لە سەربەخۆیی کوردستان، چونکە هەنگاوێکی گەورە دەبوو بۆ هەرەسهێنان و هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانیی، لەم هەرەسهێنانەش بە تەنیا ڕووسیا سوودمەند دەبوو، ئەم چاوتێبڕینەی ڕووسیا پاڵی بە

[15]- Lieut.Col. j.Shiel "Notes on a Journey From Tabriz Through Kurdistan Via Van, Bitlis, and Arbil to Sulaymaniyah in July and August 1839" Journalo of Royal Geography Society, Vol. 3, December 1836.

بەریتانیاوە نا پشتیوانی لە دەوڵەتی عوسمانیی بکات بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکانی کورد[16]* .

ڕاپەڕینی میر بەدرخان (1842ـ1847ز) لە ڕۆهەڵاتی ئەنادۆڵ (کوردستانی تورکیا) نموونەیەکی ترە لەسەر شوێنەواری کاریگەریی ململانێی رووسیی ـ بەریتانیی لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی لەسەر پەیوەندیی عوسمانیی ـ کوردیی، بۆ سەرهەڵدانی ئەم ڕاپەڕینە هۆکاری ئیقلیمی و نێوخۆیی هەبووە، بەڵام قسەمان لەسەر لەناوچوونییەتی، سەرەڕای هۆکاری خۆیی کە چەندین لێکۆڵینەوەی تازە پشتگیرییەتی، ئێمە بە کورتی قسە لەسەر لایەنی نێودەوڵەتیی و بەتایبەتی ململانێی بەریتانیی ـ رووسیی دەکەین.

سەرۆکی ڕاپەڕین میر بەدرخان پاشا میری بۆتان بووە، بە هۆی بەهێزیی و خۆڕاگریی و خواناسیی، توانیبووی خۆی بەسەر زۆربەی سەرۆك هۆز و ئەمارەتە کوردەکانەوە فەرز بکات، بەدرخان پاشا ویستوویەتی سەرکردایەتی کورد بکات بۆ بەرەنگاربوونەوەی سوڵتانی عوسمانیی کە بە ناوی تەنزیماتەوە لە هەوڵی سەپاندنی چاکسازیی ڕۆژئاوایی دابووە لە کوردستان..

ڕاپەڕینی ساڵی (1844ز)، زۆربەی هۆزە کوردەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانیی گرتبۆوە، ڕاپۆرتی بەرپرسانی ئینگلیز لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی ئەوە دەگەیەنن کە حکومەتی بەریتانیی زۆر نیگەران بووە بە ئاکامەکانی ئەو ڕاپەڕینە، دیبلۆماسەکانی ئینگلیز لەو باوەڕەدا بوون رووس لە پشت ئەو ڕاپەڕینەوەیە، هەتا یەکێك لەوان نائارامیی دەربڕی بوو کە ئەگەر بەدرخان سەرکەوتوو بێت دەوڵەتی

---

[16]-Letters from Persia , R. Taylor to Court of Directors,oct.21 , 1831 cited in J. Malone, U.S.A 1975, pp.4.

*لە توێژینەوەکانی بەڕێز دکتۆر عوسمان عەلی هۆکاری نێودەوڵەتیی بۆ لەباریەکچوونی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کورد ڕۆڵی گرنگ و یەکلاکەرەوەی هەیە، ئەمە پێچەوانەی لێکدانەوە و بڕوای مێژوونووسانی رابردووە، نووسەر لە وتارەکانی زیاتر پشتی بەستووە بە دیکۆمێنت و لێدوانی بەرپرسانی وڵاتانی زلهێزی هەردوو سەدەی نۆزدە و بیست، مامۆستا سەلام ناوخۆش لە لێکۆڵینەوەیەکی بە نرخیدا ئەو نوشوستیانەی دابەش کردووە بەسەر سێ تەوەرەی: ناوخۆ، هەرێمیی، نێودەوڵەتیی بە ناوی سێکوچکەی هەرەس، دەورەکەی بە وردی دابەش کردووە، بەراستی دکتۆر کە ئەم لایەنەی بە روونتر خستۆتە روو توانیویەتی ئەکادیمیانە و لەسەر بەڵگەی زیندوو ئەم لایەنە نیشان بدات، بەڵام کەمتر جەختی لەسەر لایەنەکانی تر کردووە. "وەرگێڕ"..

عوسمانیی بێبەش دەبێت لە (72) فەوجی سوارەی کورد، ئەو فەوجانەی کۆڵەکەی هێزەکانی عوسمانییان پێکهێناوە لە بەرەنگاربوونەوەی رووس[17].

بۆ سووربوونی ئینگلیز لەسەر پاراستنی یەکێتی خاکی عوسمانیی و لێك نەترازانی، ئامۆژگاریی دیبلۆماسەکانی خۆی کردووە لە شوێنی رووداوەکانەوە هەموو هەوڵێکیان بخەنە کار بۆ هاوکاری دەوڵەتی عوسمانیی و کۆتایی هێنان بە هەڵگەڕانەوەی کوردان. (نەمرود رەسام)ی یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لە موسڵ هەموو پشتگیرییەکی خستە ئەستۆی خۆی بۆ کۆتایی هێنان بەو راپەڕینە، مار شەمعۆن کە سەرۆکی رۆحی و دونیایی تایەفەی مەسیحی رۆژهەڵاتی بووە، کە (سریانی) یان (ئاشووری)یشی پێدەڵێن، ئەمانە لە هەرێمی (هەکاری) لە ژێر دەسەڵاتی بەدرخان نیشتەجێن، رەسام داوای لە مار شەمعۆن کرد گوێڕایەڵی بەدرخان پاشا نەکات و کێشە لە نێوان مسوڵمان و مەسیحیەکاندا بخولقێنێ هەتا دەرفەت لەبار بێت بۆ وڵاتانی رۆژئاوا بە بیانووی پاراستنی مەسیحیەکان دەست لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانیی و کوردستان وەربدەن، مار شەمعۆن بووە ئامرازی دەستی رەسام و کێشە و ئاشووبی لە نێوان مەسیحی و مسوڵمانەکان نایەوە و لە دەسەڵاتی بەدرخان هەڵگەڕایەوە، بەدرخان بۆ بەئاگاهێنانەوەی هێرشێکی کردە سەر مار شەمعۆن و لایەنگرانی، لێرەوە رەسام بۆ راکێشانی رای گشتیی و فشار خستنە سەر دەوڵەتی عوسمانیی بە مەبەستی کۆتایهێنان بە راپەڕینی کورد، کەوتە راپۆت نووسین لەسەر بارودۆخی هەکاری و گەورەکردنی قوربانیانی ئاشووری، لە ئاکامی ئەم شاڵاوە راگەیاندنە، بەریتانیا و رووسیا و فەرەنسا یاداشتنامەیەکیان دا بە سوڵتان و داوایان لێکرد کۆتایی بە راپەڕینی کورد بهێنێ، ئەگەرنا وڵاتانی رۆژئاوا دێنە ناو کێشەکە بۆ راگرتنی وەکو خۆیان دەڵێن "قەسابخانەی مەسحیەکان"، بۆیە دەوڵەتی عوسمانی هێزێکی گەورەی بۆ سەرکوتکردنی راپەڕینەکە نارد[18].

بە هۆی ململانێی رووسیی ـ بەریتانیی لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی، بەریتانیا رۆڵی سەرەکی گێڕا لە لەبارییەکبردنی راپەڕینی بەدرخان، ئەو راپەڕینە و ئاکامەکانی ئەوەمان

---

[17]..F.O. 78\ 957, Rawlinson to Abingdon, June

[18] - S.A. Washed, The Kurds And Their History (Lahore ; Univ. Book Agency), pp.143-144.

بۆ دیاردەخا کە کێبەڕکێی رووسیی ـ عوسمانیی لایەنی سێیەمی هەیە، ئەویش رۆڵی بەریتانیایە، لە شوێنی خۆیەوە کوردیش کەوتە ژێر کاریگەریی ئەو لایەنە.

## سالآنی شەڕی قەرم (1853- 1854ز)

لە گەرمەی شەڕی قەرمی نێوان رووسیا و دەوڵەتی عوسمانیی کە بەریتانیا و فەڕەنسا پشتیوانیان لێدەکرد، فەرماندەی هێزەکانی عوسمانیی هەواڵێکی پێگەیشت لەسەر پەیوەندیی نێوان شێخ شامیل سەرۆکی رێبازی نەقشبەندیی لە داغستان و چیچان و سەرۆکی بەرگریی ئیسلامیی دژی داگیرکەری رووسیی لەگەڵ شێخ تەهای نەهری سەرۆکی رێبازی نەقشبەندیی لە کوردستان، رووسەکان بڕوایان وابووە لە حاڵەتی هەڵگیرسانی شەڕی نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆریەتە، پەیوەندیی نێوان شێخ شامیل و شێخ تەها دەبێتە پشتیوان بۆ دەوڵەتی عوسمانیی، بۆیە رووسیا پەیوەندییەکانی لەگەڵ سەرۆك هۆزەکانی سەر سنوور چڕکردەوە و کەوتە هەوڵی بەدەستهێنانی دۆستایەتی، یان بێلایەنکردنیان لە ململانێی چاوەڕوانکراوی لەگەڵ عوسمانیی، بەڵام ئەم هەوڵانە بێئاکام بوون[19].

لە یەکەم قۆناغی شەڕی رووسیی ـ عوسمانیی لە ساڵی (1877) بەگشتیی کورد بە لای عوسمانییەکانی داشکاند بووە، بە زۆرترین هێزی سوارەی خۆیان ویستبوویان خزینی رووسی بۆ رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ رابگرن، بۆ نموونە لە شەڕی (باشقاد کلیر)ی بەناوبانگ لە تشرینی دووەمی (1877ز)، سوارەی کورد بەشی گەورەی هێزەکانی عوسمانیی پێکهێنابوو لە گەمارۆدانی هێزەکانی رووسیی، بەڵام تێکشکانە یەك لەدوای یەکەکانی هێزە ناڕێك و ئامادەنەکراوەکەی عوسمانیی کە رووسەکان لە بەرامبەریدا لە رووی چەندایەتیی و چۆنایەتیی باڵاتر بوون، ئەمە سام و هەیبەتی هێزەکانی رووسی لەبەر چاوی کوردان زیاتر کرد، هەروەها فەرماندەی هێزەکانی رووسیی لە قەوقازیا کۆمەڵێك بانگەوازی بۆ کوردان کرد و لە حاڵەتی پشتیوانی نەکردنی کورد لە عوسمانییەکان بەڵێنی سەلامەتیی پێدان، بۆیە لە دواقۆناغەکانی شەڕ، کوردەکان بە

[19] -خالفین: ل42

تەواوەتی وازیان هێنا[20]، سەرەڕای ئەو هۆکارانەی باسمان کردن چەندین هۆکاری تر هەن، شەڕی (قەڕم)یش هاوکات بووە لەگەڵ تێکچوونی پەیوەندیی دەوڵەتی عوسمانیی و کورد، لە دوای سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی بەدرخان و بەشداریی کورد لەو ڕاپەڕینە، دەوڵەتی عوسمانیی، بۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنی بەرگری لە ڕاپەڕین و ڕازیکردنی باڵیۆزی وڵاتە ئەوروپییەکان بە سزدانی ئەو میرە کوردانەی تاوانبارن بە کوشتنی گاورە نەستۆری (ئاشووری)یەکان، چەندان سەرۆك هۆزی کوردی گرت [21]، شەڕی قەرم لە ناوچە کوردییەکان بەرئەنجامی زۆری هەبوو، هەروەکو ڕابردوو ناوچەکە ببووە مەیدانی گرنگی شەڕ، درێژەکێشانی ئەم شەڕەش دەوڵەتی عوسمانیی بە گرتنەبەری ڕێوشوێنی تازەی ئابووریی لەسەر شانی جوتیارە کوردەکان ناچار کرد قەرەبووی ئابوورییە رووخاوەکەی بکاتەوە، ئەوەش زیاتر بووە هۆی نارەزایی کورد، بۆیە حکومەت پەنای بردەبەر شالاوی توند و تیژی نیزامیی بۆ سەر گوندەکان و دانیشتوانەکەی ناچارکرد بخزێنە ناو تەشکیلاتی عوسمانیی بۆ بەرەکانی شەڕ[22].

سەرەڕای ئەمە لە شەڕەکانی قەڕم فەرماندەی هێزەکانی قەوقازیا توانیبووی باری نارەزایی کورد لە دەسەڵاتی عوسمانیی بۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکاربهێنێ[23].

هەر لەو ماوەیەدا یەکێك لە فەرماندەکانی بەرەی قەوقاز بە ناوی (بۆریس میلیکۆف) هەمان ڕۆڵی ڕابردووی (باسکۆفیچ)ی گێڕا لە سەرپەرشتیکردنی پێکهێنانی هێزێکی بەکرێگیراوی کوردی هەتا لە پاڵ هێزەکانی رووسیی لە دژی عوسمانیی بجەنگن، میلیکۆف لەگەڵ یەکێك لە سەرکردەکانی ناوچەی سنووری نزیك یەریڤان، بە ناوی قاسم خان سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو، قاسم خان لە هەوڵدا بوو کەتیبەیەك لە سوارەی کورد درووست بکات بۆ لایەنگیری رووسیا، هەمان سەرکەوتنیشی لەگەڵ جەعفەر پاشا بەدەستهێنابوو، کە یەکێك بووە لە ناودارترین سەرکردەکانی هەرێمی بایەزید لە سەر

---

[20] - جلیلی جلیل: من تاريخ الامارات الكرديه فى الامبراگوريه العيمانيه، ترجمه/م.نجار، دیمشق، الاهالى 1987، ص148.

[21]- Jwaidah- pt. 1. Pp.332-333.

[22]- سەرچاوەی پێشوو، ل151-152

[23] - ئاڤریانۆڤ: ل188

سنوور[24]، پێکهێنانی ئەو دوو کەتیبەش لەو کاتە کاریگەریی هەبووە لەسەر هەڵوێستی کورد، رووسیا لە رێگەی قاسم خان و جەعفەر پاشاوە هەوڵی داوە کورد بێلایەن رابگریٚ[25]، ئەمەش باشترین دەستکەوت بووە کە ئەو خۆزگەی بۆ دەخواست، میلیکوف بۆ رێوشوێن دانان و هاندانی کۆچکردنی سەرۆك هۆزەکان بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی رووسیا، دەیوست ناوچەیەکی ئاسایش لە سەر سنووری دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەو هۆزانە درووست بکات و هەموو ئەو ئیمتیازاتانەیان بداتیٚ کە دەوڵەتی عوسمانیی لێی زەوت کردبوون[26]، بەڵام دەوڵەتانی ئەورووپی رووسیایان ناچار کرد پاشەکشە بکات لە هەموو ئەو خاکەی داگیری کردبوو، بەمەش پرۆژەکەی میلیکۆف رووناکی بە خۆوە نەبینی.

کوردەکان لە زیادەڕۆیی لە مەرکەزیەتی دەسەڵات و سیاسەتی عوسمانییەکان بە لەناوبردنی میرنشینە کوردیەکان بێزار ببوون، شەڕی (قەڕم)یان بە دەرفەت زانی بوو بۆ گێڕانەوەی سەربەخۆییە خۆجێیەکانیان، کە دەوڵەتی عوسمانیی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم لەناوی بردبوون، زۆربەی سەرکردە تەقلیدیەکانیشی لە کوردستان دوورخستبۆوە.

یەزدان شێر لەو میرە خاوەن قەڵایانە بووە کە لە ناوچە کوردییەکان مابۆوە، لە ساڵی (1847ز) هاوکاریی عوسمانییەکانی کرد لە دژی جوڵانەوەکەی بەدرخانی مامی و ئەوانیش وەکو بەرپرسی میری لە جەزیرەی ئیبن عومەر دایانەزراند، دواتر ویستیان سنوورێك بۆ دەسەڵاتی دابنێن و لە جەزیرە دووری بخەنەوە، ئەمیش دواکەس بوو لە دەسەڵاتی عوسمانیی یاخی بێت و خوازیاری راپەڕین بێت دژی دەوڵەت[27].

هۆکارێکی تری پەلەکردنی یەزدان شێر لە سەرکردایەتی کردنی جوڵانەوەی کورد لە ماوەی شەڕی قەڕم، بانگەوازە یەك لە دوای یەکەکانی فەرماندەکانی هێزی رووسی بووە بۆ دەستپێکردنی شۆڕش بە ڕووی عوسمانیی، ئەوەندە ئاماژەیە بەسە کە فەرماندەی

[24] - خالفین: ل17-177

[25] - جلیلی: سەرچاوەی پێشوو، ل151 Kendal p.22

[26] - Caucasian Command Records, Memo.col.Boris Melikov. Nov.30,1855.

[27] -خالفین: ل104-108، جەلیلی: ل30-31.

ئەو هێزانە لە قەوقاز نامەیەکی بۆ یەزدان شێر نارد بوو، هانی دابوو بۆ راپەڕین بە ڕووی عوسمانیی، بەڵێنی پشتیوانی تەواوی پێدابوو، لە نامەکەدا هاتووە: (ئەگەر توانیمان بەسەر تورکەکاندا سەربکەوین، ئەوە دەتانکەین بە حاکمی جەزیرەی ئیبن عومەر..)[28].

لە دوای پەیوەندییکردنی چڕوپڕی یەزدان شێر بە سەرۆك هۆزەکانی کورد و کەسایەتیە چالاکەکان، لە کانوونی یەکەمی (1854ز) هەڵگەڕانەوەی خۆی راگەیاند، لە سەرەتاوە هەشت هەزار چەکداری کۆکردەوە، لەو کاتەوە هەتا ئازاری (1855ز) دەسەڵاتی گرتەوە بەسەر زۆربەی کوردستان، لە باکوورەوە هەتا وان و لە باشوورەوە هەتا موسڵ، لە کوردستانی رۆژهەڵاتیش ژمارەیەك سەرۆك هۆزەکان پشتیوانی خۆیان بۆ جوڵانەوەی یەزدان شێر راگەیاند[29]، بەڵام لەبەر چەند هۆکارێك شۆڕشی کوردی رووبەڕووی بەرەنگاریی گەورەی عوسمانیی بۆوە، ئەو شۆڕشگێڕانەی دابوویانە پاڵ جوڵانەوەی یەزدان شێر کۆڵەکەی هێزی سوارەی کوردیان پێکهێنابوو لە بەرپەرچدانەوەی شاڵاوی رووسیی، سەرەڕای ناچاربوونی عوسمانی بە کێشانەوەی بەشێکی زۆری هێزەکانی لە هێڵی پێشەوەی بەرەکانی شەڕ بۆ مەبەستی بەرەنگاربوونەوە و سەرکوتکردنی راپەڕینی کورد[30].

لەبەر چەند هۆکارێکی بابەتیی و خودیی و هەرێمی و نێودەوڵەتیی بە هەمان خێرایی عوسمانییەکان توانیان زاڵ ببنەوە بەسەر کوردستان، لە بەهاری (1855ز) دووبارە گەڕانەوە ناوچەکە و یەزدان شێر خۆی بەدەستەوەدا.

جێی سەرسوڕمانە ئەو شۆڕشە وا بە زوویی لەناوچوو، ئەمە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ورد هەیە لەسەر لایەنە کاریگەرەکانی ئەو جوڵانەوەیە، بەڵام لە بەرنامەی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا نییە، لێرەدا بە تەنیا چەند هۆکارێك لە هەرەسهێنانی ئەو شۆڕشە باس دەکەین.

لە پێشەوەی ئەو هۆکارانە دواکەوتنی کاتی سەرهەڵدانی شۆڕش بووە، یەزدان شێر کاتێك دەستبەکاربوو کە شەڕ بەرەو کۆتایی دەچوو، هێزەکانی رووسی خەریکی

[28]-Caucasian Command Records Letters for General Muragvov to Yezdan Shir Beg No, g,Sarilims Aug, 20 1954.
[29]-FO. 78\ 11\5 M osul. A.N. Rassem. Teleq J an.29, 1855.
[30]-Khalfin, p.80.

کشانەوە بوون بۆ پێگە سەربازییەکانی سەر سنوور، بەمەش دەسەڵاتدارانی عوسمانیی توانیان ئەو هێزانە کۆبکەنەوە و جەخت لەسەر رۆژهەڵات بکەن بۆ لەناوبردنی راپەڕینی یەزدان شێر[31].

پێویستە لەوەش ئاگاداربین رووسەکان بە جددیی پشتیوانیان لە جوڵانەوەی یەزدان شێر نەکرد، لە کاتێکدا یەزدان شێر هەموو توانای خستبووە گەڕ بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی رووسیی، بەڵام بێئاکام بوو، زیاتر لە چوار نامە و نوێنەری نارد بۆ لای رووسەکان و داوای هاریکاری لێکردبوون، بەڵام یەك وەڵامی دڵخۆشکەرانەی لە لایەن رووسەکانەوە پێنەگەیشت، بە تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە شۆڕشەکەی لە دواهەناسەدا بوو[32].

ئەوەی شایانی باسە یەزدان شێر یەکەم سەرکردە و دواسەرکردەی کورد نەبووە، لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە هەتا سەرەتای ساڵی (1914ز) هەوڵەکانی بە بێئاکامیی بگات لە بەدەستهێنانی پشتیوانی رووسەکان، دکتۆر وادی جوەیدە (پسپۆڕی عێراقیی لەسەر جوڵانەوەکانی کورد سەدەی نۆزدەهەم)، ئەم ئارەزوو نەبوونییەی رووس دەگەڕێنێتەوە بۆ سیاسەتی رووسیای قەیسەریی دۆست بە ئەرمەن و ناحەز بە کورد، چونکە کۆسپی دەخستە بەردەم هەوڵەکانی نەتەوەی ئەرمەن لە ئەرمینیای رۆژئاوای خۆی و پشتگیریی لە جەماوەری ئەرمەن دەکرد لە ئەنادۆڵ بۆ جیابوونەوە، خۆزگە و ئاواتەکانی کورد لەگەڵ خۆزگە و ئاواتەکانی ئەرمەن تێکدەگیران، ئیمپراتۆریەتی رووسیی نەیدەتوانی لە بانگەوازە نوێیەکانی بەتریاکی ئەرتۆدەکسی هاوسۆزی بەتریاکی ئەرمەنی دوژمنکار بە کوردی "دەمارگیر و خوێنڕێژی بێتاوانەکان" دەربچێت[33].

نووسەری ئەم وتارە پێیوایە هۆکاری یەکلاکەرەوە لە کۆتاییهاتنی بزاڤی یەزدان شێر دەگەڕێتەوە بۆ جەختکردنی بەریتانیا لە سەدەی نۆزدەهەم لەسەر پاراستنی یەکێتی خاکی دەوڵەتی عوسمانیی و بێبەشکردنی رووسیا لە بەدەستهێنانی دەسکەوتەکانی لەناو ئەو دەوڵەتە.

[31]- جلیلی: ل154

[32] - خالفین: ل83

[33]- Kurdish Nationalist Movement, pt. T. p.377

هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانیی دەبووە هۆی تێکچوونی هێز لە نێوان وڵاتانی ئەوروپی و زیانی دەگەیاند بە بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لە دەریای سپی ناوەڕاست و رۆژهەڵاتی ناوەند لە هیند، جیابوونەوەی کوردستان بە سەرۆکایەتی یەزدان شێر لە سایەی رووسیا هەنگاوێك دەبوو، دەیتوانی ژانی لە دایك بوونی دەوڵەتی کوردیی لێ بکەوێتەوە، ئەمەش هەنگاوێك دەبوو بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی، لەبەر یەکدەنگ نەبوون لەسەر دابەشکردنی میراتی، هێزەکانی ئەوروپی هەوڵی لێکهەڵوەشاندنەوەیان نەدەدا.

دیبلۆماسەکانی ئینگلیز، رۆڵی گرنگیان بینی لە لێکنزیککردنەوەی ئێران و دەوڵەتی عوسمانیی هەتا لە ئاستی هەرێمی یەزدان شێر گۆشەگیر بکەن، هەروەها لەسەر ئاستی سەرۆك هۆزە چالاکەکانیش ئینگلیز هەوڵی گۆشەگیرکردنی یەزدان شێری دەدا، بە جۆرێ قونسوڵیەکانی کەوتبوونە بەخشینی سامان و دەسەڵات هەتا بەڵێنییان لێوەربگرن لە یەزدان شێر دابڕێن[34]. لە کۆتاییدا هەر ئەمانیش رۆڵی یەکلاکەرەوەیان گێڕا لە قەناعەت پێکردنی یەزدان شێر بۆ خۆ بەدەستەوەدان بە دەوڵەتی عوسمانیی و کۆتاییهێنان بە راپەڕین.

جوڵانەوەی یەزدان شێر نموونەیەکی زیندووە لەسەر کاریگەریی کورد لە هەمبەر ناکۆکییەکان و هەروەها کەوتنە ژێر کاریگەریی ناکۆکییەکان، دەبینین رۆڵی باڵادەست بەدیار کەوت وەکو لایەنی سێیەم لەسەر ناکۆکیی رووسیی - عوسمانیی کە سوور بووە لەسەر دەرفەت نەدان بە ڕووس، بە سوود وەرگرتنی لە هۆکاری کوردیی ناو دەوڵەتی عوسمانیی ئەم سیاسەتەی ئینگلیز "هەتا لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی"یش لە پێناو فراوانخوازیی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەردەوام بووە، ئەمە تا کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەم پایەیەکی سەرەکیی سیاسەتی بەریتانی بوو، هەروەها هۆکاری دابەشکردنی کوردستانیش بووە لە لایەن هێزە ئەوروپیە داگیرکارەکانەوە، توێژەرەوانی بارودۆخی کوردستان لە بیستەکان تێبینی ئەوەیان کردووە چۆن ئینگلیز مەبەستی بووە هەوڵەکانی ئێران و عێراق یەکبخات بۆ سەرکوتکردنی جوڵانەوەی نەتەوەیی، کەچی لە سەرەتاوە جۆشدانی بزاڤەکەیان وەکو کارتی فشار بەکارهێناوە لەسەر تورکیای کەمالیی و رژێمی پاشایەتی لە عێراق.

---

[34] - شەمزینی: 58-60

تاوانی دابەشکردنی کوردستان لە نێوان دەوڵەتە ناسیۆنالیستەکانی ئێستا و ئەوەی بەدوای خۆی دا هێنای لە کاولکاریی و مەینەتی بەرپرسیاریەتیەکەی بە ئەندازەیەکی زۆر دەکەوێتە ئەستۆی هێزەکانی ئەوروپی، نەك گەلانی موسڵمانی تورك و فارس و عەرەب، ئەوانە باجی دیکتاتۆریەتی و دواکەوتوویی سیاسییی و ئابووریی دەمڕاستە دەسەڵاتدارەکانیان داوە، کە بە زمانی تورکیی و عەرەبیی و فارسیی قسـە دەکەن.

## شەڕی رووسیی - عوسمانیی (1877- 1878ز)

کوردستان لە ساڵانی (1877- 1878ن) مەیدانی گرنگی شەڕی رووسیی - عوسمانیی بوو، بۆیە لێرەش هۆکاری کوردیی هەمان کاریگەریی ساڵانی (1827- 1828ن)و (1854- 1855ن) هەبووە، کوردیش لە لای خویەوە کاریگەریی گەورەی ئەم شەڕانەی بەرکەوتووە، رووسەکان لە ململانێی هەفتاکانی سەدەی نۆزدەهەم لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیی گرنگی بەرچاویان بە ڕۆڵی کورد داوە.

دەوڵەتی عوسمانیی لە ئاکامی ئەزموونی رابردووی لە شەڕەکانی لەگەڵ رووس درکی بە هۆکاری کوردیی کردبوو، بۆیە لە هەفتاکان هەردوو دەوڵەت لە پێشبڕکێدا بوون بۆ بەدەستهێنانی دۆستایەتی کورد بە هەر رێگەیەکی لە توانا دابێت.

لە سەرەتای ساڵی (1875ن) (فلادمێر ئەگناتیف) باڵیۆزی چالاك و بە ئەزموونی رووسیی لە دەوڵەتی عوسمانیی نامەیەکی بۆ بەرەی قەوقاز نووسی و داوای لێ کردبوو بە هەرچی لە توانایدایە هەوڵبدات سەرۆك هۆزە چالاکەکانی سەر سنوور بە لای خۆیدا رابکێشێ، هەروەها حکومەتی ئاگادارکردبۆوە لە چالاکیی چڕی قونسوڵەکانی ئینگلیز دژ بە ڕووسیا لە ناو کورد[35]، ئەم هەوڵانەی ئینگلیز زیاتر بۆ هاندانی کورد بووە لەسەر رێزگرتنی یاساو ئاسایشی ناوچەکانی سنوور و گوێڕایەڵی دەسەڵاتی ناوەندیی عوسمانیی، ئەمەش بە مەبەستی بێبەشکردنی رووس لە سوودوەرگرتن لە نائارامیی ناوچە کوردییەکان بۆ فراوانخوازیی لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ دا.

سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (1876-1908ن) سیاسەتێکی کراوەو هاوکاری دەست پێ کرد لەگەڵ سەرکردە تەقلیدیەکانی کورد کە بەشێك بووە لە سیاسەتی

[35]-Caucasian Command Records Constantinople. Memo. No. 27. Oct.23 1876

کراوەی سوڵتان لە بەرامبەر گەلانی موسڵمان بە ناوی جامیعەی ئیسلامی، ئەو سیاسەتەش بەند بوو بە پتەوکردنی خاڵە هاوبەشەکانی لەگەڵ گەلانی عوسمانیی، بۆ ئەمەش پشتی بەستبوو بە زانایان و شێخانی تەریقەتی سۆفیگەریی لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی، لەسەر بنەمای ئەو سیاسەتەش بوو، کە شێخ سەعیدی بەرزنجی لە سلێمانی و شێخ عوبێدوڵڵای نەهری لە دەروازەی باڵا نزیککردەوە، لەوێ رێزی لێگرتوون و نازناوی داونەتێ[36].

هەوڵە چڕەکانی رووسیا لە هەفتاکانی سەدەی نۆزدەهەم بۆ کڕینی پەیمان لە سەرۆك هۆزە کوردییەکانی سەر سنوور بە بێئاکامیی مایەوە، بە تەنیا لەگەڵ چەند هۆزێکی ئێزیدی نەبێت، کە لە دەسەڵاتی عوسمانیی بێزار بوون، لە سەرەتای شەڕی رووسیی ساڵی (1877ز) زۆربەی هۆزەکانی کورد دایانە پاڵ جیهادی ئیسلامیی دژ بە ڕووس، هەر لە سەرەتاوە شێخ عوبێدوڵڵای نەهری رۆڵی گەورەی گێڕابوو لە ئامادەکردنی موجاهیدانی کورد بۆ بەشداریی شەڕ دژی داگیرکەری رووسیی.

لێرەدا ئەوەندە ئاماژەیە بەسە، کە لە حوزەیرانی (1877ز) لە رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ هێزەکانی رووسیی هاتنە ناو شاری بایەزید، دەوڵەتی عوسمانیی هێزێکی یازدە هەزار کەسی نارد، بۆ دەرپەڕاندنی رووسەکان، حەوت هەزاری ئەو هێزە کورد بوون[37].

لە ساڵی دووەمی شەڕ، پشتیوانی کورد، لە هەوڵە جەنگیەکانی عوسمانیی وردە وردە بەرەو کەمیی چوو، ئەمەش هۆکاری بنەڕەتیی بوو لەو تێکشکانە خێرایەی هێڵەکانی بەرگریی عوسمانیی لە بەرانبەر هێرشی رووسیی، لە ماوەیەکی کورتدا کوردەکان درکیان بەوە کرد سوپای عوسمانی لاوازە و ناڕێکە و ناتوانێ بەرگرییان لێبکات، بۆیە بێلایەن مانەوە[38]. سەرکردایەتی سیاسیی ئەستەنبوڵ لە ماوەی شەڕ لە لایەن مەدحەت پاشا و عەونی پاشاوە بەڕێوە دەبرا، کە هەردووکیان لە بانگەوازکارانی دەستوور بوون، ئەمانە لە ململانێدا بوون لەگەڵ سوڵتان لەسەر دەسەڵات، ئەو شەڕە ناشایستەیی مەدحەت پاشا و لایەنگرانی بەدیارخست لە بەڕێوەبردنی وڵات کە لەو

[36] - خالفین: ل101

[37] -خالفین: ل105

[38] - خالفین: ل179

بارودۆخە ناسکەدا بەرەی چاکسازیی سەرۆکایەتی وڵاتیان پێناکرێت، کشانەوەی تێکۆشەرە کوردەکانی لایەنگری شێخ عوبێدوڵڵای نەهری لە بەرەکانی شەڕی دژ بە رووس بەهی گەندەڵیی ئیداریی مەدحەت پاشاو مامەڵەی خراپی سوپای عوسمانیی بووە لەگەڵ لایەنگرانی نەهری.

بۆ نموونە ئەفسەرانی سوپا پێداگربوون کە دەبێت لایەنگرانی شێخ ملکەچیی ئەوان بن، ئەمە لە کاتێکدا ئەو هێزانە نانیزامیی بوون و وا چاکتر بوو لە ژێر فەرمانی سەرۆکەکانیاندا بن، لەو کاتە تێکۆشەرانی کورد بە فەرمانی سەرکردەکانی سوپا سزا دەدران بەوەی کە پێویستییەکانیان بۆ دابین نەدەکردن و چەك و تەقەمەنیی و ئازوقەیان لێ دوادەخستن، سەرکردە کوردەکان و لە پێشەوەیاندا شێخ عوبێدوڵڵا لە چەندین بۆنەدا سکاڵای خۆی کردبوو، بەڵام بێئاکام بووە[39].

باری خراپی ئابووریی و سیاسییی رۆژگاری شەڕی قەرم و ئەو ئاڵۆزی بارودۆخەی مابۆوە بەم شەڕە وێران و خراپتر بوو، گەندەڵیی و خراپەکاریی لەناو کاربەدەستان و هێزەکانی عوسمانیی بڵاوبۆوە، شەڕی ساڵانی (1877 ـ 1878ز) بە هۆی باج و وێرانبوونی لە ڕادەبەدەری ئارامیی و ئاسایش باری قورس زیاتر کەوتە سەر شانی جوتیاران.

بە هۆی ئەو بارودۆخەی قورسە، برسیەتی لە ناوچە کوردیەکانی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بڵاوببۆوە، کاربەدەستانی تورك "لەو قۆناغە هەموویان توورك بوون لە جیاتی ئیدارەی کوردیی سەر بە میرە کوردیەکان دانرابوون"، خراپەکاریی و بێئاگایی ئەوان لە بارودۆخی ناوچەکە گەندەڵیی هەرێمە کوردیەکان بڵاوببۆوە[40].

بە هۆی باری قورسی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و بەرەنگاربوونەوەی دژ بە دەوڵەت (بۆتان) ببووە مەڵبەندی ئەو بەرەنگاربوونەوەیە، هەریەك لە عوسمان پاشا و حوسێن پاشای کوڕانی میر بەدرخان پەیوەندییان بە چەندین سەرداری کوردەوە کرد، هەتا ئامادە بن بۆ شۆڕش، لە پاییزی ساڵی (1878ز) جوڵانەوەکە بە سیمایەکی جەماوەریی

---

[39] --خالفین: ل108

[40] - FO, 60\44\ |Memo Oct 1. 1881.General Abdul Tabviz.

رەتکردنەوەی دەسەڵاتی عوسمانیی دەستی پێکرد[41]، بەڵام بەر لەوەی بڵاوبێتەوە لە ناو برا. ئەوەی جێی ئاماژەیە هەر لە سەرەتاوە کوڕانی بەدرخان رایانگەیاند بوو ئامانجی شۆڕشەکەیان گەڕاندنەوەی سەربەخۆیی میرنشینە کوردیەکانە[42]، بۆیە شۆڕشی کوڕانی بەدرخان ئاماژەیەکی ترە لەسەر ئارەزووی کورد بۆ سوود وەرگرتن لە ناکۆکیی رووسیی ـ عوسمانیی لە بەدەستهێنانی سەربەخۆیی.

لە دوای خنکاندنی شۆڕشی کوڕانی بەدرخان (حوسێن و عوسمان)، ئیدارەی تورکی بەردەوام بوو لە سیاسەتی پاکتاوکردن و فەرزکردنی باجی قورس و بە زۆر بردنە خزمەتی سەربازیی، لەبەر ئەم هۆکارانە بوو کە شێخ عوبێدوڵڵای نەهری کوڕی شێخ تەهای نەهری سەرۆکی تەریقەتی نەقشبەندیی و خاوەن دەسەڵاتی بەرفراوان ویستویەتی سنوورێك دابنێ بۆ ئەو بارە تاڵەی پەرەی سەندوە.

لە ئەیلولی (1879ز) لایەنگرانی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری هەوڵیاندا نەهێڵن هێزی جەندرمەی عوسمانیی بە زۆر باج لە ناوچە کوردییەکان کۆبکەنەوە، ئەم رووداوە بووە هۆی پێکدادانی چەکداریی و کوژرانی ژمارەیەك لە هەردوولا کوژران[43]، ئەمەش سەرەتایەك بوو بۆ راپەڕینێکی گەورە بە سەرۆکایەتی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری.

راپەڕینەکە لە چەند لایەنێکەوە پەیوەندیی هەبووە بە ناکۆکیی رووسیی ـ عوسمانیی، هەندێ لە توێژەرەوان بڕوایان وایە ئەو راپەڕینە یەکێك بووە لە دەرهاویشتە بنەڕەتییەکانی شەڕی هەردوو دەوڵەت لە نێوان ساڵانی (1877ـ1878ز)، ئەوەی شایانی باسە، دەوڵەتی عوسمانیی لەو شەڕەدا تێکشکا، بە ناچاریی رێکەوتننامەی (سان ستیڤانۆ)ی ساڵی (1878ز) پڕ لە ڕیسوایی واژوو کرد، دەوڵەتانی ئەورووپی و لە پێشەوە بەریتانیا دوودڵ بوون لە بەرامبەر ئەو دەستکەوتە سەربازیی و سیاسییانەی رووسیا کە لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی بەدەستی هێنابوون، بۆیە رووسیا لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ ناچار کرا پاشەکشە بکات و لە جێگەی رێکەوتننامەی ناوبراو، رێکەوتننامەی (بەرلین)ی لەهە مان ساڵدا پێ واژۆ کرد، ئەمەی دوایی چەند بابەتێکی تایبەت بە

---

[41] - ئەڤریانۆڤ: ل122

[42] - خالفین: ل117

[43] - FO, 60\44\ |Memo Oct 1. 1881.General Abdul Tabviz.

وازهێنانی دەوڵەتی عوسمانی بووە لە هەندێ ویلایەتەکانی بولقان، هەروەها سوڵتان بەڵێنی دابوو چاکسازیی کارگێڕیی لە ویلایەتەکانی رۆژهەلاَت لە ئەنادۆڵ لە بەرژەوەندیی ئەرمەن ئەنجام بدات لەگەڵ راگرتنی ئەوەی پێی دەوترا "دەستدرێژیی کورد بۆ سەر ئەرمەن".

ژمارەیەك لە توێژەرەوان لە پێشەوەیان وادی جوەیدە لە لێکۆڵینەوەیەکی بە نرخیدا لەسەر جولاَنەوەی کورد، روونی کردۆتەوە کە پەیوەندیی هەیە لە نێوان جولاَنەوەی شێخ عوبێدوڵلاَ و بەندەکانی رێکەوتننامەی بەرلین، ئەوەی تایبەتە بە چاکسازیی لە بەرژەوەندیی ئەرمەن، جوەیدە لەو باوەڕەدایە سوڵتان عەبدولحەمید نەیویستووە بەندەکانی رێکەوتننامەی بەرلین جێبەجێ بکات، بۆیە ئامۆژگاریی شێخ عوبێدوڵلاَی کردووە، ئارامی ویلایەتەکانی رۆژهەلاَتی ئەنادۆڵ بشێوێنێ، هەتا بیانوو هەبێت بۆ جێبەجێ نەکردنی ئەو چاکسازییانەی لە بەرژەوەندیی ئەرمەنەکان دا بووە[44].

سوڵتان لە چەندین جێگەی بیرەوەرییەکانیدا نیگەرانیی خۆی بە دیار خستووە لەو بەندانەی پەیوەستن بە چاکسازیی لەسەر راڕەوی رۆژئاوا لە ویلایەتەکانی ئەنادۆڵی رۆژهەلاَت لە بەرژەوەندیی ئەرمەن، ئەمەشی بە مەترسیدار وەرگرتبوو، وتبووی ئەوانە (واتە ئەوروپیەکان) لق بە لق پەیوەندییەکانی دەوڵەتی عوسمانیی بە ناوی چاکسازییەوە دەبڕن و هەوڵ دەدەن بە بیانووی چاکسازیی لە بەرژەوەندیی ئەرمەن، قەوارەی رۆژئاوایی لە ناوجەرگەی دەوڵەتی عوسمانیی درووست بکەن[45]، شێخ عوبیدوڵلاَش بە ئاشکرا نیگەرانیی دەربڕیوە بەوەی چاکسازیی کارگێڕیی لە ویلایەتەکانی رۆژهەلاَت بیانووە بۆ مەبەستی درووستکردنی قەوارەیەکی نەتەوەیی بۆ ئەرمەن لەو ناوچانەی زۆرینەی کوردن، هەروەها هەڕەشەی کردووە کە ڕێگەی کاری لەو جۆرە نادات هەتا ئەگەر پێویست بە چەکدارکردنی هەموو پیاوان و ئافرەتانی کورد بکات، گەیشتنی چاودێرە نێودەوڵەتییەکان بۆ ویلایەتەکانی رۆژهەلاَت بۆ سەرپەرشتی چاکسازیی کارگێڕیی ئەو بڕوایەی لە لای کورد، بەتایبەتی شێخ عوبێدوڵلاَ پتەو کردووە، کە هێزەکانی ئەوروپی سوورن لەسەر بەکارهێنانی رێکەوتننامەی بەرلین بۆ دامەزراندنی

---

[44] - محمد حرب: مذكرات السلطان عبدالحميد، القاهرة، ص55-57

[45] - Jwaideh, p.223.

قەوارەی ئەرمەنی لە ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات[46]، ئەگەر دۆستایەتیی نێوان شێخ و سوڵتانیش بە هێند وەربگرین، ئەوە ناتوانین بە تەواوی خۆببوێرین لە جۆرێك لە لێكتێگەیشتنی نێوان ئەو دوو كەسایەتیە بەر لە ڕاپەڕین.

سوڵتانی عوسمانی دوو دڵ بوو لە گرتنەبەری ڕێوشوێنی خێرا لە دژی جوڵانەوەكە، لە واقیعدا لە دوای فشاری زۆری هێزە ئەوروپیەكان نەبێت بەتایبەت بەریتانیا و ڕووسیا، هێزەكانی عوسمانیی نەبزووتن بۆ لەناوبردنی ڕاپەڕین[47]، شێخ لە دوای خۆبەدەستەوەدانی بەشێوەیەكی فەرمیی و لە مەراسیمێكی جەماوەریدا لە لایەن سوڵتانەوە پێشوازیی لێكرا، بەمەش باڵیۆزی بەریتانی لە ئەستەنبوڵ نیگەران بوو، سەرەڕای ئەمە شێخ عوبێدوڵڵا لەساڵی (1881) توانی بە نهێنی لە ئەستەنبوڵەوە هەڵبێت بۆ هەكاری، لە سنووری ئێرانیی ـ عوسمانیی، ئەوەش مەترسی زیاتری لە لایەن هێزە ئەوروپیەكانەوە لێكەوتەوە كە ئەو لە لایەن سوڵتان، یان بەرپرسانی دەروازەی باڵاوە پشتگیریی لێ كرابێت[48].

ئەوەی لێرەدا لێی تێدەگەین، ڕێكەوتنی لە پێشتر لە نێوان شێخ عوبێدوڵڵا و سوڵتان دا نەبووە، بەڵام سوڵتان ڕاپەڕینی كوردی بەكارهێناوە بۆ خۆدزینەوە لە جێبەجێكردنی ئەو بەندانەی ڕێكەوتننامەی بەرلین كە پەیوەندیی هەبووە بە چاكسازیی كارگێڕیی لە ویلایەتەكانی ڕۆژهەڵات لە بەرژەوەندیی ئەرمەن. دوور نییە لە دوای ئەوەی شێخ هەستی كردبێت دەوڵەتی عوسمانیی ناتوانێ بەرگری لێ بكات دەستپێشخەریی كردبێت لە ڕاپەڕین. دوای واژۆكردنی ڕێكەوتننامەی بەرلین و گەیشتنی چاودیرانی نێودەوڵەتیی، شێخ زنجیرەیەك كۆبوونەوەی ئەنجامدا، وەك پەیوەندییكردن بە سەرۆك هۆزەكانی كورد و زانایانی ئایینی و موریدەكانی تەریقەتی نەقشبەندیی لە كوردستانی گەورە، هەموو ئەو پەیوەندییانەش لە ئابی (1880) لە كۆبوونەوەیەكی مێژوویی پوختكرا بوونەوە لە گوندی (ناوچیا)ی نەهری، شوێن و بارەگا و حەوانەوەی شێخ عوبێدوڵڵا لە پارێزگای هەكاری سەر سنووری ئێران و توركیای ئەمڕۆ، نزیكەی دووسەد كەسایەتیی كوردی ئامادەبوون، هەتا ئێستا هیچ توێژینەوەیەك و بەڵگەنامەیەكی

46 - Jaideh. Pp. 240-241.
47 - S.G. Wisdom, Persian Life and Customs. (New York 1969) p. 110.
48 - Jwaideh, pp. 239-240.

فەرمیی لەبەردەستدا نییە لەسەر ئەو بابەتانەی لەو کۆبوونەوەیە باس کرابوون، بەڵام ئەوەی لەسەر زاری میسیونەری ئەمەریکی، میستەر (کوچران)و قونسوڵی رووس و ئینگلیز لەسەر ئەو کۆنگرەیە بەدەستمان گەیشتووە کورت بۆتەوە لە دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی کوردی بە سەرۆکایەتی شێخ عوبێدوڵڵا کە ئەرکی سەرشانی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کوردی بووە[49]. شێخ بە میسیونەرە ئەمریکی و دیبلۆماسەکانی ئینگلیزی راگەیاندبوو کە هەردوو دەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانیی دادگەر نین لە مامەڵەکردن لەگەڵ کورد، ئەوان بەدەست دەسەڵاتی هەردووکیانەوە دەناڵێنن، بەڵام زۆربەی رووداوی راپەڕینەکانی کورد لە ناو کوردەکانی ئێراندا بووە، شێخ بیانووی بۆ ئەمە هێنابۆوە کە ئێران دوژمنە لاوازەکەیانە و دەیەوێت هێزەکانی بگوازێتەوە بۆ سەرکوتکردنی جوڵانەوەی هۆزە تورکمانەکانی باکوور، شێخ ئەمەی بە پاڵنەرێکی باش داناوە کە کورد بۆ یەکەم جار لە ئێرانەوە دەست پێبکات[50].

ئەوەی بۆچوونی نووسەرانی رووس بووە، بزاڤی شێخ عوبێدوڵڵا پیلانی نێوان خۆی و عوسمانیی و ئینگلیزەکان بووە بۆ لاوازکردنی ئێران کە ئەوکات لەژێر دەسەڵاتی رووسەکان دابووە[51]، بەڵام ئەمە پڕوپاگەندەیە و هیچی لەسەر نییە.

سەدان کەس لە لایەنگرانی شێخ بۆ ناو خاکی ئێران پەڕینەوە و زۆری کوردەکانی ناو ئێران لە هەردوو هەرێمی کوردستان و ئازەربایجان لە باکوور و رۆژئاوای ئێران پەیوەندییان پێوەکرد، لە مانگی یەکەمدا هێزەکانی کورد چەندین سەرکەوتنیان بەدەستهێناو دەستیان بەسەر زۆربەی ناوچە کوردییەکان گرت، هێزەکانی شێخ بە ئاڕاستەی کۆنترۆڵکردنی شاری تەورێزی پایتەختی ئازەربایجانی ئێران ڕۆیشتن[52]، رووسەکان راستەخۆ لەو شەڕەدا بەشدار بوون و چەندین پارچە چەکیان بۆ هێزەکانی ئێرانی نارد، قونسوڵی رووسیی راستەخۆ رۆڵی هەبووە لە چەکدارکردنی هۆزەکانی

---

[49]-Jwaideh, pp. 239-240

[50] -شەمزینی: ل60

[51] - خالفین: ل182-184

[52] -Robert E Speer, The Haima Sahib The foreign Doctor (London; Flemining H. Revell Comp) pp. 82-83.

ئازەری و هەندێ هۆزی کورد بۆ پشتیوانی لە هێزە نیزامیەکانی ئێرانیی و لەناوبردنی ڕاپەڕینی کورد[53].

لەو هۆکارە بابەتیی و خودییانەی پەیوەستن بە سروشتی جوڵانەوەکە کە ئێرە جێی درێژەپێدانی نییە، شێخ نەیتوانی پارێزگاری لەو دەستکەوتانە بکات کە لە سەرەتاوە لە بەرانبەر هێرشی ئێرانیی بەدەستی هێنا بوون، پەرت و بڵاوی لەناو هێزەکەی بەدیار کەوت، ناچار بوو بکشێتەوە بۆ ناو خاکی عوسمانیی و خۆی بەدەست ئەو هێزەوە بدات کە لە سەر سنوور چاوەڕوانیان دەکرد، بەمەش جوڵانەوەکەی کۆتایی هات.

ڕاپەڕینی ئەم دواییەی کورد دەرهاویشتەی چەند هۆکارێك بووە، لەوانە: ململانێی رووسیی ـ عوسمانیی لە لایەك و رووسیی ـ بەریتانیی لە لایەکی ترەوە، ناتوانین نکۆڵی لەو پەیوەندییە دوو جەمسەریە بکەین، کە جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵڵا دەرهاویشتەی شەڕی ئەو دواییەی رووسیی ـ عوسمانیی بووە، جوڵانەوەی یەزدان شێریش بەرئەنجامی شەڕی قەرم بووە، لە هەردووکیان کورد یەك نیشانەی پێکاوە، ئەویش سوود وەرگرتن لە ململانێی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بۆ گەڕاندنەوەی ئەو میرنشینە کوردیانە کە سوڵتان مەحمودی دووەم (1808ـ1839ز) لەناوی بردبوون.

هەوڵەکانی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد بە درێژایی سەدەی بیستەم بێئاکام بووە، ئارەزووی رووسیا بۆ پاراستنی یەکێتی خاکی ئێرانی رێگر بووە لە بەردەم سەرکەوتنی بزاڤی شێخ عوبێدوڵڵا، لێرەدا پێویستە ئاماژە بە ڕۆڵی بەریتانیا بکەین لە یەکخستنی هەوڵی هێزەکانی ئەورووپی دژی جوڵانەوەی کورد، کوردیش بووە قوربانی ناکۆکیی هێزەکانی ئەورووپا بەتایبەتی بەریتانیا و رووسیا لە هەیمەنە کردن لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی، ئەمەش لەگەڵ پەندێکی ئەفریقی دا دێتەوە کە دەڵێ "فیلەکان بەگژیەکدا چوون و گیا زامدار بوو".

---

[53]--Speer. pp 90-93.

## پوخته

بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم کورد رۆڵی کاریگەری هەبووە لە ناکۆکییەکانی عوسمانیی ـ رووسیی، بە ئاشکرا هەریەك لەم دوو دەوڵەتە لە هەوڵی ئەوەدابوون کورد بەکاربهێنن، هۆی رکەبەرایەتی کورد لەگەڵ عوسمانییەکان دەگەڕێتەوە بۆ دەستبەسەراگرتنی میرنشینە کوردیە سەربەخۆکان و بە سەپاندنی سیستمی مەرکەزیی بە زەبری هێز، خستنە ژێرکاریگەری دەوڵەتە ناسیۆنالستەکانی رۆژئاوایی و هاندانی سوڵتان مەحموودی دووەمیش تۆڵەسەندنەوەی رۆژئاوا بووە لە دەوڵەتی عوسمانی.

هەوڵی چەندین جارەی کورد بە هۆی تێکگیرانی بەرژەوەندییەکانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی کە پارێزگاری دەوڵەتی عوسمانیی مەبەست بووە، نەك ئارەزووی کورد بۆ سوود وەرگرتن لە ناکۆکیی عوسمانیی ـ رووسیی لە پێناو گێڕانەوەی میرنشینە سەربەخۆکانی بێئاکام بووە، بەمەش کورد باجەکەی داوە.

خوێنەر لەگەڵماندا دەپرسێ: لە کوردستانی تورکیا چی ڕووی دەدا ئەگەر دەستتێوەردانی ئینگلیز نەبوایە لە ناکۆکیی نێوان دەوڵەتی عوسمانیی و یەزدان شێر؟ یان چارەنووسی کوردستان چی دەبوو؟ یان ئەگەر ئینگلیز و رووسەکان هاوکاریی حکومەتی ئێرانیان نەکردبا لە دژی جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری؟.

زۆر بە کورتی دەڵێین: بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە مەیدانی ململانێی هێزە گەورەکان بووە، بۆتە قوربانیی جوگرافیای سیاسییی، (بسمارك) دەرفەتی مێژوویی بەدەستهێنا بۆ گەلەکەی و یەزدان شێر و شێخ عوبێدوڵڵاش لەو بێ هێزتر نەبوون، ئەمە ئاکامی دواکەوتوویی سەرکردایەتی کورد و کۆمەڵگای کوردی نەبووە، بەڵکو هۆکاری (جوگرافیای سیاسییی)و بەرژەوەندی هێزەکانی رۆژئاوا بووە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەتا ئێستاش ئەمە هۆکاری بێئاکام بوونی خۆزگەکانی نەتەوەی کوردە.

موحەممەد پاشا میری سۆران ناسراو بە (میری کۆر) لە ماوەی سالآنی (1828 ـ1836) دەسەلآتی کوردستانی باشووری لەژێردەستدا بووە[54]، بە گەورەترین پیاوی کوردانی سەدەی نۆزدەهەم دادەنرێت، ئەو مەترسییەی میر موحەممەد لەسەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی درووستی کرد کەمتر نەبووە لەو مەترسییەی موحەممەد عەلی پاشای میسر درووستی کرد.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا تیشك دەخەینە سەر کەسایەتی میر موحەممەد و هەوڵدەدەین ئەو رووداوانە هەڵبسەنگێنین کە لە سەردەمی ئەودا روویان داوە، ئەمارەتی سۆران یەکێکە لەو ئەمارەتە کوردیانە کە دەسەلآتی لە نێوان دوو رووباری زێی بچووك و زێی گەورەدا بووە لە کوردستانی باشوور، لە بەشی باکووری هەردوو میرنشینی بادینان و بۆتان و لە بەشی رۆژهەلآتی میرنشینی بابان بووە، سەربەخۆیی تەواوی هەبووە و بە تەنیا ملکەچی رەمزیی بۆ دەوڵەتی عوسمانیی هەبووە.

هەندێك بنەچەی دامەزرێنەری ئەو میرنشینە دەگەڕێننەوە بۆ بنەماڵەیەکی بەغدایی[55]، بەڵام توێژینەوە تازەکان لەسەر مێژووی ئەمارەتەکە دامەزرێنەرەکەی دەگەڕێنەوە بۆ خانەوادەیەکی کوردی ناوچەی (هاودیان) لە بەشی رۆژوای رەواندز[56].

## حکومەتی میر موحەممەدی سۆران

لە ساڵی (1828) دەسەلآتی ئەمارەت لەسەر دەستی میر موحەممەد گەیشتە لوتکە، توانی لە سنووری تەقلیدی خۆی دەربچێت، شاری هەولێری گرت و بابانەکانی لە

[54] - میر موحەممەد لە ساڵی (1813ز)، یان (1814ز)، یان 1815ز/ی زاینی لە دوای نەخۆشیی و پەککەوتنی مستەفا بەگی باوکی، بۆتە میری سۆران، هەتا ساڵی (1826) سەرقاڵی چاکسازیی ناوخۆیی میرنشینەکەی بووە، لەو ساڵە بانگەوازی سەربەخۆیی راگەیاندووە، ساڵی (1836) لە ئاکامی هێرشی بەرفراوانی عوسمانیی میرنشینەکەی رووخاو هەر لەو ساڵەدا لە رێگەی گەڕانەوەی لە ئەستەنبووڵ بەشێوەیەکی نادیار بە فەرمانی سوڵتان شوێن بزر کراوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: کامەران بابان زادە، میرنشینی سۆران، هەولێر (1998). "وەرگێڕ".

[55] - شەرەفخانی بەدلیسی: شەرەفنامە فی تأریخ الدول والامارات الکردیە، الترجمە الکردیە، ل273.

[56] - Kendal ,(Kurds under the Ottoman Empire) in People Without a Country –(London:1980) ,pp.27-28

ڕانییە و کۆیە و دەرکرد، هەروەها توانی لە لای باکووری خۆراواوە میرنشینەکەی بگەیەنێتە بادینان و دهۆك و ئاکرێ و ژەنگار و ئامێدی، بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت (نەسەبین و ماردین)ی گرت، لە ساڵی (1835) هێزەکانی ئامادە کرد بۆ داگیرکردنی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات بە ئاڕاستەی کوردستانی ئێران[57]، خەڵکی پێشوازییان لێدەکرد و وەکو ڕزگارکەر سەیریان کردووە[58]. هەندێك لە کوردان وەکو پیاوێکی بە تواناو سەرکردەی هەموو کوردستان لە میر موحەممەدیان ڕوانیوە.

مێژوونووسان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە میر موحەممەد لە مێژووی کورد بە پیاوێکی سیاسیی و ئیداریی و عەسکەریی پلە یەك ناسراوە، ئەو شەڕانەی بۆ ملکەچ پێکردنی هۆزە بەهێزەکانی برادۆست کردی، کە بە درێژایی دەسەڵاتی عوسمانیی ملیان بۆ کەس دانەنەواندووە، شالاوە سەرکەوتووەکانی بۆ سەر ئەمارەتی بادینان، سەرەڕای سەختی ناوچەکە و قەڵا سەختەکانی ئاکرێ و ئامێدی و ژەنگار، بەڵگەی کارامەیی سەرکردایەتی زیاتری میر موحەممەد بوون. لەوەدا کارامەیی سەربازیی ئەو بەدیار کەوت کە بە چاکی نەزانی هێزەکەی لە دوای گەمارۆدانی موسڵ بەدیار شوورەی شارەوە هیلاك بکات، کە پێش (40) ساڵ لە موسڵ نادر شا کەوتە هەڵەیەکی سەربازیی لەو جۆرە، لەوەدا ئازایەتی میر موحەممەد بەدیارکەوت کە توانی هێزی سەرۆك وەزیرانی عوسمانیی موحەممەد ڕەشید پاشا لە شەڕی (حەریر) لە ساڵی (1834) تێکبشکێنێت[59] کە لە ڕووی چەك و ئامادەییەوە زۆر بەسەر هێزەکەی میر موحەممەدەوە بوون، موحەممەد ڕەشید پاشا شەو هەڵات و دەستکەوتی زۆری بۆ کوردان بەجێهێشت[60].

---

[57] - لەراستی دا هێرش کردنی بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئێران، هاوکات لەگەڵ هاتنی هێرشی عوسمانی لە ناوچەی بادینان بەرەو سۆران، هەڵەیەکی سیاسیی و سەربازیی میر موحەممەد بووە، لای هەموان ئاشکرابوو بە هۆی ئاو و هەواوە قۆناغی دووەمی هێرشی عوسمانیی دواکەوتبوو بۆ بەهاری (1936)، لەو کاتە ناسکە لە جیاتی میر سوودمەند بێت لە ناکۆکیی تەقلیدیی ئێرانیی و عوسمانیی، هێرشی بردە سەر ناوچە سنوورییەکانی ئێران، ئەمەش بووە هۆکارێکی تر لە هۆکارەکانی لەناوچوونی میرنشینی سۆران. "وەرگێر".

[58] -- Kendal ,pp.27-28.

[59] - دەبێت ساڵی (1836) بێت. "وەرگێڕ".

[60] - حوسێن حوزنی موکریانی: مێژووی میرانی سۆران، چ2، چاپخانەی هەولێر، (1962)، ل83-84

میر موحەممەد پیاوێکی سەربازیی خوێنڕێژ نەبووە، حەزی بە دەسەڵات و هێز نەکردووە، بەڵکو سەرکردەیەکی خاوەن خۆزگە بووە، خۆی بۆ سەرکردایەتی کردنی موسڵمانانی کورد زۆر زیاتر لە دەوڵەتی عوسمانیی بە شایستەتر زانیوە کە خۆرەی گەندەڵیی لێی دابوو، ببووە دیلی هێزەکانی ئەورووپی، بەتایبەت رووسیای قەیسەریی و بەریتانیا، میر موحەممەد رێزی زۆری هەبووە بۆ موحەممەد عەلی پاشای میسر، بە شایستە و سەرمەشقی زانیووە.

میر هەوڵی زۆریداوە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی هاوچەرخ لە کوردستان هەتا بێتە ناحەزی دەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانی، بۆ ئەوەی خەونەکانی لە واقیع بەدیبێت سوپایەکی هاوچەرخی دامەزراند بوو کە پێکهاتبوو لە دە هەزار سوارە و بیست هەزار پیادە، دەیویست سوپایەکەی توانای جەنگیی بەرزی هەبێت و لەسەر نوێترین شێوازەکان مەشق بکات، میزانییەیەکی باشی بۆ چەکدارکردنی جەنگاوەرەکانی تەرخان کرد بوو، بە باشترین جۆرەکانی چەکی ئەو کات چەکداری کردبوون، کارگەی درووستکردنی چەکی دامەزراند و نزیکەی دووسەد تۆپی درووستکرد[61]. لە ساڵی (1833) دکتۆر (رۆس) پزیشکی پاشکۆی قونسولیەتی بەریتانی لە بەغدا لە ڕەواندزی پایتەختی ئەمارەتی سۆران سەردانی میر موحەممەدی کردووە، لەو بارەوە دەنووسێت: "میر موحەممەد جوان گوێی دەگرت بۆ رێگەچارەی زانستیانەی لەناوبردنی نەخۆشی کولێرا لە ئەمارەتەکەیدا"، هەروەها دەنووسێت: "هەتا گفتوگۆمان دەکرد لەسەر کێشە دەولیەکان، حەزەکانی بۆ مەعریفە و خەونە سیاسییەکانی پێکەوە تێکەڵ بوون"، فریزەر جێمس گەشتیاری بەریتانی لە هەمان ساڵ سەردانی رەواندزی کردووە و بە چاوی خۆی لە بابەت کارامەیی دەزگای ئیداریی ئەوکاتەی کوردستان دەگێڕێتەوە، لەگەڵ ئەو رێکخستنەی لەو سوپا و ئەو گەشەسەندنە رێژەیەی لە بواری ئاوەدانیی و کشتوکاڵ، بینیویەتی[62].

باسکاری کورد د.کاوس قەفتان لە لێکۆڵینەوەکەی دا لە بابەت میرنشینی سۆران هۆکارەکانی گەشەی دەسەڵاتی میر موحەممەدی لەو خاڵانەی خوارەوەدا کورت دەکاتەوە:

[61] - کینداڵ: سەرچاوەی پێشووە، ل27.

[62] - B.Gravels Travels in Kurdistan (London), p.135-136

## قایمی ناوچەی ڕەواندزو دەرووبەری

میرنشینی سۆران لەسەر ڕێگای چەند کاروانێکی بازرگانیی هەڵکەوتووە، ئەمەش هێزبەخشی دارایی و سیاسییی بووە بۆ میر موحەممەد.

دەوڵەتی عوسمانیی لە نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیە بە تەواوی لاواز ببوو، هەتا موحەممەد عەلی پاشای میسر دەستی بەسەر بەشێکی سوریا و بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیادا گرتبوو، ئەگەر هێزە ئەوروپیەکان فریا نەکەوتبان دەیتوانی دەست بەسەر ئەستەنبوڵیش دا بگرێ، بۆیە دەوڵەتی عوسمانیی لە ئاست ڕووبەڕووبوونەوەی میر موحەممەددا نەبووە.

ئەمارەتی بابان دوو سەدە بوو بەهێزترین ئەمارەتی کوردیی بووە، بەڵام ئەوکات تووشی لاوازی ببوو، حکومەتی عوسمانیی بە ناچاری چاوپۆشی لە فراوانخوازییەکانی میر موحەممەد کردووە، بەو هیوایەی ئەمارەتی سۆران وەکو پێشووی ئەمارەتی بابان ببێتە پاڵەوانی کوردستانی باشوور بەرانبەر هەوڵەکانی قاجاڕی لە لکاندنی ناوچەکە بە ئێرانەوە.

والیەکانی بەغدا وایان دەبینی کە ئەمارەتی سۆران دەبێتە ڕاگری هاوسەنگیی هێز لە بەرانبەر ئەمارەتی بابان کە هەندێ جار هەڕەشەی لە بەغدا دەکرد.

ئەمارەتەکانی دەورووبەری سۆران بە دەردی ناکۆکیی ناوخۆوە دەیانناڵاند، بەڵام میر موحەممەد توانیبووی بە کارامەیی خۆی میرنشینی سۆران لە ئاژاوەی ناوخۆ ڕزگار بکات و خەریکی فراوانخوازیی بێت[63].

لەگەڵ هێژا قەفتان کۆکین لەسەر زۆربەی خاڵەکان، بەڵام لەپێشەوە نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە کەسایەتیی میر موحەممەد هۆکاری گەورە بووە لە پەیدابوونی ئەو قەوارە کوردیە.

## هۆکارەکانی ڕووخانی میرنشینی سۆران

هۆکارەکانی کەوتنی میرنشینی سۆران پێویستی بە هەڵوێستە و بە پێداچوونەوە هەیە، زۆربەی توێژەرەوانی کورد[64] لەو بڕوایەدان هۆکاری بنەڕەتیی لە ڕووخانی

---

[63] - کاوس قەفتان: چەند لێکۆڵینەوەیەك لە مێژووی بابان، سۆران، بۆتان، بەغدا 1985، ل24-28.

دەوڵەتی میر موحەممەد ئەو فەتوایە بووە کە مەلای خەتیٚ دابووی بەوەی شەڕ لەگەڵ هێزەکانی عوسمانیی حەرامە، چونکە ئەو هێزە هی خەلیفەی موسڵمانانە، بەداخەوە زۆربەی ئەو بەڕێزانە ئەو هەڵوێستەیان لە ئاستی ئەو هۆکارە نەبووە، ئەو "فەتوا"یەیان بە چاوی رەخنەوە سەیر نەکردووە، وەکو راستیەکی مێژوویی لە یەکتریان وەرگرتووە[65].

حوسێن حوزنی موکریانی لەگەڵ خانەوادەی مەلای خەتیٚ ناکۆکیی هەبووە، موکریانی ئەو فەتوایەی وروژاندووە، کە دەڵێ: "مستەفا پاشا کە لە پێشدا تەفکیری کردبوو، بەر ئاوەژووری داو ناچار بوو بە شەو پاشەوپاش بگەڕێتەوە، بە هەر جۆرێك بوو لە زێ پەڕیەوە و رووەو موسڵ رۆیشت و هەلات، تالاّن و ئەسپابی زۆر کەوتە دەست کوردەکان و گەڕانەوە حەریر، مستەفا پاشا کە گەیشتە موسڵ فەرمانێکی ساختەی بۆ مەلا موحەممەدی خەتیٚ، قاقەزێکی پڕ لە ئایەت و حەدیسی کە ئالەتی دەستی تورك بوو بۆ میللەتی کورد کوژتن بەکاریان برد و بۆ میری گەورەیان نارد کە بیخەڵەتێنن، مەلای خەتیٚ چونکە پەروەشی دەستی داود پاشای گورجی زادەی والی بەغدا بوو لەو جۆرە مەنشور و فەرمانانە ئاگادار بوو[66]، دەسبەجێ تەرویجی کرد و

---

[64] -ئەو بابەتە زیاتر لە ناوەند و شەقامی سیاسییی دێتە گۆڕێ، ئەگینا لە لای مێژوونووس و نووسەرانی کورد و غەیری کوردەوە فەتوای مەلای خەتیٚ کاریگەریی بەرچاوی نەبووە لە رووخانی میرنشینی سۆران. "وەرگێر".

[65] - پێموایە ئەوانەی فەتواکەی (مەلای خەتیٚ)یان بە هۆکاری بنەڕەتیی داناوە زۆربەیان مێژوونووس، یان توێژەری ئەکادیمیی نەبوون، بەتایبەت لە ناوەندە ئەکادیمیەکانی زانکۆ ئەو بۆچوونەی نووسەر باسی دەکات نەماوە. "وەرگێڕ".

[66] - لێرە دوو هەڵەی گەورە لەو دەقەی موکریانیدا دەبینم کە دەمانخاتە ئەو بڕوایەی قسەی د. عوسمان راست بێت و بە هۆی ناکۆکیی لەگەڵ بنەماڵەی مەلای خەتیٚ ئەو قسەیەی دروست کردبێت. یەکەمیان: لە هەریر هێزی رەشید پاشا و هاوکارانی بەو شێوەی موکریانی باسی کردووە شکاون، بنەڕەتێکی نییە. دووەم: لەو کاتەی مەلای خەتیٚ لە بەغدا بووە داود پاشا والی بووە، داود پاشا لە مەملوکەکان بووە، لە دەسەلاّتی سوڵتان هەڵگەڕابۆوە، پێنج ساڵ پێش کەوتنی سۆران لابرا بوو، عەلی رەزا کرابووە والی، چۆن مەلای خەتیٚ لە داود پاشا فێری گوێڕایەڵی سوڵتان بووە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: کامەران بابان زادە، میرنشینی سۆران، هەولێر (1998)، ل75-77.

فەتوای دا کە شەڕ لەگەڵ سەلاتینی (سائیر)ی ئالی عوسمانی بۆ دین و تەلاق و باوەڕی ڕەخنەی هەیە، دڵی کوردی هەژاری لە شەڕ خاو کردەوە.."[67]. توێژەرەوە کوردەکان بەبێ ڕەخنە ئەو گێڕانەوەی (موکریانی)یان نەقڵ کردووە، بێجگە لە د.کاوس قەفتان نەبێت، کە لەبەر دوو هۆ باوەڕی بەوە نییە، سەرەڕای ئەو خزمەتەی موکریانی پێشکەشی مێژووی کوردی کردووە، ئەو یەکەم نەوەیە کە ڕەگەزپەرستیەتی تۆرانییەتی دیووە، کە چۆن ئاینیان بۆ خزمەتی دەسەڵاتی خۆیان بەکار هێناوە بۆ سەرکوتکردنی گەلانی ناتۆرك، لە کاردانەوەی ئەوەدا موکریانی هەڵوێستێکی دژی لە بەرانبەر زانایانی ئایینی وەرگرتووە، بەتایبەت لەسەر ڕۆڵی پیاوانی ئایینی لە میرنشینی سۆران[68].

دەوڵەتی عوسمانیی لە ڕۆژگاری ناکۆکییەکانیدا لەگەڵ میرنشینی سۆران (1828–1836) دەوڵەتێکی نەتەوەیی تورکیی نەبووە، سوپا و فەرماندەکانی و ئیدارە بە دەست مسوڵمانە ئەورووپیەکان (ئەندامانی ئینکیشاری)و عەرەب و کوردەوە بووە، هەتا کودەتای کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی دوای ساڵی (1908) نەبێت دەوڵەت نەبووە دەوڵەتی نەتەوەیی تورکی، ڕاست نییە ناکۆکیی عوسمانیی لەگەڵ میرنشینەکانی کورد بەر لە سەدەی بیستەم بە ڕووخساری ناکۆکیی نەتەوەیی لێك بدەینەوە و ناوی بنێین ناکۆکیی تورکی ـ کوردی، لە ڕاستیدا ئەو سوپایەی لە ژێر فەرمانی موحەممەد ڕەشید پاشادا بوو زۆربەیان لە کوردەکانی ماردین و سیواس و دیاربەکر و ناوچەی بادینان بوون، هەتا فەرماندەی گشتیی سوپاکەیان خۆی تورك نەبووە[69].

لەسەر کاریگەریی ئەو فەتوایە موکریانی دوو ڕای جیاواز باس دەکات، لە یەکیان دەڵێ: "زۆربەی فەرماندەکانی سوپا ڕەتیان کردەوە و خەڵك سوێندیان خوارد هەتا ماون بجەنگن"، لە شوێنێکی تر، دەڵێ: "فەتواکەی مەلای خەتێ کاریگەریی خراپی هەبووە لەسەر لاوازکردنی ورەی سوپا و خەڵکیی"، بۆچی لە سەرەتاوە میر بە پیر ئەو

---

[67]- بڕوانە: داماو، حسێن حوزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل83-84. (لە کتێبەکە پوختەی ئەو دەقەی موکریانی هاتووە، بەڵام من گەڕامەوە بۆ دەقی نووسینەکەی موکریانی کە تەنها ڕێنووسەکەیم گۆڕیوەو وەکو خۆی وەرمگرتووە. "وەرگێر".

[68] - سەرچاوەی پێشوو، ل83.

[69] - موحەممەد ئەمین زکی بەگ:"دیارینەکراوە کام کتێبەیە"، ص414.

فەتوایەوە نەچوو، خۆی بەدەستەوە نەدا؟ دیارە دواتر بۆی دەرکەوتووە درێژەدان بە شەڕ بێئاکامە.

لەگەڵ بۆچوونەکەی قەفتان هاوڕام کە دەنووسێت: ماقوڵ نییە میرنشینێکی بەهێزی وەکو سۆران بە کاریگەریی فەتوایەك رووخابێت، میر موحەممەد بە هۆی بێئاکامی بەرهەڵستی هێزەکانی عوسمانیی، ئەو بڕیارەی داو فەتوایەکە کاریگەریی لەسەر داڕشتنی بڕیارەکەدا نەبووە[70].

بە بۆچوونی من وەرگرتنی ئەو فەتوایە وەکو هۆکاری بنەڕەتیی لە کەوتنی میرنشینی سۆران، سوکایەتییە بە توانای ئەو سەرکردە کارزان و پیاوە ئیداریی و سیاسییە[71]. ئەو فەتوایە لە لایەن توێژەرە عەلمانییەکانەوە بەکار هاتووە وەکو بەڵگەی مێژوویی لەسەر بەکارهێنانی ئیسلام و شەریعەت بۆ لەناوبردنی کورد، بۆ نموونە سەیدۆ عەلی گەورانی لە بابەت کاریگەریی ئەو فەتوایەوە دەنووسیٚ: "زۆر بەداخەوە ئەوەی سەیری مێژووی کورد بکات دەبینی هەندیٚ لە پیاوانی ئایینی بەسەر پیاوانی سیاسییدا باڵا دەستن و دەبن بە هۆی نوشوستی، نەك لەبەر ئەوەی مەبەستی خراپەیان هەیە، بەڵکو بە کوێرانە هەنگاو دەنێن، ئەو میرنشینە بەو فراوانییە بێئەوەی پەیکەری تێکبچێت و بێئەوەی بیٚ هێز بێت، بە تەنیا بە فەتوای شێخی فێڵباز برووخیٚ"[72]. ئەگەر چاوێك بخشێنین بە مێژووی میللەتی کورد دەبینین زانایان رۆڵی گرنگیان بینیوە لە بزاڤی سیاسیی کوردستان، گەرچی ئاساییە ئەوانیش وەکو خەڵکی تر هەڵە بکەن، بەڵام بەرگرییان لە گەلەکەی خۆشیان کردووە و لە بواری رۆشنبیریی و بەرگریی، خەباتیان کردووە[73].

---

[70] – د. کاوس قەفتان: سەرچاوەی پێشوو، ل56.

[71] – لێرەدا زیادەڕەویی هەیە لەو خەسڵەتانەی دروانەتە پاڵ میر موحەممەد، زۆربەی لەسەر ئەوە کۆکن کە لە هۆیە سەرەکییەکانی رووخانی سۆران نەبوونی کارزانیی و شارەزایی میر بووە لە سیاسەت، فەتوا کاریگەریی نەبێت و میریش هێندە سیاسیی و ئیداریی و کارزان بێت، ئەی ئەو میرنشینە بۆ وا بە ئاسانیی رووخا؟!!. "وەرگێڕ".

[72] – من عمان الى العمادية جولة في كردستان الجنوبية، قاهرة 1930،ص134

[73] – بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: محمد امین زکی بەك: مشاهیر الكرد، آية الله مردوخي: علماء و ادباء كورد.

ئەوجا لە ڕووی شەرعیەوە سوڵتانی عوسمانیی ڕێکەوتننامەی لەگەڵ کوردان هەڵوەشاندۆتەوە، کە لە سەرەتای سەدەی شازدە ئیدرسی بەدلیسی بە نوێنەرایەتی میرنشینەکانی کورد لەگەڵ سوڵتان سەلیمی مۆر کرد بوو، بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیە هەموو میرەکان لە جێگەی خۆیان بە شێوەی پشتاوپشت دەسەڵاتیان بۆ بمێنێتەوە و ساڵانە ئەندازەیەك باج بدەن بە دەوڵەتی عوسمانیی لەگەڵ ناردنی جەنگاوەر لە کاتی جەنگە دەرەکییەکاندا، هەریەك لە میرنشینەکان دەسەڵاتی لامەرکەزییان بۆ بمێنێتەوە[74]. دواتر سوڵتان مەحمودی دووەم ئەو پەیمانەی هەڵوەشاندۆتەوە کە لە شێوەی ڕێکەوتننامەدا لەگەڵ میرنشینە کوردەکان واژۆ کرابوو، لە سیاسەتی شەرعییدا هەتا ئەگەر خەلیفەش بێت، نەك سوڵتانی عوسمانیی، ئەگەر بڕیاری شکاند، لەسەر هەموو موسڵمانێکە بەرەنگاری بێتەوە هەتا دەگەڕێتەوە سەر ئەو بەڵێنەی لەسەری ڕێکەوتبوون[75]، بەڵام وەکو بەدیار کەوتووە کەوتنی میرنشینی سۆران ئاکامی حەتمیی ئەو بارودۆخە نێودەوڵەتییەی دوای ساڵی (1833) جیهانی ئیسلامیی بە خۆیەوە دیت، سوڵتان مەحمودی دووەم لە سوڵتانە بەهێزەکانی دەوڵەتی عوسمانیی بووە، خواستی بە مەرکەزیکردنی ئیمپراتۆریەتی هەبووە، سوور بووە لەسەر سەپاندنی دەسەڵاتی ناوەند بەسەر هەموو گۆشەیەکی ئیمپراتۆریەتەکەی، لەو بارەشەوە سەرکەوتنی بەدەستهێنا، پێشتر میرنشیە تورکمانییەکانی ئەنادۆڵی لەناو برد، لە ساڵی (1830) ئەمارەتی جەلیلی لە موسڵ نەهێشت و لە ناوچەی فوراتی ناوەڕاست سنووری بۆ میرنشینی بەهێزی مونتەفیك دانا، کۆتایی بە حوکمی مەمالیك هێنا لە بەغدا، لە ساڵی (1833) ڕێکەوتننامەی کۆتاهیە لە نێوان موحەممەد عەلی پاشای میسر و سوڵتان مەحمود مۆر کرا، سوڵتان دەرفەتی لەباری بۆ هاتە پێش هەتا کاری گەورە ئەنجام بدات، ئەویش سەر پێشۆڕکردنی میر موحەممەد بووە کە ببوە جێگای مەترسیی بۆ دەوڵەتی عوسمانیی.

نەخشەی دەوڵەتی عوسمانیی بەو شێوە بووە کە هەریەك لە عەلی ڕەزا (والی بەغدا)و سوپایەکەی لە باشوورەوە بۆ هەولێر و موحەممەد بیرقدار (والی موسڵ) لە

---

[74] - شەرەفخانی بەدلیسی: سەرچاوەی پێشوو، ص137.

[75] - محمد فتحي عثمان: من اصول الفكر السياسيي الاسلامي، بيروت، 1988،

ڕۆژئاواوە، هێزی کاریگەریش بە سەرۆکایەتی موحەممەد ڕەشید پاشا لە ناوچەی بادینان بە ئاڕاستەی ڕەواندز پێشڕەویی بکەن، لە دوای زنجیرەیەك شەڕ، زۆربەی قەڵاکانی میرنشینی سۆران کەوتن و ڕەواندز لە هەموو لاوە گەمارۆ درا، میر موحەممەد ئەو فەتوایەی مەلای خەتێی قبوڵ کرد بەو هیوایەی "لێبوردنی سوڵتان بەدەست بهێنێت" وەکو میر بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، سوڵتانیش ڕێزی لێگرت، بەڵام والی بەغدا پیلانی کوشتنی داڕشت و لە تەرابزوون کوژرا، ترسا لەوەی بگەڕێتەوە لە کوردستان حیساب بۆ دەسەڵاتی ئەو نەکات[76].

هێزەکانی دەرەکیی ڕۆڵی بنەڕەتییان بینی، لە یەکلاییکردنەوەی ململانێ لە بەرژەوەندیی عوسمانیی، ئەوکات بەریتانیا ئەمری واقیع بووە لە ناوچەکە و پێیوابووە فراوانبوونی پێگەی میر موحەممەد مەترسیی دەبێ بۆ تێکدانی هاوسەنگیی هێز لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بۆیە نێردراوی خۆی (ریچارد وود)ی نارد بۆ ڕەواندز هەتا هانی بدات لەسەر نیشاندانی ملکەچیی بۆ خەلیفە، هەروەها کاریگەریی خۆی لەسەر رووسیا و ئێران بەکارهێنا هەتا پشتیوانیی بکەن بۆ ئەوەی یارمەتی میرنشینی سۆران نەدرێ، لە ناکۆکییەکانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیی، لەو بوارەدا هەندێ سەرکەوتنی بەدەستهێنا، لەو کاتەی میر موحەممەد خۆی بەدەستەوەدا بەو هیوایە بووە لە لایەن (ریچارد وود) زەمانەتی لێبوردنی لە لایەن سوڵتانەوە مسۆگەر کردبێت، هەروەها ئێران هاوکات (10) هەزار سەربازی نارد بۆ هێرشکردنە سەر هێزەکانی کورد[77].

هێرشی ئێران بەو بیانووە بووە کە میر موحەممەد هێرشی کردۆتە سەر خاکی ئێران. (قەفتان) باوەڕی وایە، بەڵام لەڕاستیدا پیلانێکی دەرەکیی بووە، بە سەرکردایەتی ئینگلیز بۆ پارێزگاری لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی، کە بە "پیاوە نەخۆشەکە" ناسرابوو، ئەگەر هەڵبوەشابایەوە ئاڵۆزییەکی نێودەوڵەتیی درووست دەکرد بە قازانجی رووسیای تینوو بۆ گەیشتن بە خاکی عوسمانیی کۆتایی دەهات.

هۆکاری ناوخۆییش کاریگەریی هەبووە لەسەر کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی میر موحەممەد، پێکهاتەی سەرکردایەتی ئەوکاتەی کورد کە لەسەر بنەمای دەرەبەگایەتی

[76] - عبدالعزيز نوار: تأريخ العراق الحديث، القاهرة 1968، ص108.

[77] - المصدر نفسه، ص106-108

داڕێژرابوو، ئەویش بە خۆشیی، یان بە زەبر دەبوایە ملکەچی دەسەڵاتی میری ڕەواندز بێت، بەڵام خۆپەرستیی و بەرژەوەندیی وای لێکردن لە میری ڕەواندز هەڵگەڕێنەوە، میری ڕەواندزیش لە جیاتی نەرمیی بنوێنێت، کەوتە توندوتیژیی و بەکارهێنانی بەرانبەر زۆربەی خەڵك، لە لایەکی ترەوە شەڕ بەردەوام باری سەرشانی جەماوەری قورس کردبوو، ئەمانە دەرفەتی بۆ هێزی عوسمانیی ڕەخساند، قەڵا کوردیەکان یەك بە دوای یەکدا کەوتن[78].

## پوختەی توێژینەوە

میر موحەممەد لە یەك کاتدا فەرماندەیەکی سەربازیی و ئیداریی بووە، کۆبوونەوەی ئەو خاسیەتە کارامەییە سەربازیی و ئیدارییە لە کەسی میر موحەممەد پڕوپاگەندەی شۆڤینییەکانی عەرەب و فارس و تورك ناهێڵێ کە پێیانوایە کورد خاوەنی پیاوی کارامەیی سیاسیی نەبووە.

میرنشینی سۆران دەگەڕێنەوە بۆ پیلانی هێزە گەورەکان بە هاوکاری هێزە خۆجێییەکان، لەگەڵ سووربوونی بەریتانیا بۆ هێشتنەوەی بارودۆخی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەسەر شێوازی کۆنی هەتا بتوانێ لە پێناو بەرژەوەندییەکانی خۆی بەکاری بهێنێت، ئەوە هۆکاری سەرەکیی بووە، نەك فەتوایەکەی مەلا خەتێ.

[78] - قەفتان: سەرچاوەی پێشوو، ل53-54

# بەشی سێیەم:
# حکومەتی بەدرخانی کوردی و ململانێی کوردیی - ئاشووریی (1847-1843)

میر بەدرخان کوڕی عەبدولخانە، دەچنەوە سەر خێزانی (ئەزیزیە)ی بەدرخانیی کە بۆ ماوەی زیاتر لە (500) ساڵ میرنشینی (بۆتان)یان بەدەستەوە بووە، ئەو میرنشینە لە ناوچەی نێوان لقێکی رووباری دیجلە بە ناوی بۆتان سۆ لە رۆژئاوا و رووباری دیجلە لە ڕۆژهەلات هەڵکەوتووە، باشووری دەبێتە ویلایەتی موسڵ لە ناوچەیەکی ناسراو کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن (جەزیرە) لە کوردستانی تورکیا، دامەزرێنەری میرنشینی بۆتان عەبدولعەزیزی کوڕی عومەری کامدیە لە نەوەی سەرکردەی مسوڵمانی بەناوبانگ خالیدی کوڕی وەلید،[79] بەڵام هەندێك رەچەڵەکی بنەماڵەی بەدرخان دەبەنەوە سەر گوندی (ئاوێزانی) کورد لە نزیك شاری جەزیرەی ئیبن عومەر، مێژوونووسی رووسی فلادمێر مینۆڕسکی بڕوای وایە ڕەچەڵەکی ئەو خێزانە دەگەڕێتەوە بۆ یەك لەو هۆزە کوردە ئێزیدیانەی بوونەتە مسوڵمان[80].

کۆمەڵێك هۆکار هەبوون بۆ چەسپاندنی یەکێتی هۆزە کوردییەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانی لە دەوڵەتێکی کوردی فیدراڵدا لە ژێر سایەی میر بەدرخان، کەسایەتی سەرنجڕاکێشی خۆی و رووداوە لەبارە هەرێمی و نێوددەوڵەتییەکان کاریگەریی هەبووە لەسەر ئەو قەوارەیە لە باشوورەوە هەتا موسڵ و لە خۆرهەلاتەوە هەتا شاری سنەی میرنشینی ئەردەلانی کوردی لە ئێران و لە باکوورەوە هەتا شاری وان و لە باشووری رۆژهەلاتی تورکیا بۆ دەورازەی شاری دیاربەکر فراوان بێت.

## کەسایەتیی میر بەدرخان

توێژەرەوان لەسەر ئەوە کۆکن میر بەدرخان کەسایەتییەکی فەرماندەیی سەرنجڕاکێش و سەرکردەیەکی سیاسییی و ئیداریی کەموێنە بووە، دکتۆر وادی

---

[79] - سەرچاوەی یەکەمی ئەم زانیاریە شەرەفنامەیە، مەلا جەمیلی رۆژبەیانی قسەی لەسەر ئەو مەسەلەیە کردووەو دەڵێ: "ئەمە لە راستیەوە دوورە، چونکە خالیدی کوڕی وەلید کوڕ و میراتگری نەبووە و میراتەکەی عەبدوڵڵای کوڕی سەلەمە بردوویەتی، هەروەها حەزرەتی خالید نەچۆتە ئەو هەرێمانە، رەچەڵەك بردنەوە پاڵ یارانی پێغەمبەر (دروودی خوایان لێ بێت)، لەبەر نەجیبزادەییە و هیچی تر". بڕوانە: شەرەفنامە، تاران 1981ز پەراوێزی ژ (1)، ل272

[80]-Noel Diary, pp.12, Harmannm “Djazirat B. Omar” Encyclopedia of Islam.
شرفخان بدلیسی: شرفنامە في الدول و الامارات الکردیە، ص320

جوەیدە لە نامەی دکتۆراکەی دا لەسەر کەسایەتیی ئەو پیاوە دەنووسێ: "میر بەدرخان کەسایەتییەکی کاریزمایی سەرنجڕاکێش و مێژوویی بووە، گومانی تیانییە گەورەترین کەسایەتیی مێژووی کورد بووە"[81].

دکتۆر جوەیدە لەسەر قسەکانی دەڕواو دەڵێ: "میر بەدرخان باوەڕی پتەوی هەبووە، خوا هەڵیبژادووە بۆ سەرکردایەتی مسوڵمانی کورد و بۆ دابینکردنی یەکێتی و رزگاربوون لە زوڵمی دەسەڵاتی عوسمانیی)[82].

ئیسلامەتی وەکو ئاین و بیروباوەڕ کاریگەریی بەرچاوی هەبووە لەسەر کەسایەتیی میر بەدرخان، هەردوو میسیۆنەر (میستەر رایت و میستەر بریت)، ماوەی دوو مانگیان لە میوانداریێتی بەدرخان بەسەر بردووە، لەو بارەیەوە دەڵێن: "پیاوێکی لە خواترس بوو، زۆربەی کاتەکانی بە خواپەرستی و وێردەوە دەگوزەراند، هەندێك جار رۆژگاری بەرپرسیاریێتی وەکو بەرپرسی دەوڵەت بە زیکر و خواناسیەوە دەبردە سەر"[83]. زانایان رۆڵی بەرچاویان هەبووە لە حکومەتی بەدرخان، حوکمی لە هەر بابەتێکدا بێت لە بەڕێوەبەرایەتیەکەی، راوێژی بە زانایان کردووە، توێژەر و گەڕۆك و دیبلۆماسی ئینگلیزی (هنری لایارد) لە ساڵی (1843ز) سەردانی شاری جەزیرەی پایتەختی میرنشینی بۆتانی کردووە، لە بارەی میر بەدرخانەوە دەنووسێ: "لە واقیعدا لە ژێر کاریگەریی و کۆنترۆڵی زانایانی ئایینیدا بووە". شەڕی میر بەدرخان لەگەڵ ئاشوورییەکان بە ڕای (لایارد) لە ژێر کاریگەریی ئایین و بە هۆی دەورەدانی بووە بە زانایانی ئایینی، دەڵێ: "لە نزیکەکانی بەدرخان زانایەکی موجاهید هەبووە بە ناوی شێخ زاهیر"[84]. میسیۆنەری ئەمریکی، دکتۆر گرانت چەندین جار سەردانی دەوڵەتەکەی میر بەدرخانی کردووە و بۆچوونی هاوشێوەی ئەمەی هەیە و دەڵێ: "میر بەدرخان بە چینی زانایان و شێخەکانی تەریقەت دەورە درابوو، ئەمیش رێزی زۆری لێدەگرتن"[85].

---

[81] - W. J waideh (Kurdish Natoinist Movement Syracuse Univ.1960) Pt.184.
[82] - Ibid, p.185
[83] - Missionary Herald XL11, November 1946.p.37 Letters form Mr. Wright and Mr.,.Breath.
[84] -(H.Layard. Nineveh and Lets Remains {New York 1950},p183)
[85] --(Missionary Herald Letter from Dr. Grant XXXIX, No, 11. November.1843).

ڕۆڵی زانایان لە ئاڕاستەکردنی حکومەتی بەدرخان گەیشتە ڕادەیەك کە لە دوای ڕووخانی، لە شاری ورمێی کوردستانی ئێران، زانایان کۆنگرەیەك ببەستن و لە بەیاننامەیەکدا ئۆباڵی بەرپرسیارێتی حکومەتی بەدرخان بخەنە ئەستۆی ئاشووری و دوژمنانی ئیسلام لە میسیۆنەرەکان[86].

بەدرخان لە ڕۆژانیدا سوور بوو لەسەر سەرنجڕاکێشانی جەماوەری کورد، ئەمەش بە دابینکردنی خۆشگوزەرانیی لە ناو میرنشینەکەی دا، کەوتبووە بڵاوکردنەوەی دادگەریی لە ناو دارودەستەکەیدا، میر بەدرخان زەوی بەسەر جوتیارەکان دابەش دەکرد و ئەندازەیەکی زۆری ئەو باجانەی لابرد کە دەوڵەتی عوسمانیی دەمارگیرانە بەسەر جوتیارەکانیدا سەپاند بوو، میسیۆنەری ئینگلیزی (میستەر ڕایت) باسی لە کۆبوونەوەی دەوریی کردووە لە نێوان میر بەدرخان و هەژار و کەمدەرامەتەکان، ڕاستەوخۆ پێداویستییەکانی خۆیان خستۆتە بەردەم میر و ئەویش بۆی دابینکردوون و هانی میر و سەردارە کوردیەکانی داوە هەمان سیاسەت لەگەڵ جەماوەر پەیڕەو بکەن، لەبەر ئەو متمانەیە بووە لە نێو جەماوەر وا بڵاوبێوە "کە خوای گەورە میر بەدرخانی ناردووە هەتا ڕزگاریان بکات" لە پاشماوەی ئیدارەی سەختی وێرانەی عوسمانیی لە کوردستان[87].

میر بەدرخان بە ئەندازەی خانەدانیی و سۆز و میهری لە بەرانبەر هەژاران لە جێبەجێکردنی یاساکانی ئیسلام بەتایبەت (سزادان = العقوبات) لە نێو میرنشینەکەیدا توند و تۆڵ بووە، گەشتیار و میسیۆنەرەکان لە کاتی سەردانیان بۆ دەوڵەتەکەی بەدرخان بەسەر سوڕمانەوە باسی بە عەزمیی ئەویان کردووە لە کارەکانیدا، میستەر ڕایت دەڵێ: "چەندین میل لە ناو کوردستان لە سەفەردا بووین، ئەوەی تێبینیمان کردووە ئارامیی و ئاسایش و گەشەکردنی ژیانی ئابووریی بووە، هەندێك جار بەبێ ترس لە دەشت و دەر خەوتووین، نە دزیی هەبوو، نە کوشتن، گەرچی بەر گوێمان دەکەوت لە هەرێمەکانی تری دەوڵەتی عوسمانیی دزیی و کوشتار هەیە"، هەروەها میستەر ڕایت

86 - British Documents on Foreign Affairs.The Ottoman Empire 1860-1880,(Unversity Publications of America). 1984. P.291. Telegram. No. 113. June. 2-1848.

87- Mr. Wright, p.381.

دەڵێ: "تاوانبار ڕۆژێ لە ڕۆژان چاوپۆشی لێنەدەکرا، هەرێمی کوردستان لەوانە پاککرابۆوە، ئەمە لەسەر فلان حیسابە و ئەوە لەسەر فیسار حیسابە، گەندەڵیی نەمابوو، ئەمانە لە بەشەکانی تری دەوڵەتی عوسمانیی هەبوون"، میستەر رایت کۆتایی بە قسەکانی دێنێ و دەڵێ: "ڕۆژێکیان لە لای میر بەدرخان بووم، دزێکیان هێنا، لە دوای ساغبوونەوەی تاوانەکەی یەکسەر فەرمانی دا دەستی ڕاستی ببڕن، ئەمەش نیشانەی بوونی ئاسایش بووە"[88].

توێژەرەوەی ڕووسی (ن، خالفین) لە گەشتیاری ڕووسی (ج. دیتلۆ) دەگێڕێتەوە کە لە ڕۆژانی دەسەڵاتی بەدرخان، سەردانی بۆتانی کردووە، ئاماژەی ئاسایش و ئارامیی تەواو کردووە لە ناوچەکەدا، خالفین ئەم سەرنجەی لە دیتلۆ وەرگرتووە کە دەڵێ: "منداڵ بە ڕۆژ دەتوانێ لە شانشینەکەی بەدرخان بڕوات و زێڕی بەدەستەوە بێت، بەبێئەوەی لە کەس بترسێت، ئەمەش بووە هۆی کۆچکردنی زۆری کوردان بۆ میرنشینی بۆتان، میر بەدرخان وەکو نەریتی خۆی پارچە زەویەکی کشتوکاڵیی دەدایە هەموو پەنابەرێك بەرانبەر $3/1$ی بەهای داهاتەکەی بۆ دارایی، وەکو مەرج دەبوایە خاوەنی ئەسپ و چەك بێت و لە حاڵەتی ئامادەییدا بێت بۆ پارێزگاریی لە میرنشینەکە، بەمەش میر بەدرخان میرنشینێکی پێکهێنابوو کە پێویستیی و بژێوییەکانی خۆی دابین دەکرد"[89].

میر بەدرخان سیاسەتێکی بە حیکمەت و وردی هەبووە لەگەڵ میرەکانی کورد، پێیوابوو ئەوانە لە ناوچەکانی خۆیاندا شوێنی تایبەتیان هەیە لە دڵی شوێنکەوتووانی خۆیان، هەر هەوڵێکی بە زۆر لکاندن بە دەوڵەتەکەی ئەوەوە شەڕی ناوخۆی میللیی لێدەکەوێتەوە، ئەمەش هەموو لایەك بێهێز دەکات و دوژمن "مەبەست لە دەسەڵاتی مەرکەزی عوسمانییە" بەهێز دەکات، بۆیە هەوڵیدا دۆستایەتی سەرۆك هۆز و میرە کوردیەکان بکات بە ناردنی دیاریی و داواکردنیان بۆ پایتەختی دەوڵەتەکەی هەتا ڕێککەوتننامەیەك بە ناوی (پەیمانی پیرۆز) ببەستن، میسیونەر رایت بۆمان دەگێڕێتەوە کە دەوڵەتە کوردیەکان لە پێشبڕکێدا بوون بۆ جەزیرەی ئیبن عومەر بۆ گوێڕایەڵیی و

---

[88] - Ibid,pp.381-382.

[89] - ن. خالفين: الصراع على كردستان، الترجمة الكردية، سليمانية، ص77-79.

دۆستایەتیی و دیاری هێنان بۆ میر بەدرخان، زانایان و سەرۆك هۆزەكان بە شەرەفی گەورەیان زانیوە لە خزمەتیدا ئامادەبن[90]، میر بەدرخان بە هۆی رەوشت بەرزیی و خانەدانیی و میوانداریی توانی بووی دڵی سەرۆك هۆزەكان بەلای خۆیدا رابكێشێ[91].

بەمەش میر بەدرخان بەبێ خوێن رشتن توانیبووی حكومەتێكی فیدراڵ دابمەزرێنێ كە زۆربەی هەرێمە كوردیەكانی نێودەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانیی ملكەچی بن، ئەو دەوڵەتە كوردیەی دەسەڵاتی لە باشوورەوە نزیك بە موسڵ بۆ دیاربەكر و لە رۆژهەڵات هەتا شاری سنە لە باكوور هەتا وان درێژ ببۆوە.

## هۆكارە ئیقلیمیەكان لە بەدیاركەوتنی بەدرخان

سالآنی (1816–1847ز) لە مێژووی دەوڵەتی عوسمانییدا كۆمەڵێك گۆڕانكاریی ریشەیی لە پێكهاتەی كارگێڕیی و سەربازیی و سیاسیی و باری دەرەكیی هاتە دی، هەموو ئەم گۆڕانكارییانە پێكەوە هۆكاری یاریدەدەر بوون بۆ سەرهەڵدانی بەدرخان، بەشێك لەو هۆكارانە سوڵتان مەحموودی دووەم بوو، كە دەیویست دەوڵەتی عوسمانیی بگۆڕێ بۆ دەوڵەتێكی مەركەزیی بەهێز لەسەر شێوەی رۆژئاوا، بۆ ئەو مەبەستە رژێمی لامەركەزیی هەڵوەشاندەوە و دەسەڵاتی دەزگای ناوەندیی لە هەرێمەكان پتەو بكات، لەبەرئەنجامی ئەو سیاسەتە بوو سوپای (ئینكیشاری) هەڵوەشاندەوە كە بۆ ماوەی چەند سەدە كۆڵەكەی سوپای عوسمانیی بووە، بەمەش سوڵتان مەحمود هەڵەی گەورەی كرد، ئەم كارەی ئەنجامدا پێش ئەوەی پێكهاتەی تازە لە سوپای نوێ گەشە بكات كە بەناوی (هێزی مەحمودیەی سەركەوتوو = قوه المحموديه المنصوره) لەسەر شێوازی رۆژئاوا دایمەزراندبوو، بەمەش بۆشایەكی سەربازیی درووست كرد، والی هەرێمەكان بە دەرفەتیان زانی سەربەخۆیی خۆیان رابگەیەنن، رووسیاش بەشێكی بەرفراوانی لە ئاسیای ناوەڕاست و قەوقاز داگیر كرد، لە ماوەی سالآنی (1816-1839ز) موحەممەد عەلی لە میسر وەكو هێزێكی عەرەبی بە دیاركەوت و بە دەسەڵاتی

---

[90] – ئەم رەوشتە پێچەوانەیە لەگەڵ رەوشتی میرموحەممەدی رەواندزی و میرانی بابان كە هەمیشە بە زەبر مامەڵەیان لەگەڵ میر و سەرداره كوردیەكانی تردا كردووە. "وەرگێڕ".

[91]- Mr, Wright, p. 381

عوسمانییدا هەڵشاخا، هێزی مەمالیك لە عێراق سەری هەڵداو ویلایەتەکانی باکووری ئەفریقیا جیابوونەوە، لە ساڵی (1838ز) ئیبراهیم پاشای سەرکردەی سوپایەکەی موحەممەد عەلی پاشای والی میسر شەڕی دژ بە دەوڵەتی عوسمانیی لە وڵاتی شام و ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات دەستپێکرد، ئەمەش یەکێك بوو لەو گۆڕانکارییانە کە شوێنەواری بەسەر کوردستانەوە هەبوو، لە ئاکامدا هێزەکانی عوسمانیی لە بەرانبەر هێزەکانی میسر تێکشکاند، دەوڵەتی عوسمانیی هێزی تەواوی نەبوو بۆ بەرپەچدانەوەی هێزەکانی ئیبراهیم پاشا، بۆیە داوای لە میر بەدرخان کرد بۆ ئەو مەبەستە سوپایەك ئامادە بکات، میر بەدرخان و میرانی کورد لاوازیی دەوڵەتی عوسمانییان بۆ دەرکەوتبوو، بڕوایان وابوو هێزەکانیان یەکبخەن و دەستپێشخەریی بکەن بۆ پارێزگاری لە کوردستان[92].

گۆڕانکارییە ئیدارییەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانیی کە بە (تەنزیمات) ناسرابوو لە ماوەی ساڵانی (1812- 1843) شوێنەواری خراپی بۆ سەر ژیانی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی ناوچە کوردییەکان هەبووە، دەوڵەتی عوسمانیی سوپایەکی بێبەزەیی بە سەرۆکایەتی ڕەشید پاشای سەدری ئەعزەم (سەرۆك وەزیرانی پێشوو)و موحەممەد ئیجە بیرقدار (والی دیاری کراو بۆ کوردستان) نارد هەتا کۆتایی بە دەسەڵاتی میرنشینەکانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ و ویلایەتی موسڵ بهێنن، هێزەکانی عوسمانیی توانیان بەسەر میرنشینەکانی بادینان و سۆران و باباندا زاڵ بن[93]. لە کوردستانی باکوور دەوڵەتی عوسمانیی دەسەڵاتی خۆی گەڕاندەوە ناوچە کوردیەکان، تەنیا دەسەڵاتێك لە بۆتان مابووە هێزەکەی میر بەدرخان بووە. شتێکی ئاسایی بوو میرە کوردەکانی هەموو بەشەکانی کوردستان چاویان لە میر بەدرخان بێت، ئەمە لە کاتێکدا بڕیاری سوڵتان مەحمودی دووەم، دواتر سوڵتان عەبدولمەجیدو عەبدولعەزیز بۆ لە ناوبردنی میرنشینە کوردیە خاوەن دەسەڵاتە خۆجێیەکان، پێچەوانەی نەریتی باوی چوار سەدەی پێشووی ناو دەوڵەتی عوسمانیی بوو، ڕێکەوتننامەی نێوان میرە

---

[92] - Noel, Diary, p. 129

[93] -ئەمارەتی بابان لە ساڵی (1851ز) واتە چوار ساڵ دوای بۆتان لەناوچووە، ئەو فیدراسیۆنەی دکتۆر و مێژوونووسانی تریش لە باسی بەدرخان ئاماژەی پێدەکەن لە مێژووی سیاسییی هەریەك لەو میرنشینانە بە ڕوونی بەدیار ناکەوێ. "وەرگێڕ".

کوردەکان و دەوڵەتی عوسمانیی ساڵی (1516ز) دەسەڵاتی میرنشینە کوردیەکانی لە شوێنی خۆی هێشتبۆوە.

کاتێ دەسەڵاتی ئەو میرنشینانەی کە خاوەنی حوکمی زاتی بوون نەما، بەمەش باری ئابووریی و کۆمەڵایەتیی دانیشتوانی ناوچەکە وێران بوو، دەوڵەتی عوسمانیی کاربەدەستی ناکامڵ و گەندەڵی لە بەڕێوەبردن دامەزراند، دەسەڵاتی ئەمانەش زیاتر لە شارەکان کورت هەڵهاتبوو، بەڵام گوندە دوورە دەستەکانی کوردستان، دوور لە دەسەڵاتی یاسا تووشی وێرانیی و بێزاریی ببوون، جووتیارەکان لە دوو لاوە دەچەوسێنرانەوە، بە هۆی کاربەدەستانی دەوڵەت و هەم بە هۆی ئەو سەرۆك هۆزە کوردانەی ئەو بارودۆخەیان بە دەرفەت زانی بوو[94].

لە ئاکامی پیادەکردنی یاسای ئیلتیزام لە کۆکردنەوەی باج لە جووتیاران، هەرەسهێنانێکی بەرچاو لە ژیانی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی رووی دا، بە پێی ئەو سیاسەتە، دەوڵەت کۆکردنەوەی باجی بەکرێ دەدا بە مولتەزیمەکان، ئەوانیش باجەکەیان کۆدەکردەوە و لە بەرانبەر ئەو خزمەتەی بە دەوڵەتیان دەکرد لە کۆکردنەوەی باج دەستیان بەسەر بەشێکیدا دەگرت، ساڵانە بەشێکی باج دەچووە گیرفانی ئەو مولتەزیمانە کە بە زۆریی پیاوی دەوڵەمەند، یان بەرپرسانی پێشووی دەوڵەت بوون، ئەمانیش دڵڕەقانە خۆیان گران دەکرد هەتا زۆرترین رێژەی باج و داهات کۆبکەنەوە لەو جوتیارانەی بە هەژاریی و کولەمەرگی دەژیان، ئەوەش لە توانایدا نەبوایە باج بدات، لێدان، یان زەوی و زار و سامانەکەی زەوت دەکرا، یان ناچار دەکرا کێڵگە کشتوکاڵییەکەی بەجێبهێڵێ، بەمەش باری کشتوکاڵ دواکەوت. لە سەدەی نۆزدەهەمدا سیاسەتێکی خراپتر سەری هەڵدا، ئەویش بەکرێدانی پلە و پایەی کارگێڕیی بوو، کەسێك لە پایە حکومییەکان، یان لە دامەزراوێکی حکومیی دەهات بەرپرسیاریەتێکی حکومیی لە یەکێك لە هەرێمەکان بۆ ماوەی ساڵێك، یان دووساڵ بەکرێ دەدایەوە بە یەکێك لە بازرگانەکانی ئەستەنبوڵ، ئەم لە جیاتی خاوەن فەرمان دەبووە بەرپرس.

---

[94] - M. Van Bruinessen, Agha ,Sheikh And Sate. Utercht,1978, p.221. an Bruinessen. Pp.229-227

ئەرکەکەیان دەکرێ بەبێ ئەوەی خۆیانی تێبگەیەنن، ئەو کاربەدەستەی پلە و پایەی کڕیبوو، هەموو شێوازێکی دڵڕەقانەی دەگرتەبەر و دەرفەتی لەدەست نەدەدا لە کۆکردنەوەی باج و میرانەی حکومیی، هەتا بەشێکی بداتە حکومەت و بەشێکی بۆ ئەو کەسەی لێی بەکرێ گرتووە و بەشێکی بۆخۆی، چونکە کاری ئەم کاربەدەستانە کاتیی بووە، بایەخیان نەداوە بە ئاستی بژێوی جووتیاران و حاڵەتی دووبارەنەبوونەوەی برسیەتی و کارەسات و نەخۆشیی، بۆیە ناوچە کوردییەکان تووشی بارێکی زۆر خراپ بوون[95].

لامان سەیر نابێت کورد و میرەکانی بەرەو لای بەدرخان بچن هەتا لەو بارودۆخە سەختەدا سەرکردایەتییان بکات، ئەوەشمان لەبیر نەچێت لە مێژ بوو میر بەدرخان خۆی ئامادە کردبوو میرنشینەکەی بکاتە ناوەندی بەرەنگاربوونەوەی عوسمانیی، لە سییەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە هەستی بەدامەزراندنی پێویستیەکانی دەوڵەتی هاوچەرخ کردبوو، بۆ ئەمەش کارگەی چەك و تەقەمەنیی داناو کەوتنە بنیاتنانی دامەزراوەی فێرکردن و ناردنی خوێندکار بۆ دەرەوە بە مەبەستی زیادکردنی شارەزایی هونەریی[96]..

زۆربەی نووسەران و بەشێك لە ڕۆژهەڵاتناسان بزاڤی بەدرخانیان بەبزاڤێکی نەتەوەیی ناو بردووە، کە ئامانجی ڕزگارکردنی کوردستان بووە لە ملهوڕی نەتەوەیی تورکی کە لە عوسمانییەکان بەرجەستە ببوو، ئەوەی تێبینی دەکرێ نووسەرە کوردەکان تێڕوانینی خۆیان لەسەر ئەو نامیلکەیە بنیاتناوە کاتی خۆی لە بیستەکانی سەدەی بیستەم میر جەلادەت بەدرخانی نەوەی میر بەدرخان نووسیویەتی بە ناوی "القضية الكردية، ماضي الكرد وحاضرهم"، وەکو دەزانین جەلادەت بەدرخان نە شۆڕشەکەی باوکی دیوە و نە لە کاتی شۆڕشەکەدا هەبووە، بەڵکو هەڵسەنگاندنەکانی لە ڕوانگەی ئەم سەردەمەی ناسیۆنالستیی ڕۆژئاواییەوە داڕشتووە[97]. وادی جوەیدە

---

[95] - جليل جليلی: من تاريخ الدول والامارات الكرديه فی الامبراگوريه العپمانيه، الترجمه العربيه، ديمشق، 1987، ص116-117.

[96] - بلة.ج. شيركو: القضية الكردية، الترجمة العربية، ديمشق، بيروت 1956، ص50-52.

[97] - شيركو: سەرچاوەی پيشوو، ل50-60.

دیراسەیەکی تەواو گشتگیری لەسەر بزاڤی بەدرخان ئامادە کردووە و رای تەواو جیاوازی هەیە لەوەی بزاڤی بەدرخان بزاڤێکی ناسیۆنالستیی بووبێت، بە بزاڤێکی تەقلیدیی دەزانێت کە ئامانجی تەقلیدیی سنووورداری هەبووە، هەروەها (مارتن ڤۆن برۆنسن) لە لێکۆڵینەوەیەکی بەنرخیدا لەسەر کورد هەمان بۆچوونی هەیە، برۆنسن وای بۆچووە بزووتنەوەی بەدرخان دەچێتە خانەی ئەو بزووتنەوانەی لە سەدەی نۆزدەهەم لە هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانیی پەیدابوون، بەتایبەتی لە هەرێمە کوردیەکان، ئەم بزاڤە بە هەوڵ و کۆششی دەمڕاستە تەقلیدیەکان هاتە کایەوە، بۆ پارێزگاریی لە بەرژەوەندیی هەڕەشەلێکراویان لە لایەن دەسەڵاتی ناوەندییەوە، هەروەها برۆنسن دەگاتە ئەوەی بڵێ: "هیچ ئاماژەیەکی نووسراو لە سەردەمی بەدرخان نییە ئەوە بسەلمێنێ ئامانجی نەتەوەیی هەبووبێت"[98].

رای نووسەری ئەم وتارە بە لای رای دکتۆر جویدە و برۆنسندایە لەسەر جەختکردنە سەر بزاڤی بەدرخان بەوەی بەرئەنجامی هەوڵەکانی دەوڵەتی عوسمانیی بووە بۆ نەهێشتنی میرنشینەکانی خاوەن حوکمی زاتی، لە دوای دۆزینەوەی بەڵگەنامە رووسیی و عوسمانییەکانی تایبەت بە سەدەی نۆزدەهەم هەتا ئێستا هیچ ئاماژەیەك نەدۆزراوەتەوە جەخت بکاتە سەر ئەو دەمارگیرییە، هەتا لەو کاتەش میر بەدرخان دەسەڵاتی کردەیی هەبووە بەسەر کوردستانی سەر بە دەوڵەتی عوسمانیی ناوی سوڵتان لەگەڵ ناوی زۆربەی ئەو میرە کوردیانە هاتووە کە خاوەنی دەوڵەت و حوکمی زاتیی بوون، بۆ نموونە لە ساڵی (1846ز) میر بەدرخان بە میسیۆنەرە ئەمریکیەکانی راگەیاندووە هەتا ئێستاش رێزی سوڵتان دەگرێ و لە بەڵێنی خۆی پاشگەز نەبۆتەوە[99].

نموونەی هەوڵەکانی بەدرخان لە کوردستان بۆ بنیاتنانی دەوڵەتی سەربەخۆی هاوچەرخ وەکو هەوڵەکانی موحەممەد عەلی پاشای والی میسر و داود پاشای مەملوکی دەسەڵاتداری عێراقی وابووە، لە هەموو حاڵەتەکاندا والیە رووناکبیر و کارامەکان بناغەی هێزێکی هەرێمیی سەربەخۆیان بە کردەوە دانابوو، بەڵام وەك چۆن ناتوانین موحەممەد عەلی پاشای ئەلبانی بە پێشەنگی نەتەوەیی عەرەبی دابنێین، هەروەها داود پاشای لە قەوقاز راهاتوو، بکەینە دەمڕاستی عروبەی عەرەبیی، بۆ بەدرخانیش بە هەمان شێوە.

---

[98] - Van ruinessen, pp.226-227.

[99]-- Wright, p381.

حوكمدان لەسەر جولانەوەی بەدرخان، یان هەر جولانەوەیەکی کوردیی سەدەی نۆزدەهەم بە بزاڤی نەتەوەیی، حوکمدانێکی نابابەتی و پێچەوانەی راستیە، چونکە ئەمە لە پێش سەرهەلدانی سیاسەتی بەتورککردن (تتریك) بوو لە ناو دەولەتی عوسمانیی، بیری ناسیۆنالستیی هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم نەگەیشتبووە دەولەتی عوسمانیی.

حکومدانی هەندێك لە نووسەرە رۆژئاواییەکان لەسەر جولانەوەی بەدرخان بەوەی بزاڤێکی ناسیۆنالستیە، هەلەیە، لە ئەنجامی لێکۆلینەوەی سەرپێیدا دەگەیەنە ئەو ئاکامەی ئەو حکومدانە دەگەرێتەوە بۆ ئەقلیەت و مەنهەجیەتی هەندێك لە نووسەرە رۆژئاواییەکان و بڕیاردان لەسەر رووداوەکانی کومەلگای ئیسلامیی بە هەمان پێودانگ کە ئەو شەپۆلە ناسیۆنالستیە ئەو کات لەناو کوردا سەری هەلنەدا بوو.

دەتوانین بلێین بزووتنەوەی بەدرخان بنەمای فیکریی و سیاسییی بۆ بزووتنەوەکانی شێخ عوبێدوللای نەهری و شێخ عەبدوسسەلامی بارزانی و ئەوانی تر دارشت، خالی هاوبەشی ئەوانە کاریگەریی ئایین بووە بەسەر رووخساری جولانەوەکەیان، ئیلهامی بزاڤەکەیان لە ئایینەوە وەرگرتبوو.

## هۆیەکانی رووخانی حکومەتی بەدرخان

کۆمەلێك هۆکار بوونە هۆی رووخانی حکومەتە کوردیەکەی بەدرخان، بەلام لە پێشەوە ناکۆکیی کورد و ئاشوورییەکان هۆکاری یەکلاییکەرەوەی راستەوخۆ بووە، میسیونەرانی ئینگلیز و ئەمریکی و فەرەنسی رۆلی بەرچاویان لە ئاگرخۆشکردنی ئەو ناکۆکییەدا بینیووە، ئەمەش لە پێناوی درووستکردنی بڕووبیانوو هەتا دەولەتی بەریتانیی ـ عوسمانیی کۆتایی بە حکومەتی سەربەخۆی بەدرخان بهێنن.

## ململانێی کوردیی - ئاشووریی

سەدان سال بوو ئاشوریە نەستۆری و کلدانەکان لەگەل کورد لە ویلایەتەکانی هەکاری و موسل نیشتەجێن، پەیوەندیی ئاشتیانە و رێزی هاوبەشیان هەبووە، گەلی ئاشووریی گەلێکی کۆن و ئازان، سروشتیان لە جەنگدا وەکو هۆزە شاخاویەکانە،

هەندێك لە لێكۆڵەرەوان پێیانوایە كلدان لەو هۆزە كوردانەن لە زووەوە بوونەتە مەسیحیی، سەدان ساڵە لەو هەرێمە نیشتەجێن و خاڵی هاوبەشیان لەگەڵ کورددا هەبووە، كورد و میرە كوردە مسوڵمانەكان بەشێك لە بەڕێوەبەرایەتی خۆجێیان دابوو بە ئاشووریی و كلدانەكان، ئاشوورییەكانی هەكاریی لە ناوچەكانی تیاری و تخوما و ئەشیتا لەلایەن چینێكی تیۆكراتی بەڕێوەدەچوون بە ناوی (ئەبوناو كاشتیاس) لە سەرووی ئەم چینە تیۆكراتیە، مار شەمعۆن هەبووە كە لە ناوچەی جولەمێرگ دانیشتووە، ئەمە لە كاتێكدا دەبوایە دەسەڵاتی دونیایی لەو ناوچانە لەلایەن سەرۆك هۆزەكانەوە بەڕێوەببرایە، كە پێیان دەوترا پاشا (الملوك)، ئەو پاشاو مەلیكانە وەكو دەستەیەكی بەڕێوەبەرایەتی حوكمی ناوچەكە باجیان كۆدەكردەوە و بڕیارەكانی دەوڵەتی عوسمانیی، یان میرە كوردە دەسەڵاتدارەكانیان لە ناوچەكە جێبەجێ دەكرد[100].

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دەسەڵاتی حكومەتی بەریتانیا لە نێو دەوڵەتی عوسمانیی زۆر زیادی كرد، ئەمەش بەشێك بوو لە ناكۆكیی بەریتانی - رووسیی بۆ پاراستنی هاوسەنگیی هێز لە ئەوروپا، لە ئەنجامی كۆمەڵێك شەڕی نێوان رووسیا و عوسمانیی، هێزەكانی رووسیا هاتنە ناوچەكانی هاوسنووری كوردستانی توركیا و لە ناوچەی ئازەربایجانی رۆژئاوا، چوونە نێو قوڵایی كوردستانی ئێران، كار گەیشتە هەڕەشە كردن لە بەرژەوەندییەكانی بەریتانیا لە لایەن رووسەوە لە گەرووی دەردەنیل و بەسفۆڕ لەگەڵ بەرژەوەندییە ئیستیعمارییەكانی لە عێراق و هیند، لەبەر ئەوە پشتیوانیكردنی دەوڵەتی عوسمانیی و پاراستنی یەكێتی خاكی عوسمانیی بووە گرنگترین بنەمای سیاسەتی بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەبەر گرنگیی ستراتیژی كوردستان، لە ململانێی رووسی - بەریتانی، هەریەك لەو دوو دەوڵەتە ویستوویانە جێ پێی خۆیانی تیا بكەنەوە[101]. رووسەكان لە میانەی دروستكردنی پەیوەندیی پتەو

---

[100] - عبدالعزيز الشناوي: الدولة العثمانية دولة اسلامية مفترى عليها، الجزء الرابع، القاهرة 1986، ص1830-1831. Major Frederick Milligan wild Life Among the Kurds .London.1870, P.272

[101] - دكتور كمال مظهر: كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى.

لەگەڵ ئەرمەن، هەوڵی هاتنە ناوەوەی ناوچە کوردییەکانیان دەدا، ئینگلیزەکانیش لە لای خۆیانەوە باسی یەزیدی و ئاشوورییان هێنایە گۆڕێ[102].

سەرەتای ناکۆکیی ئاشووریی ـ کوردیی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای چلەکانی سەدەی نۆزدەهەم، ئەو کاتەی دەوڵەتی عوسمانیی ژەنەراڵ موحەممەد بیرقداری والی کوردستانی بە سوپایەکەیەوە ئامادەکرد بۆ لەنێوبردنی میرنشینە کوردییەکان، بەتایبەتی بۆ لەنێوبردنی میرنشینی بادینان لە ئامێدی، میرەکانی بادینان خاوەنی دەسەڵاتی فراوان بوون لە ناو خاکی کوردستان، هەروەها میرنشین و کوردە یەزیدیی و سەرۆك هۆزە کوردەکان کەوتنەخۆ بۆ ناردنی دەستەی فریاکەوتن بۆ میر ئیسماعیل و داوایان لە مار شەمعۆن کرد هێزێك بۆ فریاکەوتنی میری بادینان لە دژی دەوڵەتی عوسمانیی ئامادە بکات، لەسەر ئەو بنەمایەی ئەوان سەر بە دەسەڵاتداریەتی میری هەکاری بوون، مار شەمعۆن ئەو کات لە ژێر کاریگەریی یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانیدا بوو لە موسڵ بەناوی (رەسام)، با ئەوەش ئاگادار بین حکومەتی بەریتانی ئەو کات پشتیوانیی لە دەوڵەتی عوسمانیی کردووە بۆ لەنێوبردنی میرنشینە سەربەخۆکانی کورد، بۆیە مار شەمعۆن فەرمانی میری هەکاری رەتکردەوە لە ناردنی هێز بۆ یارمەتی هێزە کوردەکان، ئەمە قینی کوردانی دژی ئاشوورییەکان بزواند[103].

بە گەیشتنی مسیۆنەرە بەریتانیی و ئەمریکییەکان بۆ ناوچەی هەکاریی، ناکۆکییەکانی نێوان ئاشووریی و کورد گەرمتر بوو، لە ساڵی (1838ز) میسیونەری بەریتانی ناسراو بە (بادجەر) گەیشت و پێشتر بە دوو ساڵ (بیستر بیکن) گەیشتبووە ناوچەکە، هەردوو میسیۆنەر بە ئاشکرا بانگەوازیان بۆ هەڵگەڕانەوەی ئاشوورییەکان کردووە، دژی ئەوەی پێیان دەوت "کوردە دەمارگیرەکان"، هەروەها یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانیی رۆڵی گەورەی لەو ئاگرخۆشکردنەدا بینی بە ناوی بانگەوازی بەردەوامی بۆ دەستێوەردانی بەریتانیی بە بیانووی راگەیاندنی چاودێریی بۆ سەر هەکاری بۆ پاراستنی ئاشوورییەکان، زیادبوونی ناوەندەکانی میسیۆنەرەکان بۆ

---

[102]- Wegram and D. Lambeth The Griddle of Mankind Life in Eastern Kurdistan London, pp. 144-148. (Princton Unversity, 1961).pp.54-56.

[103] W. J waideh (Kurdish Nationalist Movement Syracuse Univ.1960) Pt,1.pp.192-193

ئاشوورییەکان لە ساڵی (1841) متمانەی بە مار شەمعۆن دا بە ئاشکرا داوای چاودێریی بەریتانیی بکات، لە ساڵانی (1841 ـ 1843ز) کورد و لایەنگرانی مار شەمعۆن چەند هێرشێکیان بۆ سەر یەکتر دەستپێکرد، ئەمە زیاتر بووە هۆی هاندانی میر بەدرخان، بەڵام ئەو هەوڵیدا بەرلەوەی هەر بڕیارێك بدات راوێژ لەگەڵ والی ئەرزڕۆم بکات کە لە ڕووی کارگێڕییەوە سەرپەرشتی هەکاری و بۆتانی دەکرد، والی ئاگاداری مار شەمعۆنی کرد دەست لە کاروباری دونیایی وەرنەدات و لە سنووری خۆی دەرنەچێت، ئەمە بۆ چینی پاشاکان لێگەڕێ، بەڵام مار شەمعۆن فەرمانی والی رەتکردەوە و بەردەوام لە پەیوەندیدا بوو لەگەڵ یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لە موسڵ و بەردەوام بوو لە هەڵگەڕانەوە لە دەسەڵاتی میری هەکاری، لەو کاتەی بادجەر لە ساڵی (1843ز) لە ناوچەی (تیاری) بوو، نوێنەری میری هەکاری گەیشتە لای مار شەمعۆن و داوای لێکرد بۆ یەکلایکردنەوەی چەند مەسەلەیەکی ناکۆکیی نێوانیان سەردانی میر بکات، کوڕی مار شەمعۆن بە ئامادەبوونی باوکی بە نێردراوی میری وت: (ئێمە ملکەچی ئێوە نین، ئێستا وڵاتی ئێمە موڵکی ئەو پیاوەیە، ئاماژەی بە بادجەر کرد)[104].

لە دوای بە دیارکەوتنی هەڵگەڕانەوەی مار شەمعۆن، میری هەکاری داوای لە میر بەدرخان کرد دەست بگرێ بەسەر هەڵگەڕانەوەی ئاشووریی، میر بەدرخان یەك لە پیاوەکانی بە ناوی زەینەڵ بەگ لەگەڵ هێزێك نارد بۆ ئاشیتا، هێزەکانی مار شەمعۆنیش چەند رۆژ هێزی کوردەکانیان لە قەڵای شار گەمارۆدا، هەتا ئەوانەی ناو قەڵا لـە برسان مردن[105].

بۆ مەبەستی چاوترساندی مار شەمعۆنی هەڵگەڕاوە میر بەدرخان سوپایەکی (26) هەزار کەسیی ئامادە کرد کە هەموو میرنشینە کوردییەکان بەشدارییان تیا کردبوو، سوپای کورد لە ژێر فەرمانی توندوتۆڵ دابوو بەوەی نابێت ئازاری هیچ ئاشوورییەکی شەڕنەکەر بدرێت، بۆ نموونە ئاشوورییەکانی دانیشتووی (تخوما) تووشی هیچ ئازارێك

[104] - Joseph The Nestorians and the Muslim Neighbors (Princeton University, 1961). Pp.54-56

[105] - British Documents on Foreign Affairs, Ottoman Empire 1860-1880 P. 271; Vice Consul Rassam, July No.108.August 26,1844.

نەبوون، چونکە سەرۆکە روحی و دونیاییەکانی تخوما نەچوونە پاڵ هەڵگەڕانەوەکەی مار شەمعۆن، میر بەدرخانیش خەڵاتی کردن[106].

حکومەتی بەریتانی بە ڕێگەی سیخوڕایەتی و لە بەرگی میسیۆنەرایەتی خۆیان شاردبۆوە، ئاگاداری تەواوی رووداوی هەڵگەڕانەوەی ئاشوورییەکان بوون، هەروەها ئاگاداری ڕێوشوێنی میر بەدرخان بوون لە چاوترساندنی ئاشوورییەکان، بۆیە هەوڵیاندا فشار بخەنە سەر موحەممەد پاشای کویتلی هەتا بەرگریی لە ئاشوورییەکان بکات، بەڵام هەوڵەکان بێئاکام بوو، هەروەها بە ڕێگەی ژەنەراڵ (شیل) ئەفسەری یەکەمی سیخوڕی لە ڕۆژهەڵات، هەوڵ درا فشار بخرێتە سەر ئێران نەیەڵێ کوردەکانی ئەوێ هاوکاریی میر بەدرخان بکەن بۆ هێرشکردنە سەر پێگەی هەڵگەڕاوە ئاشوورییەکان، نازانرێ بۆچی والی موسڵ لە بەرژەوەندیی ئاشوورییەکان نەبزووت و خۆی لەم کارە نەگەیاند، هێزەکانی کورد پێگەکانی مار شەمعۆنیان گرت و ئەویش هەڵات بۆ موسڵ، لەوێ پەنای بردە بەر قونسوڵیەتی بەریتانیی[107].

سەرچاوە ڕۆژئاواییەکان بە ترسناکیی باس لە کوشتاری ئاشووریی و زەوتکردنی ماڵ و سامانیان کردووە، هنری لایارد سیخوڕی بەریتانی ژمارەی کوژراوەکان بە (10) هەزار و بریندار بە سەدان هەزار مەزەندە کردووە[108].

نامە هاتووەکانی میسیۆنەرە ئەمریکی و ئینگلیزەکان باسی کارەسات و حاڵەتی تاڵان و تێکدانی کەنیسە و کێڵگە و بە کەنیزەکردنی ئافرەتان و کوشتنی منداڵ و قەشەیان کردووە لە لایەن "کوردە دەمارگیرەکان"ەوە، ئەمە لە کاتێکدا میر بەدرخان ژمارەی کوژراوی ئاشوورییەکانی بە هەزار کوژراو داناوە و کوژراو و برینداری کوردانیشی بە نزیك لەوە دیاری کردووە، مار شەمعۆن دانی ناوە بە پێنج هەزار کوژراو و برینداری لایەنگرانی[109].

---

[106] -W. J waideh (Kurdish Natoinist Movement Syracuse Univ.1960, pp.199-200

[107] - British Documents on Foreign Affairs, Ottoman Empire 1960-1880 p.282. Enclosure No.169. August 2,1844.

[108]-H.Lyard Nineveh and It's Remains p.156-

[109] - British Documents on Foreign Affairs, Ottoman Empire 1960-1880

نابێت خۆ لەوە ببوێرین لەو شەڕە خێڵەکیانەی نێوان کورد و ئاشوورییەکان ژمارەیەکی زۆر قوربانیی هەبووبێت، بەتایبەتی لایەنی ئاشووریی تێکشکاو، بەڵام دە هەزار بە تەواوی زیادەڕۆییە و مەبەستی سیاسیی لە پشتەوە بووە، ئەمە لە کاتێکدا ژمارەی ئاشوورییەکان لە ناوچەکەدا نەدەگەیشتە (60) هەزار کەس و شەڕ بۆ ماوەی مانگێك و لە ناوچەیەکی شاخاویی سەخت و بە چەکی سەرەتایی بووە، ئاشوورییەکان بەش بەش بوون و بە تەنیا شەڕ ناوچەی (تەیاری) گرتبۆوە، راستیی زیاتر بە لای بەدرخاندا دەشکێتەوە کە ژمارەی کوژراو و بریندارى هەردوولای بە (2ـ 3) هەزار کەس داناوە، بەڵام میسیۆنەرانی ئەوروپیی بە مەبەستی سیاسیی زیادەڕۆییان لە ژمارەی قوربانیاندا کردووە هەتا دەست لە کاروباری ناوچەکە وەربدەن و بە ناوی سنووردانان بۆ کوشتاری ئاشووریی، فشار بخەنە سەر دەوڵەتی عوسمانیی[110].

دەوڵەتی عوسمانیی یەکسەر وەفدێکی حکومیی بە سەرۆکایەتی کامیل پاشا ناردە لای میر بەدرخان و داوای لێکرد شەڕ رابگرێ و دیلەکان تەسلیم بە کامیل پاشا بکات، میر بەدرخانیش بەرگری لە هەڵوێستی خۆی کرد و جەختی کردەوە کە ئاشوورییەکان بە فیتی میسیۆنەرەکان و (رەسام)ی ئینگلیز دەستدرێژیکەربوون، هێرشەکانی ئەم بۆ چارترساندن بووە لە بەرانبەر دەستدرێژیی بەردەوامی ئەوان بۆ سەر گوندە هاوسنوورەکانی ئاشووریی، هەروەها بەدرخان بە باشیی لەگەڵ دیلەکان رەفتاری کردووە و تەسلیم بە کامیل پاشای کردوون، بێجگە لە هەندێکیان کە مسوڵمان بوون، (رەسام)یش دانی بە رەفتارچاکی بەدرخان داناوە لەگەڵ دیلەکان[111].

لەگەڵ ئەوەیدا میر بەدرخان لەلای خۆیەوە لاپەڕەی شەڕی بەلاوە ناو و کۆتایی پێهێنا، بەڵام ئینگلیز بە رێگەی رەسام و میسیۆنەرەکان لە هەوڵی بەردەوامدا بوون بۆ دروستکردنی ئاژاوە لە نێوان کورد و ئاشووریی، لە ساڵی (1846ز) چەند شەڕێك لە

---

p.282. Enclosure No.169. August 2,1844.

- [110]-British Documents on Foreign Affairs, Ottoman Empire, 1860-1880,p. 277; Telegram No. 194. September 1, 1844..

[111] - Briitish Documents on Foreign Affairs, Ottoman Empire, 1860-1880,pp.279-280 Enclosure No 169 August 2, 1844; Telegram No.126 17, 1844.Sir Connington.

نێوان لایەنگرانی مار شەمعۆن کە دووبارە هەڵهاتبوو بۆ لای والی موسڵ و لەوێ دەپارێزرا لەگەڵ هێزەکانی کورد روویاندا، میسیۆنەر و قونسوڵیەکانی وڵاتانی ئەوروپیی ئەمەیان گەورە کرد و قوربانیانی لایەنی ئاشوورییان لە قەبارەی خۆی زیاتر نیشاندا لەپێناو هاندانی حکومەتەکانیان هەتا بێن و فشار بخەنە سەر دەوڵەتی عوسمانیی بۆ کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی بەدرخان، تەنانەت رۆژنامەوانی رۆژئاواش ژمارەی قوربانیانی ئاشوورییان لەو رووداوە گەیاندە پێنج هەزار کەس، لە کاتێکدا بەڵگەنامە نهێنییەکانی بەریتانیا کە بەم نزیکانە بڵاوبوونەتەوە تەنیا ئاماژەیان بە (500) پێکراوی لایەنی ئاشووریی کردووە[112] .

## رۆڵی دەوڵەتی عوسمانیی لەو ململانێیە

زۆربەی نووسەرە کوردەکان لەو بڕوایەدان دەوڵەتی عوسمانیی لەگەڵ ئینگلیز دەستی هەبووە لە هاندانی ئاشوورییەکان لە دژی کورد، بۆ ئەمەش هیچ بەڵگەیەکی نووسراوی رۆژانی ناکۆکییان لەبەردەستدا نییە، ئەم باوەڕەش لە کتێبەکەی ب، ج، شێرکۆ (جەلادەت بەدرخان)و کتێبەکەی جەلیلی وەرگرتووە[113] .

دکتۆر جوەیدە ئەگەری دەستێوەردانی دەوڵەتی عوسمانیی لە ململانێی کوردی - ئاشووری بەدوور نازانێت، ئەمیش لە لای خۆیەوە پشتی بە هیچ بەڵگە، یان بنەمایەکی مێژوویی نەبەستووە، بە تەنیا باوەڕی خۆی لەسەر گومانێك دامەزراندووە بەوەی حکومەتی ناوەندیی لە پێناوی دووبارە گەڕاندنەوەی خۆی بۆ ناوچەکە، ویستویەتی هەردوولا، کورد و ئاشووریی لاواز بن[114] .

لە ناوەندەکانی ئەوروپیی بەتایبەتی لە نێو ئینگلیز باوەڕی پتەو هەبووە، کە دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ کوردەکان دەستی هەبووە بۆ پیلان لە دژی ئاشوورییەکان،

---

112 - British Documents on Foreign Affairs, Ottoman Empire 1860-1880 p.288 Mr. Wellesley No. January 1847.

113 - جليلي: من التاريخ الامارات الكردية، ص130-131.".

114 -The Missionary Herald XXX1X, No,11;November 1843,pp.435-437; British Documents on Foreign Affairs, Ottoman Empire 1860-1880 p.273 Telegram. No.208 October.11843 -.

هەروەکو باڵیۆزی بەریتانییش ئاماژەی بۆ دەستێوەردانی دەوڵەتی عوسمانیی لە بەرژەوەندیی کورد کردووە بۆ سەرکوتکردنی ئاشوورییەکان، میسیۆنەری ئەمریکی (گرانت) بڕوای وایە والی موسڵ لەگەڵ کورد هاوکار بووە بۆ لێدانی ئاشوورییەکان، چونکە لە کاتی شەڕەکانی (1843)دا سنووری ویلایەتی موسڵی لەگەڵ ویلایەتی هەکاری داخستووە، هەتا کارئاسانیی بۆ کوردان بکات بە دوای لایەنگرانی مار شەمعۆن بکەون[115].

لە بەڵگەنامە بڵاوکراوە و بڵاونەکراوەکانی بەریتانیی هیچی یەکلایکەرەوە لەسەر هاوئاهەنگیی کورد و دەوڵەتی عوسمانیی دەستناکەوێ، لێرەدا گومانی بەریتانیا لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە دەوڵەتی عوسمانیی هیچ ڕێوشوێنێکی بۆ وەستانی شەڕی نێوان ئاشووریی و کورد ئەنجام نەداوە، بە بیرماندا دێت ئایا ئەندازەی توانای دەوڵەتی عوسمانیی بۆ کاریگەریی لەسەر لایەنە ناکۆکەکان چەند بووە؟

گومانی تیا نییە دەوڵەتی عوسمانیی لە شەڕی ئاشووریی ـ کورد، نیگەران بووە، ئەمەش لەبەر ئەنجامی مەترسییەکانی شەڕەکە بووە، لە حوزەیرانی (1844ز) کامیل پاشا لە کاتی هاتنی بۆ بۆتان، بە میر بەدرخانی وتووە: ئەگەر ناکۆکیی بەردەوام بێت، بیانوو بەدەستەوە دەبێت بۆ دەستێوەردانی ڕۆژئاوا لە کاروباری نێوخۆیی دەوڵەتی عوسمانیی، هەروەها وتبووی: ئەگەر لەو ئاشوورییانە نەگەڕێن، بەریتانیا داوا لە دەوڵەتی عوسمانیی دەکات جەنابتان سزا بدرێن، ئەگەر نا خۆیان سزاتان دەدەن، ئەوە بزانە ئەوانە دەتوانن پێتان بگەن، چونکە پێشتر لەگەڵ چین جەنگاون کە پێنج هەزار سەعاتەڕێ لە بەریتانیاوە دوورە[116].

دەوڵەتی عوسمانی هیچ دەورێکی لە برەودان بە ناکۆکی ئاشووریی ـ کوردییدا نەبووە و ناکۆکییەکە زیاتر هۆکاری ریشەیی ناوچەیی بووە، میسیۆنەرە ئەمریکایی و

---

[115] - British Documents on Foreign Affairs, Ottoman Empire 1860-1880,p. 273;Mr. Stevens, May 18, 1844; Enclosure No. 126, June 17, 1844, Sir Canning.

[116] -British Documents on Foreign Affairs, Ottoman Empire 1860-1880,p. 279;Mr. Stevens, May 18, 1844; In closure No. 126, June 17, 1844, Sir Canning.

ئینگلیزەکان لەو لایەنەوە راستەوخۆ رۆڵیان هەبووە، نەك دەوڵەتی عوسمانیی، بەڵام بۆچی ئینگلیز ئاشوورییەکانی لە بەدرخان هاندا؟ ئەمەش کۆمەڵێك هۆکاری خۆی هەیە، لە پێشەوە ئارەزووی بەریتانیا بۆ لەناوبردنی هەر هەوڵێکی والیە ریفۆرمیستەکان، یان فەرماندە ریفۆرمخوازەکانی ناو ئیقلیمەکانی دەوڵەتی عوسمانیی بیهێننە ئاراوە بە مەبەستی چاکسازیی لە دەوڵەتی عوسمانیی، چونکە ئینگیزەکان لەوە دەترسان ئەمە ببێتە هۆی لێکهەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانیی کە لە واقیعدا لە ژێر کاریگەریی راستەوخۆی بەریتانیادا بووە، بۆیە بەریتانیا یارمەتی عوسمانیی دا بۆ سەرکوتکردنی موحەممەد عەلی پاشای والی میسر بە هەمان شێواز عوسمانییەکانی ناچار کرد هێرش بکەنە سەر میر بەدرخان.

لە دەزگا فەرمییەکانی ئینگیز ئەو بڕوایە هەبووە، مامەڵەکردن لەگەڵ بەرپرسانی ئەستەنبوڵ و سەپاندنی ویستی رۆژئاوا ئاسانە، بەڵام ئەستەمترە لەوەی مامەڵە لەگەڵ میرێکی کوردی سەربەخۆی ناوچە شاخاوییە سەختەکان بکرێ، سیخوڕی بەریتانی (هنری لایارد) لە ڕاپۆرتێکی دا نووسیویەتی: "دەستبەسەراگرتنی میرنشینە سەربەخۆکانی کورد یارمەتی بەریتانیا دەدات بۆ دەستبەسەراگرتنی ئابووریی و بازرگانیی ناوچەی کوردستان"[117].

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت دەوڵەتی عوسمانیی نەیوستووە دەست بەسەر کوردستاندا بگرێت و کۆتایی بە حوکمی سەربەخۆی میر بەدرخان بهێنێت و ئەو ناکۆکییانە بۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکاربێنێت.

لە بنەڕەتەوە حکومەتی سەربەخۆی کوردستان بە سەرۆکایەتی میر بەدرخان هەڕەشە بووە بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانیی، ئەمە لە کاتێکدا هێزە گرنگەکانی سوارەی سەر بە دەوڵەتی عوسمانیی لە بنەڕەتەوە پشتیوانیی چەکدارە کوردەکان بوون کە هۆزە کوردەکانی ناوچەکە چل کەتیبەی سەر بە دەوڵەتی عوسمانییان پێکهێنابوو، هەروەها بیست کەتیبەی تر لە نەوەی هۆزە کوردەکانی وەکو حەیدەرانییە، جەبرانییە،

---

117 -British Documents on Foreign Affairs, Ottoman Empire 1860-1880,p.290 ;Lord Cowley, No. 360. October 17 1847.,Memorandum on Kurdistan,, by H. Layered In closure.

میران، دودری، کەحان ئەترۆش و میللیی هەبوون، ئەمانە کۆڵەکەی بنەڕەتیی هێزی عوسمانییان پێکهێنابوو لە بەرانبەر ئێران و رووسیای قەیسەریی دا[118].

## هێرشی هێزەکانی عوسمانیی بۆ سەر میرنشینی بۆتان[(119)]

لە دوای دەستپێکردنی چەند شەڕێکی نێوان میر بەدرخان و هێزەکانی ئاشووریی، دەنگ و باسی کوشتار و کارەسات لە دژی ئاشووریی ئەوروپای هەژاند، نوێنەرایەتی هێزەکانی ئەوروپا داوایان لە دەوڵەتی عوسمانیی کرد بە خێرایی فریایان کەوێ، ئەگینا

---

[118] - Sheikh Warhead, The Kurd And Their Country Lahore, 1958, p. 144.

[119] - پەیوەندیی کورد و نەتەوەکانی دی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیی بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە: قۆناغی یەکەم لە سەرەتای سەرهەڵدانی دەوڵەتی عوسمانییەوە دەست پێدەکات، بەڵام لە ناو کورد و عەرەب و نەتەوەکانی رۆژهەڵات لە دوای شەڕی چالدێرانەوە (1514ز) دەستی پێکردووە، ئەم قۆناغە هەتا پیادەکردنی سیاسەتی سوڵتان مەحمودی دووەم لە دەیەی دووەمی سەدەی (19)ی خایاندووە. قۆناغی دووەم لە سوڵتان مەحمودەوە هەتا کەوتنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (1908ز). دواقۆناغیش سەردەمی دەسەڵاتی ئیتحادیەکانە، هەتا کەوتنی دەوڵەتی عوسمانیی لە ساڵی (1918). لە قۆناغی یەکەم پەیوەندیی نێوان کورد و دەوڵەتی عوسمانیی بە ئەندازەیەکی بەرچاو باش بووە، ئەمەش لە بەرئەنجامی رێکەوتننامەی (سوڵتان سەلیم ـ ئیدریسی بەدلیسی) کە پێشتر ئاماژەمان پێدا، کێشە و ناکۆکیی بە بەراورد لەگەڵ قۆناغەکانی تر زۆر کەم بووە. کاتێك سوڵتان مەحمودی دووەم (1808ـ 1839) بە سیاسەتی بە مەرکەزییکردنی دەوڵەت رێکەوتننامەی ناوبراوی هەڵوەشاندەوە، میرنشینە کوردییەکان کەوتنە بەر هەڕەشەی لەناوچوون، لێرەوە ناکۆکیی زەق کەوتە نێوان میرنشینە کوردەکان و دواتر سەرکردەکانی شێخی تەریقەت لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیی. کێشەی سەپاندنی دەسەڵات لەگەڵ خواستی لامەرکەزیی دەسەڵات لە ناو هۆکارەکانی ئەو ململانێیە پشکی شێری بەردەکەوێ، دواتر و لە کۆتایی سەدەی (19) ئەو ململانێیە بە ئاقاری چەکەرەکردنی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی چوو، قۆناغی سێیەم سەردەمی ئیتحادیەکانە (1908-1918) کە بە تەواوی ناکۆکیی نێوان رەگەزی تورکی ناسیوتالستو خۆسەپێنەرو نەتەوەکانی تره بەتایبەت کورد کە لە شەشەم بەشی ئەم کتێبە بە درێژی باسی دەکرێت، دەمەوێ لە دەرفەتێکدا ئەوە بسەلمێنم کە دادگەریی و ویژدان بە لای ئەوەدایە ئەم قۆناغە لەگەڵ ساڵانی تەمەنی عوسمانیی حیساب نەکرێت، چونکە ئەم قۆناغە لە هەموو رووەکانی فیکریی و سیاسییی بە دەوڵەتی عوسمانیی ناچێت، لەم قۆناغە ناکۆکیی ناسیۆنالستی لە ئاکامی پەیڕەوکردنی سیاسەتی رەگەزپەرستانەی بەتورککردن کەوتە نێوان ئیتحادیەکان و نەتەوە ناتورکەکان، سروشتی ململانێ و دەوڵەتی عوسمانیی لەگەڵ پێشتر زۆر جیاواز بووە. "وەگێر".

بەرژەوەندییەکانی عوسمانیی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەوروپا بە توندیی دەکەوێتە بەر مەترسیەوە، کەشتیگەلی ئەوروپیی بەرەو ئاوەکانی عوسمانیی بزووت هەتا بە سوودی ئاشوورییەکان فشار بخاتە سەر دەوڵەتی عوسمانیی لە دژی میر بەدرخان هەڵوێست وەربگرێت، لە 1846/10/27ز دەوڵەتی عوسمانیی داوای لە کارمەندانی باڵیۆزخانەی بەریتانیا کرد حکومەتەکەیان ئاگادار بکەنەوە دەوڵەتی عوسمانیی خۆی بۆ لێدانی بەدرخان ئامادە کردووە، بەڵام سروشتی کوردستان و باری ئاو و هەواو (60) هەزار چەکدار لەژێر فەرماندەی بەدرخان دەوڵەتی ناچار کردووە هێرشەکەی بۆ ساڵی ئایندە دوابخات، ئەمەش بۆ خۆئامادەکردن و دانانی رێوشوێنی پێویست بوو بۆ هێرشکردنە سەر کوردستان، سەدری ئەعزەم بە نوێنەری حکومەتی بەریتانیای وت: حکومەت یەکێك لە بەرپرسانی خۆی ناردووە بۆ لای بەدرخان هەتا رازی بکات یەکسەر شەڕەکە بوەستێنێت[120].

لە بەهاری (1847ز) حکومەت لە کوردستان کەوتە خۆئامادەکردنی چالاکییە سەربازییەکانی، ئەمەش لە دوای پەسندنەکردنی دەعوەتنامەی سەفەری میر بەدرخان کە لەسەر داوای سوڵتان بچێتە ئەستەنبوڵ بۆ وتووێژ لەسەر بابەتی شەڕی ئاشووریی - کوردیی، عوسمان پاشای فەرماندەی هێزەکانی ئەنادۆڵ سەرکردایەتی هێزەکانی عوسمانیی دەکرد بۆ سەر کوردستان، لە سێ قۆڵەوە (باکوور، باشوور، رۆژهەڵات) بە سوپایەکی بەهێز و بە بەشداریی باشترین سەرکردەکانی سوپا هێرشیان دەستپێکرد، میر بەدرخانیش بۆ پارێزگاریی لە کوردستان خۆی ئامادە کردبوو، هەرچەندە هێزەکانی عوسمانیی لە ورمێ تووشی زیانی گەورە بوون، بەڵام هەر زوو میر بەدرخان پێی زانی (یەزدان شێر)ی برازای فەرماندەی هێزەکانی لەگەڵ زۆربەی لەشکرەکەی چۆتە پاڵ هێزەکانی عوسمانیی[121]، میر بەدرخان ناچار هێزەکانی بۆ پارێزگاریی لە جەزیرەی ئیبن عومەر کێشایەوە، هەتا دواجار خۆی و هێزەکەی چوونە قەڵای (ئارخ).

---

120 - British Documents on Foreign Affairs, Ottoman Empire 1860-1880, p. 284-259;. MrWelesly. No. 101. October 27?,1846.

121 - ئەمەش بەشێکە لە وەهمی هاوشێوەی مەلای خەتێ لە مێژووی نوێی کورد، تایبەتمەندیەك لەمێژووی میللەتی ئێمە هەیە ئەویش بەکامڵ سەیرکردنی سەرکردەکانە، کاتی خۆی بۆشاردنەوەی خالە

سەرچاوە کوردییەکان دەڵێن بەدرخان دوای چەند مانگ بەرگریی لەبەر کەمی تەقەمەنیی و بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی ناچار بووە خۆی بداتە دەست هێزەکانی عوسمانیی، سەرچاوە و بەڵگەنامەکانی بەریتانی جەخت لەسەر رای مێژوونووسی تورك (لوتفی) دەکەنەوە، بەوەی شەڕەکان کورت بوون و لە مانگێکی زیاتری نەخایاندووە و یەکلابۆتەوە[122].

عوسمان پاشای فەرماندەی هێزەکانی عوسمانیی لەسەر ئەو بەڵێنەی بە بەدرخانی دا بوو، لە دوای خۆبەدەستەوەدانی، بە ڕێزەوە ناردی بۆ ئەستەنبوڵ، لە دوای ئەوەی چاوی بە سوڵتان کەوت ڕێگەی پێدرا لەگەڵ دووسەد کەس لە لایەنگرانی بچێ لە قوبرس بژی، دەڵێن ئەو رێزلێنانەی سوڵتان لە بەدرخان ئینگلیزەکانی نیگەران کردووە، هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕە کە پێشتر رێککەوتن لە نێوان بەدرخان و سوڵتاندا هەبووە[123].

میر بەدرخان و لایەنگرانی رۆڵی گرنگیان لە سەرکوتکردنی هەڵگەڕانەوەی قوبرسیەکاندا گێڕا، کە ئینگلیز و یۆنانییەکان پشتیوانیان لێ دەکردن، لە چاکەی ئەوە سوڵتان رێزی لێگرت و لەساڵی (1856ز) نازناوی میری میرانی دایە، دواتر لە ساڵی (1866ز) رێگەی پێدرا بگەڕێتەوە و لە دیمەشق دابنیشێت، هەتا لەوێ مرد و لە

---

لاوازەکانی سەرکردە کاریزماکان ئەم جۆرە کەسایەتیە خیانەتکارانەیان کردۆتە هۆکاری سەرەکی نووشستی، یەزدان شێر لە شۆڕشی بەدرخان و مەلای خەتێ لە شۆڕشی میر موحەممەدو مشیری حەمەی سلێمان لەدەربەندی بازیان .....هتد، بەزەقکردنەوەی ئەو هۆکارە لاوازە هاوشێوانە، هەندێ لە مێژوونووسانی رابردوو هەمان سەربووردەی نابابەتی ناو هەگبەی بیرەوەریەکانی کۆمەڵگای کوردەواریان کردۆتە هۆکاری زەقی نوشستیەکان، بەڵام لێکۆڵینەوەی بابەتی لە چوارچێوەو قەبارەی خۆی نەبێت هێندە هەق بەو هۆکارە زاتییانە نادات، مەسەلەی یەزدان شێرو خیانەتی لە میر بەدرخان سەرەداوی تازە پەیدابووە کە نەك بە خیانەتکاری ناناسێت، بەڵکو بەنەرێتی ئەوکاتەی دەسەڵات ئەو مافی میرابەتی هەبووە لە جیاتی بەدرخان و لەسەر ئەم داوایە لەکاتی هێرشی عوسمانی یەزدان شێرو باوکی لە گرتووخانەی بەدرخان پاشا گیرابوون و پەیوەندییان بەم مەسەلەیەوە نەبووە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: د. جەبار قادر، چەند بابەتێکی مێژووی کورد، سلێمانی 1999، ل89-97.

[122] - British Documents on Foreign Affairs, Ottoman Empire? 1860-1880, p. 260. October 17.17?.0

[123]-E.B. Soare, to Mesopotamia and Kurdistan. London. P.156.

گۆڕرسانی سالحیەی نزیك دیمەشق لە هەمان گۆڕستانی سەلاحەددینی ئەیوبی لێ نێژرابوو، لەوێ نێژرا[124] .

## پوختەی توێژینەوە

1- بزاڤی میر بەدرخان کاردانەوەی هەوڵەکانی دەسەلاتی ناوەندیی عوسمانیی بوو بۆ لەناوبردنی ویستی کورد لە بەردەوامبوونی بەڕێوەبردنی کاروباری نێوخۆیی و جولانەوەیەکی ناسیۆنالستیی نەبووە.

2- میر بەدرخان وەکو کەسایەتی ئیسلامیی ڕووناکبیر، ویستویەتی دەوڵەتێك دابمەزرێنێ شەریعەتی ئیسلامی تیا جێبەجێ بکرێت و زانایان (پسپۆڕانی بواری زانستی شەرعیی) لە ئاستی بەرپرسیارێتیدا بن.

شەڕی بەدرخان لەگەڵ ئاشووریی و میسیۆنەرانی ئەورووپیی هۆکاری سەرەکیی بوو بۆ لەناوبردنی ئەو دەوڵەتەی کورد، بەداخەوە هەمان ڕۆڵی خراپیان لە جولانەوەی سمکۆ و شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەدی بارزان، دووبارە کردەوە.

---

[124] سون، ل129 - Layered, Nineveh p. 188

## پاشکۆی بەڵگەنامەکان

FO 195\ 228

بۆ سەعادەتی باڵیۆزی بەریتانیای گەورە/ ئەستەنبوڵ

راپۆرتێك لەسەر سەردانەکەم بۆ لای بەدرخان لە بارەگاکەی لە جەزیرە

10ی تەمووزی 1844

لە دەمی رۆژئاوای (25)ی تەمووز بە رێگەیەکی گشتیی پۆستەدا شاری موسڵم بەجێهێشت، بە تەنیا بۆ گۆڕینی ئەسپ لە سمیڵ وەستاین کە (12) سەعات لە موسڵەوە دوورە، دوای (32) سەعات رێکردن، لە ئێوارەیەکدا گەیشتینە جەزیرە، رێگایەکە زۆر خۆش بوو، بۆیە بە کاتژمێرێك (4) میلمان دەبڕی، لە شوێنی پشوودان حەساینەوە، بەو هیوایە بووم بە رێگاوە و لە ماوەی مانەوەم لە جەزیرە سەرژمێریی ئەو گاورانە بکەم کە دیل کرابوون، لە ئێوارەی رۆژی دووەم شاری جەزیرەم بەجێهێشت، بۆ ماوەی یازدە کاتژمێر و نیو بە قەراغی رووباری دیجلە چووینە ناو هەرێمەکانی ناوەوە بە ئاراستەی رۆژهەڵات، بە بەردەوامیی رۆیشتین، بە دۆڵێکی نزمی پاڵ رووباری رەسوڵ سۆ، لێرەدا دۆڵەکە (40) پێ بەرزە و دوای پەڕینەوە لە رووبارەکە سەعاتێکی تر بە ئاراستەی رۆژهەڵات، لە دوای ئەو رێکردنەش لە ناکاو ئاراستەی دۆڵەکە بەرەو باکوور گۆڕا، لەوێ بە ناوەڕاستی دۆڵێکی بەرتەسکدا رۆیشتین، کە رۆخەکەی بەرزی (100) پێ دەبوو، ئەم ناوچەیە وەکو کلیلی ناوچەیەکی تر وابوو کە بەدرخان بەسەریدا دەڕوانێ، دەرفەتم بدە بە درێژیی لەسەر ئەو ناوچەیە بدوێم کە بە هۆی مانگەشەو دەمانبینی و لە کاتژمێر (10)ی شەو گەیشتین.

لە لای راستی دۆڵەکە دەتوانی قەسری بەدرخان ببینی، لەسەر لوتکەیەك بە بەرزی (50) پێ دروستکراوە، قەسرەکە بەسەر لای راستی دۆڵەکەدا دەڕوانێت، لای چاودێر وا بەدیار دەکەوێ هەردوو دۆڵەکە لە تەنگەبەری کۆتایی نێوان هەردوو چیایەکە یەکدەگرن، دەڵێن ئەو کۆشکە بە قەد (900 ـ1000) کەس فراوانە، خاوەن قەڵا (المتسلم: پایەیەکە بەرانبەر موتەسەڕیف کە مەبەستی لێرەدا بەدرخانە. دانەر) بە سەد چەکدارەوە لەو قەڵایە دادەنیشێت، لە دەروازەی لای باکوورییەوە دۆڵێکی بەردینی زۆر سەخت هەیە، مەحاڵە بەرەو ئەو دەروازەیە بچیت، ئەم قەسرە لە ئەسڵدا هی میر سەیفەدین بووە، بەڵام لە واقیعدا بەدەست بەدرخانەوەیە، قەڵایەکی قایم و

رووبەڕووبوونەوەیەکی گەورە بوو بەرانبەر هێزی موحەممەد ڕەشید پاشا کە هاتبوو بۆ کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی میرنشینەکانی کورد، موحەممەد ڕەشید پاشا دووجار هەوڵی دابوو بیەڕێتەوە بۆ قەسری بەدرخان، بەڵام بێئاکام بوو، زیانی زۆری پێگەیشت، بۆ جاری چوارەم هێزەکانی موحەممەد ڕەشید پاشا توانیان لەو تەنگەبەرە بپەڕنەوە، بەڵام لە دوای خوێنرشتنێکی زۆر، میر سەیفەدین ناچار هەڵات بۆ بەغدا و بەدرخان بەرەو چیاکانی دەورووبەری، لە کاتێکدا لە پشتەوە زنجیرەیەك چیای بەردینی قەراغ تیژ دەوری قەڵای داوە، خاڵێکی گرنگ هەیە ئەویش یەکێك لە ڕۆخە بەرزەکان پیاوانی بەدرخان پاسەوانیی لێدەگرن و بە هۆی بەردێکی گەورە بە ئاڕاستەی دۆڵەکە ڕێگەی پێ لە دوژمن دەگرن، لە لایەکی تری لێرەوارەکەوە بورجێك هەیە، لەسەر لوتکەی چیایەك کە پیاو دەتوانێ ناوچەیەکی بەرفراوانی جەزیرە و دەورووبەری ببینێت، بە هۆی ئەو بورجەوە میر بەدرخان چاودێریی دەورووبەری خۆی دەکرد، هەتا لە ڕێڕەوەکە دەردەچیت دۆڵەکە فراوانتر دەبێت و ڕێگەکە چاکتر دەبێت و هەندێ گردۆڵکە بە دیار دەکەوێت، دوایی بە ئاڕاستەی باکوور لار دەبێتەوە بەرەو (دێر غله)، شوێنی نیشتەجێبوونی زستانەی میر بەدرخان، قەسری میر لێرەیە، لە لای ڕاستی دۆڵەکە و ڕێگایەکە فراوان دەبێت بە نزیکەی (80) پێ و لێرەوە بە ئاڕاستەی گوند ڕۆیشتین.

وەکو دەڵێن (250) خێزان لە گوندی دێرغەل نیشتەجێن (190) لەوانە کورد و ئەوانی تر مەسیحی ئەرمەن و سریانن، کۆشکی میر بەلای ڕاستی ڕووبارەکەوەیە لە شوێنێکی بەرزە، نزیکەی (100) پێ دەبێت، کۆشکەکە لە بەرد دروستکراوە، دیمەنێکی جوانی هەیە، بەڵام کە دەچیە ناوەوە ئەو جوانییەی نامێنێ، کاتێ دەچیە ناو کۆشك مەیدانێك هەیە (80) پێ چوارگۆشەیی دەبێت و خاوێن نەبوو، لە هەر سێ لای قاتی سەر زەوی، خانی ئاژەڵی لێبووە، لە سەرووی ئەم خانانەش ژووری خزمەتکارەکان بوو، لەوێ ژوورێکی درێژ هەبوو بۆ سەر ڕووبارەکە درێژ دەبۆوە، ئەمە هۆڵی پێشوازیی میوان (سلام علیك) بوو، شوێنی حەرەم (جێگای خێزان و خزم و کەس)ی لە شوێنێکی بەرزی حەوشەی کۆشکەکەیە، دیوی ناوەوەی کۆشك بە بەرد و قوڕ درووست کراوە، بە جۆرێك بنیاتنراوە پاسەوانی میر بە چەکەوە بتوانێت لە کاتی هێرش بەرگریی بکات.

لەگەڵ ئەوەدا ڕێگای جەزیرە بەردەڵان و سەختە و مەحاڵ بووە عەرەبانەی بۆ بچێت، بە چەك بەرگریی لێدەكرێت، بەڵام بۆ بەرگریی چەكی قورس گونجاو نییە، لەگەڵ ئەوەدا شوێنێكی بەرز نییە بەسەر كۆشكدا بنوارێ.

كۆشكی میرسەیفەدینیش بە لای باكوور بە (100)؟[125] بە هەمان شێوەی كۆشكی بەدرخان درووست كراوە، هەر لەوێ سێ باڵەخانەی بەردی بۆ خزمەكانی میر دروست كراون، هەموو ماڵەكانی تریش هی گوندنشینەكانە، لە ناوچەكانی تری ژێر دەسەڵاتی میر بەدرخان سەرنجی گەشەسەندن و ئاسایش و بەختیاریی بە ڕووی لادێیەكانەوە دیارە، ئەمەش پێچەوانەی ئەو بارە ناڕێكە بەربڵاوەی موسڵە.

لە بەیانی ڕۆژی (24)ی مانگ، دێرغەلەم بەجێهێشت و بە ئاڕاستەی گوندە كشتوكاڵیەكانی ناوچە نزمەكانی قەراغ ڕووباری (ڕەسوڵ سۆ) ڕۆیشتم، لە چەند شوێنێك لە ڕووبار پەڕیمەوە، (9) سەعات لە ناوەڕاستی دارستانێكی چڕی دۆڵی چیا بەرزەكان بووین، بە ناچاریی ماوەیەك بەسەر پشتی ئەسپەكانمان دەماینەوە، لەگەڵ ئەوەدا ناوچەكە سەخت بوو توانیمان (15) میل ببڕین، ئەمەش ماوەی نێوان دێرغەلە و چیای (میرجانداگ)ە، لەوێ سەربازگەی میر بەدرخانمان لێ بە دیار كەوت.

سەربازگەی میر لە نزیكەی (100) ڕەشماڵ پێكهاتووە، بەسەر سێ گروپ دابەش كراوە، بەشی پێشەوەی بۆ خزمەتكار و ڕەعیەتەكانی میر و بەشی ناوەڕاستی بۆ شوێنی میر بەدرخان و میر سەیفەدین، بەشی پشتەوە شوێنی خێزان و خانەوادەی هەردوو میر بووە، لەم بەشە (10ـ 20) ڕەشماڵ هەیە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەرفراوانیی خانەوادەی هەردوو میر، لە ئەسپەكەم دابەزیم و چوومە ڕەشماڵە تایبەتیەكە، لەگەڵ گەیشتمە سەربازگە دیوان ئەفەندی نێردراوی بەدرخان هات و گوتی دەتوانیت لە سەعات (9)ی شەو چاوتان بە میر بكەوێ، لە كاتی دیاریكراو میر پێشوازیی لێكردم، لە ڕەشماڵێكی سپی بە قوماشی سوور داپۆشرا، پێشوازیی لێكردم كە بە قوماشی ئاوریشم درووستكراوی عوسمانیی رایەخ كرابوو، لە دەرگایەك چوومە ژوورەوە و میر بەدرخان و میر سەیفەدین لە دەرگایەكی ترەوە هاتنە ژوورەوە، میر بەدرخان پیاوێكی جوان و درێژی شەش پێ دەبوو، گوێیەكانی بەرچاو و سمێڵی كورتی

---

[125] - لە دەقی عەرەبییەكەی پێوانەیی ئەو ژمارەیە دیار نەنووسراوە. "وەرگێڕ".

هەبوو، بەڵام ریشی نەهێشتبۆوە، کەچی میر سەیفەدین کورتە باڵا و بە رووخساریدا گەنجێکی بیست ساڵان بوو، لە واقیعدا لەوە گەورەتر دەبینرا.

ئەوەی شایانی باسە پێش (10) ساڵ لە بەرانبەر هێرشەکەی رەشید پاشای سەدری ئەعزەم، سەرکردایەتی سوپای کردووە[126]. بەرگی هەردوو میر جوان و ئەوەی سەیری بکردایە دەوڵەمەندیی و دڵفراوانی ئەمارەتەکەی پێوە دیار بوو، میر بەدرخان پشتێنی گرانبەها و دەسکی خەنجەری گرانبەهای بە قەدەوە بوو، لە کاتی قسەکردنمان نزیکەی (100) پاسەوان لە دەرگای رەشماڵەکە وەستابوون.

گفتوگۆکانمان بە قسەی خۆش لەسەر بابەتە جیاجیاکان دوایی هات، بۆ رۆژی دوایی میر سەردانی کردم و هەر لەگەڵ دانیشت بە حەماسەتەوە باسی کریستانەکانم لەگەڵ کرد، لەسەر بابەتی ئەم رووداوە دڵتەزێنە بۆچوونی خۆی بەم شێوەیە بۆ باس کردم:

پێشتر مار شەمعۆن سەرۆکی روحی کریستانە ئاشوورییەکان ملکەچی دەسەڵاتی بۆتان بووە، لە کاروباری دونیایی تایفە هیچ رۆڵێکی نەبووە، ئەمە لە کاتێکدا کاروباری دونیایی بە دەست کۆمەڵە کەسانێکیانەوە بووە پێیان دەوتن پاشا (الملوك)، ئەوانە پەیوەندییان بە منەوە هەبووە. لە پێشتر ئەگەر ناکۆکیی بکەوتایە نێوان تایفەی سریان، یان سریان و هۆزە کوردیەکانی ملکەچی ئێمە، ئەوە بە رێگەی ئاشتیانە و بەبێ دەستێوەردانی کەس چارەسەر کراوە.

مەلیکەکانیان لەگەڵ نزیکەکەم، نوروڵڵا بەگ، هاوکاریی یەکتریان کردووە و لە نێوان ئەو و ئاشوورییەکان ناکۆکیی نەبووە، بەڵام لەم دوو ساڵەی دوایی مار شەمعۆن کەوتە دەستێوەردان لە کاروباری سیاسەت و بە هێزەوە کەوتە پیلانگێڕان دژی نوروڵڵا بەگ، وەکو ئێمە لێی تێدەگەین میسیۆنەری ئەمریکی میستەر گرانت هانی داوەو پارەی داوەتێ بۆ ئاشووب نانەوە، ئەمە لە کاتێکدا میسیۆنەری ناوبراو باڵەخانەیەکی گەورەی لە شوێنێکی بەرزی ئەشیتا نوێ کردۆتەوە، لەو ماوەیەدا لایەنگرانی مار شەمعۆن هاتنە ناوچەکەمان و دوو کەسیان لە هۆزە کوردییەکان کوشت، بە پێی نەریتی باوی ناوچەکە لە تۆڵەی خوێنی هەردوو کوردەکە، دوو تاوانبارە سریانییەکەمان گرت و کوشتمانەوە،

---

126 - بەو شێوەیە دەبێت میر سەیفەدین لە تەمەنی (10) ساڵان سەرکردایەتی سوپای کردبێت؟ ئەمەش رێی تێناچێت. "وەرگێڕ".

سریان له بەرانبەردا چوار کەسی تریان کوشت، شاڵاوێکی تۆڵەسەندنەوەمان بۆ سەر سریان دەست پێکرد و (8) سریان کوژران.

له کاتی رووداوەکان نورولڵا بەگی سەرۆکی ناوچەی هەکاری هاتە لام کە بۆ چاوترساندنی سریان یارمەتی بدەم کە سریان هێرشیان کردبووە سەر چەند گوندێکی جولەمێرگ و تالانیان کردبوو، بە پیر داواکەیەوە چووم و لە دوای ملکەچبوونی سریان سەردانی ناوچەکەم کرد، تیپێکی چەکدارم لە ژێر فەرماندەی زەینەڵ بەگ لە ناوچەکە بەجێهێشت، راستەوخۆ دوای گەڕانەوەی من، چەکدارەکانی سریان گەمارۆی تیپە کوردییەکەیان دابوو، ئاو و خواردنیان بۆ ماوەی (9) رۆژ لێبڕی بوون، لەگەڵ ئەوەدا زەینەڵ بەگ خۆی بەدەستەوەدا، بەڵام زۆربەی پیاوەکانی کوژران، دوایی ئاویان پێگەیشت، گەڕانەوە قەڵاو داوای لێکردم فریای کەوم، منیش هێزێکی (26) هەزار کەسیم بۆ شکاندنی گەمارۆ و چاوترساندنی سریان بۆ نارد.

دەبینین سریان دەستپێشخەری هۆکاری ئەو مەرگەساتە بوون، جەولەی یەکەم ئەو گرنگیەی نەبوو، چونکە هەردوولا بەقەدەر یەك زیانمان لێکەوت، جەولەی دووەم بە هۆی خیانەتی ئەوان لە زەینەڵ بەگ روویدا، ئەمجارەیان دەرفەتم دا بە هەندێك لە پیاوانی هۆزەکان کە سریان بکوژن و ئەو قەسابخانەیە روویدا، لەڕاستیدا لە توانامانداندا نەبوو جڵەوی تووڕەیی سوپا بگرین کە کەرامەت و مەزنیی ئەوان ئیهانە کراوە.

من دڵگرانم بەو هێرشەی بەبێ خواستی دەسەڵاتی ناوەند بۆ چاوترساندنی مەسیحیەکان ئەنجام دراوە، چاوەڕێ نەبووم وڵاتانی ئەورووپی لە بەرژەوەندیی ئەوان دەست لەو کارە وەربدەن، لەمێژە مل پێکەچکردنی مەیلی هەڵگەڕانەوەی مەسیحیەکان لە رووی یاساوە بەمن سپێردراوە، کاتێ بەدرخان قسەکانی تەواوکرد پێم وت: ئەو رووداوی شاڵاوبردنەی رابردوو بۆ سەر سریان بۆتە حاڵەتی دوودڵیی و نیگەرانیی لای ناوەندەکانی ئەورووپی، بەتایبەتی بەریتانیا، حکومەتی بەریتانی زۆر سوورە لەسەر گەڕانەوەی هەموو سریانەکان بۆ شوێنی خۆیان، پێم وت: "لێرەدا هەنگاوی یەکەم بە پێویست دەزانم، ئەویش ئازادکردنی هەموو گیراوەکانی سریانە"، لەوڵامدا بەدرخان پاشا وتی: "هەموو ئەو دیلانەی لامان بوون کامیل پاشا لەگەڵ خۆی بردن". پێم وت: "ئەمە راست نییە، بەپێی سەرچاوەکانمان هیچ گومان نییە هەتا ئێستاش هەندێ دیل

له جەزیرەن"، بەدرخان وتی: "ئەو دیلانە ماون و بوونە مسولْمان"، ئەمەم قبولْ نەکرد و وتم: "زۆربەیان نامەیان بۆ ئێمە نووسیوە و داوایان کردووە هاوکارییان بکەین و لە دیلیی رزگاریان بکەین، ئەگەر بوونەتە موسڵمان بۆچی نامە بۆ ئێمە دەنووسن و داوا دەکەن لە بەرژەوەندیی ئەوان بێینە پێشەوە، ئەگەر نەبووبنە موسڵمان بە حوکمی ئایین و یاسا بە مسولْمانی راست ناژمێردرێن".

لە دوای گفتوگۆیەکی بە سوود، گەیشتینە ئەو رێکەوتنەی من رێگەم پێبدرێت ئەو دیلە سریانانەی بوونەتە مسولْمان ببینم و سەعاتێك لە لایان بمێنمەوە، ئەگەر هەتا ئێستا باوەڕی بە نەسرانی هەیە لەگەڵ خۆم بیبەمەوە، ئەگەر باوەڕی بە ئیسلام هەیە ئارەزووی خۆیەتی وازی لێبهێنم. وتم: ئەوەی من هەتا ئێستا ئاگادارم (9 ـ10) دیلی سریان لە لای تۆ و میر سەیفەدین هەیە. وتی: بەڵام ئێستا ئەو دیلانە بوونەتە مسولْمان و رێگە نادەم بیانگری، دوایی بە پێکەنینەوە وتی: (بۆیە ئێستا سووربوونی تۆ لەسەر ئەو داواکاریانە هیچ سوودی نییە، بەڵام لە ئاییندە لە حاڵەتی بەدواداچوون دەگەینە ئاکامی باش)، بڕیارمدا ئەو بابەتە وازلێبهێنم و بچمە سەر بابەتی تالآنی.

وتم: هیچ گومانم نییە میر بەدرخان قەرەبووی زیانەکانی سریان دەکاتەوە هەتا سەر لەنوێ دەست بکەنەوە بە ژیانی تازە، پرسیاری کرد چی قەرەبووکردنەوەیەکتان لە نەزەر گرتووە؟. وەڵامم دایەوە: سریان (180) هەزار سەر مەڕ و ملیۆنێك بیاسترە (دراوێکی عوسمانییە)یان دەوێ، لە وەڵامدا میر وتی: ژمارەیەکی زۆر مەڕ تالآن کراوە، بەڵام ناگاتە ئەو ژمارەی باسی دەکەن، ناگونجێ حەیاری (هۆزێکی سریانییە) ئەو هەموو مەڕانەیان هەبووبێت، بەڵام هەر چۆنێك بێت ئەو مەڕە تالآنکراوانە ئەو سەربازانە خواردوویانە کە لە ماوەی حەوت مانگ لە وڵاتی سریان ماونەتەوە و هیچی تریان نەبووە بیخۆن و پێی بژین، ئەمە هەڵوێستێك نییە مەسیحیەکان داوای قەرەبوو بکەنەوە.

لە بابەت ماڵە دزراوەکانەوە ئاماژەی میر ئەمە بوو: "مار شەمعۆن پیاوی ئاینییە و چۆن رێگە بە خۆی دەدات موبالەغە و زیادەڕۆیی لەسەر ماڵە تالآنکراوەکە بلێ، هەموو ئەو ماڵەی دۆزراوەتەوە لە دوو گۆزەدا لە ماڵی مەلیك ئیسماعیل شاردرابۆوە، میر سەیفەدین بەسەر چەکدارەکانی دابەشی کردووە، هەروەها بەشێکی زێڕ و زیوی دزراوی کەنیسەیان گەڕاندەوە بۆ قەشە لە (دێز)، نزیکەی (1000) چەکداریان بە تفەنگ و

ئەسپسواریەوە ناردبوو لەگەڵ گەڕاندنەوەی زێڕ و زیوە دزراوەکە، میر وتی: (320) دیلیان گرتبوو، ئەوانەی توانیبوویان بگەڕێنەوە بە خێرایی گەڕاندیانەوە بۆ (دیز)، میر بەدرخان لە لێدوانێکیدا دەیوت مەسیحیەکان دووبارە دەتوانن بەهێز ببنەوە، هەروەکو من هێزی بۆتانم لە دوای لێدانە کاولکارییەکەی کە تووشمان بوو بەدەست موحەممەد رەشید پاشاوە، دووبارە گەڕاندەوە. میر دەیوت: هۆزە شاخاویەکان لە دوای تێکشکان، توانای باشیان هەیە بۆ بووژانەوە.

هەروەها گلەییم لە هەڵسوکەوتی زەینەڵ بەگ کرد، لەو ماوەی لە (ئەشیتا) سەرکردایەتی سوپای کوردی کردووە و دەستیان گرتووە بەسەر زەوی سریانەکان، سەبارەت بە هەڵسوکەوتی زەینەڵ بەگیش رێککەوتین لەگەڵ میر بەدرخان کە هەڵە بووە و وتی: لەسەر ئەمەش لە بەرپرسیاریەتی دەرکراوە، بەڵام باوەڕیشی وابووە زیادەڕۆیی لەو بارەیەوە وتراوە. هەروەها رەتی کردەوە کورد دەستی بەسەر زەوی سریاندا گرتبێت، وتی: قورس نییە سەبارەت بە من سەردانی ناوچە شاخاویەکان بکەم و لەسەر ئەرزی واقیع راستیەکان ببینم، میر بەدرخان نکۆڵی ئەوەی کرد زەوی سریان لە لایەن کوردەوە دەستی بەسەردا گیرابێت. لە درێژەی قسەکانیدا وتی: "مار شەمعۆن هاوپەیمانێکی بەهێز "مەبەست لە بەریتانیایە. نووسەر" لە پاڵ خۆیدا دەبینێ، بۆیە بڕوام وایە لە میانەی ئەمەدا رووداوەکان گەورە دەکات". هەروەها دەیوت: "بۆ نموونە مار شەمعۆن ژمارەی کوژراوەکان دەگەیێنێتە (4- 5) هەزار کەس، لەڕاستیدا ژمارەی کوژراوەکان لە (2) هەزار کوژراو تێناپەڕێت". بە میرم وت: مەبەستم لەم سەردانە ئەوە بووە ناوبژیوانی تۆ و مار شەمعۆن بکەم، میر لەمەدا ئامادەیی خۆی دەربڕی، هەندێ دیاری بۆ مار شەمعۆن بنێرێ هەتا دڵی رابکێشێت.. میر بەدرخان بە جددیی دڵنیایدا مەبەستی نییە تەنگ بە سریان هەڵبچنێت و لە ئاییندەش بە یەك چەکداریش بێت پشتگیریی میری هەکاریی ناکات لە دژی سریان، هەوڵمدا بزانم میر هەستی بەوە کردووە میری هەکاری مەبەستی هێرشی هەیە بۆ سەر سریان، لە وەڵامدا وتی: ئەگەری ئەوە هەیە هەستی لەو شێوەی هەبووبێت، بەڵام ئێستا هەستی لەو شێوەی نییە، هەروەها ئاماژەی دا: "لەو کاتەی سریان دەگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان ئەو و کامیل بەگ ناوبژیوانی راستەقینە لە نێوان ئەوان و میر نورولڵای هەکاریدا دەکەن، ئەو ناوبژیوانییەش دەروازەی باڵا بنیات دەنێت کە زەحمەتە بۆ کەس لێی لابدات".

هەروەها ئەو گلەییانەم بۆ میر بەدرخان باس کرد کە لە ماوەی مانەوەم لە جەزیرە لە مەسیحیەکانم گوێ لێبووە، وەکو گلەیی لەسەر ئەو ئیهانە بەردەوامانەی تووشی مەسیحیەکان دەبێت، کە موسڵمانەکان لە کاتی خواپەرستیی بەرد دەگرنە کەنیسە و شوێنی خواپەرستیی و نوێژکردنی ئەوان، هەندێ جار بۆ ماوەی چەند مانگ ناتوانن دەرگای کەنیسەکان بکەنەوە لە ترسی تەنگ پێهەڵچنینی بەردەوامی موسڵمانەکان، بەدرخان نکۆڵی کرد کە ئاگای لەو کارانە بێت، بەڵێنی دا لە ئاییندە لە بەرانبەریان دا ڕێوشوێنی گونجاو بگرێتە بەر.

ئەو پیاوەی یاوەرم بوو نامەیەکی لە حکومەتی موسڵەوە بۆ بەدرخان هێنابوو، ئاماژەم بە کوشتنی ئەو ڕاهیبە سریانییەی تورعابدین دا لەگەڵ هەڵوێستی میر بەدرخان لەو بارەیەوە کە دەوڵەتانی ئەورووپی نیگەران کردووە. میر وتی: "بۆ یەکەم جار لە دیاربەکر گوێم لەو تاوانە بووە"، هەروەها ئاماژەی دا: "ئەگەر شاری میدیاد لە ژێر دەسەڵاتی ئەو بمابایەوە حوکمی دادگەریی جێبەجێ دەکرد دژی پیاوکوژ". بەدرخان وتی: "پیاوکوژ لەم حاڵەتەدا سریانییە و پێشتر سەرۆکی دونیایی سریان بووە، ئەو پیاوە لە جیاتی خزمێکی پیاوکوژ بە ناوی سەلاح کوژراوە، چونکە سەلاح ناکۆکیی هەبووە لەگەڵ ڕاهیبی کوژراو، بە هۆی ئەم ناکۆکییە سەلاح دەنێرن بۆ گرتووخانەی دیاربەکر و لەوێ دەمرێ، خزمەکانی سەلاح تۆڵە لەو ڕاهیبە دەکەنەوە و دەیکوژن"، بەڵام لە سەرچاوەی تر گوێم لێ بووە میر بەدرخان پیلانی کوشتنی ئەو ڕاهیبەی داناوە، چونکە ئەو ڕاهیبە ویستوویەتی بچێت بۆ دیاربەکر و ڕاپۆرتێك بدات لەسەر قەبارەی ئەو سامانەی میر لە خەڵکی میدیادی تاڵان کردووە، وەکو بڵێی ئەو گەشتەی نەخشە بۆ کێشراو بووە بە بۆنەی دەرچوونی میدیاد لە دەسەڵاتی بەدرخان، ئەم گومانەش بایەخێکی زۆری هەیە، چونکە میر بەدرخان زۆر بایەخی بە ئارامیی و ئاسایشی ئەو ناوچانەی ژێر دەسەڵاتی خۆی دەدا.

میر بەدرخان سکاڵای لای من دەکرد لەو دەسەڵاتەی کاتی جوڵانەوەی میدیادی پێیدرابوو، بەڵام ئێستا لێی بێبەش بووە. چەندین پیاوی لەو پێناوە داناوە، لە کاتێکدا بەم دواییە دەسەڵاتی بەسەر سەعرەت و مەرزانیشەوە نەمابوو، بەدرخان بڕوای وابوو کامیل ئەفەندی پیاوێکی ژیر و کارزانە، لە پشت هەموو ئەو زیانەوەیە پێی کەوتووە،

دەیوت: "پێشتر کامیل ئەفەندی بەڵێنی پێدابووم یارمەتیم بدات بۆ ئەوەی ببمە پیاوێکی گەورەی دەوڵەتی عوسمانیی، بەڵام لە جیاتی وەفادارییی بە بەڵێنی، خۆی بە هەموو رێگەیەك هەوڵی داوە لە دەسەڵاتم کەم بکاتەوە". هەروەها دەیوت: "ئێستا بەتەنیا بوومەتە میری بۆتان"، بەڵام قانیع و کامەرانە بەوەی هەیەتی ئەگەر حکومەت بەهای ئەو خزمەتگوزارییانە بزانێت کە پێشکەشی کردووە، پێش ئەوەی ئیدارەی کودستان ملکەچی حوکمی ئەو بێت ئیدارەیەکی زۆر خراپ بوو، بەڵام ئێستا پیاو دەتوانێت بەوپەڕی ئەمان و متمانەوە سەفەر بکات، کیسەیەکی زێڕی بەدەستەوە بێت جگە لە خوا لە کەس نەترسێت.

دەیوت: من پابەندم بە ئارەزووی پاشایانی بەغداو ئەرزرۆم و دیاربەکر، ئەگەر لە یەکیان نزیکببمەوە و دوژمنکاریی ئەوانی ترم بۆ پەیدا دەبێت، دەڵێن من هەڵگەڕاوەم، چونکە قبوڵم نەکرد بچمە سەردانی موحەممەد پاشای والی موسڵی پیاوخراپ، کە رۆڵی زۆر گەورەی هەبووە لە ناشیرنکردنی کەسایەتیی من لای سوڵتان، ئەگەر بەراوردی بارودۆخی خەڵکی میرنشینەکەی من بکەیت لەگەڵ دانیشتوانی ژێر دەسەڵاتی پاشایەکانی تر لە موسڵ و دیاربەکر، دەزانی کێ خزمەتکاری راستەقینەی سوڵتانە، من، یان ئەو پاشایانە؟!

ئەوەم بۆ میر سەلماند کە بە کردەوە ئارامیی و ئاسایش لە ئەمارەتەکەیدا هەیە، ئەمەش شەرەفێکی گەورەیە، بارودۆخی ئەمارەتەکەی بە بەراورد لەگەڵ ئەوانی تر زۆر باشە و هەموو گەشتیارێك هەست بەمە دەکات.

سەرەڕای ئەوە بەدرخان دەیوت: "پێشتر وەکو باجی ئەمارەتی بۆتان تەنیا (400) قورشی داوە بە والی دیاربەکر، دوای لکاندنی بە ویلایەتی موسڵ، موحەممەد پاشا یەکەم جار زیادی کرد بۆ (500) قورش و ئینجا بۆ (1000) قورش‌و دوایی بوو بە (1400) قورش، ئێستا (1000) قورش وەکو باج دەدەم بە والی موسڵ، من ئێستا باجی (7٪) لەسەر بەهای داهاتی ساڵانە فەرز دەکەم، بە زۆری بەشی ئەو باجە ناکات کە دەیدەم بە پاشای موسڵ. ئەمساڵ داهاتی کشتوکاڵ بە هۆی بەڵای کوللە زیانی زۆری لێکەوتووە، ئەمەش رێژەی بەهای ئەو باجەی لە بۆتان وەردەگیرێ دابەزیوە بۆ سێیەك، لەگەڵ ئەوەدا تاوانیان بۆ هەڵبەستم کە خەڵکی لە ژێر دەسەڵاتی ناوچەی پاشایانی ترەوە هاندەدەم بێن لە بۆتان نیشتەجێ بن، ئایا ئەمە تاوانێکی خراپە؟".

شەریف پاشا فەرمانی پێکردم بە گەڕاندنەوەی (200) خێزانی خەڵکی زاخۆ، ئەوانەی بەر لە (3)، یان (4) مانگ لە زوڵمی موحەممەد پاشا هەڵاتبوون و لای من نیشتەجێ بوون، داوایان لێکرا بگەڕێنەوە موسڵ، بەڵام لەگەڵ گەڕانەوەیان سەرلەنوێ بڕیاریاندا بگەڕێنەوە، چونکە شەریف پاشا داوای کردبوون باجی ئەو چوار ساڵە بدەن کە لە بۆتان لای من بوون، ئایا ئەوە مەسەلەیەکی نامۆ، یان چاوەڕوانکراو بوو؟ تاوانی من لە هەموو ئەم کارانەدا چیە؟ دڵنیام حکومەت هەموو ئەم راستیانە نازانێت، بەڵام رۆژێك دێ دەیزانێت و ئەوکات هەڵوێستیان لە بەرانبەر مندا دەبێت.

لە سەرەتای قسەکانمان بەدرخان بەگ وتی کە نازانم بە تورکی قسە بکەم، لەگەڵ من بە رێگەی وەرگێڕەکەی قسەی دەکرد، بەڵام لە دوای ئەوەی چووینە ناو بابەتەکانەوە بە هەڵچوونەوە لەگەڵ بابەتەکان رێکدەکەوت و دەستی کرد بە قسەکردن بە تورکیی و پێویستمان بە وەرگێڕ نەما، هەر لە بنەڕەتەوە وا باش نەبوو.

وا دەردەکەوت کە بەدرخان دڵنیا نەبووە لە هەڵوێستی حکومەتی عوسمانیی لە بەرانبەر خۆی، باوەڕم وایە ئەگەر حکومەتی عوسمانیی هەندێك فشاری بخستایە سەر میر بەدرخان ناچار دەبوو قەرەبووی بۆ سریانی بکردایەوە، بۆ نموونە ناچار بوو ئەو چوار دیلە ئازاد بکات کە بە بیانووی موسڵمان بوون هێشتبوونییەوە، قبوڵکردنی لە دەستدانی دەسەڵاتی میر بەدرخان لە میدیاد و هیزان لەگەڵ ئەوەدا خەڵکی ئەو دوو ناوچەیە پشتگیرییان دەکرد و ئامادەی بەرگریی بوون لە بەرانبەر هێزەکانی دەسەڵاتی ناوەند، بەڵگە بووە لەسەر ئەوەی میر بەدرخان سوورنەبووە بە هێز رووبەڕووی دەسەڵاتی ناوەند ببێتەوە، هیچ گومانی تێدا نییە بەدرخان پیاوێکی خاوەن خۆزگە بووە و مەبەستی بووە دەسەڵاتی ئێستای خۆی بەسەر سەرۆکە کوردەکاندا بپارێزێ، بەڵام هەموو تکای ئەو ئێستا ئەوەیە بەرپرسان لە دەسەڵاتی ناوەند هەندێ حیسابی بۆ بکەن.

ئەوەی پەیوەستە بە کاروباری ئەورووپی، بەدرخان بە تەواوی لێی بێئاگا بوو، بۆ نموونە پرسیاری لێکردم دەوڵەتی بەریتانیاو فەڕەنسا کامیان بەهێزترە؟ کامیان پەیوەندیی دۆستایەتی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیی بەهێزە؟ بەدرخان سەرکردایەتی سوپای کوردی کردبوو لە شەڕی نزیب دژی ئیبراهیم پاشا کوڕی موحەممەد عەلی پاشا،

که به ئاکامی خراپ بەسەر دەوڵەتی عوسمانییدا شکایەوە، بە ئەمە زۆر کەوتبووە ژێر کاریگەریی موحەممەد عەلی پاشا، چاك ئاگاداری هێزەکانی بەریتانی بوو کە هێزەکانی موحەممەد عەلی پاشایان لە سووریا شکاند. بۆیە میر بەدرخان بە چاوی رێز و سەرسوڕمانەوە دەیڕوانییە بەریتانیا، پێیوابوو دەستێوەردانی حکومەتی بەریتانیی لە بەرژەوەندیی ئەرمەن، خەسارەتێکی سیاسییی گەورەیە.

پێموایە ناتوانین لە ئاییندە متمانە بە بەڵێنی بەدرخان بکەین کە سریانەکان تووشی زیان نەکات، بەڵام دەبێت سریان لای خۆیەوە وریا و لێزان بێت و کاری هەراسانی وا نەکەن هەستی ئایینیی لای موسڵمانانی کورد بورووژێنێ.

ماوەی رۆژێك من لە سەربازگەکەی بەدرخان بووم، تێبینیم کرد چەندین گرووپی چەکدار گەیشتنە سەربازگەکە، پرسیارم لە لایەنگرانی بەدرخان کرد، پێم بڵێن ئەوانە چین؟ وتیان ئەو هێزانە لە بنەڕەتەوە هی سەربازگەن، بەڵام لە مۆڵەت دەگەڕێنەوە، دواتر بۆم دەرکەوت لەو کاتەی من لەوێ بووم میر ئەو سیناریۆیەی لە سەربازگەکەی رێکخستووە، هەتا من بە بەهێزیی ئەو ئاگادار بم، ئەو دیاردانە بە دڵنیایی رامانێکی لە لا درووستکردم، بەڵام بەو ئەندازەیە نەبوو، دیاردەی رووخسار و سەرسووڕمانم لە لا درووست بکات. لە لایەکی سەربازگەکەوە (300) چەکدار بە بەرگی وەکو یەك وەستا بوون، بەرگەکەیان بریتی بوو لە پەردە قوماشێکی داکەوتوو و شەرواڵێکی سوور و کراسێکی بەئەنگوچکەوە.

لە لایەکی ترەوە دەتوانی هێزێکی سەربازیی بەڕێز یەکسان لە ژمارەدا ببینێت، بەڵام ئەمانە شەرواڵی شینی موشەکەلیان لەبەردابوو، هەموویان دەست لەسەر خەنجەر وەستاون و بە دەسکی خەنجەرەکەیەوە تەسبیحی تایبەتیان بۆ وێردەکان تێئاڵاندبوو، چونکە زۆربەی سوپای بەدرخان لەو ئیسلامیە دەمارگیریانەی سەر بە رێڕەوی شافعین، بە بۆچوونی شافیعی شوێنکەوتووی مەزهەبە ئیسلامیەکانی تر بڕوادارتر نین و لە کافر و موشریکەکانن، ئەگەر ویستی شوێن مەزهەبەکانی تر بکەوێ دەبێت قبوڵی فەلاقەی توند بکات، ئەمەش بۆ پاککردنەوەی لە تاوان[127].

[127] - ئەمە بە تەنها هەستێکە و زیاتر هەڵقوڵاوی خەیاڵە. نووسەر

له ڕۆژی 1844/6/30ز بە بەدرخان پاشا گەیشتم و بە جددیی بەڵێنی پێدام دەرفەت بە هیچ کەس نادات لە بۆتان و هەکاری و ئەو کەنیسانەی کەوتوونەتە جەزیرە، ئازاری گاورەکان بدات، هەروەها بەڵێنی دا لە هەر شوێنێك دیلەکانی دیتەوە بۆم بنێرێ، داوای لێکردم پێش ئەوەی دەوڵەتی عوسمانیی بەجێبهێڵم جارێکی تر سەردانی بکەمەوە، دوای ئەوەی من داوام لێکرد مۆڵەتم بدات سەربازگەکەی بەجێبهێڵم، پێش ئەوەی لە سەربازگەکە دەرچم گەڕامەوە رەشماڵە تایبەتییەکەم، هەر کە گەیشتم پیاوێك لێم هاتە ژوورەوە و (10) هەزار قورشی خستە نزیك پێم و رایگەیاند ئەوە دیاریی میرە، کیسە پڕ لە پارەکەم دایەوە پیاوەکە، وای زانی لەبەر کەمیی وەریناگرم، فەرمانیدا زیادی کرد بۆ (15) هەزار قورش[128]، دوایی بە دیوان ئەفەندیم وت: تکا دەکەم بۆ بەدرخانی روون بکەوە، سروشتی کارەکەم قبوڵکردنی دیاریی لەو جۆرەم بە توندی لێ قەدەغە دەکات، بە هیوام بە ئیهانەی تێنەگات. دیوانە ئەفەندی چوو لەگەڵ میر بەدرخان قسە بکات، هات و گەڕایەوە و عوزری هێنایەوە و پارەکەی خستەوە بەردەمم، وتی: میر قبوڵی ناکات و ئەمە نەریتی ناوچەکەیە، چونکە هەموو ئەو بەرپرسانەی ئەستەنبوڵ سەردانی ئێرە دەکەن ئەم جۆرە دیارییانەی بە منی داوە، ئەوانیش قبوڵیان کردووە. لە کاتەی هێشتا لە سەربازگەکە بووم میر بەدرخان ئەسپێکی کوردیی پێشکەش کردم، قبوڵم کرد بەو هیوایەی بیفرۆشم و تەرخانی بکەم بۆ خەرجیی هەندێ دیاریی کە کڕیبووم بۆ بەدرخان و خانەوادەکەی، چونکە ئەمە لە نەریتی ناوچەکە بوو.

بە هەمان رێگا گەڕامەوە جەزیرە، لەوێ لە سەرچاوە سریانییەکانەوە زانیم هەتا ئێستاش (29) پیاو و ژنی سریانی دیلن، داوام لە بەرپرسی حکومەتی عوسمانیی کرد ئەو دیلانەم بۆ بێنێت، دوای ماوەیەك هێنای، دیلەکانم لە (25) ماڵی جیاجیا دانان، یەکیان لە ماڵی ئیسماعیل پاشای ئامێدی، دوو لە ماڵی بەرپرسە عوسمانییەکە، دوو لە

128 - نامەوێ بەگشتی سەرنج لەسەر بەڵگەنامەکان دەربڕم، ئەم کارە بەشایستەی دکتۆر عوسمانی دەزانم بەڵام لێرەدا تێبینی زەق هەیە، میر بەدرخان وەکو بەدیاری دەخا نیگەرانە بە1000قروشی باجی ساڵانەی ئەمارەتەکەی بۆ لایەتی موسڵ کەچی ئەو دیاریەی بۆ ئەم میوانەی داناوە 15هەزار قروشە کە دەکاتە باجی پانزدە ساڵ، ئەمە ئەگەر لەوەرگێڕانی یەکەمی دەقی بەڵگەنامەکە بۆعەرەبی هەڵەی چاپ نەبێت زۆر جێی سەرنجە. "وەرگێر".

ماڵی قازی و ئەوانی ترمان بەسەر ماڵی مەلایەکاندا دابەش کردن، هەر یەك بۆ ماڵی مەلایەك، بەو شێوە دیلەکان لە ماڵی (25) لە پیاوماقوڵانی شار دانران، دوو لە دیلەکان منداڵ بوون، وتیان بوونەتە موسڵمان، بڕیارمدا شایەدیەکەیان لێوەربگرم و وازیان لێبهێنم، بە بەرپرسە عوسمانییەکەم وت: بایەخی پێبدە دەگونجێت لە ئاییندە داوای گەڕانەوە بکەن، (27) ئەسیری ژن و کوڕ و کچ هەبوون، وتیان ئەوانە نەسرانیین و تەسلیم بە من کرانەوە، منیش بە جیاو بە بەدوو تەوافەی لە پێست درووستکراو بە کەڵەك و سەوڵان بە ئاوی دیجلەدا جەزیرەمان بەجێهێشت و بەرەو موسڵ گەڕاینەوە، لە چواری تەمووز گەیشتینەوە شار.

ا ر. دبلیو. ستێڤن

یاریدەری قونسوڵی لە موسڵ

## بەڵگەنامە

Irade Muhimme 1266

24/مارس/ 1847

## گەورەم عەتوفە

بۆ قسەکردن لەسەر ئەو دوو نامەیەی لە پاشای والی ئەرزڕۆمەوە لەسەر بارودۆخی (وان) و نامەی پاشای والی دیاربەکر لەسەر بەدرخان بەگ گەیشتبوون، ئەنجومەنی راسپێردراوی تایبەت لە رۆژی پێنجشەممە کۆبۆوە، لە نامەکەی والی ئەرزڕۆم بەو شێوەیە هاتووە کە پێشتر هەواڵی داوە بە گەیشتنی فەرمانی بالاّ هەتا خەڵکیی لاپەڕەیەکی تازە لەگەڵ شەریف ئاغا هەڵبدەنەوە، ئەو لە پیاوماقوڵانی (وان) بووە، کە گەیشتۆتە (وان) بە دروستیی لەگەڵ خان مەحمود دواوە، بەڵام دوایی دەرکەوتووە کە مەحمودخان سوێند و پەیمانی لەگەڵ بەدرخان هەیە لە فەرمانی دەرنەچێت، رووخسەتی وەرگرتووە چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکات، ئەمە بێجگە لە تەیمور زادە، خەڵکیی سوپاسگوزارییان راگەیاندووە بۆی کە لێبوردنی بالاّی بۆ دەرچووە، پێیان وتووە بە دوای ناوبراو نەکەویٚ، مەحمودخان بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ شەریف ئاغا دابنیٚ، ژمارەیەك کورد و سوارە و پیادەی ناردۆتە سەر ماڵەکەی و ناچاری هەڵاتنی کردووە بۆ ئەرزڕۆم، دوێنی برایەکەی مەحمودخان لەگەڵ ژمارەیەك یاخی ناردووە بۆ ناحیەی

ئەخلات رەشید بەگ کە لە نزیکەکانی شەریف ئاغا بووە دەریان پەڕاندووە، هەروەها هەڕەشەی کردووە بە هێرشکردنە سەر بەدلیس، بۆ ئەوەی سنووریکیان بۆ دابنێ، موحەممەد بەگی قائمقام بە سەربازی نیزامیەوە لە قەزای ناوبراو، بە شەش تیپی سەربازی نیزامی سوڵتانی و تۆپێك بەرەو گوندی ناوبراو رۆیشتوون، هەزار کەس لەو کوردانە کە توانای بەرگرییان نەبووە هەڵاتوون، بۆ ئەوەی سەربازە نیزامیەکانی سوڵتان کە لە لای (موش) کۆبوونەتەوە بۆ ئەو مەبەستە دەرچن، دووجار سێ تیپیان ناردووە، ئاگادار کراونەتەوە خۆدووربگرن لە هێرشبردن بۆ سەر خان مەحمود و دەوروبەری (وان)، سەرتیپ ئەحمەد پاشای فەرماندەی سەربازەکانی سوڵتان وای دەبینێ ئەوەی خان مەحمود ئەنجامی داوە لە کاری خەراپەکاریی و ئاژاوەگێڕیی، لە پاڵ ئەو هەموو هێزە سەربازییە، خان مەحمود ناتوانێ لە بەرانبەر سوپا بەرگریی بکات، هیچ ڕێگەیەکی لەبەردەم دا نییە، بێجگە لە هەڵاتن و پەنابردنە بەر قەڵایەکەی، بۆ ئەوەی گروپەکەی پەرت و بڵاوبکرێت و ئارامیی و ئۆقرەیی دابین بێت، دەبێ تیپی ناوبراو بەرەو موش ببزوێ، لەگەڵ ئەوەدا لەسەر ئەو مەسەلەیە نووسراو چووە بۆ دەوڵەتی پاشا موشیری سوپای هەمایونی هەتا دەرفەت بدات لەو رووەوە کارێك بکرێت، بەڵام وەڵامەکەی وەکو راسپاردە داوەتەوە، ئەو هەڵسوکەوتەی شەریف ئاغای ناوبراو لە خراپیی باری ئۆقرەیی هێناویەتی گرنگە و دەبێت نیزام لەوێ فەرز بکرێ، بەڵام بڕیار دراوە ئەو کارە دواخراوە بۆ دوای بەدەستهێنانی ئەوەی بۆ مەسەلەی بەدرخان پێویستە، ئەوەی لە گفتوگۆکانی پێشوو و ئیرادەی سونی پەیوەست بەو کارە هەیە، لە ناردنی سەربازی نیزامی سوڵتانیی پێویست بۆ گوندی ناوبراو بۆ پاراستنی وڵات، ئەگەر هەندێ لە یاخیبوان لە ڕێگەی راست لایانداوە ئەوە وەکو لەبەرچاوی پیاوماقوڵان بەدیار دەکەوێ بە توانای خوای گەورە و حەزرەتی مەولامان سوڵتان ئاشکرایە چارەنووسیان خەسارەتمەندییە، بەڵام سەبارەت بە بابەتی ئەرکی ئەو تیپەی ئاماژەمان پێدا کە لە لای (موش) دانراوە بۆ چاوترساندن و پەشیمانکردنەوەی خان مەحمود، ئەو فەرماندە رێنومایيكاری سوپای هەمایونی، دەسەڵاتی تەواوی بەسەر چالاكییە سەربازییەکانەوە هەیە، هەر دەستێوەردانێك لەو بارەیەوە ئەرکەکە پەرتو بڵاودەکاتەوە، چونکە ئەو چالاکیە سەربازییانە لە لای وان تیپی ناوبراو پێی هەڵدەستێ، بەپێی زانیاری سەربازیی و توانستی رێنومایيكاری ناوبراوە، ئەنجومەن بە گونجاوی دەبینی بە بیرۆکە و

بۆچوونەکانی والی ئاگادار بکرێتەوە کە ئاماژەمان پێدا، هەروەها وێنەیەکی لە نامەی هاتوو بۆ دەربهێنی هەتاوەکو ئەوەی پێویستە هەڵسوکەوت بکات، لەو روانگەیەشەوە نووسراوێك بۆ والی بکرێت، لەگەڵ نامەی والی وەرەقەیەکیش لە شێخانی خالیدی بنووسرێ ئامۆژگاریی تێدا بێت کە بەدرخان بەگ زۆر بڕوای پێی هەیە، ئەگەر لە وەڵامدا میری ناوبراو و لایەنگرانی داوای لێبوردن نەکەن، ئەوە خەڵکی لێیان دووردەکەوێتەوە، هەتا ئەگەر قسەشیان بڕوا، بەپێی ئەوەی سەرەوە و هەواڵی هەواڵگریی بەڵگە هەیە کە تیپێك لە لای ناوبراو و لایەنگرانیدا خۆیان شاردۆتەوە، ئەوەش هەراسانیی لای سەرفراز و بەختەوەر مەولامان سوڵتان، درووست کردووە.

لەسەر ئەوەی خستمانەڕوو، ئەنجومەن بە باشی دەبینێ دووبارە نووسراوی بۆ بنێردرێ، داوای لێبکرێ بە پیر لێبووردنی سوڵتانەوە بێ، نوسخەی ئەو نامەیەش بۆ سوڵتان بەرز بکرێتەوە، لە دوای ئەوە نامەیەك لە عەتوفە والی بەغداوە هاتووە، لەو نامەیەدا دەڵێ کوردەکان لە ڕووی مەعنەویەوە یەکیانگرتووە، دەوروبەری بەغدا پڕە لە کورد، ئەگەر ئەو کوردانە ببزوون، ئەوە لە ماوەی چالاکی سەربازیی دژی میری ناوبراو، ناردنی هێزێکی نیزامی بەسە بۆ دەوروبەری هەولێر هەتا لە ژێر کۆنترۆڵی زەبردا بمێننەوە.

ئەنجومەن ئەو سەرنجانە تەماشا دەکات کە لە نامەکەدا هاتووە و دەڵێ لە پاڵ خۆبەگەورە زانین و بێئەمەکیی بۆ سەڵتەنەت، لە پشت ئاریشەی ناوبراوەوە هۆکار هەیە، بەڵام بۆ ئەوەی لایەنی پەیوەندییدار تەماشای بکەن، نوسخەیەکی ئەو نامەیەمان بۆ ناردن، لەگەڵ نوسخەیەك بۆ موشیری سوپای هەمایونی، هەروەها وەڵامی سوپاسی والی ناوبراویشی لەگەڵدایە، ئەو یاداشتنامەیەمان ئامادە کردووە هەتا رێوشوێنی گونجاو بگرنە بەر، هەروەها بە رێگەی وتەبێژی باڵاوە بۆ جێبەجێکردن فەرمان دەردەچێت.

## 9ی جومادی دووەمی ساڵی 63 مایسی 1847
## عەریزەیەك لە زانایان و پیاوچاكان و پیشەوا و وتارخوێنان و پیاوماقوڵ و ناوداران و خەڵك و رەعیەتەكانی شاری وانی پاسەوان

روون و ئاشكرایە ئەو رق و زوڵم و بەرەنگارییەی تووشی ئێمەی بەندەی هەژار هاتووە، هیچی بەدەستەوە نەهێشتووین و ناتوانین ئەوەی داوامان لێكراوە بیدەین و پێشكەشی بكەین بە خەزێنەی خاوەن پایە، لە تواناماندا نییە ئەوەی بەڵێنمان دابوو جێبەجێی بكەین، ناتوانین ئەمەكدار بین بە بەڵێنەكانمانەوە، هەژاریی و نەبوونییە، نەك پەنا بەخوا یاخیبوون، هەموو ئەو فەرمانبەرانەی دێن دەمانترسێنن، هەڕەشەمان لێدەكەن كە بە شمشێری سوڵتان لە گەردنی خۆمان و خانەوادە و منداڵەكانمان دەدەن، هەرچیمان هەبووە تاڵانیان كرد، ترس و تۆقاندنیان لەناو ئەو هەژارانە بڵاوكردۆتەوە، بۆ باشتركردنی داهاتی ویلایەتی ناوبراو قائیمقامی موش عەتوفە (شەریف بەگ)یان نارد، لە میرەكانی شارە و لە خێزانێكی شەریفە، دەفتەردار ئەفەندی دەوڵەتی رای سپارد و وەكالەتی تەواوی دایە هەڵسوكەوتی باشمان لەگەڵ بكات و بەزەیی پێماندا بێتەوە، ئێمە متمانەمان بە میری ناوبراو هەیە، پیاوێكی بە ئەزموونە و لە باری ناوچەكە ئاگادارە.

خەڵك پێیان وت بە هەژاریی ناتوانین ئەو ئەندازەی لەسەرمان دانراوە، ئەو پێنج هەزار قڕوشە، بیدەین، پەیمانیان داینێ سێ هەزار قوڕش بە شێوەی قیست بدەین، ئەمەش لە تشرینی دووەمی ساڵی شەست و دوو لە (وان)و ئەو قەزا و ناحیانەی مەحمودخان بەڕێوەی دەبات بەبێ خواستەكانی میری، هەتا بە دوو قیست ئەو پارەیە بدەین، ئەم عەریزەیەمان بۆ موقامتان بەرز كردەوە، تكایە داواكاریی ترمان لێمەكەن.

بە ئیمزای ژمارەیەكی زۆر لە خەڵكی ناودار و زانا

Tirade Mesail- 1 Muhimme 1266

**بۆ مەقامی سەدارەتی سامی**

(28 **مایسی** 1847**ز**)

روون و دیارە لە حاڵەتی گرتنەبەری ڕێوشوێنی درووست و بڕیار لەسەردراو بۆ لابردنی کێشەی ناوبانگ خراپ بەهێزی حەزرەتی مەولامان سوڵتان، میری ناوبراو ناتوانێت بەرگریی بکات، بەناچاریی پەنا دێنێتە بەر دەوڵەتی عیللیە، یان هەڵدێ بۆ ئێران، بەڵام ئەو زیاتر لای فڕوفێڵان دەگرێ، بە پشتیوانی خوا ڕێگەیەکی تر هەیە بۆ لابردنی ئەو کێشەیە، پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکات، لای مەقامی باڵاتان دیارە تایفەی کوردان لە چەند هۆزێکی جیاجیا پێکهاتوون، هەموو ئەو ناوچەیەی ئێستای میر بە تەواوی، سێ بەشی ناوچەکانی عێراقە ئەگەر داواکار بێت دابەشکردنی خەڵکەکەی لە تایفەی ناوبراون.

لەو سەرنجە بەدوور نییە پەیوەندیی رەچەڵەك لە نێوان ئەمانەدا هەیە و کردوونییە یەك لاشە، ئەگەر بەشێکی تووش بێت هەموو بەشەکانی تر دەگرێتەوە، لە ڕووی ماددیی و مەعنەویی یەکدەگرن، هەتا رەسوڵ پاشای رەواندزی و ئەحمەد پاشای سلێمانی لێرە هێندە ناکۆك بوون بە ئاوی گەرم ماوەیەك بمان کوڵاندبان مەحاڵ بوو یەکبگرن، لە کاتێکدا ساڵی پار ناردمانن بۆ سلێمانی، کەچی بەیەکدا هەڵنەشاخان و بوونە دۆست و ڕێکەوتن، بە قسەی ئەوانەی لێیانەوە نزیکن ئەو دوو پیاوە لە یەکەوە نزیکن و بە نهێنی یەکتر ئاگادارن، لەسەر ئەو ئاڕاستەی بۆم روونکردیەوە دەوروبەری بەغدا جمەی دێت لە کورد بەتایبەتی ئەیالەتەکانی سلێمانی و کۆیە و هەریر و رەواندز، بەم نزیکانە چوونەتە چوارچێوەی گوێڕایەڵیی ئەو، رەسوڵ پاشای لێپرسراوی چالاکیی پێشووی رەواندز بە هەموو لایەکدا دەسووڕێتەوە، سەعدونی شێخی عوبێد و شێخی جەربە لە بازنەی گوێڕایەڵیی ئەون، لە دەوروبەری بەغدا و موسڵ تەنگ بەیەکتر هەڵدەچنن و لەگەڵ میری ناوبراو لێکتێگەیشتن و یەکگرتنیان هەیە، ئەگەر بە هاندانی ئەمیری ناوبراو هەڵبگەڕێنەوە ئەوە هێزی پێویستمان لە سەرباز لەبەردەستدایە هەم بۆ سەرکۆنە و تێکشکاندن، هەم دەتوانین ڕێگەیان لێبگرین و نەیەڵین پشتیوانی میری ناوبراویان پێبگات، لە لایەکی ترەوە باری ئەو چالاکییە سەربازییانە سووك دەکەن کە لەشکری ئەنادۆڵی هەمایوونی ئەنجامی دەدەن.

دەتوانین بەشێك لەو هێزە نیزامیانەی لای من بەرەو شوێنی قەیرانەکەیان بەرین، پێویستە بەشێك لە هێزەکان بەرەو هەولێر بەرین کە قەزایەکی بەغدایە و دوانزە سەعات لە بەغداوە دوورە، بە پشتیوانی خوا میر هەرچەند هێز کۆبکاتەوە ناتوانێت بەرانبەر لەشکری سولّتان بەرگریی بکات، هێزی سەرکەوتوو هی حەزرەتی مەولانا سولّتانە، ئەزموونی رۆژانی رەشید پاشای خوا لێخۆش بوو، بەتایبەت بۆ ئەو بە دڵنیایی سەلماندی بەرانبەر دوو تابوری سەرباز لە زەوی دەشتایی دەدۆڕێن، هەرکاتێك هێزەکان لێیان نزیك ببنەوە بەرەو چیاکان پاشەکشە دەکەن.

هەرچەندە بتوانێت کوردان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، هەندێکیان ناچار دەبن لە چیاکانەوە بۆ کوکردنەوەی بەرهەمەکانیان بێنە خوارێ و هەندێکی تر بۆ بینینی کوڕ و منداڵەکانیان، واباشترە بەیەك جار سوپا بەرەو گوند و شارۆچکە و رێڕەو و پردەکان رەوانە بکرێت، ئەوانە لە چیاکان گەمارۆ بدرێن، بە سروشتی خۆیان ناتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر لەوێ بمێننەوە، هەندێکیان دێنە خوارێ و داوای ئەمان دەکەن و هەندێکی تر بڵاوەی لێدەکەن و میری ناوبراویش دەمێنێ، یان داوای ئەمان دەکات، یان هەڵدێ، ئەوکات بەرژەوەندیمان بە ئاسانیی دێتە دی، دوایی دەتوانین بەرپرسی حکومیی لەو ناوچانەی ژێر دەسەڵاتی میری ناوبراو دابنێین، بە مەرجێ هێزی تەواو لە سوپا لە شوێنە پێویستەکان هەبێت بۆ دابینکردنی کاری پۆستە و پارێزگاریی لە نەوەکان.

3ی جەمادی دووەمی ساڵی 63

والی بەغدا

# بەشی چوارەم:
# جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری
# (1880- 1883 )
# لێکۆڵینەوە لەسەر هۆکارە کاریگەرە هەرێمیی و نێودەوڵەتییەکان

بزووتنەوەی شێخ عوبێدوڵڵای کوڕی شێخ تەهای نەهری نەقشبەندی، خاڵێکی ڕۆشنی مێژووی کورد و کوردایەتییە، لە لایەکی ترەوە پردی بەیکگەیشتنە لەگەڵ بزووتنەوەی میر موحەممەدی سۆرانی لە ڕەواندز و بزوتنەوەی بەدرخان و یەزدان شێر، بەو گوزارشتەی هەموویان کاردانەوەی سیاسەتی ریفۆرم و تەنزیماتی عوسمانین، لەوێوە بە سیاسەتی ناوەندیی و بە تورککردن و دەستگرتنی میرنشینە کوردیەکان، لەلایەکی ترەوە بزاڤی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری هەڵقەیەکە لەو زنجیرە بزاڤە جیهادیانەی شێخەکان و رەعیەتەکانی تەریقەتی سۆفیگەری لە کوردستان، لە سەردەمی شاڵاوی ئەوروپیەکان بۆ سەر جیهانی ئیسلامیی لە سەدەی نۆزدەهەم، ئەمە درێژەدەری بزاڤی شێخ عەبدولقادری جەزائیری و بزاڤەکانی قەوقازیایە بە سەرۆکایەتی شێخ شامیل و شێخ عوسمان دان فیدۆیە لە نێجیریا[129].

بزووتنەوەی شێخ عوبێدوڵڵا وەکو هەموو جوڵانەوەکانی تر پشتگیرییەکی گەورەی لە ناو مسوڵمانانی کورد هەبووە، فاکتەری زاتیی و بابەتیی هەبوون بۆ لەناوچوونی ئەو جوڵانەوەیە کە نەیتوانی ئامانجەکانی خۆی بەدەست بهێنێت، چونکە تێکدەگیرا لەگەڵ بەرژەوەندیی هێزەکانی ئەوروپی و دەوڵەتی عوسمانیی و قاجاڕی ئێرانی.

ئەمە لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر ئامانج و هۆکارە هەرێمیی و نێودەوڵەتییە کاریگەرەکان "بەو پێیەی لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیی و عوسمانیی دا هاتووە".

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم هەموو ئەو میرنشینانەی بە درێژایی دەسەڵاتی عوسمانیی و ئێرانیی بەردەوام بوون لەناوبران، بەر لەو دێرۆکە کوردستانی باشوور بەسەر میرنشینەکانی بابان، سۆران، بادینان دابەش کرابوو، میرنشینی ئەردەڵان لە کوردستانی رۆژهەڵات و بۆتان و بەتلیس و لەگەڵ کۆمەڵێك میرنشینی بچووکی تر لە کوردستانی باکوور.

---

[129] - جۆرە یەکدەنگییەك هەیە لەسەر ئەوەی بزاڤی شێخ عوبێدوڵڵا سەرەتای بزوتنەوەی رزگاریخوازیی نەتەوایەتی کوردیی بێت، بەڵام لەو تایبەتمەندییە کەم ناکاتەوە کە سروشتێکی لەو جۆرەی هەبێت کە دکتۆر باسی دەکات، چونکە هەتا نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم سەرکردایەتی بزاڤی نیشتیمانی کوردستان خاسیەتی کوردایەتی لە بەرگی ئیسلامەتی و ئیسلامەتی لە بەرگی کوردایەتیی پێوە دیاربووە. "وەگێڕ".

له سەرەتای سەدەی نۆزدە دەوڵەتی عوسمانیی بە دەستی هێزەکانی ئەوروپیی تووشی چەندان تێکشکان ببوو، لەو ماوەیە سەرقاڵ بوو بە چاکسازیی کارگێڕیی و فیکریی و سەربازیی، ئیبن خەلدونی بیریار و زانای کۆمەڵناس دەڵێ: ئاساییە دۆڕاو لاسای سەرکەوتوو بکاتەوە، بۆیە بانگەوازکارانی چاکسازیی بە لاسایی دەوڵەتە نەتەوەییەکانی ئەوروپا کەوتنە شوێن سیستمی سەربازیی و مەرکەزیەتی کارگێڕی تۆکمە لە دەوڵەتی عوسمانیی، راوێژکارەکانی سوڵتان سەلیمی دووەم و دوایی سوڵتان مەحموودی دووەم (1808– 1839)، دوایی پیاوانی تەنزیمات لە دەوڵەتی عوسمانیی وازیان لە سیستمی کارگێڕیی عوسمانیی لامەرکەزیی هێنا، ئەو سیستمەی لەسەر بنەمای فرەڕەگەزیی دامەزرابوو، گۆڕیان بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی لەسەر شێوازی رۆژئاوا[130].

لێرەوە بۆ یەکەم جار "نیشتیمانی عوسمانیی" پەیدا بوو، دوایی لەسەر دەستی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی (1908– 1918) ئەم بیرۆکەیە گۆڕا بۆ ناسیۆنالستی تۆرانی[131]. لەناوبردنی میرنشینەکانی کورد بەشێك بوو لەو هەڵقە بەرفراوانەی کەوتنی میرنشینەکانی ئەلبانیاو ئەنادوڵ کە سەدان ساڵ بوو بە ناوی (Dere Bey) حوکمی زاتیان هەبووە، هەروەها دەوڵەتی مەمالیك لە عێراق و ئەمارەتی جەلیلی لە موسڵ و ئەمارەتی مونتەفیك لە باشووری ئێراق و مەمالیك لە میسر و سوریا و سۆرانیی و بابانیی و بادینانیی لە کوردستانی ئێراق.

موحەممەد رەشید پاشای چەرکەسی سەدری ئەعزەمی دەوڵەتی عوسمانی پێشوو، والی کوردستان موحەممەد بێرقدار ئەرکی لەناوبردنی میرنشینەکانی کوردیان گرتە

---

[130] - دکتۆر ئەو وتەیە زۆر دووربارە دەکاتەوە کە سوڵتان لاسایی وڵاتانی ئەوروپیی کردۆتەوە بۆ سیاسەتی بە مەرکەزییکردنی دەوڵەتی عوسمانیی، لە کاتێکدا ئەوکات ئەڵمانیا و رووسیا و ژمارەیەکی دەوڵەتی تری ئەوروپی بەسەر چەند هەرێمێك دابەش کرابوو، ئەوەی سوڵتان لاساییکردنەوە نەبووە، بەڵکو واقیعی تر بووە کە سوڵتان بە هاندانی ژمارەیەك لە وڵاتانی ئەوروپیی کە بەرژەوەندییان نەبووە دەوڵەتی عوسمانیی دابەش ببێت، ئەو رێگەیەی گرتۆتەبەر. "وەرگێڕ".

[131] - بۆ زیاتر بەدەرخستنی کاریگەریی رۆژاوا لەسەر چاکسازیی و تەنزیماتی ناو دەوڵەتی عوسمانیی بڕوانە بەشی سێیەم و چوارەم لە کتێبی:

Bernal Lewis, The Emergence of Modern Turkey. London ;Oxford Univ ,Press.1961 .

ئەستۆ و لەو پێناوەش قونسولّیەکانی بەریتانیی و رووسیی لە بەغدا و ئەستەنبولّ و شارە کوردییەکان پشتگیریی بەهێزی دەولّەتی عوسمانیی بوون[132].

لە دوای نەمانی سەرکردایەتیی تەقلیدی کورد لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم کە خۆی لە میرە کوردیەکان و خانەوادە دەرەبەگان دەدیتەوە، شێخەکانی رێبازی سۆفیگەریی، بەتایبەتی نەقشبەندیی و قادریی لە هەرێمە کوردیەکان بە بەرفراوانیی بۆ سەرکردایەتی کورد لە کوردستان گەشەیان کرد، سەرهەلّدانی جولاّنەوەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری لە ناوچەی شەمدینان (پارێزگای هەکاری ئەمڕۆ)، بەشێکە لەو رێڕەوە مێژووییەی کە دواتر چەندین شێخی تری رێبازی سۆفیگەریی لە کوردستان پەیوەندییان پێوەکرد بۆ تێکۆشان، بەتایبەتی جولاّنەوەی شێخ عەبدوسەلامی بارزان (1914)، جولاّنەوەی شێخ سەعیدی بالۆ لە کوردستانی تورکیا بۆ گەڕانەوەی خەلافەت[133] (1925)، جولاّنەوەی شێخ مەحمودی حەفید لە کوردستانی عێراق لە دژی ئینگلیز (1918ـ 1932).

بەدواداچوونی بەرنامە و ئامانجی هەریەك لەوانە بە ڕوونی بەدیار دەکەوێ کە پەیوەندییەکی ئۆرگانییان هەبووە لە بەرگریی لە شەریعەتی ئیسلامیی وەکو بەرنامەی حوکم و بەرگریی لە مەزلومیەتی کورد[134].

---

[132] - عبد العزيز النوار: تأريخ العراق الحديث، القاهرة 1968، ص108-114

[133] - جیاوازییەکی بنەڕەتیی هەیە لە نێوان جولاّنەوەی شێخ عوبێدوڵڵا و ئەوانی دوای خۆی، راستە هەموویان بە سەرکردایەتی شێخانی تەریقەت بوون، بەلاّم ئەوانە دژی دەسەلاّتی ئیتحاد و تەرەقی، یان دەسەلاّتی ئینگلیز و قەوارە ناسیۆنالیستەکانی عێراق و تورکیای دوای شەڕی یەکەمی جیهانیی هەلّگیرساون. د. عوسمان و زۆرێك لە توێژەروان دەکەونە نێوان دوو تێڕوانینی دژ بەیەك لەلایەك، وەکو خەلیفە و داکۆکیکار لە مافی موسلّمانان سەیری سولّتان عەبدولحەمیدی دووەم دەکەن، لە لایەکی تر رەوایەتی و شەرعیەت دراوە بە جولاّنەوەی شێخ عوبێدوڵڵا، دەبێت یەکیان بۆ ئەوەی تر وەلانێین، یان دەبی سولّتان عەبدولحەمید ئەو خەلیفەیە نەبێت کە باسی کراوە، یان دەبێت لە رەوایەتی بزاڤی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری بکەوینە گومان. "وەرگێڕ"

[134] - بڕوانە: وتاری (کوردستان لە سایەی دەسەلاّتی ئیتحاد و تەرەقی) لە بەشی شەشەمی ئەم کتێبە.

## ڕووداوەکانی ڕاپەڕین

ئەیملیس کلایتن یاریدەرەی قونسولی بەریتانی لە (وان)، بە وردی ئاگاداری بزاڤی شێخ عوبێدوڵلا بووە، دەڵێ: شێخ ڕاستەوخۆ دوای گەڕانەوەی لە بەرەکانی شەڕی ڕووسیی ـ عوسمانیی (1877–1878)، نەخشەی داناوە بۆ ڕاپەڕینێکی بەرفراوان دژی دەوڵەتی عوسمانیی کە بە بۆچوونی ئەو لەسەر کەناری ڕووخانە، پێشتر شێخ وەکو جیهاد بەشداریی شەڕی ڕووسی کردبوو، ئەو چەکانەی لای موریدەکانی هەبوو پاراستبووی کە دەگەیشتنە (5) هەزار چەکدار، ئامادەی کردن لە دژی دەسەڵاتی گەندەڵی عوسمانیی لە کوردستان، بۆ ئەو مەبەستە نامەی بۆ سەرۆکەکانی کورد نارد هەتا هانیان بدات هاوکاری بن لە پێناو ڕزگارکردنی کوردستان لە خراپەی پاشاوات و پۆلیس و سەرباز و مەئمورانی عوسمانیی، شێخ ئەو شاڵاوەی ئیدارەی عوسمانیی بە دەرفەت زانی کە لە تەموزی ساڵی (1879) چەند کەسێکی هۆزی "هەرکی"یان کوشت و ژمارەیەکیان بە دیل گرت، بەوپەڕی دڕندەیی مامەڵەیان لەگەڵ کردبوون، پەیامی بۆ کۆمەڵێك سەرۆك هۆزی کورد نارد و لەوێدا ڕوونی کردبۆوە کە دەوڵەتی عوسمانیی ناتوانێ ئیدارەی کوردستان بگێڕن، بۆخۆشی لەگەڵ ژمارەیەك لە موریدەکانی بەرەو ئامێدیی (مەڵبەندی بادینان) کەوتەڕێ هەتا ڕزگاری بکات و بیکاتە ناوەندی ڕزگاریی بۆ هەموو کوردستان، بەڵام شێخ کە گەیشتە ڕێکان دەسەڵاتدارانی عوسمانیی پێیانزانی و بە خێرایی والی موسڵ کەتیبەیەك لە هێزەکانی عوسمانیی نارد هەتا بەرگریی لە ئامێدیی بکەن، بەڵام شێخ بەرگری نەکرد و عەبدولقادری کوڕی نارد بە هێزێکەوە کە پێکهاتبوو لە (900) مورید، شەڕ لە دەوروبەری ئامێدیی ڕوویدا، هێزەکانی شێخ عەبدولقادر نەیانتوانی ئامانجەکانیان بپێکن، بە ناچاریی پاشەکشەیان کرد، هەر لەوکاتە موتەسەریفی باشقەڵا هاتبووە ناوچە سنوورییەکان بۆ کۆکردنەوەی باج، شێخ فەرمانی بە لایەنگرانی کرد وەکو بارمتە لە بەرانبەر زەمانەتی ئازادکردنی گیراوە هەرکیەکان بیانگرن[135].

وادیارە دەسەڵاتدارانی عوسمانیی لەسەر سیاسەتی تەقلیدیی خۆیان ڕۆیشتوون، لە ناوخۆ هێزێکی تر لە ڕۆژئاوای کوردستان پەیدابوو، هۆزەکانی حەیدەرانلۆ و یەکێ لە

---

[135]- FO,78/2991 NO, 7 September, 6.1879. E. Clayton to Major Trotter Van .

سەرۆکە کوردە چالاکەکانی ناوچەکە لە ناوخۆی کوردستان بەرەیەکی تری درووست کردووە دژی شێخ، بۆیە شێخ دڵنیابوو کە هێشتا دەسەڵاتدارانی عوسمانیی لە کوردستان بەهێزن و بەبێ پشتگیریی هۆزەکانی رۆژئاوای کوردستان کۆسپی گەورەی دێتە پێش، بە ناچاریی بۆ ماوەیەکی تر ناکۆکییەکەی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیی دواخست، خۆی وانیشان دا کە گوێڕایەڵی حکومەت و سوڵتانی عوسمانییە، کوڕەکەی ناردووە بۆ ئامێدیی هەتا کێشەی نێوان هۆزە کوردیەکانی ئەوێ و حکومەت بە شێوەی ئاشتی چارەسەر بکەن، بەڵام حکومەت دەستپێشخەریی کردووە و تەقەی لە هێزی شێخ عەبدولقادر کردووە، هەروەها دەڵێن شێخ داوای (20) هەزار قروشی "پارەی عوسمانییە" کردووە بۆ خەرجیی تەکیەی سۆفیەکانی لە نەهری، بەو شێوە لەگەڵ حکومەت پێکهاتووە و بەڵێنی دا لە بەهاریساڵی (1880) بۆ دڵنیایی گوێڕایەڵیی سەردانی سوڵتان بکات[136].

شێخ ئەو سەردانەی ئەنجام نەدا، بۆمان هەیە بپرسین بۆچی شێخ لە سەرەتاوە ئامێدیی هەڵبژارد وەکو قۆناغی یەکەم بۆ هێرشکردنە سەر حکومەت؟ بۆچی شێخ عەبدوڵڵا بریفکانی خیانەتی لێکرد؟ ئەویش شێخێکی تری رێبازی سۆفیگەریی بووە لە بادینان، پشتیوانیی ئەو لە شێخ عوبێدوڵڵا و ناوچەی بادینان لە ڕووی جوگرافیی و ئابوورییەوە بایەخی خۆی هەبووە.

لە دوای ئەو بەرەنگاربوونەوە کورتە، لە سەرەتای ساڵی (1880) هەموو توانای خۆی خستەگەڕ بۆ رزگارکردنی کوردستانی رۆژهەڵات (ئێران) لە هەوڵی ئەوەدا بووە بیگۆڕێ بۆ بنکەیەکی رزگاریی هەموو کوردستان، کەرەستەی سەربازیی و مەعنەویی تازەی بۆ بەرەنگاربوونەوە ئامادەکردووە، بە پێی راپۆرتی کەسایەتی ئەرمەنی لە کوردستان میسیۆنەر کریمیان، شێخ لە مانگی حوزەیرانی (1880ز) بیری لە نەخشەی هێرشی سەر هێزەکانی ئێرانیی لە کوردستانی ئێران کردبۆوە[137]. شێخ لە پێویستیی راکێشانی دۆستایەتی سەرۆك هۆز و شێخەکانی کوردستان گەیشتبوو، پێش ئەوەی

---

136 - FO,78/2991 NO, 7 September, 6.1879. E. Clayton to Major Trotter Van

137 FO, 78/2991 Enclosure, In No, 8. Letter from Monsieur Krimian to the Armenian Patriarch Van ,June 20, 1879 Turkey No, 5 .

دەست بکات بە چالاکییە سەربازییەکانی دژی ئێران، نوێنەری ناردبوو لایان و داوای لێکردبوون بۆ تێکۆشان و یەکخستنی کوردستان ئامادەبن، موسڵمانانی کورد وەڵامی جیهادەکەیان دایەوە و دووسەد کەسایەتیی کوردیی لە هەموو گۆشەیەکی کوردستان کۆبۆوە و هاوپەیمانییەتیەکیان پێکهێنا بە ناوی "پەیوەندیی سەرۆکەکانی کورد".. میر بەحری هەکاری "کوڕی میر بەدرخان" لە ئامادەکردنی ئەو کۆنگرەیە رۆڵی گەورەی گێڕا.

شێخ عوبێدوڵڵا لە وتاری کونگرەکەدا دەڵێ: "عوسمانییەکان (550) ساڵ دەبێت بە ڕێگەی ناشەرعیی هاتوون و (400) ساڵە لە ڕێبازی ئیسلام لایانداوە، لەوکاتەوە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی لاوازە و دیلی هێزەکانی ترە، بەڵکو لەسەر روخانە و هیچ گومانی تێدا نییە لەناوچوونی زۆر نزیك بۆتەوە".

بەڕێزان، کاتی ئەوە هاتووە گوێ لە ئامۆژگاریی باپیرانمان رابگرین، لە ئێستاوە ملکەچی زوڵمی تورکان نەبین، کە بە ئیسلام پابەند نین، ئێوە داواکراون بۆ ئەوەی بێن بەرگریی لە بەرژەوەندیی کورد و بیروباوەڕی ئیسلام و وڵاتەکەمان بکەن، هەروەکو باپیرانتان بە بەردەوامیی بەرگریی لێکردووە.

لەڕاستیدا بە تەنیا دەوڵەتی عوسمانیی نییە زوڵمان لێدەکات، براکانتان لە ئێران لە بارودۆخێکی ئابووریی و سیاسیی سەختدا دەژین، لە سایەی دەسەڵاتێك کە فڕی بە ئیسلامەوە نەماوە، وەکو دەزانن حکومەتی ئێرانیی لەم رۆژانە سەرقاڵی شەڕی هۆزە تورکمانەکانە، ئەو هێزەی هەیەتی بۆ ئەوێی ناردووە، لەو حاڵەتە ئەگەر هێرش بەرین ناتوانێت دووسەد هەزار جەنگاوەریش دژمان کۆبکەنەوە، نیوەی ئەوانە کوردن و لە کاتی شەڕ پەیوەندییمان پێوە دەکەن، سەردەکەوین و بنکەیەکی گرنگ و دەوڵەمەندمان دەبێت دژ بە دوژمنی گەورەمان کە دەوڵەتی عوسمانییە)[138].

---

[138] - بڕوانە: عەزیز شەمزینی: جوڵانەوەی رزگاریی نیشتیمانیی کوردستان، وەرگێڕدراوی کوردیی، ل60، لەو کاتە کۆمەڵەی کورد (مەبەست لە پەیوەندیی سەرۆك هۆزەکانە. "وەرگێڕ") خاوەنی (4000) چەکداری کورد بووە لە سنوری دەوڵەتی عوسمانیی و (2000) چەکداری کورد بووە لە سنووری ئێرانیی، لە ماوەیەکی کەم خاوەنی لقی خۆی بووە لە هەموو شار و گوندە گەورەکانی کوردستان "بڕوانە: عەزیز میرزا: لە تاریکیەوە بۆ رووناکیی، بەڵگەنامەکانی شۆڕشی (1880)، سلێمانی، سەردەم 1999، ل12-13.

سەرچاوەکانی عوسمانیی دەڵێن لە کاتی شەڕی رووسی، حکومەت (20) هەزار پارچە چەکی بەسەر تێکۆشەرە کوردەکان دابەش کردووە، بەڵام نەیتوانیوە وەریان بگرێتەوە[139] . سەرەڕای ئەوە شێخ نمایندەکانی خۆی ناردووە بۆ شارەکانی وان و ورمێ بۆ کڕینی چەك، ئێرانییەکان لەو باوەڕەدابوون حکومەتی تورکیی بەبێ کۆسپ دەرگای کۆگاکانی تەقەمەنیی خۆی کردۆتەوە بۆ لایەنگرانی شێخ[140] . لە کاتی شەڕەکانیش کوردەکان دەستکەوتی زۆریان بووە لە چەك و تەقەمەنیی لەو هێزانەی حکومەت کە هەڵاتوون، یان خۆیان داوەتە دەست هێزەکانی شێخ عوبێدوڵڵا، شێخ ئامادەکارییەکانی بەوە کۆتایی هێنا بە ڕێگەی ئەو پەیوەندییە باشەی لەگەڵ نەستۆری و ئەرمەنەکانەوە هەیبووە، لە کوردستان لەگەڵ قونسوڵیەکانی ئەورووپیی قسەی کردبوو. هەروەها دەیزانی میسیۆنەرە ئەمریکییەکان لە کوردستانن و شاڵاوەکەی هێزەکانی ئەورووپیی و میسیۆنەرەکان ناگرێتەوە، زۆربەیان لە ژێر چاودێریی هێزەکانی ئەورووپی دان[141] . سەیر لەوەدایە شێخ عوبێدوڵڵا وەکو فەرماندەی شەڕگە مامەڵەی کردووە، لەگەڵ ناردنی هێز بۆ ئێران نامەیەکی بۆ ئیقبال دەولەی حاکمی ورمێ نووسیوە، ئاگاداری کردۆتەوە هێزەکەی بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادری کوڕی مەبەستی رزگارکردنی کوردستانە لە دەسەڵاتی ئێرانیی و عوسمانیی، ئامۆژگاری کردووە کە بەرگریی نەکات، ئەگەر بەرگریی بکات بە هیچ ناگات، چونکە هێزەکانی کورد لە هەموو لاوە گەمارۆی شاریان داوە، ئەو کار دەکات، نەك بە تەنیا بۆ بەرژەوەندیی کورد، بەڵکو بۆ دابینکردنی ئارامیی و ئۆقرەیی ناوچەکە، کە بە دەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانیی دابین نەکراوە[142] .

---

[139] -FO, 78/2991. Enclosure, In No. 71, September 9. 1879 Abbott to Thomson, Turkey, No ,4 (1880), pp.100-101

[140] -- Jwaideh, pt,1.pp.238

[141] - Jwaideh, pt,1.pp.233-234

[142]- FO. 78/2991, Enclosure No, 5 in No, 61m Précis of Letter from Sheikh Obeidullah to Isabel- Dowleh, Governor, of Uremia September 15 1880, Turkey No, 5 (1880), pp.49

شێخ هەوڵی دا دەستپێشخەرییەکی سیاسیی بکات بە سەرنجڕاکێشانی ئەمیر عەباس میرزا بەلای خۆیدا، کە وەلی عەهد و دایکی کورد بووە و پەیوەندیی لەگەڵ هۆزە کوردیەکان هەبووە و لە ناکۆکییدا بووە

شێخ عوبێدوڵلا لە سەرەتای تشرینی یەکەمی ساڵی (1880) لە کوردستان چالاکییە سەربازییەکانی دەستپێکرد، هێزەکانی کرد بە سێ بەش:

1ـ هێزی یەکەم و سەرەکیی ژمارەیان (20) هەزار جەنگاوەر دەبوو بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادر لە باشووری ورمێ بەرەو مهاباد.

2ـ هێزی دووەم بە سەرۆکایەتی شێخ سدیقی برازای شێخ عوبێدوڵلا[143] بە هەزار چەکدارەوە لە مەرگەوەڕ بۆ پشتگیریی هێـزی یەکەم.

3ـ هێزی سێیەم بە سەرۆکایەتی خەلیفە موحەممەد، ژمارەیان پێنج هەزار چەکدار و بە ئاڕاستەی ناو شاری ورمێ..

هێزێکی تر بە سەرۆکایەتی شێخ عوبێدوڵلا خۆی، بە پێنج هەزار چەکدارەوە، ئەم هێزە گەمارۆی شاری ورمێیان دا.. زۆربەی هۆزە کوردیەکانی کوردستانی ئێران و عێراق دایانە پاڵ بزاڤەکەی شێخ.

بە ماوەی چەند هەفتەیەك ئیدارەی ئێرانیی لە کوردستان نوشستی هێنا و شێخ ئیدارەیەکی جێگرەوەی کاتیی پێکهێنا، گومان لەوەدا نییە ژمارەیەك لە نەوەی هۆزەکان بە مەبەستی تاڵانیی و زەوتکردن چوونە پاڵ جوڵانەوەی شێخ، ئەوانە بارودۆخەکەیان بە هەل زانی بوو بۆ تاڵانیی گوندە ئازەری و شیعەکان و سەروەت و سامانی مەسیحیە نەستورییەکانی ناوچەی ورمێ کە کەوتبوونە ژێردەسەڵاتی ئیدارەی کوردیی، هەتا لە میاندواو کارەساتی دڵتەزێن روویدا، دوای گەمارۆدانی شار، شێخ

---

لەگەڵ ناسرەدین شا، شێخ نامەی بۆ نووسی و داوای لێکردووە بە زووی پەیوەندیی بکات بە شۆڕشەکەیەوە، بەڵام میر عەباس لەو نامەیە ترساو نامەبەری گرت و دایە دەست حکومەت و یەکسەر لە سێدارەیان دا. بڕوانە: میرزا عەزیز، سەرچاوەی پێشوو، ل83. وا دیارە شێخ ویستبێتی ناکۆکیی لە نێوان حکومەتی ئێرانیی دروست بکات، لەوبارەیەوە عەباس میرزا دەڵێ: لەگەڵ ناسرەدین شای مامی ناکۆکییان هەبووە، ئەو نامەی شێخ ئەوی خستۆتە قەیرانەوە، ویستویەتی بەوە تۆڵە لە مامی بکاتەوە کە مامەڵەی زۆر خراپ بووە لەگەڵیدا، ئەو نامەیە بە دەرفەت بزانێت و بێتە تەورێز بۆ هەڵگەڕانەوەی لە دەسەڵاتی مامی و بەبێ شەڕ حکومەت بڕوخێنێت، بە لایەکی تر "دەبوو وەفادار بوایە بەرانبەر مەزهەبی شیعە"، دووەمیانی هەڵبژاردو شای ئاگادار کردەوە لەو مەسەلەیە و پۆستەچی شێخیان کوشت. بڕوانە: حەمەی حەمە باقی، ل140-142.

143 - لە دەقی عەرەبیەکەی نووسراوە "برازا"، بەڵام شێخ سدیق کوڕی بووە. "وەرگێر".

عەبدولقادر خالی لەگەڵ چەند پاسەوانێك ناردە ناو شار بۆ دانووسان بە مەرجی خۆبەدەستەوەدان.

حاکمی شار فەرمانی دا بە کوشتنی نماینده و یاوەرەکانی لەگەڵ ناشیرنکردنی لاشەکانیان، ئەمە رقی کوردانی ورووژاند و چوونە ناو شارەوە، بە پێی هەندێ سەرژمێری حکومەت (300) کەسیان کوشت، لە ناویاندا ژن و منداڵ هەبوو، ئەم کارە هەڵە و پێچەوانە بووە لەگەڵ نەریتی کورد و ئاکاری سوارچاکیی، حکومەتی ئێرانی بە خراپیی سوودی لێوەرگرت بۆ ناشیرنکردنی راپەڕین لە ناوەندە فەرمیەکان و جیهان، هەتا وێنەی هەموو راپەڕینەکە بگرن بە کاری کوشتن و تالانیی و گەڕەلاوژەی خێڵایەتی، هەروەها حکومەتی ئێرانیی ئەو رووداوەی قۆستەوە بەوەی شەڕی سووننە - شیعەیە، ئەمەش بۆ بەگەڕخستنی ئازەر و فارسی شیعە دژ بە کورد[144].

گەمارۆدانی شاری ورمێ لە دوو هەفتەی کۆتایی تشرینی یەکەم، قۆناغی هەستیاری شەڕی کوردیی - ئێرانیی بووە، شێخ عوبێدوڵلا لە گەمارۆدانی ورمێ بۆ ئەوەی هەڵەکانی (میاندواو) دووبارە نەکاتەوە، دەرفەتی دوو هەفتەی دایە حاکمی شار لە خەڵکانی سڤیل چۆڵی بکات و تەنیا بۆ ماوەی سێ رۆژان شاریان بدەنە دەست، دوایی بەڵێنی دا دوو رۆژ بەرەو داگیرکردنی شاری تەورێز شاری ورمێ بەجێدەهێڵێ.

هەروەها خەلیفە سەعید زمانحاڵی هێزە گەمارۆدەرەکە لە (20)ی تشرینی یەکەم، داوای لە میسیۆنەرەکان بەتایبەت دکتۆر جوزیف بلوم کۆچران میسیۆنەری ئەمریکی لە ورمێ کرد، هەموو مەسیحیەکانی ورمێ لە شار دەربێنی، شێخ عوبێدوڵلا نامەی بۆ زانایانی ئاینی لە سوننە و شیعە نووسی و دوای لێکردبوون ئیقبال دەولە بڕوا پێ بکەن لە شار بێتە دەرێ هەتا خوێن نەڕژێ، لە (22)ی تشرینی یەکەم شێخ لەسەر داوای ولیم ئابوت قونسوڵی ئینگلیزی و دکتۆر کۆچران، بە ڕەزامەندی ئیقبال دەولە بیست و چوار کاتژمێری تر هێرشی دواخست، ئیقبال دەولە بۆ بەسەربردنی کات سوودی لەو گفتوگۆیە بینی، چونکە زانیبووی هێزەکانی حکومەت بە سەرۆکایەتی تەیمور پاشا لە رۆژئاوای ئازەربایجانەوە بەڕێوەن بۆ شکاندنی گەمارۆ لەسەر شاری ورمێ، ئەمە بە کردەوە رووی داو شێخ عوبێدوڵلا دەرفەتێکی مێژوویی لە دەستچوو، وای لێهات شەڕەکە چووە بەرژەوەندیی هێزەکانی ئێرانیی.

---

[144] - ساڵح ئەمین، کورد و عەجەم، ل171-172، Jwaideh, pt,1.pp

له 24ی تشرینی یەکەم، هێزێکی گەورەی ئێرانیی بە سەرۆکایەتی حیشمەت ئەلدەولە سوپا سالار (فەرماندەی هێزەکانی شا) گەیشتە کوردستان، ئەو هێزە پێکهاتبوو لە (20) هەزار سەرباز و (20) تۆپ و (12) هاوەن، هێزەکانی ئێرانیی لە ژێر چاودێریی چەند پسپۆڕێکی سەربازیی نەمساویدا بوون، هێزەکانی شێخ هەوڵیاندا بچنە ناو ورمێ، بەڵام خراپ شکان و وازیان لە گەمارۆی سەر ورمێ هێنا.

لێرەوە راپەڕین پێچەوانە بۆوە، شێخ پێیوابووە رووس هێز بۆ نەخچەوان دەنێرێت و لە ئاییندە ئێران دەکەوێتە شەڕەوە، هەروەها حکومەتی عوسمانیی چەند لیوایەکی لە ناوچە سنوورییەکان هێنایە هەکاری بۆ بڕینی هاوکاری و تەقەمەنیی لە هێزەکانی شێخ عوبێدوڵڵا، لە گەرمەی شەڕەکاندا ژمارەیەکی کەم لەوانەی بۆ مەبەستی تاڵانیی پەیوەندییان پێوەکردبوون مەیدانی شەڕیان بەجێهێشت، ئەمانەش کاریگەریی مەعنەویی خراپیان هەبووە بۆ سەر ورەی کورد، لە (12)ی تشرینی دووەمی (1880) شێخ فەرمانی بە پاشماوەی هێزەکەی دا کە بڵاوەی لێبکەن، خۆی لەگەڵ کۆمەڵێك لە هێزەکەی لەگەڵیدا بوون گەڕانەوە بۆ ناوچیا لە نەهری ـ هەکاری[145]. بەمەش راپەڕینی شێخ توایەوە.

لە دوای گەڕانەوەی شێخ بۆ بارەگای خۆی لە هەکاری، حکومەتی ئێرانیی بە پشتیوانی بەریتانیا و رووسیا کەوتنە شاڵاوێکی دیبلۆماسیی چڕ بۆ دوورخستنەوەی شێخ لە ناوچە سنوورییەکان، حکومەتی ئێرانیی لەسەر زاری باڵیۆزەکەی لە ئەستەنبوڵ هەڕەشەی کرد بەوەی ناچارە بۆ سزادانی شێخ بچێتە ناو خاکی عوسمانیی ئەگەر حکومەتی عوسمانیی دەستبەسەری نەکات، حکومەتی ئێرانیی داوای قەرەبووی دەکردەوە لە حکومەتی سوڵتان، بەو حیسابەی شێخ عوبێدوڵڵا لە ڕەعیەتی دەوڵەتی عوسمانییە، هەروەها شا داوای تەسلیمکردنەوەی سەدان سەرۆك هۆز و شێخی کوردستانی ئێرانی دەکرد، بەتایبەت هەمزاغای مەنگوڕ کە یەکێك بووە لە فەرماندەکانی شێخ و لەگەڵ هاوەڵانی پەنای بۆ تورکیا بردووە، حکومەتی عوسمانیی ژمارەی

---

[145] - جمال میرزا: لە تاریکیەوە بۆ رووناکیی، بەڵگەنامەکانی شۆڕشی(1880ز)، سلێمانی، 1999ز، ل16-170. شێخ عوبێدوڵڵا لە نەخشەی هێرشکردنە سەر تەورێز و گەمارۆدانی شار مەبەستی بوو ئەمە وەکو کارتی گفتوگۆ بەکار بهێنێت لەگەڵ حکومەتی مەرکەزیی. بڕوانە: (Speer, 83).

پەناهێندەکانی بە سێ هەزار پەناهەندە حیساب دەکرد کە لە بارێکی خراپدا دەژیان[146].

لە تەموزی (1881) لە دوای فشارێکی زۆری باڵیۆزی رووسیا و بەریتانیا لەر ئەستەنبوڵ، دوای گەیشتنی نێردراوی سوڵتان بۆ نەهری، شێخ ناچار بوو بەرێ بکەوێ بۆ ئەستەنبوڵ بۆ قبوڵ کردنی دەستبەسەری، هەموو ئەو شوێنانەی کاروانی شێخی پێدا تێدەپەڕیی بۆ ئەستەنبوڵ وەکو پاڵەوان نەك دیل، لە لایەن خەڵك و بەرپرسانی عوسمانیی پێشوازیی میلیی گەرم دەکرا، نمایندەی هەردوو حکومەتی بەریتانیی و رووسیی لە ئەمە نیگەران بوون، لە ئەستەنبوڵ سوڵتان رێزی لێگرت و شوێنی حەوانەوە و موچەی شایستەی بۆ دیارییکرد،[147] بەڵام شێخ لە ئابی ساڵی (1882) هەڵات و گەڕایەوە نەهری، دووبارە لە لایەن خەڵکی کوردستان و مورید و مەنسووبەکانی پێشوازیی و پشتیوانی گەورەی لێکراوە، هەتا حکومەتی ئێرانی سەغڵەت بوو، عوسمانیی تاوانبار کرد بەوەی لە پشت هەڵاتنی شێخەوەیە، بەڵام بەڵگەنامەکان پشتیوانیی لەو رایە ناکەن، لە ڕاستیدا هەڵاتنی شێخ نیگەرانی زۆری بۆ حکومەتی عوسمانیی درووست کرد، ئەو مەسەلەیان دیراسە کرد و خێرا بڕیاری گرتن و دوورخستەوەیاندا بۆ مەککەی پیرۆز[148].

لە دوای گەڕانەوەی بۆ نەهری هەزاران کەس لە موریدەکانی و سەرۆکەکانی کورد هاتنە سەردانی و ئامادەیی خۆیان نیشاندا بۆ بەشدارییکردن لە هەر پڕۆژەیەکی شێخ پیشنیازی بکات بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی کورد، بەرپرسەکانی ناوچەکە رایانگەیاند

---

[146] -میرزا عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل47-49 لە مانگی ئابی 1881 حاکمی سابلاخ لێبوردنی بۆ هەمزە و پیاوەکانی دەرکرد، ئەویش گەڕایەوە ئێران، لە کاتی سەردانی حاکمی سابلاخ بە فەرمانی حکومەت بۆسەیەکیان بۆ نایەوە و هەمزاغا و (13) لە پیاوەکانی کوژران، حاکم سەری براوی هەمزاغای نارد بۆ حاکمی ئازەربایجان بڕوانە: FO,60\441 No ,2,telegram. From Abbott to Thomson, Tarabzoon August, 31881.

[147]- Speer, pp.99, Jwaideh, pt.1. pp.243-244

[148]- Y.A.Res Jwaidud ulna 20 ,1298, (April 19. 1881) Y.A. Res/1299 h, 2258 (August 21, 1882) Jwaideh, pt.1. pp.265-266 .

که ناتوانن شێخ بگرن، چونکه وەکو پیاوێکی ئایینی خاوەنی پشتگیریی جەماوەرییە[149].

لە کۆتایی تشرینی یەکەمی ساڵی (1882ز) لە دوای هاتنی چەند تیپێکی سەربازیی لە ویلایەتەکانی تر و دوای گەمارۆدانی نەهری لە چەند لایەکەوە، شێخ لەگەڵ نێردراوی تایبەتی سوڵتان کامیل بەگ کەوتە دانووستان و دوور خرایە بۆ مەککەی پیرۆز[150]. شێخ هەوڵی زۆریدا ڕێگەی پێبدەن لە موسڵ نیشتەجێ ببێت، چونکە ئاووهەوای لە ئاووهەوای هەکاریەوە نزیکە، دەسەڵاتدارانی عوسمانیی قبوڵیان نەکرد، ترسان لەوێ ڕاپەڕینێکی تر ڕێکبخات. لە ڕێگەی موسڵ شێخ عەبدولقادری کوڕی هەوڵی دا باوکی و خێزانەکەی لەو کاروانە سەربازییە بسەنێتەوە، بەڵام بێئاکام بوو، ناچار هەردوو کوڕانی شێخ سادق و عەبدولقادر پەیوەندییان بە باوکیانەوە کرد و گواستیانەوە بۆ حیجاز، لەوێ ساڵی (1883ز) شێخ عوبێدوڵلا مرد[151].

---

149- FO, 60/449 No, 40, September, 16, 1882, Tabreez, William Abbott to Thomson.

150 - FO, 60/449 No, 40, September, 16, 1882, Tabreez, William Abbott to Thomson

سالح ئەمین: کوردو عەجەم، ل191،

پێش ئەوەی دەروازەی باڵا (الباب العالی) بڕیاری گرتنی شێخ بدەن، ئاکامەکانی ئەو مەسەلەیان لە ئەنجومەنی وەزیرانی عوسمانیی بە درێژیی دیراسە کرد، دەوڵەتی عوسمانی ترسی هەبووە لەو حاڵەتە شێخ بۆ لای ئێرانیەکان هەڵبێ و لە ئایندەدا بەکاری بهێنن دژی دەوڵەتی عوسمانیی، بڕیاری گرتنی شێخ نەدرا هەتا وەزارەتی دەرەوەی عوسمانیی زەمانەتی لە حکومەتی ئێرانیی وەرنەگرت لەسەر ئەو مەسەلەیە. بڕوانە:

Y.A. Res.1298, 20 Jumadel Athani. (April. 19. 1881.(

151 - FO, 60/446 December 7. 1882 Memorandum by Mirzad: 60/449 No, 47 October 4, 1882 Tabrez, William Abbott to Thomson .

میرزا جوادخان وەرگێڕی باڵیۆزخانەی بەریتانیی لە ئەستەنبوڵ لەو یاداشتنامەیەدا دەڵێ: (لە دوای زنجیرەیەك لە خافڵاندن و هەوڵی بە ئەنقەست بۆ دواخستنی سەفەری بۆ سوریا، هەتا دوایی شێخ رازی بوو بە هاوڕێیەتی کامیل بەگی نێردراوی سوڵتان، بۆ سوریا بچێت، ئەمەش بە پاسەوانیی کۆمەڵە سەرباز، کە گەیشتنە ناوچەی شبتان، شێخ هەوڵیدا بە چەند بیانوویەك ئەو سەفەرە دوا بخات، لەوانە نەخۆشیی

له بابەت هەڵسەنگاندنی راپەڕینی شێخ عوبیدوڵڵا، نەوشیروان ئەمین (ساڵح ئەمین) دەڵێ: "شێخ سوودی لە کات وەرنەگرت و نەچووە ناو ورمێ، لە کاتێکدا ژمارەی کەم چەکدار لە ناو ورمێ هەبوون و ورەیان رووخابوو، دوایی پرسیار دەکات بۆچی شێخ ورمێی هەڵبژاد بیکاتە بارەگای سەرەکیی، لە کاتێکدا ئەو شارە تێکەڵەیەکەی ئاینیی و نەتەوەیی تێدایە؟[152]. ئاسانە لەو مەبەستە تێبگەین، چونکە شێخ کاتێك جەختی کردۆتە سەر ورمێ، دەزانێ ژمارەیەکی زۆری لایەنگرانی لەو ناوچەیە هەیە و بانگیان دەکات بۆ ئەوەی رزگاریان بکات لە زوڵمی قاجارییەکان، هەتا کورد لە ڕۆژانی سمکۆش ویستوویەتی شاری ورمێی مێژوویی بکەنە پایتەختی دەوڵەتەکەیان، چونکە بەسەر باری ئابووریی و بازرگانیی هەموو ناوچەکە زاڵ دەبن".

ئەو راپەڕینە لە بزاڤی کوردان و حکومەتی ئێرانیی بووە هۆی زیانی گەورەی دارایی و گیانیی لە هەردوولا، بە هۆی ئەو راپەڕینەوە زیاتر لە (200) گوند سووتان و هەزاران کەس لە کورد و ئازەریی ئاوارە بوون، هەزاران لە کوردانی ئێرانیی لایەنگری شێخ لە نەوەی ئەو هۆزانەی پشتگیریی شێخ عوبێدوڵڵا بوون، لە ترسی لەناوبردن بەدەست هێزەکانی شا، هەڵاتن بۆ کوردستانی تورکیا، هێزەکانی کوردیش لایەنێکی ترن کە کاری تێکدەرانە و کوشتنی مەدەنیی و تاڵان و زەوتکردنیان ئەنجامدا بوو، بەڵام ئەوانەی لە نزیکەوە چاودێریی رووداوەکان بوون، دەگێڕنەوە کە ئەوەی هێزەکانی حکومەت ئەنجامیاندا زۆر زیاتر بووە لەوەی کوردان، هێزەکانی حکومەت سیاسەتی زەوی سووتاویان گرتبووە بەر، بە کوشتنی بە کۆمەڵ و شاڵاوی دەستبەسەراگرتن و تاڵانی و

---

هاوسەرەکەی و بیانووی تر، لەوکاتە شێخ عەبدولقادری کوڕی پەیوەندیی پێوە کرد و داوای کرد هێرش بکرێتە سەر ئەوانەی لەگەڵیدان لە پێناو ئازادکردنی شێخ، شێخ عەبدولقادر هێرشی کردنە سەریان و هەموویان کوژران، یان بەدیل گیران، لەو کاتەی کامیل پاشا دیل بووە لای کوردان توانیبووی هەندێ کەس هەڵخەڵەتێنێ هەتا هەواڵی بۆ بدەنە موسا پاشا، بە خێرایی هێرش بکاتە سەر شەبتان، بەو هۆیەوە هێزەکانی حکومەت گەیشتنە شوێنەکە و شەڕ رووی دا، لە کوردان (200) کەس کوژرا، هەتا شێخ ناچار بوو خۆی بدا بە دەستەوە، حوسێن پاشا گەیشتە شێخ و تفی لە شێخ کرد و قسەی پێگوت، شێخ پێی وت: "تۆ یەزیدی نەفرین لێکراوی" تۆ بەرازی"، کامیل پاشا وتی: "بەڵکو شێخ تۆ لە بەراز خراپتری" دەستی شێخیان بە پەتەوە بەست و بۆ سوکایەتیی سواری کەریان کرد.

[152] - بڕوانە: کورد و عەجەم، ل171-173.

ناموسبردنی ئافرەتانی کورد[153] . حکومەت سزای بە کۆمەڵی سەپاندبوو بەسەر ئەو گوندانەی پشتگیرییان لە ڕاپەڕینەکە کردبوو، بە غرامەکردن، بۆ نموونە بۆ هەر گوندێك بەشداریی راپەرینی کردبێت (10) هەزار تومانیان غرامە کردووە[154] .

## ئامانج لەو راپەڕینە

د. عەبدولعەزیزی شەمزینی یەکێك بووە لە نەوەکانی شێخ عوبێدوڵڵا، دەنووسێ: "هەندێك لە توێژەرەوان روخساری ئایینیی دەبەخشن بە ڕاپەڕینەکە و ئێران و ناحەزەکانی بەوە تاونباریان کردووە خواستی هۆزە کوردیەکان بووە بە ئاڕاستەی فەوزاو تالانی، هەیە لەو باوەڕەدایە شێخ لە بازنەی نەخشەی تورکیدا بووە دژی ئێران و هێزەکانی ئەورووپیی، بەڵام ئەو بزافە لەبەر هیچ لەم هۆکارانە نەبووە، بەڵکو لە پێناو بەدیهێنانی سەربەخۆیی کوردستان بووە"[155] .

ئەم دەربڕینانەی سەرەوەی مامۆستا شەمزینی، پوختەیەکی باشە و سروشتی گفتوگۆی ئامانجی راپەڕینی شێخ عوبێدوڵڵای دیارییکردووە، لەوەدا لەگەڵی کۆکین کە رزگارکردنی کوردستان لە دەسەڵاتی ئێرانیی و عوسمانیی ئامانجی جوڵانەوەی شێخ بووە، بەڵام ناتوانین مامەڵە لەگەڵ جوڵانەوەکەی شێخ بکەین وەکو جوڵانەوەی نەتەوەیی هاوچەرخ لە بەدەسهێنانی ماف چارەنووس، بۆیە سروشتی بزاڤی شێخ لە چوارچێوەی زەمەنی مێژوویی خۆی وەردەگرین، حاڵی دەبین کە کوردایەتیی بە تێگەیشتنی شێخەکانی تەریقەتی سۆفیگەری (نەقشبەندیی و قادریی) بووە لە کوردستان، لێرەدا ناتوانین فاکتەری ئایینی کورت بکەینەوە بەوەی خواستی شەخسیە و نەیویستووە ئەمارەتێکی کوردیی، یا حکومەتێکی کوردیی سەربەخۆ لەژێر فەرمانی خۆی دابمەزرێنێت، ئەوەی تایبەتە بە فاکتەری ئایینیی، دەتوانین بڵێین شێخ عوبێدوڵڵا

---

[153] - میرزا عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل84-138، حەمەی حەمە باقی، سەرچاوەی پێشوو، ل، Speer, 94.

[154] - عەزیز شەمزینی: جوڵانەوەی رزگاری نیشتیمانی کوردستان، و/ فەرید ئەسەسەرد، کوردستان، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، ل98-100

[155] - سەرچاوەی پێشوو، ل61-62

زۆر لایەنی لە کەسایەتی خۆیدا کۆکردۆتەوە، وەکو چاکسازێکی ئیسلامیی تێکۆشەر، لە پێشەوە وەك پیاوێکی لە خواترس و زانایەکی کارا بووە، لە هەموو گۆشەیەکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی و ئێرانییەوە روویان لە تەکیەکەی کردووە، هەتا زۆر بابەتی زانستیی و ئەوەی پەیوەندیی بە چارەنووسی کوردەوە هەبووە رای شێخیان وەرگرتووە، لە زانستە ئیسلامییەکان، بەتایبەت لە فەرموودەدا، زۆر شارەزا بووە[156].

میسیۆنەری ئەمریکی د. کۆچران ماوەی دوو هەفتە میوانی شێخ بووە و لە بابەت ئەو کەسایەتیە دەنووسێت: (شێخ لە پەنجاو سێ ساڵەی تەمەنیدا بووە، خاوەن ویقار و روویەکی گەش بووە، شەرواڵی کوردیی لەبەردەکرد، سەری بە پارچەیەك قوماشی سپی دادەپۆشی کە زانایانی ئیسلام لە ناوچەکە لە سەریان دەنا، شارەزای زانستەکانی ئیسلام بووە، بە ڕەوانی بە عەرەبی و تورکی و فارسی قسەی دەکرد، پیاوێکی دیندار بووە و زۆر لە بابەت خواو ئیسلامەوە دەدوا، بە باوەڕەوە پێیوابووە بە ویستی خوا بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانی کورد کار دەکات، دەیویست لە جێگای گەندەڵیی و لادانی عوسمانیی، دادگەریی ئیسلامیی لە کوردستان دابمەزرێنێت)[157].

أ. ج، ئابوت قونسوڵی بەریتانی لە تەورێز میوانی شێخ بووە و بەسەرسوڕمانەوە دەڵێ: (شێخ نەرێت و رێوڕەسمی وەکو پاشا و سەرۆك و سەرکردە مێژووییەکان بووە، لە لایەکەوە خزمەتکار و دەرباری زۆری هەبووە، رۆژانە لە ماڵەکەیدا (500 ـ 600) کەس لە زۆربەی چین و توێژە جیاوازەکان نانی خواردووە، لە لایەکی ترەوە لە ڕووی خواردەمەنی و جلوبەرگیەوە بە ژیانێکی زۆر سادە دەژیا، ئەلکەهول (مادەی سڕکەر) نەدەگیشتە باشقەڵا (ویلایەتی وان)ی ژێر دەسەڵاتی ئەو، لە هەموو کوردستان خۆشەویست بووە، لە ناوچانەکانی ژێر دەسەڵاتی گەندەڵیی و بەرتیل نەبووە، بەرپرسان نەیاندەتوانی لە بەڕێوەبردنی ناوچەکەدا لە یاساکانی دەرچن، هەر کەسێك لە یاسا لای بدایە سزای کوشتن بووە، زیرەك بووە و لە شارستانی رۆژئاوا سوودی وەرگرتووە، هەروەها پەیوەندیی پتەوی هەبووە لەگەڵ دەرەوەی کوردستان، شارەزای ئەدەب و مێژووی کوردیی بووە[158].

---

[156] - Jwaideh, pt.1. pp.220-222

[157] - Speer.pp.79-80

[158] - پاشکۆی 3، ژمارە 9، 8ی تەموزی 1880

کەسایەتیەکی سەرنجڕاکێش (کاریزما)ی هەبووە، لە خواترس و جێی ڕێزی موریدەکانی بووە، هەروەها بەرپرسانی عوسمانی لەسەروویانەوە سوڵتان عەبدولحەمید ڕێزیان گرتووە، ڕۆژهەلاتناسی ئینگلیزی "ج. ولسن" لە باسی شێخ عوبێدوڵلادا دەڵێ: لە دوای سوڵتان عەبدولحەمید و شەریفی مەککە، پیرۆزترین و بە دەسەلاتترین کەسی جیهانی ئیسلامیی شێخ عوبێدوڵلا بووە)[159].

ئابوت دەڵێ: (شێخ بالای مامناوەندیی بوو، ئەگەر لە ڕووخساری بڕوانی پێتوایە تەمەنی لە چل و پێنج ساڵ تێپەڕی نەکردووە،.. ریشێکی کەمی هەبووە، بۆیاغی ڕەشی کردووە، ئەوەی لێم بەدی کردووە خاوەنی ویست و جدیەتی بەهێز بووە، توانای لەڕادەبەدەری هەبووە، کە کار لە بەرانبەرەکەی بکات و بیبزوێنێت بۆ ئامانجەکانی)[160].

خۆ بەکەم زانین لە خواردن و جلوبەرگ و ئارەزوو بۆ کاری خێر، بەتایبەت لەگەڵ ئەو بێنەوایانە لەو جووتیار و نەدارانەی هاتوچۆی تەکیەکەیان کردووە، سەرنجی هەمووانی ڕاکێشابوو، سوور بووە لەسەر ئەوە بۆ خۆی گوێ لە زیارەتکارانی هەژار و جووتیاران بگرێ، هەروەها خانەی هەتیوانی هەبووە، بۆ خۆی و لەسەر خەرجی خۆی سەرپەرشتیی کردووە، بەوە ناسراو بوو پیاوێکی دادگەر و بە عەزمە، لە ڕووی زوڵم و زۆرداریی، دوودڵ نەبووە لە لەسێدارەدانی هەندێ لە نەوەی هۆزەکەی کاتێ گوبیست بووە تالانی گوندێکی دراوسێیان کردبوو، گەرچی نزیکی خۆی لەگەڵدا بووە[161]. لە کۆتاییدا شێخ پیاوێکی زیرەك و کراوە بووە بۆ بیروڕای تر، بە کردەوە چاودێریی کێشە و ڕووداوەکانی ڕۆژگار و دونیای ئیسلامیی کردووە، لە نزیکەوە لە ناکۆکیی نێوان دەوڵەتی عوسمانیی و هێزەکانی ئەورووپی ورد دەبۆوە، بە هۆی کرانەوە و نەرمیی لە بەرانبەر خەڵکیی، ببووە جێگای ڕێزی مەسیحیە ئەرمەنی و نەستۆریەکانی کوردستان، بە بەردەوامیی هاتوچۆیان کردووە[162]. شێخ لە ڕوانگەی سووربوونی لەسەر

---

[159]- Persian Life And Costumes, New York, 1969, p.110

[160] - "FO,60/441" تەورێز 10/1881/ 01 ژمارەی بەڵگەنامەی 23 زۆر نهێنی.

[161] -- Jwaideh, pt.1. pp.221

[162] --- Jwaideh, pt.1. pp.233-234

ئیسلامەتیەوە، هێرشەکانی ئەوروپی بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانیی زۆر ئازاری داوە، بۆیە لەگەڵ شوێنکەوتوانی بەرەوپێری بانگەوازی سوڵتانەوە چوون بۆ جیهاد دژی رووس، لە ساڵانی 1877–1878 لەو شەڕانەی هێزی عوسمانیی زەبت و ورەیان نەمابوو، ئەم فەرماندەی هێزێکی گەورەی خەباتکارانی کوردبووە. لێرەوە بڕوای بە ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیی رۆژ بە رۆژ زیادی کردووە و پێیوابووە نزیك، یان درەنگ دەڕووخێت. چونکە لە پیادەکردنی شەریعەتی ئیسلام دوورکەوتۆتەوە و گەندەڵیی ئیداریی پەرەیوەتە ناو دەزگا سەربازیی و سیاسییەکانی و بەرپرسان لە ئاستی بەرەنگاریی هێزەکانی ئەورووپیدا نین، باڵیۆزخانەی دەوڵەتە ئەوروپیەکان لە ئەستەنبوڵ قورساییان هەیە بەسەر ناوەندەکانی بڕیاردان[163] .

دوا شەڕی عوسمانیی - رووسیی، کوردستانی وێران کرد، ببووە شانۆی چالاکیە سەربازییەکان، بە هۆی زیادبوونی چەند بارەی باج و دەستبەسەراگرتنی سامانی جووتیاران و خۆسەپاندن، باری بژێویی خەڵکی ناوچەکە وێران ببوو، دیاردەی بەرتیل بڵاوببۆوە، شێخ چەندین جار سکاڵای لەسەر ئەو بارودۆخە بۆ سوڵتان نووسی، هەتا رێوشوێنی گونجاو بگرێتەبەر، بەڵام بێئاکام بوو. لە ساڵی (1879) عەبدولقادری کوڕی ناردووە بۆ ئەستەنبوڵ هەتا پرۆژەی پێکهێنانی ویلایەتی کوردستانی گەورە بخاتە بەردەم سوڵتان، بەو پێیە شێخ ببێتە بەرپرسی ئەو ویلایەتە، بەڵام ئەو هەوڵەشی بێئاکام بوو[164] .

دەسەڵاتی هێزەکانی ئەوروپی بەسەر دەوڵەتی عوسمانییەوە شێخ عوبێدوڵڵای بە ئاگا هێنایەوە و زۆر پێی نیگەران بوو، تێکشکانی عوسمانیی لە شەڕی رووسیی - عوسمانیی ساڵانی 1877ـ 1878و فەرزکردنی هەیمەنە و ناچارکردنی بە رازی بوون بەرێککەوتنامەی بەرلین و دەستێوەردانی ئەوان لە بەرژەوەندیی ئەرمەن، کاریگەریی بەرچاوی هەبووە لەسەر جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵڵا، لە ساڵی (1878ز) ئەو رێککەوتنامەیان بەسەر دەوڵەتی عوسمانییدا سەپاند و پابەندیان کرد رازی بێت

163 - FO, 78/8094 Cochrane’s August 2, 1880, E. Clayton Vice Consul at Van .

164- Enclosure 3 in No. 2 Erzerum, Teleg. No. 27 D. Stewart, 3096l78

ئەوروپییەکان دەست لە کاروباری کوردستانی تورکیا وەربدەن، بەریتانیا بە بیانووی چاکسازیی و پارێزگاریی لە ئەرمەن و نەستوورەیەکان، ئەو رێککەوتنامەیە جۆرێك لە ئیدارەی زاتی دابوو بە ئەرمەن، شێخ ئاگادار بوو بە رووداوەکانی ئەوروپا و دەیزانی ئەم رێککەوتنامەیە پەردەپۆشی نێودەوڵەتییە بۆ بنیاتنانی قەوارەی ئەرمەنی لە ناوچەکانی کوردستان، ئەمەش ئاکامی زیاتر لە سەدەیەکی چاوتێبڕینی بەریتانیا و رووسیا بووە، شێخ بە هەرچی لە توانایدا بووە خۆی ئامادەکردووە بەرهەڵستیی بکات و ئەمەشی لە سوڵتان نەدەشاردەوە.

لە کاتی سەردانی نوێنەری سوڵتان بۆ تەکیەکەی، شێخ پێی وتووە: (ئەوە چیە بیستوومە ئێوە رازین بە هێنانی ئەرمەن بۆ سەر موسڵمانانی کورد، نەستووریەکان بەم زوانە ئالآی بەریتانیی هەڵدەدەن، ئێمە ئەمە قبولّ ناکەین و بە هەرچی لە تواناماندا بێت بەرهەڵستیی دەکەین، ئەگەر بە پێوستمان زانی ژن و منداڵمان چەکدار دەکەین)[165].

لەو وتارە مێژووییەی پێشتر ئاماژەمان پێدا لە کۆنگرەی سەرۆك و شێخەکانی کوردستان لە نەهری بە روونی ئاماژەی کردووە: "ئێوە داواکراون بۆ ئەوەی بێن بەرگریی لە بەرژەوەندیی کورد و بیروباوەڕی ئیسلام و وڵاتەکەمان بکەن، هەروەکو باپیرانتان بە بەردەوامیی بەرگریی لێکردووە".

زۆربەی گەورەکانی کورد و سەرۆکەکان لەگەڵ شێخ عوبێدوڵڵا بەشدار بوون لەو هەستە، حاجی قادری کۆیی لە شیعرێکیدا ئەو راستیە بە دیاردەخا و دەڵێ:

خاکی جەزیرە و بۆتان یەعنی وڵاتی کوردان
سەد حەیف و سەد مخابن دەیکەن بە ئەرمەنستان
مەسجید دەبێتە دێرە و ناقوسیان موئەزین
مەتران دەبێتە قازی، موفتی دەبێتە رەهبان[166]

سوڵتان عەبدلحەمید سوپاسی عەزیمەتی شێخی کردو موفتی (وان)ی نارد هەتا بە شێخ عوبێدوڵڵا بڵێ: "لەشەریعەتدا نابێت لەگوێڕایەڵی سوڵتان دەربچیت". شێخ وەڵامی

[165] - Jwaideh, pt.1. pp.111

[166] - حەمەی حەمە باقی: سەرچاوەی پێشوو، ل96-97

دایەوە: "دەوڵەت لە جێبەجێکردنی شەریعەت دوورکەوتۆتەوەو زوڵم و زۆری هەیە، وەکو زانا و فەرماندەی گروپێکی ئیسلامیی وای دەبینم بەرەنگاربوونەوەی واجبە"[167] .

شێخ عوبێدوڵلا دڵنیایی دا بەر لایەنگرانی بەوەی لەسەرمان پێویستە شەڕ لە بەرانبەر هەردوو دەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانیی بکەین، چونکە هەردوولا کەوتوونەتە ژێر فشاری باڵیۆزخانەی هێزەکانی ئەوروپییەوە، بۆیە شەڕی ئەوان جیهادی پیرۆزە بۆ پاراستنی رووخساری پاکی ئیسلامەتی[168] . نمایندەی هێزەکانی ئەوروپی لە سروشتی ئیسلامیەتی بزاڤی شێخ عوبێدوڵلا ئاگادار بوون، لە (5)ی تەموزی ساڵی (1880) ولیم ئابوت قونسوڵی بەریتانی لە ورمێ دەونووسێت:

"من دڵنیام بزاڤی شێخ عوبێدوڵلا لە لایەن لایەنە پارێزیکارەکانی تورکیەوە پشتیوانیی لێدەکرێ، پێویستە چاودێریی بکەین، چونکە بەو نزیکانە کاریگەریی گەورەی دەبێت.. شێخ دەمارگیری لە ناو موسڵمانەکان دەوروژێنێت، ئەگەر سنوری بۆ دانەنێین ئەوە زیان دەگەیەنێت بە بەرژەوەندیی رۆژئاوا و مەسیحیەکان"[169] .

شێخ عوبێدوڵلا و شێخ عەبدولقادری کوڕی سروشتی ئیسلامەتی بزاڤەکەیان نەشاردۆتەوە، شێخ بە لایەنگرانی وتوە "موجاهید"، لە کاتی گەمارۆدانی ورمێ لە نامەکەی نووسیبووی: (بە فەزڵ و پشتیوانی خوا، سوپای ئیسلام سەردەکەوێ)[170] . ئەو دەبڕینە روون و ئاشکرایە لەسەر سروشتی بزاڤی شێخ عوبێدوڵلا.

بەڵام شێخ بەراستی پێشڕەوی کوردایەتیی بووە، چونکە بڕوای وابووە کە کورد لە یەك کاتدا زوڵملێکراوی دەستی عوسمانی و ئێرانین، شایستە بە دەوڵەتی تایبەت بە خۆیانن.

شێخ لە تشرینی یەکەمی ساڵی (1880) نامەیەکی بۆ د. کۆچران نووسیووە، لەوێدا مەبەستی بزاوندنی هێزەکەی بۆ کوردستانی ئێران روون کردۆتەوە، دەڵێ: "عوسمانیی و ئێرانییەکان بەرانبەر کورد نییەتی باشیان نییە، هەوڵدەدەن لە سادەترین ماف

---

[167] -ن، خالفین: خەبات لەرێی کوردستان، 1971، ل167-168

[168]- FO, 78/8094 Kochannes August 2, 1880, E. Clayton Vice Consul at Van

[169] - میرزا عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل17-35.

[170] - میرزا عەزیز: سەرچاوەی پێشوو،ل139.

بێبەشمان بکەن... ژمارەی کورد لە (500) هەزار خێزان زیاترە، ئایینیان جیایە لەگەڵ تورك و فارس، نەریت و ئاکاریان جیاوازە، بەڵام هەتا ئێستا بە کەلەڕەق و هەندێ خوی خراپ باسی دەکەن، سەرنجتان بۆ ئەوە رادەکێشم کە ئەو سیفەتانە بە ناڕەوا لە لایەن ئێرانیی و عوسمانییەکانەوە دانراوە، بۆ نموونە عەلی ئاغای شوکاك پیاوێکی خراپە و مەسیح و مسوڵمانەکان وەکو یەك ئازار دەدات، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت هەموو کورد بە بەربەریی ناوببەی، چی تر هۆزە کوردەکان ئەو ناو و ناتۆرانە قبوڵ ناکەن و چەك هەڵدەگرن بۆ بەرگریی کردن لە خۆیان و قبوڵی ناکەین چی تر لە سایەی ئەو رژێمەدا بژین"[171].

لەوەی رابوورد دەبینین بیری کوردایەتیی لە رێگەی شیعرەکانی ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی رەنگی داوەتەوە، تایبەتمەندییەتی کورد لە ناو درواسێیەکانی تێڕوانێکی رەوانە لە بیری شێخانی تەریقەتی نەقشبەندیی، ئاماژەیە بە بنەڕەتەکانی دەوڵەتی نەتەوایەتی کوردیی[172]. لەو بڕوایەداین خوێندنەوەیەکی نابابەتییانە ئەگەر بڵێین شێخەکانی رێبازی نەقشبەندی ئاگاداری بیر نەتەوایەتی نەبوون. لەو نامەی شێخ بە روونی بیری کوردایەتی لە چوارچێوەی "کارکردن لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی کورد، نەك بە بیری نەتەوەیی کورد" بە دیار دەکەوێ، کە شێخەکانی تەریەقەت وای تێگەیشتبوون، شێخ ئاگادار بووە قونسوڵی بەریتانی و هێزەکانی ئەورووپا تر جڵەوی دەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانیان بەدەستەوەیە و بە هەر رێگەیەك بێت مەسەلەی کورد پشت گوێ دەخەن.

شێخ چەندان جار بە نمایندەی بەریتانی وتووە قبوڵی نییە نییەتی دوژمنکارانەی بەرانبەر مەسیحیەکانی کوردستان هەبێت: لە (2)ی ئابی (1880) بە کلایتۆن دەڵێ: "لەگەڵ ئەوەدا کە من رەعیەتی سوڵتانم، بەڵام دەمەوێ لە ژێر ئیشارەتی بەریتانیدا بم، چونکە من لە پەیوەندییدام لەگەڵ مسوڵمانانی هیند و گۆڕانی ئەوان لە سایەی حوکمی بەریتانی، من ئامادەم فەرمان لە بەریتانیا وەربگرم، ئەگەر هاوکاریی ئەوان بۆ من دەستەبەر بێت دەتوانم عوسمانیی و ئێرانییەکان لە کوردستان دەربکەم، هەروەها من

[171] - هەمان سەرچاوە، 86.

[172]- حەمەی حەمە باقی: سەرچاوەی پێشوو، ل121-131.

نارازی نیم لە پێکهێنانی دەوڵەتی ئەرمەنی، بە مەرجێ کوردیش ماف خۆی بدرێتێ، بەڵێنتان پێدەدەم ئەگەر حکومەتی کوردیی دابمەزرێ و پەیوەندیی باشی هەبێت لەگەڵ ئەوان و بە ئازادیی رێگەیان بدرێتێ بە دروستکردنی کەنیسە و ئازادیی بیروباوەڕ و سامان و سەلامەتیان زامن بێت[173]. شێخ باش دەیزانی بەریتانیا نیگەرانە لە شەڕی ئەو هۆزانەی سنووری بەریتانیی و عوسمانیی دەبەزێنن و پەیوەندییەکانی بەریتانی - رووسی دەشێوێنن، شێخ بەڵێنی دا کۆتایی بەو حاڵەتە بێنێت و ئارامیی و ئۆقرەیی لە ناوچەکە بڵاو بێتەوە، شێخ بە ئابوتی قونسوڵی وت: "ئەگەر لە ئیدارەی کوردستان نەمتوانی بە توانا و کارامەیی دادگەر بم بۆ هەمووان، با لیژنەیەکی ئەورووپی دادگاییم بکات"[174]. شێخ بە هەمان گوتارەوە لە رێگەی قونسوڵەکەیانەوە لە ئەرزڕۆم قسەی لەگەڵ حکومەتی رووسی دەکرد، دڵنیاییدا کە دەوڵەتی عوسمانیی ناتوانێ ئاشتیی و ئارامیی لە ناوچە سنووریەکان دابین بکات، گیان و سامانی هاوواڵاتیانی کورد بپارێزێت، شێخ دەڵێ: "رووسیا دراوسێی کوردانە و کورد پابەندن بناغەی پەیوەندیی بەهێز لەگەڵیدا، بەهێزتر لەوەی لەگەڵ بەریتانیادا هەیانە"[175].

## هۆکارەکانی کەوتنی راپەڕینی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری

چەندین هۆکار هەن بۆ رووخانی لە ناکاوی بزاڤی شێخ عوبێدوڵڵا، لە گرنگترینیان: ململانێی هێزەکانی ئەورووپیی لە پێناو پێگەیەك بۆ دابیکردنی دەسەڵات لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانیی، هاریکاری ئیقلیمی نێوان ئێران و عوسمانیی لەسەر حیسابی کورد، سروشتی شێخ عوبێدوڵڵا و خراپ تێگەیشتنی لە هێزی هەریەك لە دەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانیی، پشتبەستنی شێخ بە هەندێك شێخ و سەرۆك هۆزی کوردی دەرەوەی تەریقەتی نەقشبەندیی.

سالح ئەمین دەڵێ: "کەوتنی لە ناکاوی بزاڤی شێخ عوبێدوڵڵا دەگەڕێتەوە بۆ شارەزانەبوونی بە شەڕی پارتیزانی و داواکاریی لە لایەنگرانی بەوەی بگەڕێنەوە ماڵی

---

173 - FO, 78/8094 Kochannes August 2, 1880, E. Clayton Vice Consul at Van

174 - میزا عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل69-70

175 - سالح ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل180-181

خۆیان، شێخ لە توانای دا هەبوو بەرەو ناوچە شاخاوییە سەختەکانی سەر سنوور بکشابایەوە"[176].

پەنا نەبردنی شێخ عوبێدوڵڵا بۆ شەڕی پارتیزانی بەراستی بابەتێکی قسە هەڵگرە، لە کاتێکدا نەقشبەندییەکانی ئەوکات کەلەپورێکی دەوڵەمەندی هاوچەرخیان هەبووە لە خەبات لە شێوەی شەڕی پارتیزانی، شێخ شامیلی داغستانی بۆ ماوەی سی ساڵ (1834- 1859) لە داغستان و چاچانستان لە دژی رووس شەڕی پارتیزانی کردووە، لەو کاتە شێخ شامیل لە پەیوەندیی پتەودا بووە لەگەڵ شێخ تەهای باوکی شێخ عوبێدوڵڵا، لە هاوزەمانی ئەو، میر عەبدولقادری جەزائیری سەرۆکی تەریقەتی قادریی سۆفیگەریی لە ساڵانی (1832- 1847) سەرکردایەتی تێکۆشانێکی تاڵی دەست پێکرد دژی فەرەنسیەکان و بۆ ماوەی (15) ساڵ بە هۆی موریدەکانی تەریقەت لە شەڕی پارتیزانی دابووە، پرسیارێکە و دێتە پێشەوە، بۆچی شێخ عوبێدوڵڵا لاسایی ئەو دوو شێخەی نەکردۆتەوە، لە کاتێکدا ئەم لە لاوێتیەوە هەواڵی ئەوانی بیستووە؟. پێکهاتەی دانیشتوان و سروشتی شاخاوی سنووری تێکۆشانی هەردوو شێخی ناوبراو جیاوازییەکی زۆری نەبووە لەگەڵ سروشتی جوگرافیی و پێکهاتەی خێڵەکیی کوردستان؟[177].

خاڵێکی تری جیاوازیی بزاڤی شێخ عوبێدوڵڵا لەگەڵ ئەوانی تر ئەوەیە رێگەی دابوو بە ژمارەیەکی زۆری بەرژەوەندچی بێنە ریزی شۆڕشەکەی، لەکاتێکدا شێخ ئاگادار نەبوو بە سروشتی هەلپەرستیی و بەرژەوەندیچیەتی ئەو توێژە لە کۆمەڵگای کوردیی کە بێجگە لە بەرژەوەندیی خۆیان و خانەوادەیان، بیریان لە هیچی تر نەدەکردەوە، لە شەڕدا بەلای بەهێزدا دەشکانەوە، ئەوانە لەبەر بەرژەوەندیی ماددی بە پەلە بیر لە تێکۆشانی درێژخایەن ناکەنەوە، وازهێانی ئەوانە لە گەرمەی شەڕ و چوونە پاڵ دوژمن، بێگومان دەبێتە هۆی داڕووخانی مەعنەویاتی هێزەکانی شێخ عوبێدوڵڵا.

---

[176] - ساڵح ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل174.

[177] - پێموانیە ئەوکات شێخ عوبێدوڵڵا بەو وردیە ئاگاداری شەڕی پارتیزانی شێخ شامیلی چاچانی و ئەوانی تر بووبێت، بەڵام ئەزموونی هەڵگیرساندنی شۆڕشی میللی بەرفراوان و دوایی پەرت و بڵاوەکردن و دیلکردنی سەرکردە، یان خودانەدەستی ولاتێکی تری داگیرکەری دراوسێ لەناو بزاڤی سیاسیی کوردستان ئەزموونی دووبارەی زۆربەی سەرکردە کارزماکانی شێخانی تەریقەت بووە. "وەرگێڕ".

شێخ عوبێدوڵڵا هەڵە بووە لە بەکەمگرتنی دوژمنەکانی و هێزی خۆی لەوە پیٚ زیاتر بووە کە هەبووە، هەروەها هەڵخەڵەتابوو بە بەڵێنی باڵیۆزەکانی بەریتانیی و میسیۆنەرە ئەمریکیەکان لە کوردستان، لە ئەو نامەی پێشتر کە بۆ شێخ عەبدولقادری بریفکانی ناردووە، دەڵیٚ: "شتێك نەماوە بە ناوی دەسەڵاتی عوسمانیی و حکومەتی عوسمانیی دەتوێتەوە و میراتەکەی لە لایەن هێزەکانی ئەوروپاوە دابەش دەکریٚ"، بەڵام لە ناکاو هێزەکانی لە موسڵ (ئامێدی) تووشی بەرگرییەکی بەهێزی هێزەکانی لایەنگری حکومەت بوون.

لە ساڵی (1879) لە ناکاو شێخ جیهادی لە دژی دەوڵەتی عوسمانیی کۆتایی پێهێنا و رووی سوڕاند بەرەو ئێران، قسەشمان هەیە لەسەر وتارەکەی نەهری بەر لە هێرشی بۆ سەر ئێران کە پێشتر ئاماژەمان پێدا، لەو وتارەدا راستیەك هەیە ئەویش ئەوەیە شێخ وای نەزانیووە حکومەتی ئێرانی دەتوانێت هێزی تەواو بنێرێتە سەر هێزەکانی. وەکو بینیمان شا هێزێکی نارد لە ئەزموون و تەقەمەنییدا، زۆر باڵاتر بووە لە هێزەکانی شێخ.

سەرەڕای ئەمانە، شێخ عوبێدوڵڵا باش لە زمانی دیبلۆماسیەتی باڵیۆزو میسیۆنەرەکان نەگەیشتبوو، وەکو بەدیار دەکەویٚ ببووە نێچیری دۆستایەتی رووکەشانە و فرۆفێڵی دکتۆر کۆچران و قونسوڵ ئابوت و یاریدەدەری قونسوڵ کلایتۆن، رووکەشانە هاوسۆزیو بایەخی خۆیان بۆ شێخ بەدیاردەخستو بەنهێنی راپۆرتیان دەنووسی لە بابەت مەترسیی شێخ لەسەر ئەمن و ئاسایشی ناوخۆی ئێران و دەوڵەتی عوسمانیی، شێخیان والێکردبوو بڕوایان پێبکات بەوەی حکومەتەکانیان باوەڕ پێدەهێنن لەسەر پشتگیریی شێخ لە دژی دەوڵەتی عوسمانیی و ئێران.

شێخ حەقیقەتی حکومەتی عوسمانیی تێنەگەیشتبوو کە هێرش دەکاتە سەر کوردستان، لە کاتێکدا لە سەرەتاوە عوسمانییەکان ئاماژەی پشتگیرییان دابووە شێخ لەسەر خۆئامادەکردنی هێرش بۆ سەر ئێران، بۆیە شێخ عوبێدوڵڵا بە ئاماژەی پشتگیریی پێی وابووە لە حاڵەتی هێرشکردنە سەر ئێران، دەوڵەتی عوسمانیی بیٚ دەنگ دەبێت.

ساڵح ئەمین لەو بارەیەوە نامەیەکی شێخمان بۆ دێنێتەوە کە نووسیویەتی: "کاروبار بە چاکیی دەڕوا، بەم دواییە ئەحمەد بەگی راوێژکاری سوڵتان هاتووە بۆ ئەنجامدانی

هەندێ کاری نهێنی لە ناوچەکەماندا، ئەو دووڕوویییە نەبێت و خەڵکی کوردستان لە نێوان خۆیاندا رێککەون، بێگومان بەخێر کۆتایی دێت، هەموو حکومەتەکان هەقیان داوە بە ئێمە کە عەجەم دەستدرێژکارن"[178]. پشتبەستنی شێخ عوبێدوڵلا بە میسیۆنەرەکان بە جۆرێ بە هاوپەیمانیی خۆی دەژماردن، هەر ئەوانیش بوون لە ورمێ لە گەورەترین سەرکەوتنی سەربازیی بێبەشیان کرد، دەستتێوەرانی د. کۆچران و قونسوڵ ئابووت لە گەمارۆی سەر ورمێ لە ئاکامی نەخشەی پێشتر هاتبوو لەگەڵ حکومەتی ئێران کە هێزی ناردبوو بۆ رزگارکردنی شار، میستەر سبیر لەوکاتە لە ورمێ بووەو دان بەو راستیەدا دەنێت کە: "ئەگەر شێخ گوێی بە داواکاریی ئێمە نەداباو (24) سەعات هێرشەکەی دوانەخستبا، ورمێ دەکەوت و ئەوەی ئێمە لە ئاکامەکانی دەترساین، دەهاتە دی"[179].

دەستێوەردانی هێزەکانی ئەوروپی لە بەرژەوەندیی ئێران و دەوڵەتی عوسمانیی بە هۆکارێکی بنەڕەتیی دادەنرێ لە هەرەسهێنانی جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵلا، بەتایبەتی سیاسەتی هەمبەری هێز کە زامنی پاراستنی ئاسایش بووە لە سەدەی نۆزدەهەم، ئەورووپا هۆکاری لە باریەك بردنی ئەو بزووتنەوەیە بووە، ئەمە پێشتریش هۆکاری رووخانی زۆربەی جوڵانەوەکانی کوردی بووە، ئەو کات و دواتر سیاسەتی بەریتانیا بەرگری لە ڕووسیای قەیسەری بووە لە فراوانخوازی بە ئاڕاستەی باشوور لە ناو دەوڵەتی ئێرانیی و عوسمانیی، چونکە دەستبەسەراگرتنی دەوڵەتی عوسمانیی، یان لێك هەڵوەشاندنەوەی مانای دەرفەتدان بووە بە رووسیا بۆ دەستبەسەراگرتنی گەرووی بەسفۆڕ و دەردەنیل و کەنداوی فارس، ئەمەش بەرژەوەندییەکانی بەریتانی لە دەریای سپی ناوەڕاست و هیند دەخستە مەترسییەوە، لەبەر ئەوە هەر ناکۆکییەکی ئێرانیی - عوسمانیی لای بەریتانیا نەخشەی رووسیایە بۆ درووستکردنی بارودۆخێك هەتا دەرفەت وەربگرێ پێگەی خۆی لە ناوچەکە لەسەر حیسابی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا پەرەپێبدات، بەریتانیا سووربووە لەسەر ئاشتیی نێوان دەوڵەتی ئێرانیی و عوسمانیی، هەروەها سوور بووە لەسەر پاراستنی یەکیەتی خاکی ئەو دوو دەوڵەتە و بە درێژایی

[178] - هەمان سەرچاوە، ل174

[179] - The Foreign Doctor, pp.83-84

سەدەی نۆزدەهەم بە چاوی گومانەوە دەیڕوانییە جوڵانەوەکانی کورد، چونکە دەبوونە هۆکاری نائارامیی ناوچەکە[180].

هێرشی هێزەکانی شێخ عوبێدوڵڵا بۆ سەر کوردستانی ئێران قەیرانێکی جیهانیی درووست کرد، رووسیا ئەو هێرشەی بە بەشێك لە نەخشەی بەریتانیی ـ عوسمانیی دەزانی لە پێناو پەشێوی خستنە ناو ئێران، چونکە ئەوکات حکومەتی ئێرانیی پەیوەندیی پتەوی بووە لەگەڵ رووسیا، حکومەتی بەریتانییش گومانی هەبووە جوڵانەوەکە لە نەخشەی عوسمانیی بێت بۆ خۆدزینەوە لەو ئیلتیزاماتانەی هێزەکانی ئەورووپیی لە ڕێککەوتنامەی بەرلینی (1878) بەسەریاندا سەپاندبوو، بەتایبەتی ئەو بڕگانەی پەیوەندیی هەبووە بە چاکسازیی لە بەرژەوەندیی ئەرمەن، بەریتانیا نیگەرانی رووسیا بوو، دەترسا جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵڵا بە دەرفەت بزانێ بۆ پەرەپێدانی پێگەی خۆی لەناو خاکی عوسمانیی، بە ناوی بەرەنگاریی شاڵاوی کوردان، بێتە ناو خاکی ئێرانیی و دواتر حالەتی گەڕەلاوژەیی ناوچە سنوورییەکان سوودمەند بێت بۆ لکاندنی خاکی عوسمانی لە ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات بە خاکی رووس.

ناسرەدین شا لە لای خۆیەوە هەوڵی دەدا رووس قەناعەت پێبکات دەوڵەتی عوسمانیی، کوردی هانداوە بۆ درووستکردنی ئەو قەیرانە، هەتا رووس بێبەش بکات لەو دەستکەوتانەی لەم شەڕەی دوایی رووسیی ـ عوسمانیی بەدەستی هێناوە، کە لە ڕێککەوتنامەی بەرلین دا خۆی دەبینییەوە، ئەوەی شایانی باسە ڕێککەوتنامەکە مافی پاراستنی ئەو خاکەی رووس داگیری کردبوو لە ڕۆژهەڵات، دابوو بە ڕووس، بەتایبەت لە ئەردەهان و قارس و باتۆم. ئەمەو سەرەڕای مافی دەستێوەردانی رووسی لە کوردستان لە بەرژەوەندیی ئەرمەن و نەستۆریەکان، لە کاتێکدا دەوڵەتی عوسمانیی لە دوای فشارێکی زۆر نەبێت رازی نەبوو ڕێکەوتننامەکە قبوڵ بکات، ئەویش دوای فشاری گەورەی باڵیۆزی رووسی (جۆرج ئەگناتیف) لە ئەستەنبوڵ و ئەو یاداشتنامەی وڵاتانی ئەورووپیی دایان بە دەوڵەتی عوسمانیی لە نێوان دوو شت سەرپشکیان کرد: قبوڵکردنی ڕێکەوتننامە، یان بە تەنیا بەرەنگاری شەڕی رووسیی دەبێتەوە.

بەرهەڵستیی دەوڵەتی عوسمانیی هەڵقوڵاوی ئەزموونی مێژوویی ویلایەتەکانی ئەورووپیی ـ عوسمانیی بووە لە بەلقان، دەستێوەردانی وڵاتانی ئەورووپیی بە ناوی

---

[180]- Jwaideh, pt.1.pp.266-268

چاکسازیی دەستی پێکرد و بە پشتگیریی ئەو گەلانە بۆ جیابوونەوە دوایی هات، ڕۆژنامەی (بیرخ)ی ڕووسیی لە وتارێکی درێژی دا لەسەر جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵڵا نووسیویەتی: ورووژاندنی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ دژی ئێران و ڕووسیا سیاسەتێکی ناسراوی عوسمانییە، پێشتر عوسمانییەکان مەسەلەی ئەلبانیان بەکارهێنا بۆ ئەوەی مۆنتینگر نەگات بە سەربەخۆیی[181].

هۆکارێکی تری بەهێزیی ڕووسیا بۆ جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵڵا بە بۆچوونی جوەیدە، لەبەر بارودۆخی ناوخۆی ڕووسیای قەیسەریی بووە، جوەیدە دەڵێ: "ڕووسیا تازە لە شەڕی شێخ شامیل و موریدەکانی ببۆوە، کە خەرجیی زۆری ویستبوو، جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵڵای بە زیندووکەرەوەی ئەو کەلەپوورە جیهادیەی تەریقەتی سۆفیگەری زانیوە، دەترسا سەرلەنوێ لە قەوقازیشەوە سەرهەڵبداتەوە"[182].

ئێرانییەکان بڕەویان بەو پڕوپاگەندەیە دەدا کە دەوڵەتی عوسمانیی داگیرگەکانی لە بەلقان لە دەست داوە و دەیەوێ مەسەلەی یەکیەتی موسڵمانانی سوونە بوروژێنێت، ئەوەش بۆ دەربازبوون لە دەسەڵاتی شیعە لە ئێران و ئیستیعماری ڕووسی لە ویلایەتەکانی ئاسیای ناوەڕاست و قەوقازیا بۆ لکاندنی ئازەربایجان و کوردستان بە ڕێگەی جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵڵا، وەکو هەنگاوی یەکەمی ئەو سیاسەتە بە دەوڵەتی عوسمانییەوە.

حکومەتی بەریتانی لایەنێکی تری نیگەرانیی ئاکامەکانی جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵڵا بووە، لە سەرەتاوە بەریتانیاو بەتایبەتی باڵیۆزەکەی لە ئەستەنبوڵ میستەر کوشن و قونسوڵ ئابووت لە تەورێز باوەڕیان وابووە حکومەتی عوسمانیی لە پشت ئەو ڕاپەڕینەوەیە بۆ خۆدزینەوە لەو ئیلتیزاماتانەی لە ڕێکەوتننامەی بەرلین دا هاتووە، بەرپرسەکانی ئینگلیز لە دەوڵەتی عوسمانیی لە سەرچاوە ئەرمەنییەکانەوە ئەو بابەتانەیان وەردەگرت. مۆن سیۆر کەسایەتی ئەرمەنیی لە کوردستان لە ڕاپۆرتێکیدا لە حوزەیرانی (1880ز)، واتە پێش مانگێك لە کۆبوونەوەی سەرۆکە کوردەکان لە نەهری، کە کۆمەڵەی سەرۆکە کوردەکانی لێ لە دایك بوو، دەڵێ: (بەم نزیکانە هەندێ

---

[181] - میرزا عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، 33. Kurdish Nationalist Movement, p.274

[182] - Kurdish Nationalist Movement, p.274

کەسایەتیی کوردیی بە هاندانی حکومەتی عوسمانیی کۆمەڵەیەکی کوردیی پێکدەهێنن، ئەمەش بۆ وورووژاندنی مەسەلەی کوردیی و لەبیرچوونەوەی مەسەلەی ئەرمەن)[183] .

هەروەها مسیو کەریمیان لە ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێ: هیچ گومانی تیانییە حکومەتی عوسمانیی لە پشت کۆمەڵەی کوردیەوەیە بۆ وورووژاندنی مەسەلەی کورد و دەستبەسەراگرتنی مەسەلەی ئەرمەن، ئەو کومەڵەیە ڕەنگدانەوەی سیاسەت و پەلهاویشتنی عوسمانیی بووە، شێخ عوبێدوڵڵا هەر بە ناو سەرکردایەتیی دەکات و سەرۆکی کردەیی بەحری بەگی کوڕی میر بەدرخان بەگ لە نزیکەکانی حکومەتی عوسمانیی بووە، لە کاتێکدا بەحری بەگ پێگە و دیاریی و سامان و هەتا هەڕەشە و سەرنجڕاکێشانیشی، نەك بە تەنیا لەگەڵ کوردی دەوڵەتی عوسمانیی، بەڵکو لەگەڵ کوردی ئێرانیش بەکارهێناوە بۆ پشتیوانی لە کۆمەڵە[184] .

ڕاپۆرتێکی تری مسیتەر کۆشن هەیە لەگەڵ ئەو ڕاپۆرتەی پێشتر باسمان کرد، دوای مانگێك نووسیویەتی و دەڵێ: (بەڵگەی یەکلاییکەرەوە نییە لەسەر دەستێوەردانی دەوڵەتی عوسمانیی لە یاخیبوونی کوردیی، بەڵام هەندێ بەڕێوەبەرایەتی سیاسییی لە قەسر هەیە بە نهێنی ڕووداوەکانی کوردستان دەوروژێنن). قونسوڵ ئابوتیش جەختی کردۆتە سەر قسەکانی کۆشن و دەنووسێ: (هەندێ بەڕێوەبەرایەتی پارێزگار لە دەوڵەتی عوسمانیی بۆ وورووژاندنی دەمارگیریی ئسلامیی دژی دەوڵەتانی ئەورووپیی، پشتگیریی بزووتنەوەی شێخ عوبێدوڵڵا دەکەن)[185] .

بەڵام میجەر ترۆوتر قونسوڵی ئەرزڕۆم دەڵێ: بانگەشەی تێکەڵکردنی عوسمانییەکان لە جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵڵا تەنیا شتێکە و لەو پشتگیرییەوە هاتووە کە ڕۆژنامەکانی ئەستەنبوڵ بە شێخیان داوە[186] .

میستەر تومیسون باڵیۆزی بەریتانی لە تاران هۆکارێکی تر دێنێتەوە بۆ ئەو گومانەی بەریتانی و بڕوای وایە حکومەت ڕازی نەبووە لەسەر ئەو پشتگیرییەی هەندێ لە

---

[183]- Enclosure in No, 6 letter From Monseigneur Krimian to the Armenian Patriarch, Van June 20, 1880. Turkey, No.5. (1881), p.6

[184]- In NO, 6, Letter from Monseigneur Krimiam to the Armenian Patriarch Van June 20, 1880. Turkey, No. 5. (1881) pp.6-7

[185] - میرزا عەزیز: ل44-45

[186] - Jwaideh, pt.1. p.241

ئەفسەرە بچووکەکان بە نهێنی پێشکەشی جولانەوەی شێخ عوبێدوللایان کردووە[187].
نامەکانی شێخ بۆ سەرۆکەکانی کوردو بانگەشەی ئەوەی سولتان پشتیوانیم لێدەکات فاکتەرێکی تری ئەو باوەڕە لای هەندێك کە بەراستی دەوڵەتی عوسمانیی پشتگیری کردووە[188]. والی هەکاری بۆ بابی عالی نووسیوە کە شێخ عوبێدوللا لە ناو کوردەکان بڵاوی کردۆتەوە کە سولتان پشتگیریی لێدەکات "بە فەرمانی سولتان نەبێت هیچ کارێك ناکات"[189].

هەردوو حکومەتی بەریتانی و ئێرانی دەوڵەتی عوسمانییان تاوانبار کردووە کە نەرمن لە بەرانبەر شێخ عوبێدوللا، چونکە ڕێوشوێنی توندیان لەو بارەیەوە نەگرتۆتەبەر. ئەمەش: یەکەم، ڕێوشوینی تەواوی پیادە نەکردووە لە نەهێشتنی پەڕینەوەی هێزەکانی شێخ بۆ ئێران. دووەم، لە کاتی گەڕانەوەی شێخ بۆ هەکاری دەوڵەتی عوسمانیی بە جددیی خۆی بۆ گرتنی ئامادە نەکردووە. ئێرانییەکان دەیانوت لە چەندین بۆنەدا داوامان لە حکومەتی عوسمانیی کردووە هێزی تەواو لەسەر سنوور دابنێت هەتا شێخ عوبێدوللاو لایەنگرانی لە کاتی ڕاوەدوونانی هێزەکانی ئێرانی لە تشرینی دووەمی (1880ز) هەڵنەیەت، لە کاتێکدا لە ئابی (1880) واتە چەند ڕۆژێك پێش ئەوە هێزەکانی شێخ عوبێدوللا بچنە ناو ئێران میستەر کۆشن لەگەڵ سولتان عەبدولحەمید روونی کردبۆوە کە شێخ عوبێدوللا مەبەستی رابوونی چەکداریی هەیە دژی ئێران، داوای لێکردبوو ڕێوشوێنی پێویست بگرێتە بەر بۆ نەهێشتنی، بەلام بێئاکام بووە[190]، حکومەتی عوسمانیی بە تەواوی نکۆڵی کردووە کە دەستی هەبێت لە جولانەوەی شێخ عوبێدوللا، لە سەرەتاوە حکومەت ڕایگەیاند شێخ عوبێدوللا ڕۆڵی لە ڕاپەڕینی کورداندا نییە، ڕەواش نییە شێخ بە تاوانی کوڕ و نەوەکانی بگیرێت. لە کاتێکدا شێخ لە سەرەتاوە بەیاننامەیەکی دەرکرد و نییەتی ئاشتیخوازانەی خۆی بەرامبەر حکومەت دەربڕی بوو، هیچ ڕۆڵێکی نەبووە لەوەی کوڕەکانی ئەنجامیان داوە[191].

---

[187] - میرزا: سەرچاوەی پێشوو، ل136-137

[188] - هەمان سەرچاوە، 134

[189] - Y.A. Res/1299 H Shawl 7 (August 21, 1882 .(

[190] - میرزا عەزیز: هەمان سەرچاوە، ل6-46,7-47

[191] ـ هەمان سەرچاوە، 110-111

وابەدیار دەكەویَ لە سەرەتاوە حكومەتی عوسمانیی هەوڵی دابێت شێخ لەو راپەڕینە بێتاوان بكات، بۆ ئەوەی گازاندە لەسەر خۆی لاببات، چونكە شێخ رەعیەتی دەوڵەتی عوسمانیی بووە، لە چەندین بۆنەدا ئێران و هێزەكانی ئەوروپی داوایان لە دەوڵەتی عوسمانیی كردووە هەندیَ رێوشوێنی پێویست بگرێتە بەر دژی شێخ، بەڵام بێئاكام بووە، بەڵام لە نامە ناوخۆییەكانی نێوان بابی عالی و دەسەڵاتدارە خۆجێیەكانی كوردستان و بەرپرسانی عوسمانیی باسی شێخیان كردووە بە"خراپەكار"و "بێئاقڵ"و "خاوەن بیری پیس"، وتوویانە جوڵانەوەكەی بەرئەنجامی مەترسیداری هەیە بۆ دەوڵەتی عوسمانیی، دەروازەی باڵا بە فەرمانی سوڵتان بانگەوازێكی بۆ كوردان دەركردوە و رایگەیاندووە بڕوا بە شێخ عوبێدوڵلا مەكەن لەوەی دەڵیَ كە سوڵتان پشتگیریم دەكات[192].

بەڵام لە ڕاپۆرتی كابتن كلایتن لە (5)ی تشرینی یەكەمی (1880) تێبینی دەكریَ لە ڕووداوەكانی راپەڕین دەسەڵاتدارانی عوسمانیی لە هەكاری لە ئاستی ئەو هەڵوێستەدا نەبوون بتوانن نەیەڵن كورد لە كوردستانی توركیا بەشداری جوڵانەوەی شێخ نەكات، ئەمەش لەبەر دوو هۆ: یەكەم، بەر لە ڕووداوەكە شێخ بە تەواوی باڵادەست بووە بەسەر هەموو ویلایەتی هەكاری. دووەم، سوپاو زەبتیەی عوسمانی لە ویلایەتی هەكاری لە مانگرتنی گشتگیردا بوون، چونكە ماوەیەكی زۆر بووە موچەیان وەرنەگرتبوو، بۆیە گوێڕایەڵیی فەرمان نەبوون. ئەوەش زیاتر نیگەرانی سوپا و زەبتكەرانی زیاد كردبوو، بڵاوبوونەوەی بێدەرامەتی و برسیەتی بووە لە ناوچەكە[193].

لە ئەم خستنەڕووەی سەرەوە روون دەبێتەوە ئەو تاوانانەی ئاڕاستەی حكومەتی عوسمانیی كراون بەوەی رۆڵی هەبووە لە جوڵانەوەی شێخ عوبێدوڵلا بەجدی تاوانباركردنە چونكە نكۆڵی لێكردنی ئاسان نییەو دەستێوەردانی هەقیقی لە ڕووداوەكان هەستی پێدەكرێت و بەرپرسانی ئێرانی و رووس و بەریتانی وەكو راستیی مامەڵەیان لەگەڵ كردووە، ئەگەر توێژەرەوانی تر بەڵگەنامەی دیكە لە ئاییندە بەدەست

[192] - Res. Y.A 1297/ 11/9848 Teleg. August 18, 1880: Teleg. 30 Aylul, 1296 (September 16, 1879.(

[193] - میرزا عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل41

بخەن لەسەر راستی ئەو پەیوەندییە، بەشێکی ئاسانی ئەو بەڵگەنامانەی عوسمانیی کە دەست نووسەر کەوتووە لە خانەی بەڵگەنامەکانی عوسمانی لە ئەستەنبوڵ پشتگیریی ئەوە ناکەن نەرمیی هەبووبێت لە نێوان دەوڵەتی عوسمانیی و شێخ عوبێدوڵڵا..

دەشێ لە ئاییندەدا توێژەرەوانی تر بەڵگەنامەیان دەست بکەوێ لەسەر پەیوەندیی نێوان شێخ عوبێدوڵڵا و عوسمانیی، بەڵام بۆ ئێستا ئەو ئەگەرانەی کە هەیە لەسەر هەڵوێستی حکومەت کە نەیتوانیوە هەڵوێستی توند وەربگرێ لە قەدەغەکردنی پەڕینەوەی هێزەکانی کوردی بۆ ناو خاکی ئێرانی. یەکەم، زۆر گونجاوە هێزەکانی ناوخۆیی کوردستان وەکو یەکێك لەو راپۆرتانە باسی کردووە توانایان هەبووبێت بۆ ئەو کارە، دووبارە دەگونجێ حکومەتی عوسمانیی لە سەرەتاوە ئاگادار بووبێت، بەڵام چاوی لێ پۆشی بێت هەتا بیکاتە ئامرازێك بۆ رزگاربوون لە فشاری حکومەتە ئەوروپییەکان لەسەر جێبەجێکردنی بەندەکانی رێککەوتننامەی بەرلین، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندیی بە مافی ئەرمەنەوە هەیە لە کوردستانی تورکیا، دەوڵەتی عوسمانی چەندان جار هەستی بەوە کردبوو حکومەتی بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ وەکو بە نهێنی لە دوای رێککەوتننامەی بەرلین لەسەری رێکەوتوون و هەردوولا واژۆیان لەسەر کردووە پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی عوسمانیی ناکات، ئەوەی شایانی باسە دەوڵەتی عوسمانی بەڵێنی لە بەریتانیا وەرگرتبووە فشار بخاتە سەر رووسیا هەتا لە ئەردەهان و قارس و باتومی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بکشێتەوە. دوور نەبووە بە نهێنی سوڵتان عەبدولحەمید لەگەڵ شێخ عوبێدوڵڵا رێکەوتبێت لەسەر هێرشکردنە سەر ئێران، ئەمەش بۆ لکاندنی کوردستانی ئێرانی سوونی بە دەوڵەتی عوسمانیی و جێبەجێکردنی بیرۆکەی جامیعەی ئیسلامی لەسەر متمانەی سوڵتان عەبدولحەمید، لەپێناو نەهێشتنی ئەرمەن لەدەستبەسەراگرتنی کورد، کە هێزەکانی ئەوروپی نەخشەیان بۆ کێشا بوو.

رۆڵی درووستی عوسمانیی لەو قەیرانە هەرچۆنێك بێت ئەوە ئێران بە جددیی مامەڵەی لەگەڵدا کرد و هەڕەشەی پەڕینەوەی کردووە بۆ ناو خاکی عوسمانیی و دەستپێکردنەوەی سەر لەنوێی شەڕی ئێرانی ـ عوسمانی، ئەمەش بەریتانیای زۆر ترساندووە، چونکە بەرژەوەندییەکانی لە ناوچەکە دەکەوتنە مەترسیەوە. میستەر تۆمیسۆن دەڵێ: ئەو ململانێیە رەهەندێکی جیهانیی دەبوو، هێزەکانی ئەوروپی نەیاندەتوانی بێلایەن بن و نەخزێنە ناوی، بۆیە بە درێژایی ماوەی راپەڕینی کوردان

هێڵی پەیوەندیی نێوان بیترسبۆرگ (پایتەختی رووسیای قەیسەری)و لەندەن گەرم بووە هەتا لێکحاڵی نەبوونی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە روو نەدات و نەبێتە شەڕی نێوان هەردوولایان، لەکۆتایدا هەردوو دەوڵەت توانیان یەك هەڵوێست گەڵاڵە بکەن و ئێران و دەوڵەتی عوسمانیی ناچار بێت بە رێگەی دیبلۆماسیی و هاریکاری ئیقلیمی دژی کورد ئەو قەیرانە چارەسەر بکەن، نەهێشتنی شێخ عوبێدوڵلا لە ناوچە سنووریەکان و دوورخستنەوەی بۆ حیجاز، بەرهەمی ئەو هەولانەیە[194].

بزاڤی شێخ عوبێدوڵلا هەردوو حکومەتی ئێرانیی و عوسمانیی ناچار بە کۆمەڵێك سازشی ئیقلیمی کردن، رووسیا بە روونی پشتگیریی ئێرانی دەکرد و لە حاڵەتی قەیرانەکە بە ئاشکرا رایگەیاند هێزەکانی بۆ هاوبەشیی لەگەڵ هێزەکانی ئێرانیی دەنێرێت و هێزی زیادە دەنێرێتە ناوچە سنووریەکان بۆ ئەوەی لە کاتی پێویست بە پەلە بەشداریی بکەن، پێگەی خۆی لە لای شا پەرە پێدا، شا لەلای خۆیەوە سازشی لەسەر هەندێ مەسەلەی ناکۆکیی نێوان رووسیا و ئێران کرد لە ئاسیای ناوەڕاست و قەوقازیا[195].

باڵیۆزی بەریتانی هەریەك لە تاران و ئەستەنبوڵی بڕوا پێهێنا پرۆتۆکۆڵێکی تایبەت واژۆ بکەن بۆ چارەسەری ئەو گرفتانەی بە هۆی هۆزە کوردەکانەوە سەرهەڵدەداو بە شالاوی خێڵەکیانە سنوور دەبەزێنن، هەروەها هەردوو دەوڵەت رێککەوتن لەسەر رێگەنەدان بە مافی پەنابەری سیاسییی و حەوانەوەی سەرۆکە کوردەکان لە هەردوو دەوڵەت، هەر لەو نووسراوەدا ئێران واژۆی لەسەر پرۆتۆکۆڵی کەشتیوانیی کردبوو لە ڕووباری کارون کە ماوەیەك بوو بەریتانیا داوای کردبوو، عوسمانییەکانیش ئیمتیازی بەکارهێنانیان پێدرا بۆ بازرگانیی[196]. هەر لەوێ دا ئێران ناچار بوو سوور نەبێت لەسەر جێبەجێکردنی بەندی ژمارە (60)ی رێکەوتننامەی بەرلینی تایبەت بە گەڕانەوەی قوتوور لەژێر دەسەلاتی عوسمانییەوە بۆ ئێران[197].

---

[194] - Jwaideh. Pt.1. pp.280-283

[195] - ساڵح ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل188، میرزا عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل31

[196]-FO, 60/446 NO, 34, Tabreez 29, 1882, FO, 60/446 Memo by Mirza Muhsin, dated 6th July 1881

[197] - ساڵح ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل191

# پوختەی توێژینەوە

بزاڤی شێخ عوبێدوڵڵا وەکو هەموو بزاڤە کوردییەکانی تری ئەوکات کاردانەوەی هەوڵەکانی عوسمانیی بووە کە بە ناوی چاکسازیی دەستی گرتبوو بەسەر دەسەڵاتی خۆکارگێڕیی لە کوردستان، بزاڤەکە بە ئەندازەیەکی کەم بەرگریی بووە لە بەرژەوەندیی کورد بە رووی گەندەڵیی کارگێڕیی دەوڵەتی عوسمانیی و زیادبوونی پێگەی رۆژئاوا و هەوڵی سەپاندنی هەیمەنەی ئەرمەنیی لە کوردستان.

هەروەها جوڵانەوەکە سوودی لە کەلەپووری تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرتووە لە پەیوەستکردنی بەرگریی لە ئیسلام و بەرژەوەندیی کورد کە پێیان دەگوت: کوردایەتیی "بەبێ بیری کوردایەتیی"، بەراستی شێخ عوبێدوڵڵا بە پێشەنگی کوردایەتیی دەژمێردرێت، چونکە پوختەی ئیسلامەتی لەگەڵ پالآفتەی کوردایەتی لە یەك تەرازوو دانابوو، هەوڵەکانی شێخ بۆ دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ و هەوڵی بەردەوامی بۆ بەدەستهێنانی پشتگیریی هێزەکانی ئەوروپی لەسەر بنەمای بڕاگماتی، وەکو گۆڕینی دۆستایەتی لە حکومەتی عوسمانییەوە بۆ حکومەتی بەریتانی، شارەزایی قوڵی شێخمان بۆ بەدیاردەخا لە هەمبەری هێزەکانی جیهانیی و کاریگەرییان لەسەر کوردستان.

شێخ عوبێدوڵڵا تێڕوانینی گشتگیری هەبووە بۆ کورد وەکو گەل، دوودڵ نەبووە لە پشتیوانیی ئەو راستیە "ئەمەش بە داواکاری کوردستانی سەربەخۆی یەکگرتوو بەدیار دەکەوێ"، نهێنی هێزی شێخ عوبێدوڵڵا لەوەدایە بە هۆی کەسایەتییەکی کارزماتی جەماوەرێکی زۆری لەدەور کۆببۆوە، بەمەش جوڵانەوەکەی بەراستی ببووە جوڵانەوەیەکی جەماوەریی، لەگەڵ ئەوەشدا کەسایەتی کارزماتی لە جوڵانەوەی کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست بووە هۆکاری نوشستی، چونکە بە کۆتایی هاتن، یان بە مردن، یان بە گرتنی سەرکردە، شۆڕشەکەشیان کۆتایی هاتووە.

# بەڵگەنامەکان

## FO\ 146

## Letter 7/12/1882

## " هەوڵی هەڵاتنی شێخ عوبێدوڵڵا "

شادمانم هەواڵتان پێبدەم کە شێخ عوبێدڵڵا هەڵاتووە و دووبارە گیراوەتەوە، شێخ و دوو لە کوڕەکانی لە بن دەستی پاسەوانی هێزەکـانی عوسمانیی بەڕێوەبوون بۆ موسل، هەتا بتوانین لەم هەموو هەواڵە لێڵ و تێکگیراوانە بگەینە ئەنجامێك، بڕیارماندا میرزا جەوادخان بنێرین بۆ هەکاری هەتا لەوێ پەیوەندیی بکات بە موسا پاشای فەرماندەی سەربازیی و راستییەکان روون بکاتەوە.

راپۆرتی میرزاخان کە بە نامەی نێردراوی موسا پاشا و مستەفا پاشا "دوو فەرماندەی سەربازی عوسمانین لە هەکاری = نووسەر" دڵنیامان دەکاتەوە لە وردەکاریەکانی و نووسیویەتی:

لە دوای زنجیرەیەك خۆخافڵاندن و هەوڵی دواخستنی سەفەر بۆ موسڵ، شێخ عوبێدوڵڵا رازی بوو بە یاوەریی کامیل بەگ نێردراوی تایبەتی سوڵتان و چەند سەربازێك، سەفەر بکات، کاتێك گەیشتنە گوندی (شەبتان) ـ ناوچەیەکە پڕە لە هۆزە کوردیەکانی لایەنگری شێخ ـ، لەوێ شێخ بە بیانووی نەخۆشی هاوسەرەکەی و بیانووی تر سەفەرەکەی راگرت، بەو هیوایەی کوردەکانی ئەو ناوچەیە پەیوەنـدیی پێوە بکەن بۆ شۆڕش و لە دیلیی رزگاری بکەن.

کامیل پاشا بۆی دەرکەوت شێخ نایەوێ بەردەوام بێت لەسەفەر بۆ موسڵ، هەڕەشەی لێکرد کە رێوشوێنی توند بگرێتە بەر، ئەمە وای لە شێخ کرد داوا لە سەرۆك هۆزەکانی ناوچەکە بکات کامیل پاشا و سلێمان پاشا بگرن، لەو ماوەیەدا کوڕی حەسەن بەگ (یەکێك بووە لەلایەنگرانی شێخ عوبێدوڵڵا) هەوڵی کوشتنی کامیل پاشای دا، تیرێکی لێداو ساقۆیەکەی دڕا، بە سەرسوڕمانەوە رزگاری بوو، بەڵام ئازاری پێنەگەیشت، بەو شێوەیە سەرباز و ئەفسەرە تورکەکان بوونە دیل لە لای شێخ، پێش ئەوەی عەبدولقادری کوڕی بە ڕووداوی شەبتان بزانێت و هێزێك بنێرێ بۆ رزگارکردنی باوکی، کامیل پاشا بە بەرتیل دوو کەسی نارد هەواڵ بدەنە موسا پاشا و مستەفا پاشا هەتا بە زوویی هێزێکی سەربازیی بنێرنە ناوچەکە، هەر لەو ماوەیە شێخ عوبێدوڵڵا

سەرلەنوێ کەوتەوە خۆئامادەکردنی شۆڕشی کوردی، بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندیی بە هۆزەکانەوە کرد، بەڵام خێرا هێزەکانی عوسمانیی گەیشتنە ناوچەکە، شەبتان و شێخ عوبێدوڵڵا گەمارۆدران.

هێزەکانی عوسمانیی بە تۆپ لە شەبتانیان داو نزیکەی دوو سەد کەس لە هێزەکانی شێخ عوبێدوڵڵا کوژران، ئەوە شێخی ناچار کرد یەکێك لە لایەنگرانی بنێرێتە دەرەوەی قەڵا و ئاڵایەکی سپی بەرز بکاتەوە، بەمە شێخ ویستی خۆی بەدەستەوە بدات، بە ماوەیەکی کەم یەکێك لە ئەفسەرەکانی سوپا بە ناوی حوسێن پاشا هات بەرەو قەڵاو شێخ عوبێدوڵڵا هاتە دەرەوە، داوای خۆبەدەستەوەدانی کرد، حوسین بەگ بە هێز بەسەری رای کێشا و تفی کرد بە رووی شێخ، بۆ ئیهانەکردنی داوای لێکرد لە ناوەڕاستی کۆمەڵە سەربازەکە بوەستێ.

حوسێن پاشا کامیل بەگی رزگار کرد و بای دایەوە بەلای شێخ، کەوتە جوێندان بە شێخ، بە"ئێزیدی"و "بەراز" ئیهانەی کرد، شێخ رووی لە کامیل بەگ کرد یارمەتیی بدات، بەڵام ئەو وتی هەتا ئێستا سەرکۆنەی زۆر کراوم لەسەر رێز و مامەڵەی باش لەگەڵ تۆ، بە شێخی وت کردەوە ناشیرنەکانت شایستەی لێبووردن نین، جوێنی بە شێخ دا بەوەی: لە بەراز خراپتری، موحەممەد سادقی کوڕی شێخیش گیراو هێزەکانی عوسمانیی باری (300) هێستری شێخ عوبێدوڵڵایان دەست بەسەرداگرت و کەلوپەلی خەڵکی شەبتانیان تالآن کرد، ئەو کوڕەی حوسێن بەگیان گرت کە پێش ماوەیەك بە تیر هەوڵی کوشتنی کامیل بەگی دابوو، مەلا ئەحمەدیشان گرت، کە یەکێك بوو لەو زانایانەی دەرسی شەرعی بە کوڕەکانی شێخ عوبێدوڵڵا وتبۆوە لە نەهری و ئیمامی مزگەوتی نەهری بوو. هەروەها قاچ و دەستی شێخ عوبێدوڵڵایان بەستنەوە و بە ئیهانە و بە سواری کەر و بە هێز و پاسەوانی عوسمانییەوە بردیان بۆ موسڵ، وەهاب ئەحمەد بەدرخان و سەرۆك هۆزە کوردەکانی لایەنگرانی شێخ هەموو گیران، شێخ عەبدولقادریش بیستی چی بەسەر باوکی هاتووە ناچار خۆی دا بەدەستەوە و داوای لە لایەنگرانی کرد بڵاوەی لێبکەن، ئەمیشیان گرت و لەگەڵ باوکی رەوانەی موسڵیان کرد، بەو شێوەیە موسا و مستەفا پاشا بە یەکە سەربازیەکانیانەوە گەڕانەوە، دوای ئەوەی ئەرکی خۆیان لە گواستنەوەی شێخ و بنەماڵەکەی بە هێز و سەربازی تەواوەوە بە سەلامەتی گەیاندیانە موسڵ.

ئێستا شای ئێران بە بیستنی ئەو هەواڵە زۆر دڵخۆشە، کاروباری نێوان ئەو دوو وڵاتە دەگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی، منیش دەبێت بۆ راپەڕاندنی هەندێ ئەرك بچمە تەورێز.

واژۆ: مـیرزا جەوادخان

## چاوپێکەوتنێکی مێژوویی دانسقە لەگەڵ شێخ عوبێدوڵڵا فـەرمـاندەی راپەرینی کوردستـان 1881[198].

تـەورێز/ 1881/1/1ز

وەزارەتی دەرەوە، ژمارەی دۆسیە 60/441

ژمـارەی بەڵگەنامە (23) زۆر نهێنی

گەورەم ئێرڵ ئۆف کرانفڵ

پێشترو لە یاداشتنامەی ژمارە (27) ئاماژەمان بە مەسەلەی شێخ عوبێدوڵڵا کردبوو، لەگەڵ ئەوەدا شەرەفمەندیی بوو بۆ من لە ساڵی رابردوو نامەم بۆ ناردن، ئێستاش هۆکاری مانەوەم ئەو شەرەفەیە لە ئەستەنبوڵ چاوم بە شێخ بکەوێ، لەم رۆژانە و لە ناوەندە سیاسییەکان سەنگی خۆی هەیە، کورتەی ئەو چاوپێکەوتنەتان بۆ دەنووسم لە نێوان من و شێخ دا ئەنجام درا، لەگەڵ پێشەکییەکی کورت لە باسی شێخ و کەسایەتیی ئەو، بەهیوام شایستەی بایەخپێدانی ئێوە بێت.

لە ساڵی رابردوو بە ناوچە کوردیەکاندا (ورمێ)م بەجێهێشت و بە لای نوێنەری شێخ عوبێدوڵڵادا تێپەڕیم، قسەم لەگەڵدا کردن، ئامادەیی شێخیان نیشاندا لەو کاتەی بە ناوچە سنووریەکاندا دەڕۆم پاسەوانی تایبەتییم بۆ دابین بکات، گومانم نەبرد، ئەوە منم بە ئاڕاستەی سەربازگەی شێخ بەڕێ دەکەوم بۆ وەرگرتنی پاسەوانی تایبەت، دووبارە ئەوەش ئەدەب و گەورەیی بوو، من خۆم لە دەوارەکەی سەردانی شێخ بکەم، لە پێشەوە سوپاسم کرد لەسەر ئەو بایەخەی بە پاراستنی منی داوە.

وا دەرکەوت شێخ سەردانەکەی گۆڕی بوو بۆ سەعاتێکی تەواوی گفتوگۆی نێوان من و خۆی، گەرچی خۆم ئامادە نەکردبوو، بەڵام لەگەڵ گەیشتمە دەوارەکەی فەرمانی دا بە هەموو ئەوانەی لە دەوری بوون بچنە دەرەوە هەتا پێکەوە لە ڕەشماڵەکەدا ماینەوە.

---

198 - ئەم بەڵگەنامە مێژووییە بە زمانی عەرەبی لە گۆڤاری (ئاڵای ئیسلام)ی ژمارە (3،2)ی نۆڤێمبەری 1995ز ساڵی پێنجەم بلاوکراوەتەوە. "وەرگێڕ".

دان بەوەدا دەنێم کە زۆر سەرم سوورِما چاوم پێی کەوت، چونکە هەرگیز ئەو کەسە مەترسیدارە نەبوو کە لە کتێبی شین[199] و سەرچاوەکانی تر بۆ خەڵکیان وێنا کردبوو.

سەرەڕای ماندویەتی و مەینەتیی رۆژگار بەسەر ڕوویەوە، نەرم و نیانی بە ڕووە پڕ سۆزەکەیەوە دیار بوو، لە چاوەکانی رامابای هەستی ناسك لە کەسایەتیی سەرنجراکێشی رەنگی دەدایەوە.

ماندوویەتی و شوێنەواری نەخۆشیی نەیانتوانیبوو لە ورەی کەم بکەنەوە، ئەمەش بەڵگە بوو بۆ کەسایەتیی ئەو شێخەی زۆر کەس گەواهی بۆ داوە کە بۆتە خاوەن شکۆی گەورە لە کوردستان، بەڵام دەم و بەتایبەتیش شەویلاگی خوارێی بە بەراورد لەگەڵ چاوە نیگابەخشەکانی کە پڕ سۆز و نەرمیی بوون هەندێ جار مەترسی لێ دەباری، باڵای شێخ دەستە بوو، ئەوەی لە ڕووخساری بڕوانێت وادەزانێت تەمەنی لە چل و پێنج ساڵ تێپەر ناکات، لە ڕاستیدا زۆر لەوە بەتەمەنترە، ریشێکی کەم بە بۆیاغ رەشی کردبوو، ئەوەی لێی تێگەیشتم شێخ عوبێدوڵڵا خاوەن ئیرادە و عەزم بوو، زۆر بە توانا بوو لە کارتێکردنی دەورووبەری و بزواندنیان لە پێناو ئامانجەکانی دا، شارەزای زمانی عەرەبیی و تورکیی بوو، بەڵام شوێنەواری زمانی دایك (کوردی) بە قسەکانییەوە دیار بوو، هەروەها شارەزایی فراوانی لە زمانی عەرەبیی دا هەبوو.

ئاگاداریان کردمەوە شێخ زۆر شادمانە بە گەیشتنی من بە ورمێ، واتە گوێبستی گەیشتنی نوێنەری حکومەتی خاوەن شکۆ (پاشایەتی) بۆ ناوچەکە، ئەمەی بەدەرفەت زانی بوو هەتا ئامانجە شاراوەکانی لەمەڕ شاڵاوەکەی بۆ خاکی ئێران بەدیار بخات، بە قسەی خۆی نییەتپاکیی پاڵی پێوە ناوە.

لە وەڵامدا منیش خۆشحاڵیی خۆم بە ناسینی ئەو دەربڕی کە زۆرم لە بارەیەوە بیستبوو، چاوەڕێم نەدەکرد پشکم لە دیداری ئەودا هەبێت، ئەوەم دەربڕی خۆشحاڵم و رێزم هەیە بۆی کە رێزم لێدەگرێ و بەناوبژیوان قبولم دەکا لە لای هاووڵاتیە مەسیحیە نەستۆریە لادێیەکان، ئەوانەی لە ماوەی شەڕ لایەنگرانی شێخ تاڵانیان کردبوون. دواتر

[199] - کتێبی شین: بەو بەڵگەنامە دیبلۆماسییانە دەوترێت، کە هەڵوێستی حکومەت لە بابەت زۆر لە مەسەلە سیاسییەکانی تێدا روون دەکرێتەوە و دابەش دەکرێ بەسەر دیبلۆماس و قونسوڵیەو نێردراوەو رێکخراوەکان، لێرەدا بە راپۆرتی بەریتانیەکان دەوترێت کە لە لایەن وەزارەتی پەیوەندییدارەوە وەکو رێنومایی بۆ نوێنەرەکانیان لە ناوچەکەدا دەردەچووە. "وەرگێڕ".

پرسیارم لێکرد بەرنامەی چیە؟ لە وەڵامدا گوتی دەمەوێ دووبارە کوردستان ڕێکبخەمەوە، پرسیارم لێکرد چۆن بیر لەو بیرۆکەیە دەکاتەوە لە کاتێکدا هیچ بیانوویەك نییە شۆڕش لە دژی ئێران بکەیت، یان بە ڕووی تورکیادا هەڵگەڕێیتەوە. قسەی لەسەر ئەو بابەتە کرد و وتی: هەردوو دەوڵەتی ناوبراو مامەڵەیان لەگەڵ کورد خراپ بووە، سەبارەت بە عوسمانیی تەقدیری نییەتپاکیی ناکرێت، شێخ رایگەیاند کوردستان پێویستی بە کارگێڕییەکە بە دەستی ئاسنین حوکمی بکات، کەسێك نەبوو لەو راستیە تێبگات، لێرە بە شێخم وت: ئەمە زۆر وردە، لێم پرسی مەبەستی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی جیای هەیە لە دەوڵەتی عوسمانیی، یان بە تەنیا ئامانجی کۆکردنەوەی ناوچە کوردیەکانە لە ژێر ئیدارەیەك کە زاڵ بێ بەسەر گەڕەلاوژەیی و جۆرێك لە ئارامیی و ئاسایش دابین بکات، لە سەرووی ئەو رژێمە ئیداریەی ئێستاوە بێت و لە بەرانبەر سوڵتان بەرپرسیار بێت بۆ زەمانەتی ئیدارەیەکی باش و کۆکردنەوەی باج؟ شێخ لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا وتی: کەسێك نییە گومانی هەبێت لە گوێڕایەڵی من بۆ سوڵتان، بەڵام ئەو بە چاوی رێز و تەقدیرەوە سەیری بەرپرسان (پاشایانی هەرێمەکان) ناکات، بەڕاستی شێخ لەسەر ئەو باوەڕە بوو کاتی ئەوە بەسەرچووە کارێك نەکرێت بۆ بەرژەوەندیی کوردستان، شێخ گەلەکەی خۆش دەوێت و بە پێویستی دەبینێت کاروباریان چاك بێت. راستە کورد نەخوێندەوارن و حەز بە زەبت کردن ناکەن و لە بێ سەرەوبەرەییدان، بەڵام شێخ عوبێدوڵڵا دەیەوێت ئەو نەخۆشییە کۆمەڵایەتییە چاك بکات هەتا گەلەکەی بگاتە ئاستێك بگونجێت لەگەڵ ژیانێکی کۆمەڵایەتی شایستە بە ئادەمیزاد. دواتر شێخ وتی مامەڵەی ئێران لەگەڵ کورد مامەڵەیەکی ریسواییە، لە سێدارەدان و کوشتن و قینی لە ڕادەبەدەر، سەرەڕای ئەمە هەرچی مرۆڤ بەلایدا دەچێت، هەڵسوکەوتی خراپی دەسەڵاتدارانی ئێرانیدا هەیە بەرانبەر بە کورد، هیچ رێوشوێنێکیان نەگرتۆتەبەر بۆ مایل بوون بە لای هۆزە کوردەکانەوە، ئەمەش دەمارگیریی کوردانی جۆش داوە هەتا ئاستی دواکەوتوویی.

لەگەڵ ئەوەدا لەو مەسەلانە لەگەڵ شێخ و بۆچوونەکانی کۆك بووم، بەڵام ناچار بووم کات بەسەر بەرم و بێدەنگ بم، دەیوت ناوچەی (هۆجە) دەکەوێتە ناو سنووری تورکیی ـ ئێرانیی و لەژێر دەسەڵاتی تورکیایە، ساڵی رابردوو کەوتە بەر شاڵاوی تاڵان و دەستبەسەراگرتنی هۆزی شکاك و ئەو هۆزە کوردانەی لە ئێران دەژین، هەتا ئێستاش

حکومەتی ئێرانی هیچ ڕێوشوێنی نەگرتۆتەبەر بۆ ئەو شاڵاوانە، هەروەها دەرفەتی ئەوە نەدراوە کارێك بکات بۆ بەرگریی لە هۆزە زیان لێکەتووەکانی ژێر دەسەڵاتی تورکیا.

لە درێژەی قسەکانیدا، شێخ عوبێدوڵڵا دەیوت: هۆزی شکاك سەرچاوەی نائارامیی ناوچەکەن، نەك بە تەنیا بۆ هۆزەکانی ژێردەسەڵاتی شا لە ناوچەی (سەلماس)، بەڵکو هەمان دەستدرێژییشیان لە دژی هۆزە کوردیەکانی ژێر دەسەڵاتی سوڵتان لە تورکیا بەتایبەتی لە ناوچەی (الباغ) ئەنجام داوە، بۆ نموونە بەم دواییە تاوانیان کردووە، لە ناو خاکی تورکیا هێرشیان بردۆتە سەر ئەرمەن، ناتوانین باسی خراپەکارییان بکەین لە بڵاوکردنەوەی وێرانیی لە ناو خاکی بەرفراوانی ناوچە سنوورییەکان، حکومەتی ئێرانی هیچ زیانی زیان لێکەوتووانی نەبژاردووە، بە ناوی شاڵاوی ناوبراوەوە بەرتیلی زۆریان لە سەرۆکی شکاك وەرگرتووە، بەرپرسانی ئێرانیی بۆ لابردنی لەکەی ئابڕوویان لە ئازەربایجانەوە گەڕانەوە بۆ تاران و ڕاپۆرتێکی پڕ لە درۆیان داوە بە (شا) و دەریان وتوویانە کە سزای سەرۆکی هۆزی شکاکیان داوەو کەوتوونە پڕوپاگەندە بەوەی نیزام و ئۆقرەیی و ئاسایش لە ناوچە سنوورییەکان باڵادەستە، بۆیە شێخ رایگەیاند کە لە سنوور پەڕیوەتەوە بۆ ناو خاکی ئێرانیی بە مەبەستی وەستاندنی ئەو پێشێلکاریی و زوڵمەی کراوە دەرهەق بەو هۆزە کوردانەی لە ژێر دەسەڵاتی تورکیا دان، هەروەها ڕایگەیاند گوێڕایەڵیی تەواوی سوڵتانە، دواتر پرسیارم لێکرد ئەگەر مەبەستی فراوانکردنی شۆڕشی هەیە بۆ ناوچە کوردیەکانی تورکیا ئەوە ریشەی ئەم کارە مەترسیدارە و سوور بووم ئامۆژگاریی بکەم لە ڕێگەی میرکور (میرکەوە = وەرگێڕی عەرەبی) بکشێتەوە بۆ نیشتیمانی ئەسڵیی خۆی، وەڵامی شێخ ئەوە بوو: وشەیەکی حکومەتی ئینگلیز بەسە قەناعەت بهێنم لە هەموو خاکی ئێران بکشێمەوە، من بە بیرم هێنایەوە چالاکییە جەنگیەکانی ئەوی خستۆتە گۆشەیەکەوە بە هیچ شێوەیەك نەتوانێت پەیوەندیی لەگەڵ حکومەتی خاوەن شکۆی پاشایەتی بەریتانی و هەتا نوێنەری حکومەت لە تاران هەبێت، بۆم ڕوونکردەوە دەسەڵاتی ئاگربەستی نێوان ئەو و ئێرانم نییە، بەو سیفەتەی نوێنەری حکومەتی بەریتانیم لە بارەگای مانەوەی وەلی عەهدی ئێرانی لە ئازەربایجان، ئەوپەڕی نائارامیی و نیگەرانیی خۆم لە شاڵاوی شێخ بۆ ناو خاکی ئێران دەربڕی، پێم وت: ئەگەر ئەو بە کردەوە سکاڵای لە دژی حکومەتی ئێرانیی و تورکیی هەیە، ئەوە کردەوەکانی ئێستای "هێرش بۆ سەر هێزەکانی

کوردستانی ئێران = وەرگێڕی عەرەبی" لە هیچ حاڵەتێکدا لە بەرژەوەندیی ئەودا نییە، بە بیرم هێنایەوە ئەگەر بەردەوام بێت لە هێرشەکانی بە ئاراستەی تەورێز، لەوێ دەکەوێتە بەرگریی بەرانبەر هێزەکانی رووسی، ئەوکات لەوێ پڕوپاگەندە هەبووە رووس هێز لە ناوچە سنوورییەکانی نزیك ئاراس (سنووری ئێرانی ـ رووسی) کۆدەکاتەوە.

وەڵامی شێخ ئەوە بوو ئەگەر رووس هێرشی بۆ بکات ئەوە خۆی لە باوەشی ئینگلیز دەهاوێ، پێموت مەحاڵە پشت بە هاوکاریی و پشتگیریی ئێمە ببەستێ، پێویستە بزانی پەیوەندیی پتەو لە نێوان بەریتانیا و حکومەتی ئێرانیدا هەیە، حکومەتی بەریتانی رازی نابێت ئێران "وڵاتی هاوپەیمان" لە هەر لایەك بێت تووشی دەستدرێژیی بێت، دوایی هاتینە سەر مەسەلەی ئەرمەن، نیگەرانیی زۆری دەربڕی لە چارەنووسی ئەرمەن کە هەڕەشەی لەناوچوونیان لەسەرە، پرسیارم لە شێخ عوبێدوڵڵا کرد ئەگەر لە بەرنامەکەی سەرکەوت و ئەوەی ویستی بۆی هاتەدی، چی لە ئەرمەن دەکات؟ ئەوەشم بۆ روونکردەوە حکومەتی بەریتانی چاودێریی جالیەی مەسیحیی دەکات و رێگە نادات هیچ جۆرە چەوسانەوەیەك لە دژیان ئەنجام بدرێ، رازی نابێت لە هیچ حاڵەتێك وەکو گەلێك لە ناوچەکە لەناو ببرێن.

شێخ خێرا وەڵامی دایەوە، کە ئەگەر کوردستان لە ئەو بەرپرسیار بێت، ئۆباڵی زەمانەتی مامەڵەی باش لە ئەستۆ دەگرێ لەگەڵ ئەرمەن، لەوێ هیچ ئاستەنگێك لەر بەرانبەر ئەرمەن نابێت، ئەگەر بیانەوێ کۆچ بکەن بۆ شوێنەکانی تر، ئەم وەڵامەم بە لێڵ دانا، بۆیە وازم لێهێنا بێئەوەی هیچ بڵێم، دوایی شێخ تکای لێکردم و سوور بوو داواکارییەکەی بگەیەنمە حکومەتی بەریتانی و جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە ئەمڕۆ پێویستی بە بەدەستهێنانی پشتیوانیی مەعنەویی بەریتانیایە بۆ پڕۆژە تایبەتیەکەی لە رێکخستنەوەی کوردستان.

وتم لاریم نییە لە کاتێکی گونجاودا ئەو قسانەی نێوانمان بگەیەنمە نەزارەتی حکومەتی بەریتانی، بەڵام رێگە بە خۆت مەدە ببێتە پێ پەستی خەون و خەیاڵاتی دوور لە ڕاستیی، بە بیرم هێنایەوە خەونە سیاسییەکانی زۆر دوورن لەوەی لە واقیع لێك بدرێتەوە و ببێتە دی، هەرچەندە رەزامەندییشم دەربڕی لە گەیاندنی داواکارییەکانی بە حکومەتی خاوەن شکۆی پاشایەتی بەریتانیا.

لەوکاتەی قسەمان گەیشتە ئەو خاڵە، لەو بڕوایەدا بووم ئێستا گونجاوە بە زمانێکی روون شێخ بەم چەند قسەیە ئاگادار بکەمەوە لە هەڵوێستی درووستی خۆم لەسەر بەرنامەکەی ئێوە: هەتا ئێستا هەست بە لێڵی دەکەم لەو بەرنامەیەی بۆ منتان خستە روو، لەو کاتەی دەیخەمە بەردەم حکومەتی بەریتانیا ناتوانم بیکەمە وێنەیەکی باش، چونکە حکومەتەکەم پشتیوانیی لە هیچ پڕۆژەیەك ناکات زیان بە بەرژەوەندیی هاوپەیمانەکەی (ئێران) بگەیەنێت، هەروەها پشتیوانی مەعنەویی هیچ نەخشەیەك ناکات زیان بە بەرژەوەندیی جالیەی مەسیحیی بگەیەنێت لە ناوچەکەدا، نامانەوێت بەرژەوەندییەکانی ئەرمەن بێتە دی لەسەر حیسابی بەرژەوەندییەکانی کورد، دووبارە قبوڵی ناکەین بەرژەوەندییەکانی کورد بێتە دی لەسەر حیسابی بەرژەوەندییەکانی ئەرمەن، پێم وت: من وەکو خۆم ئەو ڕێزە لە بیر ناکەم کە لە منتان نا، بەم شێوەیەش ئامۆژگارییتان دەکەم:

بەڵگەی تەواوم بدەیە لەسەر ئەندازەی گوێڕایەڵییتان بۆ فەرمانەکانی سوڵتان، هێزەکەت لە خاکی ئێران بکشێنەوە بۆ شوێنی ئەسڵی خۆتان لە تورکیا، ئەگەر بڕوات بە سکاڵا هەیە بیخەمە بەردەم نەزارەتی دەوڵەتی خۆتان هەتا یەکەم جار سوڵتان ئاگادار بکەمەوە لە نەخشە و بەرنامەکەت، پێشبینی هیچ هاوکاریی، یان پشتگیریی لە حکومەتی بەریتانیا مەکە و کارێك بکە لە پێناو چەسپاندنی هێمن و ئاسایش و ئۆقرەیی ناوچە سنوورییەکان، تێبکۆشە لە پێناو پشتیوانیی لە مافی هاووڵاتیی بە موسڵمان و مەسیحیەوە بێ جیاوازیی، گیانی نیزام و توندوتۆڵیی لە ناو کورددا بڵاو بکەوە.

پێموت: ئێمە گرنگیی بە بەرژەوەندیی کورد دەدەین بە ئەندازەیەك کەمتر نەبێت لەو گرنگییەی بە بەرژەوەندیی ئەرمەنی دەدەین، ئەمە ئامانجی حکومەتی خاوەن شکۆی پاشایەتی بەریتانییە کە پشکی لەۆ شکۆمەندی ئەو کارەدا هەیە، حکومەتەکەم خۆشحاڵە ئەگەر کارێکتان ئەنجام دا بە قسەی ئەو بێت، ئەگەر دەتانەوێ بە چاوی سۆزەوە سەیری داواکارییەکانتان بکرێ، ئەوە ئەو ئەرکەی دەکەوێتە سەر شانتان بەڵگەی باوەڕپێکراوی دەوێ، کە ئێوە بەوپەڕی دڵسۆزیی لە پێناو ئامانجە سەرەکییەکانی بەریتانیا کار دەکەن لە ناوچەکەدا، هەروەها پێویستە لەسەرتان بیسەلمێنن کە گوێڕایەڵی سوڵتانن.

هەتا ئێستاش هیچ لە نوێنەرێکی حکومەتی خاوەن شکۆی پاشایەتی وەکو من ئەو دەرفەتە زۆرەی دەست نەکەوتووە لە نزیکەوە هەڵسەنگاندنی بابەتیانە لەسەر

ئامانجەکانی شێخ عوبێدوڵڵا بکات، وا بە دیار دەکەوێ ئەو ئێستا لە کەسایەتییە ناودارەکانی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانییە، شۆڕشەکەی کارێکی وا ئاسان نەبوو، دەگونجێت ئەو رۆڵی هەبێت لە سیاسەتی رۆژهەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیی، ساڵێك بەسەر ئەو گفتوگۆیەمان تێپەڕیی، زۆر ئەرکی رابردووم لەسەر مابۆوە، سەرنجەکانم نەنووسیبۆوە، دوایی فشارم خستە سەر خۆم کە دووبارە لەسەر شێوەی یاداشتنامەیەك بۆ بەڕێزتانی بنووسمەوە، ئەمەش سەر رۆشنایی بەڕێزتان بەو بابەتە.

بایەخدانی بەرچاوی ئێوە بە بەرژەوەندییەکانی ئەرمەن لەگەڵ ئەو هەوڵانەی دەیدەن لە پێناو دابینکردنی پێکەوەژیانی ئاشتییانەی نێوان کورد و ئەو ئەرمەنانەی لە ناوچە کوردیەکان دەژین، لە کارە پێشینەکانی سیاسەتی بەریتانیایە لە ناوچەکەدا، کاتی ئەوە هاتووە یاداشتنامەتان بۆ بنووسم، بەو هیوایەی ئەمە بە سوود بێت بۆ بەدیهێنانی ئامانجی ئاشتەوایی.

من ناتوانم حوکم بدەم لەسەر ئەندازەی راستگۆیی قسەکانی شێخ عوبێدوڵڵا، رۆژانی ئایندە و ئەو ماوەی لە ئەستەنبوڵ مامەوە ئەندازەی دڵسۆزیی تیا دەبینم بۆ سوڵتان، هەتا ئەگەر حوکمان دا لەسەر بێ متمانەیی قسەکانی ئەو لەسەر گوێڕایەڵی لای سوڵتان، ئەوە لە قورسایی سیاسیی و ئاینیی ئەو لە کوردستان کەم ناکاتەوە، باوەڕم وایە وا باشترە بۆ حکومەتی سوڵتان هەوڵ بدات کاریگەریی لەسەری هەبێت لە ڕێگەی چاودێریی جوڵانەوەکانی و دڵنیابوون لە مەبەستی داهاتووی، لە جیاتی ئەوەی بە رەقیی مامەڵەی لەگەڵدا بکات لە سنووری تورکی. ئێرانی دوورخراوەتەوە، وا چاکە لە داهاتوو رێگەی پێنەدرێت کاریگەریی هەبێت لەسەر کورد بە جۆرێ ببێتە هۆی تێکدانی ئۆقرەیی و ئاسایش لە ئێران، لە سەرەتاوە ئەستەم بوو بۆ حکومەتی سوڵتان سنوور بۆ چالاکیەکانی دابنێت، بەڵام ئەو با ئەم کاتە ئەوە نەوروژێنێت، ئێستا بۆ پیاو قورسە هیچ بنەمایەك لەو دادگەرییە بەدەستبهێنێت کە سوڵتان بۆ سزادانی پشتی پێدەبەستێ، لە کۆتاییدا هیوادارم ئەوەی پێشکەشم کردن و ئەوەی وتم جێگەی رەزامەندیی حکومەتی خاوەن شکۆی پاشایەتیی بێت.

دڵسۆز و خزمەتکاری گوێڕایەڵتان

ولیم ا. ئابووت (قونسوڵی ئینگلیز لە تەورێز)

## بەڵگەنامەی عوسمانی

Y.A.Res

H. 1064/18-5-1298

### وێنەی یاداشتنامەی وەکالەت[200]

ئەو برووسکەی خستمانە بەردەم مەقامی حەزرەتی مەولانا سوڵتان کە شاهید و بەدواداچوونی تایبەتی ئەحمەد راتب پاشای یاوەری سوڵتان لە موسڵی لە خۆ گرتووە لەسەر شێخ عوبێدوڵڵا ئەفەندی، وێنەیمان ناردووە و لە دوای ئاگاداریی ئەنجومەنی راسپێردراوی تایبەت بە گرتنەبەری رێوشوێنی پێوست، بڕیاری دا: بەپێی یاداشتنامەی عللیەی عوسمانیی تایبەت بە گلەیینامەی بالاّ بە برووسکەی ناوبراوەوە ناردمان، ئەم یاداشتنامەمان ئامادە کرد بۆ بە عەزم بوون لەسەر جێبەجێکردنی ئیرادەی سوونی لەو بارەوە.

18 جومادی یەکەمی ساڵی 98، 4ی نیسانی ساڵی 97، (16ی نیسانی 1881)، سەعید.

وێنەیەك وەکو خۆی

### وێنەی پەراوێز

مەحزەری ئەنجومەنی وەکالەت هاوپێچی نمایندەیە، بۆ سکالانامە کە موقامی بالاّ لێی ئاگادارە، لەو رووەوە وەکو بە دیار دەکەوێ، ئەگەر عوبێدوڵڵا ئەفەندی بە زۆر بهێنرێتە خانەی سەعادە، ئەوە ناچار دەبێت پەنا بەرێتە بەر ئێران، نەزارەتی دەرەوە لەگەڵ باڵیۆزخانەی ئێرانی تەخویل کراوە قسە بکەن لەگەڵ ئێران هەتا داڵدەی نەداو دژی ئێمە بەکاری نەهێنن، موشیریەی هەمایونی لەشکری چوارەم و ویلایەتی وان ئاگادار کرانەوە بە ناوی حکومەتی سوونی لەو شوێنانەی پێویستە ئاگاداریی بڵاو بکەنەوە بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەوەی شێخ لە ڕابردوو بڵاوی کردۆتەوە، هەروەها

---

[200] - لێرە بەدواوە کۆمەڵێك بەڵگەنامە لەسەر شێخ عوبێدوڵڵا هەیە، ناوی شوێن و زاراوە و ناوی دراو و کەسایەتیی و پلە و پایەی تێدایە، پێویستی بە روونکردنەوە هەبوو، کە نووسەر خۆی لێبواردووە، منیش نەمتوانیوە خۆم لە قەرەی ئەو بابەتە بدەم. "وەرگێڕ".

ئیرادەی سوونی مشیریەی ناوبراوی ئاگادار کردۆتەوە هەوڵبدات نەیەڵێ شێخ پەنا بەرێتە بەر ئێران، مەحزەرەکە بگەڕێنێتەوە بۆ شوێنی خۆی.

20جەمادی یەکەمی ساڵی 98 و 8 نیسانی ساڵی 97 ـ

وێنە وەکو هی ئەسڵیەکە.

## برووسکەی ئەمیر لیوا تۆفیق راتب پاشا یاوەران

حەزرەتی مەولانا سوڵتان ئێستا لەو دەڤەرەیە بە فەرمانی هەمایونی ئەو پەیوەندییانە ئەنجام دەدات، ئەنجومەنی ئێمە بەدواداچوونی کردووە لەسەر بانگەشەی شێخ عوبێدوڵڵا ئەفەندی، بەدواداچوون تەواو بوو لەگەڵ بیرخەرەوەیەکی تایبەت بە ئیرادەی سوونی، کورتەی برووسکەکە ئەوەیە شێخی ناوبراو ئامادەیی خۆی نیشان داوە بە پیر داوای سوونییەوە بێت، بەڵام هەندێ ترسی ماوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەیە فەرمانی لەو جۆرە قبوڵ بکات، بەڵام مەبەستی نییە سەفەری خانەی سەعادە بکات، بەڵکو خۆی سوود لەر کات وەردەگرێت هەتا ئەوەی دەیەوێ ئەنجامی بدات، ئامادەکاریی و دەستدرێژییەکانی بە بۆچوون و رێنومایییەکانی بە ناوی دەوڵەتی عیللی نیگەرانی کردوون، لەوە دەترسێت ئەو دەنگ و باسی بانگەوازی دەوڵەتی سوونی بگات و بۆ خەڵکی دەربکەوێ کردەوەکانی و ئەوەی رایگەیاندوە پێچەوانەی رەزامەندیی بالایە، ئەوکات خەڵکی لێی دوور بکەونەوە، هەندێ لە هۆزەکانیش لێی بکشێنەوە، بەمەش بێ ئومێد دەبێت و وازدەهێنێت، لەو روانگەوە کوردستان بەجێدەهێڵێت و لە بەرژەوەندیی نابێت بمێنێتەوە، ئەگەر لە ڕێگەی پەیوەندیی بە ئێرانییەکانەوە داوای ئەمانی کرد، کە لەوانەیە پەنا بەرێتە بەر ئێران، دەبێت زەمانەتی ئەوە هەبێت بە فەرمیی ئەوە بەدەست نەیەت، ئەنجومەنی تایبەت بە شێوەیەکی روون لەو کارەی کۆڵیوەتەوە، وای دەبینێت رووس هاوشانی ئێرانییەکان نیگەرانە لە جولانەوە و کردەوەکانی، بە فەرمیی ئەوەیان گوتووە: کە ئەگەر دەوڵەتی عیللی رێوشوێنی گونجاو نەگرێتە بەر، ئەوە ناچار دەبن بە دوای بکەون، لە کاتێکدا شێخ خۆی بە جۆرێك لە جۆرەکان هەڵخەڵەتاوە، لە بنەڕەتەوە بانگەشەی سوونی لەسەر بڕیاری ئەنجومەنی ئێمە لەو بارەیەوە دەیەوێت بە ڕێگەیەکی گونجاو دوور بخرێتەوە و سنوورێك بۆ ئەو سکالایانە دابنرێت، بەڵام بە دڵنیایی شێخ بە رەزامەندیی خۆی سەفەری خانەی

سەعادە ناکات، ئەگەر ناچاری سەفەر بکرێت پەنا دەباتە بەر ئێرانییەکان و لەو حاڵەتە دژی ئێمە بەکاری دەهێنن، ئەو سکاڵایانەی لە ئێرانییەکان بەر گوێمان دەکەون، ئەوە پێویست دەکات یەکەم جار لەگەڵ ئێرانییەکان وتووێژ لەسەر ئەو بابەتە بکەین، چونکە هەوڵ بۆ دوورخستنەوەی شێخ لە ئەنجامی سکاڵای ئێرانییەکانە دژی ئەو، لە حاڵەتی ناچارکردنی پەنا دەباتە بەر ئەوان، بۆیە لەسەریانە زەمانەتی فەرمیی بدەن کە قبوڵی ناکەن، ئەگەر ئێران ئەو زەمانەتەیان نەدا، دەبێت واز لەو سکاڵایانە بهێنن، لە حاڵەتی زەمانەتدانی ئێرانییەکان، ئەوە دوورخستنەوەی شێخ پێویست دەبێت، ئەنجامدانی ئەو کارە لەسەر وەڵامی ئێرانییەکان وەستاوە، شێخی ناوبراویش بۆ هەڵخەڵەتاندنی هۆزەکانی دەوروبەری رایگەیاندووە ئەو کارانەی بە رەزامەندیی دەوڵەتی عیللی کردووە، ئەوانەش کە دەبیستن وەلی ئەمر بە کارەکانی رازی نییە لێی دەکشێنەوە، موشیریەی لەشکری هەمایونی چوارەم و ویلایەتی وان بە برووسکە ئاگادارمان کردوونەوە بە بڕیاری ئەنجومەنمان ئەو قسانە بە درۆ بخەنەوە. بۆیە وای دەبینین ناکۆکیی و دووبەرەکیی بکەوێتە نێوان ئەو و هۆزە هەڵخەڵەتاوەکان، لە حاڵەتی رەزامەندیی مەقامی باڵا دەسەڵات دەدرێتە نەزارەتی دەرەوە لەگەڵ سەفارەتی ئێرانیی قسە بکات و موشیریەت و ویلایەتی ناوبراو ئاگادار بکرێنەوە، بە ناوی حکومەتەوە راگەیاندن بڵاوبکەنەوە بۆ بە درۆخستنەوەی قسەکانی شێخ.. لە هەموو حاڵەتاندا فەرمان بۆ خاوەن فەرمانە.

18ی جەمادی یەکەمی ساڵی 98و 5ی نیسانی 97

(16ی نیسانی 1881)

واژۆەکان:

بیرخەرەوەی نەزارەتی دارایی بەڕێز خراوەتە روو لەسەر روونکردنەوەی ویلایەتی هەکاری، بەوەی پێویستە بکرێت بۆ عەریزەی عەبدولقادر ئەفەندی کوڕی شێخ عەبێدوڵڵا بەگ کە موچەیەکی کەڵەکەبووی مانگانە بە ئەندازەی چوار هەزار و پێنج سەد قورش هەیە، بە شێوەی کاتیی دانرابوو بۆ باوکی، لە ساڵانی نەوەد و شەش و نەوەد و حەوت داوا دەکات بە حیسابکردنی سەد و هەشت هەزار قورشی تر کە هی هەندێ لە خزمەکانی شێخ بووە بە ناوی دەیەك و میرانەی مەڕوماڵاتی ساڵانە، هەروەها داوای کردووە ماوەی مانەوەی لە خانەی سەعادە موچەی مانگانەی بە پێی ئیرادەی سوڵتانی

به شێوەی کاتیی بۆ خەرج بکرێ کە لە مانگی ئازاری ساڵی نەوەد و هەشتەوەیە، چوار هەزار و پێنجسەد قورش لەو پارەیەی پێشوو بە شێوەیەکی کاتیی هەڵوەشاوەتەوە لەسەر ئەو بنەڕەتەی بە هۆی مانەوەی ئەو پیاوە لێرە ڕاگیراوە، کە دەکاتە دیارییکردنی موچەی دوایین مانەوەی لێرە، دەرفەتی هەژمارکردنی کەڵەکەبووی هەردوو ساڵی نەوەد و شەش و نەوەد و حەوت نییە و لە خزمەکانی داوا کراوە کە هەڵاتووە و پێویستە موچەی ڕابگیرێت، ئەم بیرخەرەوەیەم ئامادەکردووە بۆ ڕوونکردنەوە هەتا ڕەوانەی نەزارەتی ناوبراو بکرێت، ئەوەی تائێستا ماوە حیسابی بکات و ئەوەی دەمێنێتەوە، بە تەواوی لەسەر فەرمانی هەمایونی بیبڕێت.

7ی شەوالی ساڵی 99و 9ئوغستسی ساڵی 98

(21ی ئابی 1882)

سەعید پاشا

Y.A. Res/ 1299- H – 2258

باسی ئەو برووسکەی لە ویلایەتی هەکاری هاتووە لەسەر هەڵاتنی شێخ عوبێدوڵڵا بەبێ ڕووخسەت، ئێستا پێویستە فەرمانی باڵا دەربچێت بۆ ڕوونکردنەوە بە ناوی حەزرەتی مەولامان سوڵتان، ئەوەی لە برووسکەدا بەدیار کەوتووە، شێخی ناوبراو هەندێ ئاگادارییی بڵاوکردۆتەوە بۆ زەمینەسازیی گەڕانەوە، ئەم هەواڵە وا بڵاوبێتەوە کە پێچەوانەی ڕەزامەندیی باڵایە هەتا خەڵکی دەوروبەری هەڵنەخەڵەتێنێت بۆ جێبەجێکردنی خواستەکانی، لە کاتێکدا فەرمان دەرکردن بۆ فەرمانی باڵا و ناردنی کاتێکی زۆر بەفیڕۆ دەدات، ناردنی فەرمانی باڵا لەو بارەیەوە بە برووسکە دەوەستێتە سەر ئیرادەی سوونی حەزرەتی مەولانا سوڵتان، ئەو برووسکەیەمان بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کردووە.

9ی شەوالی ساڵی 99و 9ی ئۆغۆستسی 98

سەعید پاشا

**بەڕێوەبەرایەتی سەرۆکایەتی وەزیران ـ ژووری برووسکە**
**وەڵامی برووسکەی ویلایەتی وان**

دوێنی و لە پێشتریش ئەوەمان روونکردەوە و ئاگادارییمان بڵاوکردەوە کە شێخ لە ناو خەڵك متمانەی نییە و بەقسەی سەدری ئەعزەم و بە قسەی ئەنجومەنی وەزیران ناکات، بە تەنیا بە فەرمانی حەزرەتی مەولامان سولتان دەجولێتەوە، دەمانەوێ ئەوە روون بکەینەوە دەرکردنی فەرمانی باڵا بۆ راگەیاندنی هەڵاتنی شێخ بەبێ مۆڵەتی حەزرەتی مەلامان سوڵتان چووە بۆ ئەوێ، گرتنەبەری رێوشوێنی هەر سزایەك بۆ ئەو بە ناوی حەزرەتی خاوەن موقامی خەلافەتەوە دەبێت، ئەمەش بە رای نەزارەتی باڵایە.

9 ئۆغۆستسی 98

(21 ئابی 1881)

موحەممەد حیلمی

Y.A. Res 53\17

**ساحێبی دەوڵەت**

ئاشکرایە لە لای دەوڵەت و پێشتر بە مێژووی (7)ی شەوالی ساڵی (99) بە بڕینەوەی موچەیەکی مانگانەی چوار هەزار و پێنج سەد قورشی بۆ شێخ عوبێدوڵڵا ئەفەندی بەم دوایە لە ماوەی مانەوەی لێرە بۆی دیارییکرابوو، کەدەگەیشتە پێنج هەزار قورش، لەدوای حیسابکردنی ئەوەی تا ئێستا نەدراوە بەهۆی هەڵاتنییەوە، لە بیرخەرەوەی نەزارەتی ناوخۆی بەڕێزدا بەم دوایە کە هاوپێچی موقامی باڵا کراوە هاتووە، لە ماوەی گەیشتنی ناوبراو بەخانەی سەعادەت لە ڕابردوو ئیرادەی سوونی بڕیاری دەرکرد لە شوێنێکی گونجاو نیشتەجێ بکرێن و ژیان و ئاسایش و خەرجیی بۆ دابین بکرێت، بە سەرپەرشتی فەرمانبەرێکی دیارییکراو سەد و حەوت هەزار و دوو سەد و بیست و دوو قورش و نیوی بۆ خەرج کراوە، لە ماوەی چواردەی تەممووزی ساڵی (97) هەتا کۆتایی شوباتی ساڵی دوایی، ئەوە بۆ بەکرێگرتنی خانوو و مووچەی کرێکار و خزمەتکار و خواردەمەنی و رایەخ و هەموو پێویستیەکانی تر، داوام لە نەزارەتی دارایی کرد ئەم موچانە لەسەر ناوخۆ حیساب بکات، ئەوەی لە دەفتەر و سەنەداتەکاندا هاتووە لە لایەن شورای داراییەوە وردبینی و پشتگیریی کراوە کە دەکاتە بیست و چوار

هەزار قورش لە شێوەی زێڕ و پەنجا هەزار و پێنجسەد و حەفتا و هەشت قورش و پێنج باڕ لەسەر شێوەی مەجیدیەی زیوی بووە، سی هەزار و پێنجسەد و سی و پێنج و دە باڕات بە شێوەی موسەدەسە "یان سوداسی" بووە، رووخسەتم لە ژمێریاری نەزارەت وەرگرت لە مووچەی بەخشین ئەمە حیساب بکات، بە پێی ئەوەی میوانی ئەو ساڵە لەگەڵ خەرجیی گونجاو نەبووە، ئەو بیرخەرەوەیەم ئامادە کردووە بۆ روونکردنەوەی حوکمی باڵا لە حاڵەتی دەرچوونییەوە رەوانەکردنی بۆ نەزارەتی ناوبراو، هەتا رێوشوێنی پێویست لەسەر ئەو بنەڕەتەی هەستی پێدەکرێت، بگیرێتە بەر.

6ی ذی الحجة ساڵی 99و 7ی تشرینی یەکەمی ساڵی 98

(19ی تشرینی یەکەمی 1882)

سەعید پاشا

## Y.A.Res. 1297. 11.9-848
## بۆ مەقامی نەزارەتی باڵا

لە بیرخەرەوەکەی ئەم دواییەی نەزارەتی ناوخۆی بەڕێز کە خراوەتە بەردەم مەقامی باڵا، هاتووە: لە پێشتر و کاتی گەیشتنی ناوبراو بە خانەی سەعادەت، ئیرادەی سوونی بڕیاری دەرکردووە بە نیشتەجێکردنی شوێنی گونجاو و دابینکردنی بژێویی و خەرجییەکەیان بە سەرپەرشتی فەرمانبەرێکی دیاری کراو، دوایی سەد و حەوت هەزار و سەدو بیست و دوو قورش و نیوێکی لە ماوەی چواردەی تەمووزی ساڵی (97)، هەتا کۆتایی مانگی شوباتی ساڵی دوایی بۆ خەرج کراوە، بە کرێ خانوو و موچەی کرێکار و خزمەتکار و خواردن و رایەخ و هەموو پێویستیەکانی تر، داوام لە نەزارەتی دارایی کرد لەسەر مووچەی ناوخۆ حیسابی بۆ بکات، ئەوەی لە دەفتەر و سەنەداتەکاندا هاتووە لە لایەن شووڕای داراییەوە وردبینی و پشتگیریی کراوە کە دەکاتە بیست و چوار هەزار قورش لە شێوەی زێڕ و پەنجا هەزار و پێنجسەد و حەفتا و هەشت قورشو پێنج باڕات لەسەر شێوەی مەجیدیەی زیوی بووە، سی هەزار و پێنجسەد و سی و پێنج و دە باڕ بە شێوەی موسەدەسە "یان سوداسی" بووە، رووخسەتم لە ژمێریاری نەزارەت وەرگرت کە لە پەراوێزی بیرخەرەوەکەدا هاتووە لە مووچەی بەخشین ئەمە حیساب بکات،

بەپێی ئەوەی میوانی ئەو ساڵە بە بەراورد لەگەڵ ساڵانی ناوبراو، موچەی دیارییکراو بەشی نەکردووە، فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

21ی ذي القعدة ساڵی 299 و 21 ئەیلول 298

(3ی تشرینی یەکەمی 1882)

مەحمود پاشا

Y.A.Res. 1297. 11.9-848

هاوپێچ و برووسکەی هاتووی موشیریەی بەڕێز لەشکری چوارەم خرایە ڕوو لەسەر ئەوەی فەرماندە و موتەسەڕیفی هەکاری هەستی پێکردووە لەسەر جوڵانەوە و ئامادەکاریی شێخ عوبێدوڵڵا ئەفەندی بۆ هێرشکردنە سەر لایەنی ئێرانیی، هەروەها دوێنێ ویلایەتی وان لە باڵیۆزخانەی سوونی تاران ئاگاداریی پێگەیشتووە کە دەسەڵاتدارانی ئێرانی بە شێوەیەکی فەرمیی داوای قەدەغەکردنی دەستدرێژیی کوردەکانی سەر بە شێخ عوبێدوڵڵا و سەرکۆنەکردنی دەکەن کە لە لای ئێمەوە هێرش دەکەنە سەر ئەوان، گرتنەبەری ڕێوشوێن لەو بارەیەوە بۆ چوونی موشیریەی ناوبراو ئەوەیە کە لای مەقامی باڵاتان روونە کە ئەندازەیەك پارە و خۆراك پێویستە رەوانەی ئەوێ بکرێ بۆ ئامادەکردنی سەرباز هەتا رەوانەی ئەو شوێنە بکرێ بۆ ئەوەی لە لای ئێمەوە هۆزەکان نەپەڕنەوە بۆ ئێران و پارێزگاریی لە ئاسایشی سنوور بکرێت، سەرەڕای ئەوە ئەگەر فەرمان دەرچوو ئەحکامی عورفی رابگەیەنرێت، لەسەر ئەوەی پەیوەندیی بە پارەو خۆراکەوە هەیە نەزارەتی دارایی ئاگادار بکرێتەوە، قسە لەسەر ئەوە نەماوە پێویستە ڕێوشوێنی بە پەلە بگیرێتە بەر لە لایەن حکومەتی سوونییەوە، هەتا لەو ماوەیە قەیرانی سنوور لەگەڵ ئێران سەرهەڵنەدا، شێخی ناوبراویش دەبێ جوڵانەوەکانی لەسەر راسپاردە و ئامۆژگارییەکانی یاوەران "راوێژکار- نووسەر" حەزرەتی مەولانا سوڵتان ڕێکبخات کە بەڕێوەیە، بەڵام هەواڵەکان دەڵێن چەکدارە کوردەکان و خێڵەکانی لای ئێمە کۆدەبنەوە، لەو حاڵەتەی ئەگەر هۆزەکانی ئێران پەڕینەوە بۆ لای ئێمە، پێویستە ڕێوشوێنی بەهێز بگرینە بەر بۆ پاراستنی ئاسایش. بەپێی ئەوەی لە برووسکەدا روونکراوەتەوە بۆ رووخسەتی راگەیاندنی ئەحکامی عورفی ئەگەر پێویستی کرد، ئەو بیرخەرەوەیەم ڕێکخستووە هەتا بۆ ئیرادەی سوونی روون

بێت ڕێ بە موشیریەی ناوبراو بدات لە کاتی پێویست ئەحکامی عورف رابگەیەنێت و سەربازی پێویست بۆ ئەو شوێنانە بەڕێ بکات هەتا پارێزگاریی لە ئاسایشی سنوور بکەن و نەیەڵن ئاژاوە سەر هەڵبدات.

9 ذي القعدة ساڵی 97و 1ی تشرینی یەکەمی ساڵی 96

(31ی تشرینی یەکەمی 1880)

سەعید پاشا

## Y.A. Res. 1297.11.9 - 848

## بڕووسکەی 30 ئەیلولی ساڵی 96

## (12تشرینی یەکەمی 1881)

بۆ موشیریەتی بەڕێز لە بەڕێوەبەرایەتی مابینی هەمایوونی

لە نامەی فەرماندەی (هەکاری)دا هاتووە: شێخ عوبێدوڵڵا ئەفەندی لەکوار "قەزایەکە – وەرگێڕ"و دەورووبەری خۆی و لەبەری ئێرانی لە نێوان هەشت تا دە هەزار کەسی کۆکردۆتەوە بە ئاڕاستەی سابلاخ و ورمێ هێرشی کردووە کە لە نامەکەی رابردوو بۆم روون کردوونەتەوە، هەروەها نامەی لێرەو لەوێ ناردووە بۆ ئەوەی چەکداری زۆر لە کورد و خێڵەکان لە سنووری لای (ئەشتوب)ی تەنیشت شەمدینان کۆبکاتەوە، هەروەها لە دوای ئاغاکانی سنووری ئێمەی ناردووە هەڵبگەڕێنەوە، عەبدوڵڵا ئاغای سەیدانی و عێزەدین بەگ دانیشتووی ئەلباک هەندێ پیاویان کۆکردۆتەوە و بە خێرایی ڕۆیشتوون، هەروەها خەلیفە سەعیدی هەراتیێ لێرە و لەوێ پیاو کۆدەکاتەوە، سەرەڕای ئەمە خەڵکی ناحیەی (کوێگی) سەر بە جولەمێرگ و دانیشتوانی سوارکان و ماسرۆی سەر بە ئەلباک نیشانەی یەکگرتنیان لێ بەدیار کەوتووە، دانیشتوانی شوێنەکانی تریش هەتا ئێستا لە ڕاوێژکردندان، ئەوەی دیارە شێخ هێرش دەکاتە سەر ئێران و لە عەلی خانی شکاك دەدات کە زیانی لە هۆزەکانی دەڤەری ئێمە داوە، بەڵام قسە هەیە کە ئامانجی بنەڕەتیی دەستبەسەراگرتنی ئەو شوێنەیە، چونکە هیچ ڕێگەیەکی تری نییە، پێویستی بە هێزی سەربازیی تەواو هەیە. بیرۆکەی سەرەتا و کۆتایی خراپی شێخ زۆر کارەسات درووست دەکات، ئەگەر ئێستا چالاکییەکانی لە

سنووری ئێرانەوەیە، ئەوە شای ئێران بە ڕێگەی باڵیۆزی تارانەوە برووسکەیەکی لە مێژووی 9ی ئەیلولی ساڵی 96 (1ی نیسانی 1880) کە وێنەیەکی بۆ ویلایەتی وان ناردووە و بە نەزارەتی دەرەوەی بەڕێز گەیشتووە، لەو برووسکەیەدا هاتووە: ئەگەر هێزی سەربازیی پێویست نەنێرن بۆ ئێرە بۆ سزادانی خێرای کوردەکانی سەر بە شێخ، هێزە سەربازییەکانی ئێرانیی رووخسەتیان وەرگرتووە و بە درێژایی سنوور کۆبوونەتەوە بۆ راوەدوونان و سزادانی شێخی ناوبراو و لایەنگرانی، ئەگەر بەرژەوەندیی وا پێویست بکات لەشکری ئێرانی بۆ راوەدوونان لە سنوور دەپەڕنەوە بۆ بەری ئێرە، ئەو کات بەرپرسیاریەتی دەکەوێتە سەر شانی ویلایەتی وان.

پاشماوەکەی تر و پاشماوەی برووسکەی ژمارە 2ی 29 ئەیلولی ساڵی 96 (11ی نیسانی 1880)

سامح

# ژمارە 2 ژمارەی وشەکان 200
# بۆ موشیریەی مابینی هەمایونی
# بۆ سەرۆکایەتی وەزیران
# بۆ نەزارەتی جەنگیی بەڕێز:

چونکە شۆڕشگێران لە سنووری ئێرانن، سزادان و سنوور بۆ دانانی دەکەوێتە سەر لایەنەکەی تر، گرتنەبەری رێوشوێنی پێویست کورت دەبێتەوە لە قەدەغەکردنی پەڕینەوەی هۆزەکان بۆ لایەنی تر و پاراستنی ئاسایشی سنوورەکانمان، بە ئەو شاڵاوە گەورەی ئێران شۆڕشگێڕان دەشکێن، لەو حاڵەتە دەپەڕنەوە بۆ سنووری ئێمە و بە هۆی ئەو پێگە زۆرەی شێخ هەیەتی هەر بانگەوازێکی ئەو لێرە دەبێتە پەشێویی ناو هۆزەکانی سنووری ئێمە، ئەمەش خوانەخواستە دەبێتە کێشەی گەورە بۆ وڵاتەکەمان، ئێستاش هێزی تەواومان دەوێت بۆ بەربەستی کردن، سەرەڕای ئەوە چارەسەری بە پیرەوەچوونی خەڵکی سنووری ئێمە بۆ ئەفکاری شێخیش چارەسەر بکرێت، ئەوە بە زیادکردنی هێزی سەربازیی بۆ بەرەی رەواندز و هەکاری، لە وەڵامی ئەوە ئەمڕۆ تابورێك بە دوو تۆپی شاخیی بە فەرماندەی میر ئالای عەلی شەفیق بەگ رەوانە کرا، هەروەها

به خێرایی موسا پاشای فەرماندەی تیپی هەشت بە دوو تابوورەوە لە موشەوە بەڕێکەوت، ئەمە سەرەڕای تابورێکی لەشکری سوڵتانی لەو دەڤەرە، هەروەها لە ناوەند داوامان لە تابورێکی لەشکر کردووە، داواشمان کردووە لە ناوەند کەتیبەی پیادەی سەر بە تیپی حەوت بە خێرایی خۆی ئامادە بکات بۆ کاتی پێویست، هەروەها جەختمان کردە سەر فەرماندەی شارەزوور هێزی تەواو لە ڕەواندز خڕ بکاتەوە، بە فەزڵی حەزرەتی سوڵتان هەموو ڕێوشوێنێك گیراوەتە بەر بۆ پاراستنی ئاسایش و رژێم، نەزارەتی دارایی بەڕێزم ئاگاداری کردمەوە دارایی وان باری قورسە و ناتوانێت دەیەکی پێویستییەکانی ئەو شوێنانە دابین بکات، لەم حاڵەتە کارەکان گران بوون، داوامان کرد هەوڵبدرێت بۆ دابیکردنی ئەندازەیەکی پێویست، بە خێرایی کۆمەك لە هەردوو ویلایەتی وان و بەدلیس کۆبکرێتەوە و بگەیەنرێت، رووخسەتیش هەبێت بە پێی ڕێنومایی تایبەت ئەگەر پێویستی کرد لە بەرەنگاربوونەوەی هەموو ئەگەرەکان، ئەحکامی عورفی رابگەیەنرێت.

29 ئەیلولی ساڵی 96

(11ی نیسانی 1880)

سامح

## Y.A.Res/ 2259
## نەزارەتی دارایی ـ قەڵەمی نامەکان

کتاب لە ویلایەتی هەکاری بەڕێزەوە بە ژمارەی (24) ئازاری ساڵی (98)، (5ی نیسانی 1882)، بۆ نەزارەتی دارایی و لەوێ بۆ خەزێنەی باڵا رەوانەکرا هاتووە، کە موچەی مانگانەی دیارییکراو بە شێوەیەکی کاتیی بۆ شێخ عوبیدوڵڵا ئەفەندی شێخی زاویەی شێخ تەها لە ناحیەی شەمدینان کە هەمووی دەکاتە چوار هەزارو پێنجسەد قورشی کەڵەکە بووە، کە حیسابی هەردوو ساڵی نەوەد و شەش و نەوەد و حەوتە، شێخ عەبدولقادر ئەفەندی کوڕی عەریزەیەکی داوە و داوای حیسابکردنی سەدو هەشتا هەزار قورشی کردووە، هەندێ لە خزمەکانی شێخی ناوبراو موچەی دواکراویان نەداوە بە هۆی دەیەك و میرانەی مەڕ و ماڵاتی ئەو ساڵانە کە دەکاتە سەد و دوازدە هەزار قورش، موچەی ناوبراو کاتییە و کەڵەکەبووی دوو ساڵانە لەگەڵ پاشماوەی دەیەك و مەڕ و

ماڵات كه به مەرج و كۆت و بەند پەسند كراوە، ویلایەت داوا دەكات چی بكرێ رابگەیەنرێت، له پەراوێزی بیرخەرەوە خراوەتە ڕوو بە مێژووی (17)ی كانوونی یەكەمی ساڵی (95) كه سەیدی ناوبراو و هەندێ له پیاو و خزمەكانی بە ئەندازەی پێنج هەزار قورش و نیو وەردەگرن بۆ بەجێهێنانی مەسەلەی جەنگ كه بەرانبەر ئەوە خزمەتی جەنگیی پێشكەش دەكەن، لەگەڵ كۆتاییهاتنی مەسەلەی جەنگ دەبێت ئەو موچەیە ببڕێت، هەروەها له وەڵامی نەزارەتی بەڕێزدا كه له ڕۆژی 11ی كانوونی دووەم دا نووسراوە، فەرمان كراوە هەتا ماوەیەكی تریش ئەو موچەیە بدرێت.

لەم ڕێنماییانەی دوایی هاتووە كه پێشتر بە درێژایی مانەوەی له خانەی سەعادە بە شێوەی كاتیی له خەزێنە پێنج هەزار قورش بۆ سەیدی ناوبراو بڕاوەتەوە، ئەو موچە دیاریيكراوە له مێژووی ڕێنماییەوە له شەشی ئازاری ساڵی (98)ەوە دەدرێت، موچەیەكە له بنەڕەتەوە كاتییە و بە ئاگاداری محەلیی هاتووە و له كۆتایی ساڵی نەوەد و پێنج، تەواو دەبێت، بەڵام له هەردوو ساڵی نەوەد و شەش و نەوەد و حەوت تەواو نابێت، چونكه له دوای ئەوە هیچ ئیرادەیەك نییە، ڕێكخستنەوەی مووچەی ناوبراو لەگەڵ پاشماوەی دەیەك و موچەی ئەو دوو ساڵە حیساب دەكرێت بە ڕەزامەندیی ئیرادەی نەزارەتی باڵا، بۆ ئەمەش بەڕێوەبەرایەتی خەرجییە گشتییەكان و بەڕێوەبەرایەتی راوێژكاری دارایی لەسەریان نووسیوە بۆ مەقامی باڵا هەتا چی لەسەر ئێمەیە ئەنجامی بدەین، فەرمانیش بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

16ی رەمەزانی ساڵی 299و 19ی تەموزی ساڵی 98

(31 تەمووزی 1882).

مـونـیـر

Y.A Res/ 2258-21-H-2/0

له ڕاپۆرتی سەفارەتی ئێرانی دا هاتووە: شۆڕش و هەڵگەڕانەوە له سنوورەكانی ئێرانی رووی داوە، سەرچاوەی ئەو هاندانە هەریەك له شێخ عەبێدوڵڵا و هەمزاغایە، لەسەرمانە سەركۆنە و ئاگاداریی ئەو هۆزە كوردانەی لەلای خۆمان بكەین كه سنووری ئێرانیان بەزاندووە، هەروەكو شای ئێران باڵیۆزخانەی ئێمەی له تاران بە زارەكیی له داواكاریی لەو جۆرە ئاگادار كردۆتەوە، ئاگاداریی سەرەتاو كۆتایین كه پابەندین بە

پاراستنی سنوور، بەڵام ئەوەی پەیوەندیی هەیە بە سەرکۆنەی ئەو لایەنگرانەی سەڵتەنەی سوونی سنوور دەبەزێنن، لە مێژە هۆزە ئێرانییەکان زوڵم و دەستدرێژییان کردۆتە سەر خەڵکی دەڤەری ئێمە، دەبێ چارەسەری بکەین و بە هەمان شێوە بەرپەرچی بدەینەوە، ئەگەر بیستمان هۆزەکانی دەڤەری ئێمە زیانیان بە لایەکەی تر گەیاندووە، ئەوە رێکەوین لیژنەیەکی تایبەت بۆ لێکۆڵینەوە و گرتنەبەری رێوشوێنی گونجاو بنێرین هەتا حاڵەتی لەو جۆرە روونەداتەوە، نەزارەتی دەرەوە بە بڕیاری ئەنجومەن باڵیۆزخانەی ئێرانیی ئاگادار کردۆتەوە کە رێوشوێنی پێویست گیراوەتە بەر بۆ بەربەستکردنی لایەنگرانی دەوڵەتی عوسمانیی کە زیان و خەسارەت بە دەڤەری ئێران دەگەیەنن. لە ئاکامی ئەو گۆڕانانەی بە هۆی شەڕەکانی رابردوو رووی داوە بایەخدان بە سنووری لای دەوڵەتی عیللی زیادی کردووە، سەرەڕای ئەوە هەردوو ویلایەتی (وان) و (هەکاری) کورد و خێڵەکان و زۆرێکی ئەرمەنی تیا کۆبۆتەوە، ئەمە وای کردووە سنووردانان بۆ شێخی ناوبراو و هی وەکو ئەو لە بەکارهێنانی پێگەی خۆیان لە ناو خێڵەکان ئەستەم بێت، بە جۆرێك ئەمە لەگەڵ بارودۆخی ئەو ناوچانە و بەرژەوەندیی و سوودی دەوڵەت ناگونجێت، کێشەی وا دەنێتەوە زۆر جێی بایەخ بێت، باڵوێزی ئێرانی فاکتەر و هەڵچوونی بزووتنەوەی هەڵگەڕانەوە بە هاندانی شێخ زانیوە، ئەگەر لەسەر سنوور دوور نەخرێتەوە هیوایەك بۆ ئارامیی و زەمانەتێك بۆ ئاسایش نامێنێت، دەوڵەت هیوا بڕاو دەبێت لە هاوکاری دەوڵەتی عیللی و ناچار دەبێت بە دوای چارەسەردا بگەڕێت، ئەویش داوای یارمەتیە لە دەوڵەتی رووسیی، هەروەکو ناوەڕۆکی برووسکەی موشیریە لەشکری چوارەمی هەمایونی بۆ نەزارەتی جەنگ و هی ویلایەتی وان بۆ بابی عالی باسی خڕبوونەوەی هێزەکانی رووسیی لە نەخچەوان و ناوچە سنووریەکان تیا هاتووە و خراوەتە ڕوو، ئەمەش جێی بەئاگا هێنانەوەیە.

ناردنی لەشکری رووسیی بۆ سنووری ئێرانی بۆ پاراستنی سنوور لە ڕووکەشا ئەگەر پێویستی کرد یارمەتیدانی ئێرانە، لە ڕاستییدا ئەوە ئامانجی تێکدانی پەیوەندیی نێوان ئێران و دەوڵەتی عیللیە کە بە شێوەیەکی ئاسایی دەیپارێزین و زیان بە دەوڵەت دەگەیەنێت، بە ڕوونی دیارە سەبارەت بە ئێمە لە ئێستا و ئاییندە مەترسی گەورە هەیە، هەندێ باڵوێزی دەوڵەتی بێلایەن لەو بارەیەوە ئامۆژگارییان کردووین و جەختیان کردووە بە زوویی پێویستە ئەگەر توانا هەبێت رێوشوێن بگیرێتە بەر، ئەمەی ئێستا

مەسەلەیەکی تایبەت بە سکالاّی ئێرانییەکانە، دیارە لە بەدواداچوون لە مەسەلەکە کەم ناکاتەوە، بەرژەوەندیی وا دەخوازێ لیژنەی بەدواداچوون پێکبهێنرێت و رەوانەی ناوچەکە بکرێت، دوایی چۆن پێویست بێت کاری بۆ بکرێت، سەرەڕای ئەوە ئێرانییەکان ئاگادار بکرێنەوە کە دەوڵەتی عیللی ئەم بابەتەی بە بایەخەوە وەرگرتووە، ئەگەر نا ئێرانییەکان بەلای رووسیا مەیل دەکەن، بە قسەی باڵوێزی ئێرانییەوە ئەمە دیار بوو کە هەتا ئێستا لیژنەی بەدواداچوون نەنێردراوە، بۆیە بە خێرایی جەخت دەکەمەوە لەسەر هەڵبژاردنی لیژنە و ناردنی، هەتا پاڵپشتی قسەکەمان بێت، حەیدەر ئەفەندی چاودێری پێشووی برووسکە دوو جار لە پلەی باڵوێزی تاراندا بووە و ئاگاداری بارودۆخەکەیە، بە تەواوی لەو وڵاتە گەڕاوەتەوە، توانای باشی هەیە لە ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکە، کەسێکی تر یاوەری بێت لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی جەنگ، وەکو: کۆمیسترا (پایەیەکی نزیکە لە سکرتێر: نووسەر) ئاماژەی بۆ بکرێت، کەمال ئەفەندی کە دوێنێ بە موتەسەڕیفی عەمارە دامەزراوە کۆمیسترای دووەم بێت، ئەرکی بەدواداچوونیان بخرێتە ئەستۆ، ئەگەر وەکو دەڵێن دەستدرێژیی لە سنووری ئێرانی هەبوو پەلە لە نەهێشتنی بکرێت و هەموو رێوشوێنی پێویست بگرنە بەر، ئەوراقی سکالاّیان بدرێتێ و بە زوویی بۆیان رەوانە بکرێت، هەروەها بڕیار بێت ئەو دوانە مووچەی مەئمووری پشکنەری یەکەم و دووەم وەربگرن، ئەوانەی دەنێردرێن بۆ دەڤەری ئەنادۆڵ موچەیان بدرێتێ لەگەڵ پێویستییەکانی سەفەر و خەرجیی نائاسایی... لە هەموو حاڵەتێك فەرمان بۆ حەزرەتی گەورەمان وەلی ئەمرە.

غرە، سەفەر ساڵی (98)و (21)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (96)

(2ی کانوونی دووەمی 1881)

مۆری ئەندامانی ئەنجومەنی وکلاء

## بەڕێوەبەرایەتی نەزارەتی جەنگ

وەڵامی برووسکەی هاتوو بۆ مەقامی پایەدارتان بەرز دەکەینەوە کە لە دەوڵەت نافیز پاشا موشیریەی لەشکری هەمایونی چوارەمەوە هاتووە و لەو دەڤەرەن کە

زانیاری شابەندەری تەورێزی تیایە، بەوەی دەوڵەتی رووسیا لەشکری بۆ نەخچەوان و سنوور رەوانە کردووە، هۆی ئەمە و ئەندازەی لەشکر. فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە

24ی موحەڕەمی ساڵی 98و 15ی کانوونی یەکەمی ساڵی86

(2ی کانوونی دووەمی 1881)

## وەڵامی برووسکەی هاتوو بە مێژووی (41) کانوونی یەکەمی ساڵی (96) (1ی کانوونی دووەمی 1881) بۆ نەزارەتی جەنگ

لە موحەممەد نافیز پاشا موشیریەی لەشکری چوارەمی هەمایونی لە وان

لە ئاکامی بڵاوبوونەوەی هەواڵی ناردنی هێزی گەورەی سەربازیی دەوڵەتی رووسیا بۆ نەخچەوان و سەر سنوور، پرسیارم لە قونسوڵی جێگیری ئەو دەوڵەتە کرد لە تەورێز لەسەر هۆی ناردنی ئەو هێزە، وەڵامی دامەوە بۆ پاراستنی سنوورە، لە نامەی شابەندەریەی تەورێز بە بەرواری (26) تشرینی دووەمی ساڵی (96) ئەوە روونکراوەتەوە کە لە دوای دوا سۆراغ و گوێبیستن دەرکەوتووە ئەو هێزە بریتییە لە چواردە تابوور و دوو بەتاریەتی تۆپ. تکایە بەدواداچوون.

## بەڕێوەبەری سەرۆکایەتی وەزیران- ژووری برووسکە
## وەڵامی برووسکەی هاتوو بۆ مەقامی سەدارەتی سامی لە ویلایەتی وان

شابەندەری تەورێز بە بەرواری (26)ی تشرینی دووەمی ساڵی (96) لە نامەیەکدا ئاگاداری کردین کە بە هۆی بەدواداچوون و گوێبیستی ئەم دواییە دەرکەوتووە رووسیا هێزێکی سەربازیی گەورەی ناردووە بۆ نەخچەوان و سەر سنوور، لە وەڵامی پرسیارێك قونسوڵی رووسی لە تەورێز لەسەر هۆکاری ئەو هێزە وتی: بۆ پاراستنی سنوور هاتووە و بریتییە لە چواردە تابوور و دوو بەتاریەی تۆپ.

14 کانونی دووەم 96

26 کانون یەکەم 1880

حسن

کۆنووسی ئامادەکراو و پاشبەندەکانی لە لایەن ئەنجومەنی وکلاء لەسەر بەدواداچوون و توێژینەوە لە سکاڵای دەوڵەتی ئێران لەسەر جووڵانەوە و کاری یاخیگەرایی و هەڵگەڕانەوە بە هاندانی شێخ عوبێدوڵڵا و لایەنگرانی، نازیری رابردووی پۆستە حەیدەر ئەفەندی و کەمالی ئەفەندی موتەسەریفی عەمارە بە سیفەتی کۆمیسێری یەکەم و دووەم بە یاوەری پیاوێکی شایستە لە بەڕێوەبەرایەتی سەربازیی دانران بچن بۆ بەدواداچوون، ئەگەر لای ئێمەوە بە واقیع سنوور بەزاندن هەبوو نەیهێڵن، لەگەڵ ئەوەی پەیوەستە بەو کارەوە، ئەم روونکردنەوەیەمان دەرکرد بۆ جێبەجێکردنی ئیرادەی سوونی بەڕێز لەو بارەیەوە.

غرە، سەفەر ساڵی 98و 21کانوونی یەکەمی ساڵی 96

(2ی کانوونی یەکەمی 1881)

سەعید

**Y.A. Res 1297-12-7**
**H-2053**
**وێنەی بیرخەرەوەی نەزارەت**

بایەخی ستراتیژیی دەڤەری وان و هەکاری لای موقامی باڵاتان شاراوە نییە، ئەم بایەخە بە هۆی ئەو گرژیەی ئێستا لە ئێران هەیە لە مەترسییدایە، زۆر پێویستە سوور بوون لەسەر ئاسایش و دڵنیایی لەو ناوچانە و رێگرتن بە سنووربەزاندن و ئاژاوەی هۆزە کوردەکان لە مومتەلەکاتی ئێرانی لە سنووری خانەقین، چونکە دەوڵەت لە ئاستی پێویستدا نییە، موشیریەی لەشکری چوارەمی هەمایونی بە هۆی بایەخی ئەو ئەرکە لەگەڵ نەزارەتی جەنگی بەڕێز بە گونجاوی دەبینین سەرۆکی ئەرکان سەعادەتی فەریق نافیز پاشا موشیریەی لەشکری هەمایونی ناوبراو بە ڕەزامەندی موقامی باڵا بۆ ئەم ئەرکە دابنرێت. ئەم بیرخەرەوەمان دەرکرد بۆ جێبەجێکردنی ئیرادەی سوونی بەڕێز لەو بارەیەوە.

7ی ذي الحجة ساڵی 97و 29ی تشرینی یەکەمی ساڵی 96

(10ی تشرینی دووەمی 1880)

وێنەکە وەکو خۆی

**Irade Dahiliye**
**69691**

ئیرادەی سوونی سوڵتانی نووسراوێکی هەمایونی دەرکردووە لەسەر رەزامەندیی بۆ کامیل بەگ بۆ ئەرکێکی تایبەتی لە وان کە حەسەن ئەفەندی ئەندامی ئەنجومەنی ئیدارەی ویلایەتی وان بە جیاکەرەوەی پلە دوو، ئەحمەدە ئەفەندی بەڕێوەبەری پێشووی شەمانس بە پلە سێ بکرێتە قائیمقامی قەزای کوار، عوسمان ئاغا یوزباشی زەبتیەی پیادە لە ویلایەتی وان و سامی مەجیدیەی پلە پێنجی بدرێتێ و بگوازرێتەوە بۆ موسڵ بۆ فەرماندەی یەکەی سوارە، کەتیبەی زەبتی وان، چونکە یاوەری شێخ عوبێدوڵلا ئەفەندی دەکات لە کاتی گواستنەوەی بۆ موسڵ و بۆ خزمەتی باش و ئەمەکداریی لەگەڵیدا. فەرمان بۆ حەزرەتی وەلی ئەمرە.

19سەفەری 300و 18کانوونی یەکەمی ساڵی 98

(30کانوونی یەکەمی سالی 1882)

عـەلـی رەزا

# بەشی پێنجەم:
# سوڵتان عەبدولحەمید و لەشکری حەمیدیەی کوردی1881- 1909ز[201]

201 -ئەم بابەتە لە ژمارە (3)ی ئەیلولی (1993)یساڵی پێنجەمی گۆڤاری (ئاڵای ئیسلام) بڵاوکراوەتەوە..

ماوەی دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمید (1876– 1909ز) لە مێژووی کورد بە قۆناغێکی گرنگ دەژمێردرێت، لەو قۆناغەدا ململانێی چڕی ئیستیعماری لەسەر ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ (کوردستانی تورکیا) دەستی پێکرد، بزووتنەوەی نەتەوەیی ئەرمەن بە پشتیوانی وڵاتانی ڕۆژئاوا، بەتایبەتی رووسیای قەیسەریی دەیویست قەوارەیەکی ئەرمەنی لەسەر ئەو هەرێمەی ئەمڕۆ پێی دەوترێت: ڕۆژهەڵاتی تورکیا، دابمەزرێنێ کە زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن، سوڵتان عەبدولحەمید سوارەی حەمیدیەی دامەزراند کە ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەی گێڕا لەو ململانێیە، هەر ئەمەش شەڕێکی تاڵی زیاتر لە دە ساڵەی لێکەوتەوە.

هەوڵی نووسەری ئەم وتارە خستنە ڕووی سیما سەرەکییەکانی سیاسەتی سوڵتان عەبدولحەمیدە لە ناو دەوڵەتی عوسمانیدا، لەگەڵ پەیوەندیی ئەو سیاسەتە بەرانبەر کورد، دوایی دەچینە سەر سەرهەڵدانی دامەزراندنی حەمیدیە و بەر ئەنجامەکانی.

سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە ئەنجامی کۆدەتایەك هات کە بانگەوازکارانی چاکسازیی ڕۆژئاوایی لە دژی عەبدولمەجید، سوڵتانی بەهێزی عوسمانی ئەنجامیاندابوو، گەیشتە دەسەڵات، سوڵتان عەبدولحەمیدیش لە هەمان ئاراستە بووە، بۆیە مەدحەت پاشای والی پێشووی بەغدا کە بە کارامەیی ئیداریی ناسرابوو، هێنای کردیە سەدری ئەعزەم (سەرۆك وەزیران)، هەروەها سوڵتان عەبدولحەمید رازی بوو بە دانانی دەستوور و پێکهێنانی ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی پیاوماقوڵان، سوڵتان لە بیرەوەریەکانیدا ئاماژەی کردووە بەوەی بە ماوەیەکی کەمی دەسەڵاتی بۆی دەرکەوتووە مەدحەت پاشا و هاوڕێکانی سەر بە کۆمەڵی تورکە لاوەکانن و دەیانەوێت تاکڕەویی بەسەر دەوڵەتدا بسەپێنن، هەروەها بە دیار کەوت مەدحەت پاشا و کارامەکانی لەگەڵی دان لە دەسەڵات، دۆستایەتی تەواویان هەیە لەگەڵ ناوەندەکانی ماسۆنی و باڵیۆزی بەریتانیا لە ئەستەنبوڵ، دەستوور و پەرلەمان پەردەپۆشن بۆ رووخاندنی پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانیی و سەپاندنی ئاکاری لادینی (عەلمانییەت) بەسەر کۆمەڵگای عوسمانیدا[202]. بۆیە مەدحەت پاشای لەسەر کار لابرد و دەستووری وەستاند[203].

[202] – هەندێ جار دکتۆر لە خوێندنەوەی بۆ ڕووداووەکان دەچێتە سەر ئەو فاکتەرە فیکریی و سیاسییانە و بۆ راڤەکردنی ڕووداوەکان دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئاڕاستە فیکرییەکانەوە، ئەوەی لەسەر کۆمەڵەی

گرنگترین بەرەنگارییەکانی سوڵتان عەبدولحەمید لەگەڵ سەرهەڵدانو بڵاوبوونەوەی ناوەندەکانی ماسۆنییەت بوو لە ویلایەتەکانی عوسمانیی، لایەنگرانی ئەو ناوەندانە لەژێر دروشمی کومەڵەکانی چاکسازیی "الجمعیات الاصلاحیة"دا کاریان دەکردو بانگەوازکاری گۆڕانکاری و بڵاوبونەوەی ئاکاری ئازادیو یەکسانی بوون، لەڕاستیدا پەیوەست بوون بە جولەکە و باڵیۆز و قونسوڵیەکانی ئەوروپی، سوڵتان هاتبووە سەر ئابوورییەکی رووخاو، لە کاتی وەرگرتنی دەسەڵات قەرزی دەرەکی (300) ملیۆن لیرەی عوسمانیی بووە، مەترسیی رووبەڕووبوونەوە دەرەکیەکان لە ناوخۆییەکان کەمتر نەبوو، لە پوختەی ئەم مەترسییەدا سوڵتان دەڵێ: "دوێنێ ئەوروپیەکان دەستیان بڕین بەجیاکردنەوەی سربیا و بولغاریا و میسر لە لاشەی دەوڵەت، قاچیان بڕین بە جیاکردنەوەی پارچەکانی

ئیتحاد و تەرەقی خستوویەتیە روو بە راستی دانسقەیە و زۆر لایەنی نادیاری ئەو ئاڕاستەیەی روون کردۆتەوە، بەڵام ئەوەی لای من جێی تێبینیە، سوڵتان عەبدولحەمید و زۆربەی سەرکردە تەقلیدیەکانی کوردی هاوزەمانی سوڵتان و هاوبیری سوڵتانن و کە لادەبرێ بانگەوازکاری گەڕانەوەی سوڵتانن، بەڕاستی ئەو زەمانە ئاڕاستەیەکی مەترسیدار کە لەئیتحادو تەرەقی بەرجەستە ببوو، کە کەوتبووە گیانی ئەو کەلتوورە ئیسلامییەی سەدان ساڵە داینەمۆی مانەوە و پێکەوەژیانی کۆمەڵگای عوسمانیی بووە، بەڵام من لێرەدا تێبینیم لەسەر کەسایەتیی و جۆری بیرکردنەوە و زەخیرەی ململانێی ئەو سەرکردە تەقلیدیانە هەیە، یەکێك لە تایبەتمەندییەکانیان وابەستە بوون بووە بە سوڵتان عەبدولحەمید، ئەوانە و لە پێشەوە سوڵتان عەبدولحەمید، لە بەرانبەر شەپۆلی تازە، هەم نەیانتوانیووە گیانی تازە بکەنەوە بە بەر کۆمەڵگا و هەم لەبەر ئەندازەیەك لە بەرژەوەندیی دەوڵەمەندیی و دەرەبەگایەتی خۆیان، نەیانتوانیووە دەستەبژێری خوێندەواری کورد بخەنە بەرەی خۆیانەوە، بۆیە بەشێك لە هۆکاری سەرهەڵدانی بیری کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی دەگەڕێتەوە بۆ بێ نەزمیی و تەقلیدیەتی سوڵتان و سەرکردە کوردە تەقلیدیەکان، باشە سوڵتان پەرلەمان و دەستووری هەڵوەشاندەوە، جێگرەوەی چی بووە؟ چەندین بیریاری ئیسلامی گەورە هاوزەمانی سوڵتان بوون، ئایا سوڵتان ئەگەر لە ئاستی بەرەنگاریی بوایە، نەدەکرا ئەوانە لە بەرانبەر مەترسییەکان بە شێوازی بیرکردنەوەی خۆی بەگەڕ بخات، دەستوور و پەرلەمانو ژیانی ئازادی لە سایەی دەوڵەتەکەی زامن بکات؟ پێموایە نووسەر لە بەرانبەر شاڵاوی مەترسیداری ئیتحادیەکان ناچار بووە ناتەواوییەکانی سوڵتان عەبدولحەمید و سەرکردە تەقلیدیەکان نەخاتە ڕوو، کەچی هەر خۆی لاوازیی ئەم بەرەیەی لە چەندین جێگای ئەم کتێبە دەرخستووە، دەڵێ: هیچ لەو راپەڕینانە سەرکەوتنیان بەدەستنەهێناوە و لەگەڵ نەمانی سەرکردە شکستیان هێناوە. "وەگێڕ"

[203] - عبدالحمید الثانی: مذکرات السلطان عبدالحمید، ترجمة وتقدیم، محمد حرب، القاهرة،25-26.

دەوڵەتی عوسمانیی لە ئەوروپا، ئەمڕۆش بە کێشەی ئەرمەن لە بەشەکانی ئەنادۆڵی ئاسیایی لە ڕۆژهەڵات دەیانەوێت سکمان بدڕن و هەناومان دەربهێنن، هەتا دەمرین"[204].

سوڵتان عەبدولحەمید بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسییانە و ئامانجەکانی، پشتی بەم ستراتیژیە بەستبوو:-

یەکەم: نەهێشتی گەندەڵیی ئیداریی و ڕزگاربوون لە زیادەڕۆیی و خراپ بەکارهێنانی سامان.. بۆ بەدیهێنانی ئەمەش جەختی دەکردەوە لەسەر زیندووکردنەوەی ئاکارە بنەڕەتەکانی ئیسلامیی لە دڵ و دەروونی خەڵکیی، لە سەرەتاوە سوڵتان لە خۆیەوە دەستی پێکرد، لە هەڵبژاردنی قەسرێکی ئاسایی، بەرنامەی دوورکەوتنەوە لە حەرام و بەردەوام بوون لەسەر نوێژەکانی هەینی، ئەو باڵەخانە پاشایەتیەی قەسرێکی گەورە بوو لە باب و باپیرانی بۆی بەجێمابوو لە (قاپی سەرای) لە ئەستەنبوڵ کردیە گەورەترین کتێبخانە لە ڕۆژهەڵات، لەگەڵ زانکۆیەکی ئیسلامی بۆ خوێندنی زانستی شەرعیی و زانستی سروشتی، هەرچی بۆی مابۆوە لە زێڕ و پارە تەرخانی کرد بۆ چاککردنی زەوی وازلێهێنراو (المتروکة) لەناو دەوڵەتی عوسمانی، کە دواتر بەو زەویانەیان دەوت (زەوی سوونی)، لە لایەن دەستەیەکی کارامەوە بەڕێوەدەبران و بە ئامێر و پڕۆژەی ئاودێریی پەرەی پێدرابوو، بە قەرزێکی سووك دابووی بە جووتیارەکان و باجی لەسەر کەم کردبوونەوە، بە کورتی سوڵتان دەیویست زەویەکانی سوونی بکاتە نموونەیەك بۆ فەرزکردنی بەسەر دەزگاکانی حکومەت[205].

دووەم: زیندووکردنەوەی بیری خەلافەت لە ناو گەلانی ئیسلامی کە پێشتر سوڵتانەکانی ئالی عوسمان لەم دامەزراوە گرنگەی دیوانی شاهەنشایی بایەخیان بە کورد و عەرەب نەدابوو، سوڵتان سوور بوو لەسەر پتەوکردنی برایەتیی لە هەموو شوێنێکی ئیمپراتۆریەتەکەی و گرنگیی تایبەتی دەدا بە ڕێڕەوی سۆفیگەریی و شێخەکانی تەریقەتی لە خۆی نزیك کردەوە.

---

[204]-Joan Hqslip, the Sultan: The Life of Abdul Humid London. 1958. P.211

[205] - اورخان محمد علی: السلطان عبدالحمید الثانی، حیاته واحداث عهده، کویت، ص248-251. کویت، دار الوثائق، ص248-251

سێیەم: سوڵتان بەرنامەی دانا بۆ چارەسەر و بوژاندنەوەی ئابووریی وێرانی عوسمانیی، بۆ ئەو مەبەستەش لە هەموو جێگەیەکی ئیمپراتۆریەتەکەی گرنگی بە قوتابخانە و پەیمانگای زانستیدا، ئیمتیازاتی دا بە کۆمپانیاکانی ئەوروپیی بۆ دەرهێنانی کانزا، بایەخی بە کردنەوەی هێڵەکانی رێگەوبان و ئاسن دا، تەواوکردنی هێڵی ئاسنی بەغدا۔ بەرلین و هێڵی دیمەشق ـ حیجاز، لە دەستکەوتەکانی سوڵتان بووە.

چوارەم: بەهێزکردنی هێزی سەربازیی، کە سوڵتان عەبدولحەمید بەردەوام بوو لەسەر سیاسەتی عەبدولعەزیزی مامی لە نوێکردنەوەی دامەزراوەکانی سوپا و چەك و بایەخی تایبەتی داوە بە دەریایی عوسمانیی.

پێنجەم: رێبازی سوڵتان لە سیاسەتی دەرەوەی بە لێزانیی لەسەر بنەمای بێلایەنیی دارشتبوو، درکی بەوە کردبوو کە دەوڵەتی عوسمانیی ئەو دەوڵەتە نەماوە بە تەنیا بە رووی هێزی ئەوروپی بوەستێ، بۆیە دەیویست سوود لە هێزی دوژمنەکانی وەربگرێ لە ناکۆکیی دەوڵەتی عوسمانیی لەگەڵ دوژمنێکی تر، ئەوەش لەو ماوەیە نهێنی هۆکاری لێك نزیکبوونەوەی هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی و ئەڵمانیی بووە.

چەندین جار لە لایەن ئەرمەن و ماسۆنییەت و زایۆنی هەوڵی تیرۆرکردنی سوڵتان دراوە، لەبەر ئەوە بۆ یەکەم جار ئامێری پێشکەوتووی ئاسایشی دامەزراند، دەوڵەت ئەو کات لەژێر فشاری توندی زایۆنیدا بوو هەتا رێگەیان بدات کۆچ بکەن بۆ فەڵەستین، سەرۆکی رێکخراوی جولەکەی جیهانی (تیۆدۆر هرتزل) بە سوڵتان عەبدولحەمید گەیشت و هەوڵی دا لە خشتەی بەرێ، فەلەستینی بۆ جولەکە لێبکرِێ لە بەرانبەر دانەوەی هەموو قەرزەکانی دەرەکیی دەوڵەتی عوسمانیی، جارێکی تر هرتزل هەوڵی دا بەرتیل بداتە سوڵتان، ئەویش رەتیکردەوە و پێی وتن ئامانجی جولەکەی جیهان کرانەوەی رێگەی کۆچ کردنە بۆ فەڵەستین، چونکە جولەکە لە ئەوروپا دەچەوسێنرێنەوە، هەموو دەزگاکانی عوسمانیی کراوەیە، بەڵام ئەگەر دەیانەوێت فەلەستین لە من بکرِن ئامۆژگارییان دەکەم سەروەت و سامانی خۆیان لەدەست نەدەن، هەتا لە ژیاندا بم ئەمە بە کەڵکیان نایەت، ئەگەر من مردم، یان لەسەر حوکم لابرام، ئەوە بە خۆرِایی فەلەستین بەدەست بهێنن[206].

---

[206]- موفق بنی تامرجة: صحوة الرجل المريض، كويت، مؤسسة صقر، ص211-213.

جولەکە گەیشتنە ئەو باوەڕەی مانەوەی سوڵتان عەبدولحەمید کۆسپی سەرەکییە لەبەردەم هەوڵەکانیان بۆ زەوتکردنی فەلەستین، بە ڕێگەی ناوەندەکانی ماسۆنییەت کەوتنە چالاکیی بۆ لابردنی سوڵتان عەبدولحەمید لە حوکم و ئابڕو بردنی، بە هاوکاری باڵویز و قونسوڵیەکانی ئەوروپا هێرش کرایە سەر سوڵتان و بە ناوی ناشیرینی وەکو (سوڵتانی سوور) و (دیکتاتۆر) ناویان دەهێنا، شەڕی کورد و ئەرمەن و ئاژاوەی ئەستەنبوڵ بۆ بەرژەوەندیی ئەرمەن پەیدابوو، لەم ڕووداوانە زیاتر سوڵتانیان تاوانبار کرد، ئەمەش دەستکردنی هێزەکانی دەرەکیی بوو بۆ لەباریەکبردنی بەرنامەی سوڵتان لە نوێکردنەوەی بیری ئومەتی ئیسلامیی و چوارچێوەی سیاسەتی خەلافەت، هەموویان کەوتنە خۆ بۆ برەودان بە ئاکاری نادینی رۆژئاوا و پەرەپێدانی نەعرەتەی نەتەوەیی و تایفەگەری لەناو موسڵمانان[207].

سوڵتان لە سەرووی رەخنەوە نەبووە، هەروەك و لە بیرەوەریەکانی دا لە هەندێك کاروبار خۆی بە کەمتەرخەم زانیوە، بەڵام پیاوێکی زیرەك و خاوەن خۆزگە بووە، ویستویەتی گیانی لەباریەکچوو بکاتەوە بە بەر دەوڵەتی عوسمانیی، بەڵام درەنگ هات، باسی سوڵتان دەکرێ بەوەی سینە فراوان و لێبوردە و ناتوندووتیژ بووە، هەتا لەگەڵ دوژمنەکانی، لە سەردەمی ئەو کەس لە سێدارە نەدرا کە لە وڵاتانی تر باو بوو، گەورەترین سزا بۆ ناحەزەکانی گرتووخانە، یان ماوەیەك دوورخستنەوە بووە، ئەی بۆچی بەدەستی کۆدەتاچیەکانی ماسۆنییەت کەوت کە ئیتحاد و تەرەقی سەرکردایەتی دەکرد؟ لەگەڵ هاتنی پارتە ناسیۆنالیستەکان بە کردەوە قۆناغێکی نوێی دیکتاتۆریەت دەستی پێکرد، بە جۆرێ ئەو ناسیۆنالستە تورکانە گۆمی خوێنیان بۆ گەلانی ناتورك سازدا، دەوڵەتیان لە شەڕێکی ئەوروپی (یەکەمی جیهانیی) وەردا کە هیچ بەرژەوەندیی گەلانی عوسمانیی تێدا نەبوو، ئەمە بووە هۆی لێکهەڵوەشاندنەوەی دەوڵەت.

[207] - بەڕاستی ئەوەی دکتۆر لێرەدا خستویەتیە روو بەدواداچوونی زیاتری دەوێت، بەرنامەی سوڵتان لە بایەخدان بە سوارەی حەمیدیە و بە رێبازەکانی تەریقەتی نەقشبەندی لە کوردستان زۆر بە گران بەسەریدا شکایەوە، بەشێکی ئەو هەڵەیەش دەکەوێتە ئەستۆی سوڵتان خۆی. "وەرگێڕ".

## لەشکری حەمیدیە = سوارەی کورد

لە لایەن کۆمەڵێك لە توێژەرەوانی ڕۆژئاواوە باس لە سوارەی حەمیدیە کراوە، بە گشتیی تێڕوانینی خراپیان لەسەر وەرگرتووە کە ڕەنگدانەوەی بەڕێوەبەرایەتیە فەرمییەکانی ئەوروپیە لەسەر سوارەی حەمیدیە، لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیر لەسەر ئەو بابەتە نییە، توێژەرەوەی سۆڤیەتیی ئەمیریانۆف لێکۆڵینەوەیەکی جوانی لەسەر لەشکری حەمیدیە نووسیوە، بەڵام وەکو هەموو نووسینەکانی تری سۆڤیەتیی لەسەر کورد، پشتی بەستووە بە بەڵگەنامە فەرمییەکانی حکومەتی رووسیای قەیسەریی و بەیاننامە و راپۆرتی کۆمەڵە ئەرمەنییەکان، هەموو توێژەرەوەیەکی بابەتیی پێویستە سوود لە ئەرشیفی رووسیی وەربگرێ، بەڵام نابێت خۆ دوور بگرێت لە بەڵگەنامەکانی دەوڵەتی عوسمانیی لە توورکیا.

سوڵتان لە ساڵی (1891ز) لەو هۆزە کوردیانەی ناوچە سنووریەکانی رووسیی - عوسمانیی فەرمانی دا بە پێکهێنانی لەشکری حەمیدیە، داینابوو ئەم هێزە لە کاتی شەڕ ببێتە پشتیوانی سوپای نیزامیی، لەسەر هۆزە کوردەکان بوو هەر خێزانێك سوارەیەك بۆ ماوەی (23) ساڵ ئامادە بکات پەیوەندیی بە سوارەی حەمیدیەوە هەبێت، بەم پۆلێنەی خوارەوە:

1- ئامادە (الاحضارية): بۆ ئەوانەی تەمەنیان لە سەرووی (17) ساڵەیەوەیە، لە ناوچەکانی خۆیان مەشق دەکەن و ماوەکەی سێ ساڵە.

2- نیزامی (النظامية): ماوەی (12) ساڵە، ئەمیش ناوبەناوە و بۆ ئەوانەی تەمەنیان لە کاتی پەیوەندییکردن لە نێوان (20- 32) ساڵاندایە، ناوبەناو پابەندن بە مەشق و هەرکاتێك داوا بکرێن دەبێت بۆ ماوەی (24) سەعات بە چەك و تەقەمەنیی و ئەسپەکانیانەوە ئامادە بن.

3- یەدەك (الاحتياط): ماوەی (18) ساڵە و بۆ ئەوانەیە تەمەنیان لە نێوان (32- 40) ساڵانە پابەندن بە مەشق و لە حاڵەتی پێویست ئامادە بن.

لە هەموو حاڵەتێك سوارە ئەسپێکی دەبێت و دەوڵەت لە کاتی مەشق و شەڕ خەرجیی دەکێشێت، ماوەی مەشق سێ مانگە و ژمارەی تێکڕا (المعدل)ی هەر فەوجێك لە (800 -1000) پێکدێت، هەموو فەوجێك (3- 6) کەتیبەیە و هەر کەتیبەیەك (3 -

6) کەرتە و هەر کەرتێك (3 ـ4) سریە و هەر سریەیێك لە (20ـ30) سوارە پێکدێت، لە سەرووی هەموو تیپێك ئەفسەرێکی سوارەی کارامە هەیە[208].

هۆزەکانی بەشدار لە حەمیدیە چەندین ئیمتیازاتیان هەبووە، لەوانە چاوپۆشییان لێدەکرا لە هەموو باجێکی حکومیی، بێجگە لە باجی دەیەك و کۆدە، سوڵتان لەو دوو جۆرە باجەش نەرمیی لەگەڵ نواندوون، زەویەکانی دەوڵەت (ئەمیریە) کە بەیار بوون و بەکارنەهێنرابوون، لە دوای چاککردنی دراون بە سوارەی حەمیدیە هەتا بتوانن سوودی لێوەربگرن، دەقی فەرمانی حکومی هەیە کە ئەندامانی تیپی حەمیدی ملکەچی دادگای مەدەنیی نابن، لە سەرەتاوە سوڵتان گرنگیی تایبەتی بە لەشکری حەمیدیە دابوو، کردبوویە بەردی بناغەی سیاسەتی داڕێژراوی خۆی بۆ زیندووکردنەوەی خەلافەتی عوسمانیی، بە بڕیاری تایبەتیی بایەخی پێدا و بە ناوی خۆیەوە ناوی لێنا بوو، زەکی پاشای زاوای، مێردی خوشکی، فەرماندەی سوپای عوسمانیی بوو لە ئازەربایجان هێنایی و کردیە فەرماندەی گشتیی هێزی حەمیدیە[209]، بۆ هاندانی هۆزەکان سوڵتان و زانایانی ئاینیی بەیاننامەیەکیان ئاڕاستەی کوردەکان کرد بچنە ناو ئەو سوپایەوە، چونکە حەمیدیە پارێزگاریی لە ئیسلام و کەرامەتی مسوڵمانان دەکات و بەشدارییکردن لە ڕیزی حەمیدیە جیهادی پیرۆزە، هەروەکو زانایان و تەریقەتی سۆفیگەریی ڕۆڵی گرنگیان بینی لە هاندانی کورد بۆ چوونە ناو ریزی لەشکری حەمیدیە، لە ساڵی (1891ز) کۆنگرەیەکی بەرفراوان گیرا بۆ کوردان، سەرەڕای ئامادەبوونی زانایانی ئاینیی و سەرۆك هۆزەکان و پیاوماقوڵان سوڵتان ئامادەی بوو و قسەی بۆ ئامادەبووان کرد، بە بیری هێنانەوە بە ئەرکی خۆیان هەڵسن بەرانبەر بیروباوەڕی ئیسلامیی و وڵاتەکەیان کە هەڕەشەی دوژمنانی لێدەکرێت[210].

---

[208] - كمال مظهر احمد: كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ترجمة محمد ملا عبدالكريم، بغداد، 1984، ص85-87.

[209] - گومان لەوەدا نییە کوردیش بۆ بەرپەرچدانەوەی ناحەزەکانی و چەکدارکردنی، سوودی لە سوارەی حەمیدیە وەرگرتووە، ئامانج لە دورستکردنی سوارەی حەمیدیە دیارە، فراوانکردنی ئەو ئامانجە تا دەگاتە ئاستی زیندکردنەوەی خەلافەتی ئیسلامیی زیاتر بە وتارێکی سیاسییی دەبینم، نەك واقیعێکی مێژوویی. "وەرگێڕ".

[210] -Steven Dugid The Politics of Unity: The Hamidian Policy Eastern Anatolia, Middle Eastern Studies 9 (1973): pp. 137-140.

## هۆكارەكانی پێكهێنانی حەمیدیە

توێژەرەوەی سۆڤیەتی (لازاریف) بڕوای وایە سووربوونی سوڵتان لەسەر دامەزراندنی سوارەی حەمیدیە بە مەبەستی خۆدزینەوە بووە لە جێبەجێكردنی بەندی (16)ی ڕێككەوتنامەی بەرلینی ساڵی (1878) كە بە ناچاری وڵاتانی ئەورووپیی پێیان واژۆ كرد، ئاگادارین ڕێككەوتنامەی ناوبراو جۆرێك لە بەڕێوەبەرایەتی خۆیی دابوو بە ئەرمەن و لەسەر دەوڵەتی عوسمانیی فەرز كرابوو كۆمەڵێك چاكسازیی كارگێڕیی و قەزایی ئەنجام بدات، بە جۆری زوڵم لەسەر شانی ئەرمەن نەهێڵێ، لە بڕگەیەكی ڕێكەوتننامەكەدا هاتووە: حكومەتی عوسمانیی پەیمان دەدات دەستدرێژیی كوردە مسوڵمانەكان بۆ سەر ئەرمەن نەهێڵێ[211].

جێبەجێكردنی ئەو ڕێكەوتننامەیە واتە باڵادەستیی كەمینەی ئەرمەن لە بەڕێوەبردنی ویلایەتەكانی ئەنادۆڵی خۆرهەڵات، ئەوەی شایانی باسە وەفدی رووسیی باترپاكی ئەرمەنیی هێنابوو بۆ ئەو كۆنگرەی بەرلین، لەگەڵ ئەوەدا بۆی نەبوو لە كۆبوونەوە فەرمییەكان ئامادە بێت و بە تەنیا دەرفەتی گفتوگۆی هەبووە لەگەڵ نوێنەرەكان، وەفدی ئەرمەنیی داوای لە وڵاتانی ئەورووپیی كردبوو تێكشكانی هێزەكانی عوسمانیی لە بەرانبەر رووس لە شەڕی (1878ز) بە دەرفەت بزانن بۆ گرێدانی ویلایەتەكانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بە ناوچە ئەرمەنییەكانی ژێر دەسەڵاتی رووسیای قەیسەریی[212].

سوڵتان دەیزانی مەسەلەی چاكسازیی لە ویلایەتەكانی ڕۆژهەڵات پەردەپۆشی وڵاتانی ئەورووپیە بۆ دابڕینی بەشێكی تری دەوڵەتی عوسمانیی، لە كاتێكدا هێزەكانی ئەورووپیی هەمان ڕێگەیان گرتبووە بەر لە سربیا و مەسەدۆنیا و بولغاریا، لەو هەرێمانە لە ژێر پەردەی چاكسازیی پشتیوانیان لە هێزی ناسیۆنالستی كردووە لە ڕووی سەربازیی و سیاسییەوە بۆ جیابوونەوە لە دەوڵەتی عوسمانیی، لەبەر ئەوە دووور نەبوو سوڵتان عەبدولحەمید لەشكری حەمیدیەی كردبێتە هۆكارێك بۆ خۆدزینەوە لە

---

211 - لازاريف: المسئلة الكردية 1917-1923) ترجمة/ م حاجي، بيروت1991، ص36-39.

212 - British Documents on Foreign Affairs The Near and Middle East 1914 Doc No. 59.pp.433-37.

جێبەجێکردنی بڕیارەکە، بە دەربڕینێکی تر سوڵتان ئۆباڵی بەرپرسیاریەتی وڵاتی کوردانی خستبووە ئەستۆی کورد خۆیان،[213] بەلای ئەوەدایە سوڵتان درکی بەوە کردبوو بەبێ دۆستایەتی کورد و سەردارەکانی، دابینکردنی ئۆقرەیی و ئارامیی ویلایەتە کوردیەکانی ئەنادۆڵی خۆرهەڵات نایەتە دی، لەشکری حەمیدیە دەرفەتی دابوو بە نەوەی خێڵەکان بە دابینکردنی بژێویی و گەڕاندنەوەی شکۆمەندیی سەرۆکانیان، سوڵتان زەکی پاشای راسپارد شێوازێك بەکاربهێنی بۆ پاڵاوتنی هۆزەکان کە پێکهێنانی حەمیدیە هاوسەنگیی نێوان هۆزەکان زامن بکات، هەتا سوارەی حەمیدیە نەبێتە هۆکارێکی تری زیادبوونی ئاشووب و شەڕی هۆزەکان، بۆیە ئەو شەڕە دەمارگیرییەی چەندین ساڵە هەبوو لەسەر خوێنگری و زەوی و زار، خاو بووبۆوە[214].

توێژەرەوانی رووس و نووسەرانی کورد بەو ئاڕاستەی مەنهەجیەتیە دەنووسن کە هۆکاری سەرەکیی لە پێکهێنانی لەشکری حەمیدیە بۆ ئارەزووی سوڵتان بووە لە بەکارهێنانی کورد وەکو ئامێرێکی لە باری بندەستی خۆی دژ بە جوڵانەوەی نەتەوایەتیی گەلانی ناتوورك و ئامادەکردنی ئەو هێزە وەکو سوپایەکی یەدەك بۆ شەڕەکانی داهاتووی دەوڵەتی عوسمانیی لەگەڵ رووس[215]. گومان لەوەدا نییە سوڵتان لەشکری حەمیدیەی بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی روەسیای قەیسەریی دامەزراند، لە بەرانبەر هێرشی فراوانخوازیی رووس بۆ سەر ویلایەتەکانی عوسمانیی لە ڕۆژهەڵات، بەڵام ناتوانین کۆك بین لەگەڵ ئەوەی لەشکری حەمیدیە هاتووە بۆ لێدانی جوڵانەوەی گەلانی ناتورك لەناویاندا جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کورد، ئەمەش بە هۆی چەند ئەگەرێکی نەگونجاوی بنەڕەتیی:

یەکەم: سوڵتان عەبدولحەمید لە ناسیۆنالیستە تورکەکان نەبووە هەتا بیر لە لێدانی نەتەوەکانی تر بکاتەوە، بەڵکو زۆربەی راوێژکارە نزیکەکانی عەرەب و کورد بوون.

دووەم: لەو کاتە (1891) جوڵانەوەی نەتەوایەتی کاریگەر لەناو کورد چ وەکو بیرۆکەی ناو رووناکبیران و چ لە ناو جەماوەر بە گشتیی نەبووە، بە درێژایی دەسەڵاتی

- [213] Dugid, pp.139-43.

[214]-bod.pp..42-43.

[215]- -کمال مظهر احمد: كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ل73. ، Air 20/513 Northern Kurdistan 20/51

سوڵتان عەبدولحەمید بزووتنەوەی نەتەوایەتی لە ناو کورد گەشەی نەکردبوو، دەرکردنی رۆژنامەی "کوردستان"یش لە دەرەوە لە ساڵی (1898) لە لایەن نەوەکانی بەدرخان و بە پشتیوانیی لایەنی ئەرمەنیی و ماسۆنی نابێتە بەڵگە لەسەر سەرهەڵدانی جوڵانەوەی نەتەوایەتیی، ئەمە لە کاتێکدا رۆژنامەی (کوردستان) ئینگلیزەکان پشتیوانیان لێکردووە و لایەنی ئەرمەنیی بە رێگەی سووریاوە گەیاندویانەتە کوردستان، چونکە رۆژنامەکە دژایەتیی سوڵتان و پشتگیریی لە کێشەی ئەرمەن کردووە[216].

نووسەری ئەم وتارە وای بۆ دەچێت ئەوەی سوڵتانی هەڵنا بۆ دامەزراندی لەشکری حەمیدیە، هەستکردنی بوو بە دڵسۆزیی کورد و ئەو توانا بەهێزە سەربازییەی پێی ناسراوە لە شەڕەکانی رووسیی ـ عوسمانیی لە ساڵانی (1877- 1878)، کاتی راپەڕینەکەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری (1881)، سوڵتان بە چاوی خۆی رادەی دڵسۆزیی کوردانی دیبوو، هۆزە کوردەکان رۆڵی گرنگ و شەرەفمەندانەیان گێڕا لە بەرگریی لە دەوڵەتی عوسمانیی، سەرکەوتنی رووس و نوشستی عوسمانیی لەو شەڕە بە هۆی چالاك نەبوونی کوردەکانەوە نەبووە کە لە ژێر فەرماندەی شێخانی تەریقەتی سۆفیگەریی شەڕیان کردووە، بەڵکو بە هۆی ئەو زیانانەوە بوو کە لەوە پێش بەر دەوڵەتی عوسمانیی کەوتبوو، لە ئاکامی گەندەڵیی ئیداریی ئەستەنبوڵ و ناڕێکی و نەبوونی بەگەڕخستنی باشی هێزە نیزامی و خەباتکارانی کورد، سوپای رووسیی بە مەشق و خۆئامادەکردنی باشتر سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەشداریی خەباتکارانی کورد لەو شەڕە بە سەرۆکایەتی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری ئەزموونێکی باش بوو، لە کاتێکدا ئەرمەنەکان لە سایەی موسڵمانان زیاتر لە هەزار ساڵە بە ئاشتیی و تەبایی ژیاون، کەچی بە هەزارانیان پەیوەندسیان بە هێزی هێرشکەرانی رووسەوە کرد، رووس لە هێرشی بۆ سەر ئەرزڕۆم سیاسەتی خاکی سووتاو "الاراضي المحرقة"ی پیادە دەکرد[217].

---

[216]- جليل جليلي: نهضة الاكراد الثقافية و القومية، ترجمة بافي نازىو د.ولاتو، بيروت، دار الكتاب، ص45-46

[217] -ن. خالفين: خەبات لە رێی کوردستان. وەرگێڕانی/ جەلال تەقی، سالێمانی1971، ل141-143 .Burinessfn,p. 334

ئازایەتی هۆزەکانی کورد بۆ فیداکاریی لە شەڕی رووسیی (1878ز) کورت هەڵنەهاتبوو لە کوردی هەرێمە سنوورییەکانی رووسیا، بەڵکو خەباتکارانی ویلایەتی موسڵیش رۆڵیان هەبووە، شێخ کاك ئەحمەدی بەرزنجی و شێخ سەعیدی کوڕی لە پەیوەندیی پتەودا بوون لەگەڵ سوڵتان عەبدولحەمید و رۆڵی گرنگیان هەبووە لە هاندانی کورد بۆ جیهاد، بەچەند تیپێك کوردانی ئەو هەرێمە بەشدارییان لەو شەڕەدا کردووە[218] سوڵتان درکی بەوە کردبوو پێویستە سوود لە توانای مسوڵمانانی کورد وەربگیرێ و رێکبخرێن و سوپایەکی نیمچە نیزامیان لێ درووست بکرێ لەسەر ئەو شێوە سوپا نانیزامیەی لە رووسیا پێی دەڵێن (قەوزاق)، ئەم دامەزراوەش جۆرێکی تر بووە لە میکانیزمی پەیوەندیی سوڵتان لەگەڵ کورد.

## ئەنجام و شوێنەوارەکانی سوارەی حەمیدیە

پێکهێنانی سوارەی حەمیدیە لە چەند لایەکەوە شوێنەواری بەرچاوی هەبووە لەسەر کورد، مامۆستا کەمال مەزهەر ئەزموونی پێکهێنانی سوارەی حەمیدیە بە سەرکەوتوو نازانێ و نووسیویەتی: بە سەقەتی و بە خەراپی پەیدا بوو[219]، دکتۆر کەمال دەیەوێ بێتە سەر ئەوەی بڵێ پێکهێنانی لەشکری حەمیدیە لاپەڕەیەکی رەش بوو لە مێژووی کورد، چونکە بە هۆی ئەو لەشکرەوە دەستیان چووە خوێنی ئەرمەن و ئەمەش زیانی لە بەرژەوەندیی کورد داو کردیە "بەربەری"و خوێنرێژ[220]، لەڕاستییدا لە ساڵی (1843) وە ناوبانگی کورد باش نەبوو، لەو کاتەوە گروپەکانی موژدەدەران و بەرپرسانی بەریتانیی و فەرەنسیی دیمەنێکی ناشیرنیان لەسەر ناکۆکیی میر بەدرخان و نەستووری "ئاشوورییەکان" خستبووە روو، ئەوانە راپۆرتی درۆ و شێوێندراویان لەسەر کوشتاری ئاشوورییەکان بە دەستی کورد دەنارد بۆ رۆژنامەکانی رۆژئاوا، کە پڕ بوو لە ناوهێنانی کورد بە "بەربەری"و دڕندەی تینوو بە"خوێنی مەسیحیەکان"[221]. ئەمە

---

- [218] E J. Edmonds, Kurd Turk And Arabs Oxford University Press.

[219] - كمال مظهر: المصدر السابق، ص88-89.

[220] - كمال مظهر: المصدر السابق، ص282.

[221] - H.Layard, Ninneveh And Its Remains New York, 1950,p183.

حاڵی داگیرکەر بووە، ئەگەر خاوەن کەرامەت و بوێر بەرگریی لە خۆی بکات "دەمارگیر"و "بەربەری"یە و ئەگەر لاسای و هاریکاریی ئەوان بێت بە نازناوی بەرزی وەکو "ڕووناکبیر"و "میانەڕەو"و "نیشتیمانیی" ناودێر کراوە.

توێژەرەوان یەکدەنگن لەسەر سەرکەوتنی سوڵتان عەبدولحەمید لە قەناعەت پێك هێنانی هۆزە چالاکەکانی کورد بۆ کۆکردنەوەیان لە چوارچێوەی دامەزراوەی حەمیدیە لە سنووری رووسیا و دەوڵەتی عوسمانیی، ئەو هێزە بە کردەوە بووە هێزێکی بەرگریی و نەیهێشت جارێکی تر رووس بیر لە شەڕی وا پڕ لە مەترسیی بکاتەوە بۆ داگیرکردنی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات، هێزەکانی حەمیدیە لاپەڕەی گەشیان تۆمار کرد، بەتایبەتی لە شەڕەکانی بۆسنا و سربیا و یۆنان، لەسەر قسەی نووسەر وەحیەدین بەڕاستی بەگیانی سوارچاکیی و سەربازیی بەرزەوە کورد ئەو لاپەڕانەیان تۆمار کرد[222].

ئەم هێزە نانیزامیە هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم لە گەشەسەندن و سەرکەوتن دابوو، هۆزە کوردیەکان لە پێشبڕکێدا بوون بۆ بەدەستهێنانی شەرەڤ گەورە لە پەیوەندییکردن بە لەشکری حەمیدیە، قەبارەی لەشکری حەمیدیە فراوان بوو، لە (40) لیواوە لە ساڵی (1892ز) بۆ ساڵی (1899ز) بووە (63) لیوا، زۆریی ئیمتیازات و پشتگیریی زانایان و شێخانی تەریقەت دەوری گرنگیان بینی لە سەرکەوتنی ئەو ئەزموونە[223]. ئامانج لەو هێزە بەرپەرچدانەوەی رووس و ئەرمەنییە سنووربەزێنەکان بووە، سوڵتان عەبدولحەمید زۆری هەوڵدا هۆزە کوردیەکانی کوردستانی عێراق بهێنێتە ناو سوارەی حەمیدیە[224]. حکومەتی ئیتیحادو تەرەقی لە ساڵی (1912ز) توانی زۆربەی هۆزە کوردەکانی لیوای سلێمانی قەناعەت پێبهێنێت پەیوەندیی بکەن بە لەشکری حەمیدیە، ئەوکات ناوەکەی گۆڕابوو بۆ تیپە سووکەکانی سنووور[225].

لە گرنگترین ئەنجامەکانی پێکهێنانی حەمیدیە لەسەر کۆمەڵگای کوردیی، گەڕاندنەوەی متمانە بوو بە گشتیی بۆ کورد و بەتایبەتی بۆ سەرکردە تەقلیدیەکانی لە

---

[222] - Waheed Shaikh, The Kurds, And Their Country Lahore, 1958.p148.

[223] - Bruinessen,pp.234-235

[224] - S-Longrigg, four Centuries of Modern Iraq Oxford University, Press,1923.pp.310-312

[225] - S..Logging, Iraq from 1900 to1950 Oxford University, 1953. P.49.

سەرۆك هۆز و زانایانی ئاینیی، بەتایبەت دەوڵەتی عوسمانیی لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەم (1812– 1839) بە لەناوبردنی میرنشینەکانی کورد سیاسەتی تازەی بەرانبەر کورد پیادە کردبوو، پێکهێنانی سوارەی حەمیدیە ئیمتیازاتی زۆری دا بە کورد بە مانای وەستاندنی سیاسەتی کۆن و پەیڕەوکردنی سیاسەتی تازە، گەڕیدە رۆژئاواییەکان چەندین سەربوورده لەسەر زەکی پاشا و سوڵتان دەگێڕنەوە کە چۆن کوردیان پاراست، نەك هەر لە دەستی رووس و چەکدارانی ئەرمەن، بەڵکو لە دەستی کاربەدەستە خۆجییەکانیش، دەوڵەتانی ئەوروپا بە بەردەوامیی و بە جددیی داوای سزادانی ئەو هۆزە کوردانەیان دەکرد، بەرپرسانی عوسمانیی لە ئەستەنبوڵ رازی بوون و زەکی پاشا و سوڵتان قبوڵیان نەدەکرد[226].

توێژەرەوەیەکی هۆڵەندیی چەندان جار سەردانی ناوچەی کوردانی لە تورکیا کردووە و دەڵێ: "هەتا ئێستاش کورد وەکو باوکێکی دڵسۆز سەیری سوڵتان عەبدولحەمید دەکەن"[227].

ئەو فەرماندە ناودارانەی لەو ماوەیە پەیدابوون توێژەرەوان ناوی مستەفا پاشای میران دەبەن کە جێگەی متمانەی سوڵتان بووە و چەندان هێزی حەمیدیەی لەبەردەستدابوو، مستەفا پاشا توانیبووی جێگەی میر بەدرخانی ناوچەی بۆتان بگرێتەوە، والی عوسمانیی و کاربەدەستانی میریی نەیاندەتوانی دەست لە کاروباری ناوخۆیی ناوچەکە وەربدەن، ئیبراهیم پاشای میللی سەرۆکی هۆزی میلليی (لە سنووری تورکیا، سوریا، عێراق) ببووە جێی متمانەی سوڵتان، ئیبراهیم پاشا "دایکی عەرەب و لە هۆزی شەمەڕ بوو"، وای لێهات بە کردەوە بوو بوو بە دەسەڵاتداری زۆربەی ناوچەکانی نێوان ئورفە، رقە، حەلەب، دیاربەکر، ئیبراهیم پاشا لە توانایدا هەبوو کاتی پێویست (20) هەزار چەکداری حەمیدیە بخاتە گەڕ، ناسیۆنالیستەکانی تورك "ئەو کوردانەی ببوونە تورك وەکو زیا کوك ئەلپ" کاربەدەستی ناوچە کوردیەکان بوون، نیگەران بوون لە دەسەڵاتی ئیبراهیم پاشا، لە (1894ز) خۆپیشاندانیان رێکخست و

---

[226]-- Sir Edwin pears ,Life of Abdul Hammed New York,ARNO Press, New York, 1873. Pp 226-27.

[227] - Bruinessen, p.235.

داوایان لە حکومەتی ئەستەنبوڵ دەکرد ئیبراهیم پاشا و هێزەکانی حەمیدیە لە دەوری شاری دیاربەکر دوور بخاتەوە[228]. ڤان برۆنسن دەڵێ: "دڵفراوانیی دەوڵەت بەرانبەر ئیبراهیم پاشا بەو هێزو رەفتارە سیاسیی و عەسکەرییەوە، بەڵگە بووە لەسەر متمانەی سوڵتان عەبدولحەمید بە کورد و نەمانی نیگەرانیی ئەو بووە لە بەرانبەر دەسەڵاتی کوردان"[229].

لەشکری حەمیدیە بەو خاسیەتانە شوێنی لەسەر ژیانی ئابووریی و رۆشنبیریی کوردیی بەجێهێشت، سوڵتان فەرمانی کردنەوەی قوتابخانەی سەربازیی و زانستیی دا بۆ بەرەو پێشبردنی توانای جەنگیی و ئیداریی لەشکری حەمیدیە، لە ئەستەنبوڵ و شارە سەرەکیەکانی تر، بە ئامادەکردنێکی ئیسلامیانە و پێگەیاندنێکی زانستیانە بۆ کوڕانی هۆزە کوردیەکانی سەر بە لەشکری حەمیدیە پەیمانگا و قوتابخانە بە ناوی "عەشیرەت مەکتەبلەری" کرانەوە[230]. ئەمەش کاریگەریی هەبوو لەسەر کۆکردنەوەی لاو و رووناکبیرانی کورد بە گشتیی لە دەوری بیری خەلافەتی ئیسلامیی، کە کورد بە دڵسۆزترین بانگەوازکاریی مایەوە، لە کاتێکدا بیری نەتەوایەتیی درزی خستبووە نێوان خەلافەت و گەلانی دراوسێی، بۆیە غەریب نییە فەرماندەکانی حەمیدیە چەندان راپەڕینیان سازکرد بۆ گەڕاندنەوەی سوڵتان عەبدولحەمید، ناوچە کوردیەکان سێ راپەڕینی گەورەی بە خۆوە بینی لە بەرژەوەندیی سوڵتان، شۆڕشی شێخ سەعیدی بەرزنجی، مەلا سەلیمی بەدلیسی، ئیبراهیم پاشا[231]. لەبەر ئەوە دەوڵەتە ئەوروپیەکان لە سەردەمی سوڵتان لە سەنگەردا بوون بۆ لەشکری حەمیدیە، لە یەکەم کۆدەتادا کاری ئیتیحادیەکان هەڵوەشاندنەوەی لەشکری حەمیدیە و هێرشکردنە سەر ئەفسەرە گەورەکانی کورد بووە لە سوپای نیزامی، چونکە ئەوانە جێی گومانی ئیتحادو تەرەقیی بوون، بەڵام حەمیدیە و قوتابخانەکانی سەر بە حەمیدیە شوێنەواری قوڵیان لەسەر

---

[228] - B.Dikson. {Journey in Kurdistan} Geographical Journal 35[1910] pp.370-1 ;Van Bruinessen,p.238.

[229]-Van Businesses, pp.238—39 .

[230] -Van Bruinessen,238.

[231] -Dickson pp.371-2 .

کۆمەڵگای کوردستانیی بەجێهێشت، کورد تا ساڵی (1925ن) خەباتی کردووە لە پێناو خەلافەت، شێخ سەعیدی بالۆ وەك یەکێك لە پشتیوانەکانی سوڵتان، جیهادی گەورەی ڕاگەیاند و داواکاری گەڕاندنەوەی خەلافەت بوو، زۆربەی سەرکردەکانی ئەو ڕاپەڕینە لە ئەفسەرانی حەمیدیە و دەرچووی قوتابخانەکانی سەر بە حەمیدیە بوون، وەك ئیحسان نووری و خالید بەگی جیرانی. پرۆفیسۆر رۆبرت ئۆلسن دەڵێ: "لەشکری حەمیدیە و قوتابخانەکانی چەندان سەرکردەی سیاسیی و سەربازیی کارامەی پێشکەش بە کورد کرد"[232].

## لەشکری حەمیدیە و خوێنی رژاوی کورد لە دوژمنکارییەتی ئەرمەن

هەندێ لە نووسەر و سەرکردەی ئاڕاستە نادینی و ناسیۆنالیستی پێیان وایە لەشکری حەمیدیە نەگبەتیی بووە بەسەر بەرژەوەندیی کورد و ئامرازێکی کارا بووە بۆ لەناوبردنی گەلی ئەرمەن و دابینکردنی دوژمنکاریی رۆژئاوا بۆ کورد، مامۆستا کەمال مەزهەر لە کتێبەکەی (کوردستان لە سالانی شەڕی یەکەمی جیهانیی)دا دەیەوێ ئەو بۆچوونە بسەلمێنی.

داوای لێبووردن لە خوێنەر دەکەین بە درێژکردنەوەی باسەکە و بە هێنانەوەی چەند نموونەیەك لە ناو کتێبی ناوبراو. مامۆستا لە لاپەڕە (257)دا دەڵێ: "یەکێك لە شێخەکانی کورد بە ناوی مەلا سەعید لە 1895/1/28 قەسابخانەیەکی بۆ ئەرمەن لە شاری ئورفە سازدا، فەرمانی دا ئەرمەنییەکی بێتاوانیان لە بەردەمی لەسەر زەوی درێژکرد و بە دەستی خۆی سەری لە لاشەی جیاکردەوە و هانی خەڵکی دا لەسەر کوشتنی ئەرمەن، چونکە ملکەچی سوڵتانی خەلیفە نابن"، ئەم هەواڵەی لە دیبلۆماسی ئیتالیی لە حەلەب وەرگرتووە. دکتۆر کەمال لەسەری دەڕواو لە لاپەڕە (258) دا دەڵێ: (هەر لەوێ ئاغا کوردەکان کاروانی ئەرمەنیان لە جەندرمە جیادەکردەوە و لە

---

[232] - Bruinessen, p.239; Report Olson, The Emergence of Kurdish Nationalism And the Shied Rebellion Texas, University of Texas Press. Pp.32-4.

دوای زەوتکردنی ئەوەی پێیانە دەیانکوشتن، لە دوایی بۆ گەڕان بە دوای لیرەی زێڕ سکیان هەڵدەدڕین"، بۆ ئەمەش پشتی بە کتێبەکەی (فائز الغصين) بەستووەو ئەویش لە شوێنی خۆی پشتی بە سەرچاوە ئەرمەنییەکان بەستووە، دکتۆر ڕۆڵی کوردی خەجاڵەت لە بەرانبەر کوشتاری ئەرمەن بۆ دەمارگیری کوێرانە و هەستی ئاینیی کورد گێڕاوەتەوە، مەلاو موفتی "زانایان"و "پیاوانی ئاینی بە پێی ئەو فەرمانەی لە حکومەتەوە دەردەچوو، هەستی خەڵکیان دەوروژاند و بە ئاشکرا هانیان دەدان بۆ کوشتنی ئەرمەن"، بۆ ئەمەش پشتی بە بەڵگەنامەی ناو دەوڵەتی عوسمانیی بەستووە کە قونسوڵیەکی بەریتانی باسی کردووە. لە کۆتاییدا دەڵێ: (زۆرینەی کورد و ئەوانەی بەشداریی کوشتاری ئەرمەنیان کردووە لە سوارەی حەمیدیە بوون، ئەو دامەزراوە سەربازییەی لە بنەڕەتەوە بە مەبەستی ناوزڕاندنی کورد بۆ کاری لەو جۆرە، پێکهێنرابوو)[233].

سەرەڕای ڕێز و تەقدیرم زۆر بۆ دکتۆر وای بۆ دەچم ئەم زانیاری و هەواڵانەی لە کتێبەکەی باسی کردووە، بەڕاستی دەزانێ و بڕوای وایە هیچ هەڵوێستە هەڵناگرێ و قابیلی پێداچوونەوە نییە، ئاشکرایە گروپەکانی ئەرمەنی و نووسەرانی رووس و قونسوڵیەکانی ئەوروپی هاوسۆز لەگەڵ ئەرمەن بۆ مەبەستی ورووژاندنی رای گشتیی ئەوروپی بە ئەنقەست ئەو بابەتەیان گەورە کردووە و زیادەیان پێوە ناوە، هەتا فشار بخەنە سەر حکومەتەکانیان لە بەرژەوەندیی ئەرمەن دەست لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانیی وەربدەن، بەداخەوە نووسەری ناوبراو خۆی بواردووە لە ڕاستی ئەو کوشتارە خوێناویەی ئەرمەنییەکان لە دژی کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و کاتی شەڕی یەکەمی جیهانیی ئەنجامیان داوە، هەتا هەندێك توێژەرەوەی ڕۆژئاوا وەکو (ئەستیڤان شۆی) نووسەری ئەمریکی بە سەرژمێریی مەیدانیی بەزیاتر لە (600) هەزار مرۆڤی کوردی لە قەڵەم داوە[234].

---

[233] - کمال مظهر احمد: م، س، ص262.

[234] - S-Shaw, History of Ottoman Empire And Modern Turkey ,Vol. 2, Cambridge University Press,pp.202-203.

نووسەرانی رۆژئاوا هەموو لەسەر ئەوە کۆکن لە چوارچێوەی رژێمی میللیی عوسمانیی ئەرمەنەکان لە سایەی ئیسلامەتی تورك و کورد سەدان ساڵە بە ئاشتیی و تەبایی ژیاون، بە تریاك گریگۆری لە ئەستەنبوڵ بە دوای بەرژەوەندیی ئەرمەندا دەچوو سوڵتان هەموو رێزێکی لێدەنا، بەڵام لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە دەسەڵاتدارانی ئەوروپی بەتایبەتی رووس هانی بیری ناسیونالیستیان دا لە ناو ئەرمەن بەو هیوایەی وەکو پردێك سوودی لێوەربگرن بۆ گەیاندنی دەسەڵاتی رووسی بە ئەنادۆڵی رۆژهەڵات، سەربەخۆیی سرب و بولغار و بەشدارییکردنی بازرگانە ئەرمەنەکان و باڵیۆزی وڵاتانی ئەوروپی لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی بەشداریی کاریگەرییان هەبووە لەسەر بڵاوکردنەوەی گیانی دوژمنکاریی ئەرمەن بەرانبەر دەوڵەتی عوسمانیی، بۆ ئەو مەبەستەش لە ڕووسیا دوو رێکخراوی ئەرمەنیان دامەزراند بە ناوی (هاجناق) لە ساڵی (1866) و داشناق لە ساڵی (1890) بۆ لێدانی دامەزراوە حکومیەکانی دەوڵەتی عوسمانیی، هەتا سوپای عوسمانیی ناچاری کاری تۆڵەسەندنەوە بکەن لە دژی ئەرمەن، لە ئاکامدا رۆژئاوا دەست لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانیی وەربدات.

چالاکیە تیرۆریەکانی ئەرمەن هاوکات زۆر بەیەك دەچوون لەگەڵ چالاکییەکانی رێکخراوی ئیسترینی تۆقێنەر، بە زۆری چەکدارە ئەرمەنییەکان لە خاکی جۆرجیا، یان ئازەربایجان سنووریان بەزاندوە و بە شەو هێرشیان کردۆتە سەر ئەو گوندە کوردانەی بە ئارامیی دەژیان،ماڵەکانیان دەسوتاندن و منداڵەکانیان سەردەبڕین و ئافرەتەکانیان دەفڕاند، ئەمەش بە مەبەستی ترساندنی ئەو گوندە و گوندەکانی دراوسێیان هەتا رەو بکەن و مەیدان چۆڵ بێت بۆ کۆچکردنی ئەرمەن بۆ ئەو ناوچانەی پێی دەوترا (ئەرمینیای کۆن)، چەکدارە ئەرمەنییەکان دەیانویست کێشەی ئەرمەن بهێننە گۆڕێ، بە کوشتنی کورد و سوتاندنی گوندەکانیان هەستی کورد بۆ تۆڵەسەندنەوە لە لای ئەرمەن بورووژێنن[235].

لێرەدا ئەو دەرفەتەمان نییە دۆسیەیەکی تایبەت بکەینەوە لەسەر کوشتاری کورد بە دەستی ئەرمەن، بە تەنیا یەك کارەسات باس دەکەین، ئەویش رووداوی قەزای (سامسۆن)ی کوردیە لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا، لە ساڵی (1894) چەکدارە

[235] - Haslip, p.218.

ئەرمەنییەکان بە ئاماژەی رووسیا یاخیبوونی گشتییان راگەیاند و بەرپرسانی حکومییان لە ناوچەکانی خۆیان دەرکرد، سوپای عوسمانیی بۆ لایەنگیری بەرپرسانی هاتە ناو شار و شەڕێکی کورت روویدا، چەکدارەکانی ئەرمەن بە ئاڕاستەی شاخەکانی دەورووبەر کشانەوە، بە ڕێگەوە کەوتنە کوشتاری خەڵك و سوتاندنی کەلوپەلی زیاتر لە (30) گوند، کاتێك لەشکری حەمیدیە گەیشتە شارەکە گوێبیستی کوشتاری گوندەکانی دەورووبەری بوون، لەلای خۆیانەوە هێرشیان کردە سەر ئەرمەن، لە ئەنجامی رقی تۆڵەسەندنەوە هەزاران کەسی بێتاوان لە هەردوولا کوژرا، رێکخراوەکانی ئەرمەنیی ئەمەیان قۆستەوە و هەواڵی هەڵبەستراویان لەسەر رووداوەکە بڵاوکردەوە، بە پێی پڕوپاگەندە (20) هەزار ئەرمەن کوژرا بوون، ئەمە رای گشتیی ئەورووپی هەژاند و داوایان لە حکومەتەکانیان کرد بێنە پێشەوە بۆ وەستانی شەڕی کوردە مسوڵمانە "بەربەری"یەکان لە دژی ئەرمەن، دەوڵەتی عوسمانیی لێژنەیەکی بە بەشداری کۆمەڵێ لە رۆژئاوایەکان پێکهێناو لیژنەکە بە ڕاپۆرتێکەوە گەڕایەوە و راگەیاندنی ئەرمەن پووچەڵ بۆوە[236].

شەڕی ئەهلیی نێوان کورد و ئەرمەن هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بوو، ژمارەیەکی زۆری بێتاوان لە هەردوولا بوونە قوربانیی ئەو شەڕە هەڵچووە خێڵەکیە، بە تەنیاش وڵاتانی ئەورووپیی سوودمەند بوون کە هەرگیز حیسابیان بۆ گەلانی ناوچەکە و بەتایبەت گەلی ئەرمەن نەکردبوو.

شەڕی ئەرمەنی ـ کوردی لە ڕۆژگاری سوڵتان عەبدولحەمید پیلانێکی دەرەکیی بووە بۆ تێکدانی بارودۆخی ناوخۆیی دەوڵەتی عوسمانیی، ئەرمەن و سوپای عوسمانیی و لەشکری حەمیدیەی بۆ کێش کرا، هەندێك لە توێژەرەوانی ویژدان زیندوو پەردەیان لەسەر بەشێکی ئەو پیلانە لابردووە، بەڵام چیرۆکی تەواوی ئەو شەڕە دڵتەزێنانە بە تەواوی روون نابێتەوە، لە دوای کردنەوەی هەموو دۆسیەکانی عوسمانیی و رووسیای قەیسەریی نەبێت، بەڵام بەڵگەکانی ئێستا هەروەکو برۆنسن دەڵێ: "ئەوە دەردەخەن سوڵتان عەبدولحەمید سیاسەتی نەخشە بۆ کێشراوی بۆ لە ناوبردنی ئەرمەن نەبووە"[237].

---

[236] - Shaw,pp.203-204; Pears, p.230.

[237] -Van Bruinessen, p.239

پرسیارێکە و بە خەیاڵماندا دێت، ئایا ئەرمەن بە پشتیوانیی دەرەوە بە کردەوە نییەت و توانای گۆڕینی کوردستانی تورکیایان هەبووە بۆ دەوڵەتی ئەرمەنیی؟ تا چەند سوارەی حەمیدیە وەکو هێزێکی بەرپەچدانەوەی ئەرمەن بۆ سەر کوردستان، خزمەتی کردووە؟

لەڕاستیدا رێکخراوە کۆن و تازەکانی ئەرمەنیی ئەو راستیەیان نەشاردۆتەوە کە ئارەزووی زیندووکردنەوەی مەملەکەتی ئەرمەنستانی کۆنیان هەبووە لەناوچەیەك سەدان ساڵە ناوچەیەکی کوردی بووە، وەکو لەسەرەتاوە باسمان کرد سەرکردە ئەرمەنییەکان، لە چەندان بۆنەدا داوای یارمەتییان لە دەوڵەتانی ئەورووپیی کردووە بۆ بنیاتنانی قەوارەی ئەرمەنیی لەو ناوچانە، لە ساڵی (1895ز) دەوڵەتانی ئەورووپیی پێشنیازیان بۆ سوڵتان عەبدولحەمید کرد رەزامەندیی دەربڕێت لەسەر حوکمی زاتی بۆ ئەرمەن لە ویلایەتەکانی ئەنادۆڵی رۆژهەڵات، گوزارشتی ناوبراو خرابووە ناو بەرنامەی جێبەجێکردنی بەندەکانی پەیوەندیدار بە ئەرمەن لە رێکەوتنامەی بەرلینی (1878ز). ئەورووپیەکان، بەتایبەتی رووسیا و بەریتانیا داوایان کرد، کە والی ئەورووپی "یان عوسمانیی بە رەزامەندیی ئەورووپی" دابمەزرێن، هەتا ئەرکی رێوشوێنی چاکسازیی سیاسیی و ئیداریی و قەزایی بگێڕن لە ناوچەکەدا لە بەرژەوەندی ئەرمەن، هەروەها ئەوەی لە داواکاریی ئەورووپییەکاندا هاتبوو دانانی لیژنەیەکی یەکسان لە ئەرمەن و موسڵمان (کورد و تورك) بۆ سەرپەرشتی چاکسارییەکان، ئەمە لە کاتێکدا رێژەی ئەرمەن لەوکاتە لە (18٪)ی دانیشتوانی ناوچەکە تێنەدەپەڕی[238].

لە ساڵی (1912) بەریتانیا توانی حکومەتی ئیتیحادو تەرەقی لە ئەستەنبوڵ قەناعەت پێبکات لەسەر سیغەی ساڵی (1895) بە جێبەجێکردنی چاکسازیی بۆ ئەرمەن، ئەورووپیەکان داوایان کردبوو پشکێنەری گشتیی (مفتش العام) بە هاوکاریی کۆمەڵێك لە شارەزایانی ئەورووپی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکە دابنرێ، هەتا ئەڵمانیا هانی سوڵتانی دا لەسەر گوێنەدان بە فشاری رووسیی و بەریتانی، لە کاتێکدا ئەو پرۆژەیەی بەریتانیا پێشکەشی کرد ناوەڕۆکی ئەزموونی مەسدۆنیا بوو کە بە سەربەخۆیی دوایی هات[239].

---

[238] - Pears, pp.226-27.

[239] - British Documents on Foreign Affairs, Near And Middle East 1908-1914 Vol. 20.Doc.No.59.pp433-4.

هەروەکو لەو دوو ساڵە وتووێژ هەبووە لەسەر کۆچی ئەرمەن بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، ئەو هەرێمانەش لە ڕێکەوتنامەی سایکس - بیکۆ درا بوو بە ڕووسیا بەو هیوایەی ئەو ناوچانە بلکێنرێت بە ناوچەکانی ئەرمینیای رووسیی، لە دوو ساڵی دوای شەڕی یەکەمی جیهانیی و کاتی کۆنگرەی سان ریمۆی ساڵی (1920) دەوڵەتە سوێندخۆرەکان بە زەقی لەسەر مەسەلەی دەوڵەتی ئەرمەن قسەیان دەکرد، لەوێ بە کۆی دەنگی نوێنەری دەوڵەتە سوێندخۆرەکان ناوچە کوردیەکانی (وان، بەدلیس، دیاربەکر، ئەرزڕۆم) بەشێکی زیندووی دەوڵەتی ئەرمەنی بوون و بە گەرمیی قسە لەسەر دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە کرابوو، دەوڵەتە سوێندخۆرەکان لەگەڵ واقیعێکی تاڵ تێك دەگیران، ئەویش چۆڵکردنی کەمینەی ئەرمەن بووە لە کاتی شەڕ، هەروەها مستەفا کەمال سوپایەکی گەورەی لە کوردان پێکهێنابوو، سوێندخۆرەکانیش پێویستیان بە سەد هەزار سەرباز هەبوو لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات بۆ بەشدارییکردنی شەڕ لەگەڵ هێزەکانی مستەفا کەمال و چۆڵکردنی ناوچەکە لە زۆرینەی کورد[240].

**پوختە:**

1- سوڵتان عەبدولحەمید بە زیرەکیی خۆی درکی بە گرنگیی کورد کرد بوو لە سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانیی و زیندووکردنەوەی خەلافەتی ئیسلامیی، هەروەها سوڵتان بە وردبینیی خۆی توانی کورد بگۆڕێ بۆ دڵسۆزترین بانگەوازکارانی سیاسەتەکەی و دامەزراندنی سوارەی حەمیدیەش بەرجەستەبوونی سیاسەتێکی حەکیمانە بووە.

2- پێکهێنانی سوارەی حەمیدیە شوێنەواری لەسەر موسڵمانانی کورد بەجێهێشت و سەرنجی ڕاکێشان بۆ خەلافەتی ئیسلامیی، لەو ماوە مێژووییە کەمە کۆسپی خستە بەردەم گەشەی بیری نەتەوایەتیی نادینی لە ناو کورد.

3- ئەگەر ئەزموونی زایۆنی لە دەستبەسەراگرتنی فەلەستین ئەوەی لە بۆسنە ڕوویدا بە هێند وەربگرین، ئەوە ڕابردووی مەترسیی ئەرمەن تێدەگەین لەسەر کوردستان،

---

[240] - British Documents on Foreign Affairs, The Near And Middle East 1919-1939 Vol.4. Doc. No.492- pp735-7.

ئەوەی لەشکری حەمیدیە و سوڵتان کردیان مەبەستیان هەرچیەك بوویێت بەشێکی گەورەی کوردستانیان لە مەترسیی راستەقینە رزگار کرد لە دەستی ئەرمەن و هاوپەیمانەکانی ئەرمەن.

Table 3.1 **ژمارەی دانیشتوانی ئەرمەن لەو شەش ویلایەتەدا.**

| ویلایەت | وان | مەئوریەی ئەزیز | سیواس | دیاربەکر | بەدلیس | ئەرزرۆم |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەرمەن | 22/3 | 16/6 | 13/1 | 20/98 | 38/9 | 16/6 |
| کۆی دانیشتوان | 269/86 | 481/346 | 926/564 | 289/591 | 276/998 | 659/155 |
| هەمووی | 60/448 | 80/064 | 121/473 | 60/769 | 107/804 | 109/838 |
| پرۆستانت | - | 4/971 | 1/994 | 3/981 | 1/498 | 1/970 |
| کاسۆلیك | - | 1/915 | 3/223 | 9/955 | 4/948 | 6/730 |
| غوریەکان | 60/448 | 73/178 | 116/256 | 46/833 | 101/358 | 101/138 |

Table 3.2 **ژمارەی ئەرمەن لە قەزا سەرەکییەکانی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ**

| قەزا | ئەرمەن | کۆی دانیشتوان | هەمووی | پرۆتستانت | کاسۆلیك | غوریەکان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەرزرۆم | 28/40 | 38/684 | 10/850 | 328 | 791 | 9/730 |
| ئەدەنە | 15/00 | 70/665 | 10/606 | 636 | 346 | 9/622 |
| سیواس | 25/09 | 88/375 | 22/147 | 89 | 1/592 | 20/466 |
| دیاربەکر | 24/85 | 62/870 | 15/626 | 983 | 2/560 | 12/083 |
| وان | 64/62 | 51/149 | 33/053 | - | - | 22/053 |
| تەرابزون | /22 | 117/563 | 10/846 | 91 | 1/209 | 9/546 |
| قەیسەری | 20/87 | 130/899 | 27/330 | 1/315 | 765 | 25/250 |

Source ; J. Shaw ,History of Ottoman Empire and modern Turkey- Cambridge University Press 1977, p. 201 .

بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کورد لە ساڵانی دەسەڵاتی ئیتیحادو تەرەقی (1908 ـ1918) قۆناغێکی مێژوویی ورد و هەستیارە لە گەشەسەندن و گەڵاڵەبوونی بیری نەتەوایەتیی کورد، هەر ئەم قۆناغەش شوێنەواری بۆ سەدەی بیستەمی دوای خۆی بەجێهێشتووە، لێرەوە بە کورتییش بێت دیراسەی ئەو هۆکارە نێودەوڵەتیی و ئیقلیمی و ناوخۆییانە دەکەین کە بوونە هۆی گەڵاڵەبوونی بیری نەتەوایەتی لە لای کورد، زۆر پێویستە لێرەدا ـ ئەگەر بە کورتییش بێت ـ باس لە گۆڕانکارییە گەورەکانی کوردستان بکەین لە چوارچێوەی گۆڕانکارییە بنەڕەتییەکان، وەکو سەرهەڵدانی نەتەوایەتی لە جیهانی ئیسلامیی و بەتایبەتی لە ناو عەرەب و تورك لەگەڵ کاریگەریی لەسەر کورد.

دوایی دەچینە سەر ڕێرەوی سیاسەتی کۆمەڵەی یەکێتیو بەرزی (ئیتیحادو تەرەقی) بەرانبەر کورد و ئاکامی کاردانەوەی سیاسەتی ئەوان لە کوردستان، بۆ گەیشتنە ئانجام لەو بابەتەماندا لە زۆر ڕووەوە بەرنامەیەکی جیا لە توێژەرەوانی ترمان گرتۆتە بەر، ئەمەش لە میانەی خاسیەتی کاردانەوەی گشتیی و ڕێڕەوەکانی سۆفیگەریی و ڕۆڵی نوخبەی کوردی، ئەگەرچی خاڵی هاوبەش هەیە لە تێڕوانین بەرانبەر سیاسەتی ئیتیحادو تەرەقی، دواتر بۆ زیاتر تێگەیشتن لەو بەرنامەیە دەچێتە سەر چالاکی یانەکانی کورد لە ئەستەنبوڵ و بزووتنەوەی شێخ سەعیدی حەفید، مەلا سەلیمی خیزانی لە بەدلیس، شێخ عەبدوسسەلامی بارزانی، دوایی لە هەوڵی ئەوەدا دەبین وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە کە لە بیری زۆر لە نووسەران و بایەخدارانی کاروباری کوردانی ساڵانی (1910بۆ 1914)دا هاتووە، هەر لەو ماوەیەدا هەموو پێویستیەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشێکی بەرفراوانی کوردستان لە ئارادا بووە بە سەرکردایەتی نەوەکانی بەدرخان بۆ ڕزگارکردنی کوردستان لە دەسەڵاتی تورکیی، هاوزەمان بولغار و ڕۆمان ڕزگار بوون، بۆچی کورد نائومێد و ئەوان سەرکەوتن؟ ئەم لێکۆڵینەوە زۆر بابەتی یەکلاییەکردۆتەوە کە پێویستی بە بەدواداچوونی زیاتری ئەو بەڵگەنامانە هەبووە کە لەو ماوەیەدا لە ئێران و تورکیا و عێراق نووسراون و تائێستا نەگەیشتوونەتە دەست توێژەرەوان.

## نەتەوایەتیی و بیری نەتەوایەتیی لە چوارچێوەی ئیقلیمی

زۆربەی گەڕیدە و توێژەرەوە و پسپۆڕەکانی ڕۆژئاوا لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە نەتەوایەتیی وەکو بیرۆکە هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و بەر لە ڕووخانی خەلافەتی عوسمانیی بە گشتیی لە جیهانی ئیسلامیی نەبووە، بیری نەتەوایەتیی لە ڕێگەی پێگەی ئەورووپییەوە هاتە ناو جیهانی ئیسلامیی، بۆ نموونە ناپلیۆن لە کاتی شالاوی بۆ سەر میسر کۆمەڵێك پسپۆڕی شارەزای بۆ دژایەتی ئایینی ئیسلام لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، لەو پسپۆڕانە بە سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی ناپلیۆن هەستی نەتەوایەتیی فێرعەونیان لە لای میسرییەکان دەجولاند، لێرەوە بێرۆکەی میسریەتی لە لای میسریەکان پەیدا بوو، (دامەزراوەی میسر= مؤسسة المصر) ئەو ئەرکەی گرتە ئەستۆی خۆی[241].

لە ماوەی دەسەڵاتی موحەممەد عەلی (1805ـ 1846) دامەزراوەی میسیۆنەرەکان لە چالاکی چڕوپڕدا بوون بۆ هاندانی نادینی و بە ڕۆژئاواییکردنی کۆمەڵگای میسریی، (کرۆمەر)ی حاکمی ئینگلیزیی لە میسر (1880ـ1889) سەرقاڵی گەشەپێدانی ئاڕاستە نادینییەکان و بەرهەڵستی فیکری ئیسلامیی بوو، لەگەڵ هاندانی ئەو زاناو ئەدیبانەی نەوەی کەمایەتیە ئاینییەکانی میسرن، (جۆرج ئەنتۆنیۆس) فەرمانبەری باڵوێزیخانە کتێبێکی بە ناوی (هوشیاری عەرەب = يقظة العرب) نووسیبوو، (یەعقوب صنوع)یش بە سەرپەرشتی کرۆمەر گۆڤاری (نیشتیمانی میسری) دەرکرد، هەتا نەوەیەکی غەرب زادە پەیدا بوو کە وشەی نیشتیمانیان لەسەر زار بوو، نەسرانییە عەرەبەکانی وەکو بوترووس بووستانی و سلێمان یازجی و ئەنتوان سەعادە و مشیل ئەفلەق لە عەرەبەکانی وڵاتی شام تۆوی بیری نەتەوایەتیی تازەیان لە ناو عەرەبدا چاند، بە مەبەست لێرەدا دابینکردنی قەوارەیەکی جێگرەوە (بديل) بووە بۆ ئیسلام، هەتا لەو قەوارەیەدا بە پشتیوانیی ڕۆژئاوا فەرمانڕەوایەتیان دەست بکەوێ، هەر لەو ماوەیەدا چەندین توێژینەوە ئامادەکرا لەسەر بە گەورەیی نیشاندانی سەردەمی دێرینی بەر لە ئیسلام لە سوریا و بانگەشە بۆ هۆزی سووری و نەتەوەیی سووری لە ناو نیشتمانی عەرەب، هەروەها ئاراستەی بەرزڕاگرتنی فێرعەونیی و نەتەوایەتی میسری و جەخت کردنەوە لەسەر جیایی گەلی میسر لە گەلانی تری ڕۆژهەڵاتی، تەها حوسێن

[241] - ساطع الحصري: ص91-92

نەوەی ئەو قۆناغە مێژوویەی میسرە لە کتێبەکەیدا بەناوی (ئاییندەی رۆشنبیریی لە میسر) لە سەلماندنی پەیوەندیی میسردا بووە بە ئەوروپا، لەگەڵ دابڕینی لە جیهانی ئیسلامیی، دەڵێ: "پێویستە میسریەکان بە لایەنی خراپیشەوە شارستانییەتی رۆژئاوا قبوڵ بکەن، چونکە وزە بەخشە بۆ پێشکەوتن"، ساتح حوسەری لە دەمارگیرترین نەتەوەخوازانی عەرەبیە دەڵێ: "هەتا کۆدەتای دەستووری (1909) بەسەر سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم نەتەوایەتی لە لای گەلانی عوسمانیی شتێکی نەناسراو و نامۆ بووە، سەڵتەنەی عوسمانیی لە ناو کراوەیەکی ئاینیی پتەو گەشەی کرد و بە ئاشکرا بە ئاڕستەی ئاینیدا رۆیشت، پڕ بە مانا دەوڵەتێکی ئیسلامیی بووە و دوور بووە لە هەستی نەتەوایەتی تورکی)[242].

عوسمانییەکان لە بەرانبەر وشەی نەتەوایەتی وشەی (میللەت)یان بەکارهێناوە، هەندێ جار وتبوویان ئاین و میللەت دوو ڕووی یەك شتن، بیرخەرەوە و تۆمارەکانی عوسمانیی رەعیەتیان دابەش کردووە بۆ موسڵمان و ناموسڵمان، لە بنەڕەتەوە نووسینی زاراوەی (تورك)و (کورد) و (عەرەب)یان بۆ مەبەستی زۆر سنووردار بەکارهێناوە، وەکو بۆ ناساندنی ناوچەیەك لە ڕووی ئەتنۆگرافیەوە، لە ڕاستیدا وشەی (تورکی) لە کۆبوونەوە فەرمیی و ئەدەبیەکاندا وشەیەکی گران و سەنگین نەبووە، هەروەکو وشەی (الاعراب)ی ناو عەرەب ئاماژە بووە بۆ خەڵکی سادە و ناکامڵ، ئیدارەی عوسمانیی لە دامەزراندنییەوە هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بە دەستی ئەفسەر و بەڕێوەبەرە ئەوروپیەکانەوە بوو، لەوانەی مسوڵمان بوون و گیرابوون بۆ خزمەتی سوپا و ئیدارە پێیان دەوتن: (ئینکیشاری)، لە ناو سوڵتانەکانی عوسمانیی و میللەتانی تری عوسمانیی بە شەرمیان نەزانیوە کورد بکەنە سەرۆکی رووحیی خۆیان کە ئەو کات پێیان دەوت (شەیخولئیسلام)، ئەم پایە بەرزە بە زۆریی لە بن دەستی خانەوادەکانی بەدلیسی و ئامێدی و حەیدەریدا بووە، لەگەڵ پێشەوایەتی تەریقەتی سۆفیگەریی قادری و نەقشبەندیی کە هەر هی کوردان بووە.

کاریگەریی نەتەوایەتیی وەکو بزووتنەوەیەکی فیکریی لەسەر دەستەبژێرێکی ناو دەوڵەتی عوسمانیی لە سەردەمی تەنزیمات، واتە ماوەی چاکسازیی (1836ـ 1876)

---

[242] - سەرچاوەی پێشوو، ل93.

بەدیار کەوت، (برناد لویس)ی رۆژهەڵاتناسی گەورە دەڵێ: بەر لە گەیشتنی بیری رۆژئاوایی بۆ رۆژهەڵات، فیکری نەتەوایەتیی نەبووە، بەڵکو هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم تورك و عەرەب هەستیان نەکردووە بە یەکتری نامۆن، بە هۆی ئایینی هاوبەشەوە عەرەب رازیبوون بەشێك بن لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی و تورکەکانیش شانازییان بە عەرەبەوە کردووە و رۆشنبیریی و زمانی عەرەبیان بە نیشانەی بەرزیی و پێشکەوتن زانیووە، لویس دەڵێ: "ئارتەر لۆملی دیڤید بە یەکەم پێشەنگی فیکری نەتەوایەتیی تورکی دەژمێردرێت، لەسەر تورکیا کوراسەیەکی دانابوو بە ناونیشانی لێکۆڵینەوەی سەرەتایی (دراسات تمهیدیە)، لەوێدا هەوڵی داوە سەربەخۆیی رەچەڵەکی تورك و گەورەیی ئەوان بەسەر عەرەبەوە بسەلمێنێ، فوئاد پاشاو جەودەت پاشا " پیاوانی پێشەنگی سەردەمی تەنزیمات" کتێبەکەی (دیڤید)یان وەرگێرابوو بۆ سەر زمانی تورکی و لویس دەڵێ: "بەم شێوەیە تورکەکان لە رێگەی رۆژئاواییەکانەوە فێری نەتەوایەتیی بوون"[243].

سەرەرای ئەمانە دەبینین زۆربەی دەمراستانی فیکری تۆرانی تورك نەبوون، ئەحمەد رەزای سەرۆکی بزووتنەوەی ئیتیحادو تەرەقی نیوە چەرکەسی و نیوە مەجەریی بووە، ئەنوەر پاشا یەکێك بووە لە ناودارترین سەرکردەکانی ئیتیحادو تەرەقی، پۆلۆنی بووە و بۆتە مسوڵمان و دواتر هەڵگەراوەتەوە، جاوید پاشاو عەمانۆیل قەرەسۆ لە ناودارانی ئیتیحادو تەرەقی، چەندین پلە و پایەی گرنگی دەوڵەتییان دیووە، لەوانە پۆستی وەزارەتی دارایی کە لە بنەرەتدا لە گروپی جولەکەکانی دەوڵەتی عوسمانیین کە بە (دۆنمە) ناسراون، تەلعەت پاشای وەزیری ناوخۆ و جەنگی دەوڵەتی عوسمانیی یەکێك بووە لە کۆڵەکەکانی دیکتاتۆریەت، بولغاری بووە و لە رەچەڵەکدا قەرەج بووە، زیا کۆك ئەلپ کوردی بە تورك کراو، بە رووناکبیری بیری نەتەوایەتیی نادینی دەژمێردرێ و لە ژێر کاریگەریی بیری سۆشیالزمی دیموکراتی و فەلسەفەی دورکهایمدا بووە، عیسمەت ئینینۆی دەستەراستی مستەفا کەمالی پێشەنگی بزووتنەوەی نەتەوایەتی تورکیا و سەرسەخترین دژە ئیسلام، ئەویش کورد بووە.

---

243 -Bernard Lewis Islam in history London 1973.pp133-135

ورووژاندنی دەمارگیریی نەتەوایەتی لە لای تورك بۆ ڕکابەری عەرەب و کورد دروستکرابوو، بۆ بەدەستهێنانی سیاسەتی (پەرت بکەو زاڵ بە)، بۆ نەهێشتنی خەلافەتی عوسمانیی و چاندنی رق و قین لە ناو گەلانی ئیسلامیی، ئەمەش مانای ئەوە نییە هەموو قۆناغەکانی سەڵتەنەتی عوسمانیی بە خەلافەت دابنێین، لادانی ئەوانە لە بنەماکانی ئیسلامەتی هەر لە شووراو دادگەریی و بەفیڕۆدانی سامانی ئومەتی ئیسلامیی بۆ تێرکردنی سوڵتانەکان، لە بیر ناکرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رۆژواییەکان بە چاندنی بیری ناسیۆنالستی و لابردنی ئەو کۆڵەکانەی کە دەوڵەتی عوسمانیی راگرتبوو، پیلانی بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی عوسمانییان دانابوو،،ئەم بیرەش لە بزووتنەوەی ئیتیحادو تەرەقیەوە بەرجەستە ببوو کە دەیویست رژێمی ناوەندیی بەسەر گەلانی عوسمانیی دا فەرز بکات و هەموویان لە ئوممەتی تورکییدا بتاوێنێتەوە.

## هێڵە گشتییەکانی سیاسەتی ئیتیحادو تەرەقی لە کوردستان

بە کورتییش بێت قسەکردن لەسەر سیاسەتی ئیتیحادیەکان لە کوردستان (1908–1918) پێویستی بە خستنەڕوویەکی فیکریی و سیاسیی هەیە، لە ساڵی (1908) کۆمەڵێك لە ئەفسەرانی عوسمانی لە (سالۆنیك) لە مەکدۆنیا خۆیان سازدا بوو بۆ هەڵگەڕانەوەیەکی سەربازیی، دواتر تیپێکی بولغاری پەیوەندیی پێوەکردن و بەرەو ئەستەنبوڵ کەوتنەڕێ بۆ ئەوەی سوڵتان عەبدولحەمید ناچار بکەن کار بەو دەستوورە بکات کە کاتی خۆی مەدحەد پاشای سەرۆك وەزیران و هاوڕێکانی لە ژێر کاریگەری دەوڵەتەکانی ئەورووپیی ئامادەیان کردبوو[244]، لە دوای دوو ساڵ سوڵتان عەبدولحەمید،

[244] - بە ڕەوای نابینم لەبەر خاتری سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم کە بانگەشەی پانئیسلامیزمی کردوە لەگەڵ ئەوانەی لە ژێر کاریگەریی وڵاتانی ئەورووپییدا بوون ناکۆك بوو، ناکرێ، کە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە ساڵی (1876) بە هاوکاری ئەوانەی لە ژێر کاریگەری دەستووری ئەورووپییدا بوون کۆدەتای بەسەر سوڵتان عەبدولمەجیددا کرد، دکتور بۆخۆی لە بابەتەکەی پێشووتری لەسەر سوڵتان عەبدولحەمید و سوارەی حەمیدیە دەڵێ: "سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە ئەنجامی کۆدەتایەك کە بانگەوازکارانی چاکسازیی رۆژاوایی لە دژی عەبدولمەجید سوڵتانی بەهێزی عوسمانیی ئەنجامیاندا بووگەیشتە سەر حوکم، سوڵتان عەبدولحەمیدیش لە هەمان ئاراستە بووە..". دواتر سوڵتان عەبدولحەمید وەکو سیاسییەکی دیماگۆجی پەشیمان بۆوە، یان لە دوای شەڕی رووسیی عوسمانیی (1877-1878)

له ساڵی (1878) وەستاندی، چونکە پێی وابوو بەرنامەیەکی ئەوروپیە و بۆ دەوڵەتی عوسمانیی کە بونیادی لەسەر کەلەپوور و شارستانی ئیسلامەتی دامەزراوە، باش نییە[245].

پاشخانی فیکری ئیتیحادو تەرەقی دەگەڕێتەوە بۆ نووسراوە لیبراڵیەکانی تورك لە سەردەمی تەنزیمات، وەکو نووسینەکانی نامیق کەمال "کە لە ژێر کاریگەریی فەیلەسوفی فەرەنسی مۆنتیسکۆ دابووە"و شوناسی ئەفەندیو زیا پاشا، ئەم بیرۆکەیە لە سەرەتاوە لە ژێر کاریگەریی رۆژئاوا لە گۆڤاری (تصویر الافکار)دا بە دیار کەوت و دوایی پەرپەوە بۆ ئیتیحادو تەرەقی کە لە ساڵی (1893) عەبدوڵڵا جەودەت و ئیسحاق سکوتی کوردی و ئیبراهیم تەمۆی چەرکەسی دایانمەزراند، رۆژنامەیەکیان بە ناوی (عوسمانیی) دەرکرد، ئینجا ئەم بیرۆکەیە هەموو ئەندامانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی گرتەوە، زۆربەی لایەنگرانی (تورکیای لاو) ئەوانە بوون کە زمان و ئەدەبی ئەورووپیان خوێند بوو، یان لە ژێر کاریگەریی بزووتنەوەی وەرگێڕانی ئەورووپیدا بوون، هەندێ لەوانە لە کەناڵی دیبلۆماسیی کاریان کردبوو، یان دەرچووی کۆلیژە تازەکانی سەربازیی و پزیشکیی و ئەندازیاریی بوون لە ئەستەنبوڵ کە بەرنامە و زۆربەی مامۆستاکانیان

---

شادەو ئیمانی هێنا، ئەو دەقەی ئێرەی دکتۆر زۆر ناکۆکە هەتا لەگەڵ دەقەکەی پێشووتری کە خستمانە روو. "وەرگێر".

[245] - لە کار خستنی دەستوور و بەدەستوور رازی نەبوون بابەتێکە و نەگونجانی دەستووری ناوبراو لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام بابەتێکی ترە، سوڵتان دەستووری نەویستووە، نەك رازی نەبووە بەو دەستوورەی ئەو رەوتە دایاننابوو؟، بەڵگەشمان هەنگاو و دەرفەتەکانی دوای هەڵوەشاندنەوەی دەستوورە، سوڵتان لە تەمەنی (40) ساڵەی دەسەڵاتییدا زیاتر لە (35) بێ دەستوورو ئەنجومەن، فەرمانڕەوا بووە، هیچ هەوڵێکیش لە لایەن سوڵتانەوە لەو ماوە درێژە لە ئارادا نەبووە بۆ پێکهێنانی ئەنجومەن و گەڕانەوە بۆ دەستوور، ئیسلام و رەوتی ئیسلامیی بەوە سەربەرز نابێت، هەموو نموونەیەکی دەسەڵات لە ناو کەلەپووری ئیسسلامیی بە پیرۆز وەربگیرێت، مادام لە بەرگی ئایینیە و بەرانبەرەکەی رەوتێکی دژە ئایینە، لەو ڕووە لەگەڵ هێژا دکتۆر عوسمان کۆك نیم، پاساوی سوڵتان بۆ هەڵوەشاندنەوەی دەستوور و ئەنجومەن بە دروست نابینم، خۆ سوڵتان دەیتوانی لە ساڵانی دواتر پشتی بە دەستوورێك ببەستایە کە سەرچاوەکەی لە شەریعەتەوە وەرگیراباو ئەنجومەنێکی دابمەزراندبا نوێنەرایەتی نەتەوە و پێکهاتە جیاوازەکانی سنووری دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیی کردبا، کێ بەرهەڵستی ئەو کارەی بووە؟ "وەرگێر".

ئەورووپیی بوون[246]. لایەنگرانی تورکیای لاو لە ژێر کاریگەریی گشتیی بیری رۆژئاوایی و بەتایبەتیش بیری شۆڕشی فەڕەنسیدا بوون، وەکو: یەکسانیی و ئازادیی و برایەتی، ئەندامانی تورکیای لاو عەلمانی بوون و دەیانویست دەوڵەتی عوسمانی کە پشتبەستوو بە شەریعەت و خەلافەت، بگۆڕن بۆ دەوڵەتێکی نەتەوەیی و مەلەکی، (سەڵتەنەت)و دەستووریی و مەرکەزیی وەکو وڵاتانی ئەورووپیی[247]. ئەحمەد رەزای مەجەڕی بە تورککراو یەکەم سەرۆکی ئیتیحادو تەرەقی لە پاریس و بیار لاسی فیاتی شاگردی (ئۆگۆست کۆنت)ی فەیلەسوفی شۆڕشی فەرەنسیی، رۆژنامەی (مەشروتیەت)یان بڵاوکردەوە[248] کە لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی برەوی بە بیری شۆڕشی فەرەنسی دەدا.[249]

---

[246] - بەکارهێنانی ناوی (Jeunes Turcs= توکیای لاو) ئاماژەیە بۆ بانگەوازکارانی چاکسازیی رۆژاوایی کە بۆ یەکەم جار لە ساڵی (1867) لە رۆژنامەیەکی بەلچیکی ناوی هاتووە، بێگومان ئەمە لاساییکردنەوەی بەریتانیای لاو، ئەڵمانیای لاو، فەڕەنسای لاوە، کە بۆ بانگەوازکارانی چاکسازیی ئەو وڵاتانە لە سەدەی نۆزدە، بەکارهاتووە. بڕوانە: Bernard Lewis The Emergence of Modern Turkey pp. 150-152. زين نورالدين: نشوء القومية العربية، مع الدارس في العلاقات العربية ـ التركية، بيروت، دار النهار، 1972، ص84

[247] - نابینم ئەوکات دەوڵەتی عوسمانیی پشتبەستوو بوبێت بە شەریعەت هەتا بیگۆڕن، راستە بانگەشەی ئیسلامیی هەبووە و ئیتیحادیەکان بانگەشەی عەلمانیەتی رۆژاوایان کردووە، بەڵام "پشتبەستوو بە شەریعەت حوکمدانێکی واقیعی نییە" هەر دکتۆر بۆخۆی لە باسی خستنە رووی شەرعیەتی راپەڕینەکەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری، قەناعەتی پێچەوانەی ئەمەی ئێرەی هەیە. "وەگێڕ".

[248] - راستییەك هەیە کە دکتۆر وەکو پسپۆڕێکی بە ئەزموون نایخاتە ڕوو، ئەویش دەوڵەتی عوسمانیی لاوازبووە و پێویستی بە ریفۆرم بووە، هەتا هێزی بە بەردا بکرێتەوە، سوڵتان عەبدولحەمید پرۆژەی ریفۆرمێکی بەهێزی هەڵنەگرتووە بۆ ئەوەی دەوڵەتی عوسمانیی ببوژێنێتەوە، هەموو کارزانیی خۆی لە دژایەتی ریفۆرم دا دەبینیەوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، کەواتە ئەگەر دەوڵەتی عوسمانیی لەسەر دەستی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی مردبێت، پێش هاتنی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی دەرفەتی زیاتر لە (30) ساڵ لە بەردەم سوڵتاندا بووە ریفۆرمی تازەکردنەوە و بوژانەوەی بۆ دەوڵەتی عوسمانیی دابمەزراندایە، ئەوە ریفۆرمی دامەزراوەکانی دەوڵەت نەدەبووە بیانووی ئیتیحادیەکان! "وەرگێڕ".

[249] -- Lewis pp. 197-199

هەر لە ناو ئیتیحادو تەرەقی رەوتێکی تر هەبوو بە سەرۆکایەتی میر سەباحەدین کوڕی داماد مەحمود جەلالەدین، لە دایکیەوە عوسمانیی بووە، بەربەرەکانی ئەحمەد رەزایان کردووە، سوڵتان عەبدولحەمید فەرمانی دادگاییکردنی داو ئەویش لەگەڵ خێزانەکەی هەڵات بۆ پاریس، لەوێ پەیوەندیی بە بەرهەڵستکارانەوە کرد، سەباحەدین لەوێ کۆمەڵەیەکی بە ناوی (رێکخراوی دەستپێشخەری فەردی و لامەرکەزیی) پێکهێنا، خواستی ئەو کۆمەڵەیە بڵاوکردنەوەی بیری نووسەری فەرەنسی ئادەم سمیث بوو، بانگەشەی بۆ رۆشنبیری ئەنگلۆ ـ سەکسۆنی دەکرد، بەوەی دەوڵەتی تازە چۆن دەگەنە ئاستی بەریتانیا لە پەرەسەندنی ئابووریی و سیاسییی، هەروەها میر سەباحەدین بانگەشەی بۆ دەستێوەردانی ئەورووپی و فەرزکردنی چاکسازیی کردووە بەسەر دەوڵەتی عوسمانیی، بەمەش ئەرمەن لێی نزیك بوونەوە و لە دەرەوە پشتیوانیی پڕۆژەکەی بوون.

بەر لە ساڵی (1909ز) بانگەوازی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بانگەوازێکی ناسیۆنالیستی تورکیی نەبووە، بەڵکو گوتاری میللەتی عوسمانی بووە لەگەڵ داوای دەستوورو مەرکەزیەتو ئاکاری لیبرالی بۆ هەموو عوسمانییەکان[250]، بۆ نموونە عەبدوڵلا جەودەت لە ژمارە سێی رۆژنامەی (عوسمانیی) وتارێکی نووسیوەو دەڵی: "نەمانویستووە بەرهەڵستی هیچ زمانێکی نەتەوەکانی عوسمانیی بکەین، بەڵام ئێمە دڵنیابووین ئەگەر کار بە دەستوور بکەین ئەوە دەسەڵاتی عوسمانیی دەبێتە هی هەموو لایەكو یەکسان دەبن و زمان و نەتەوەکان مافی خۆیان وەردەگرن، پەرەپێدان و گەشەسەندن دێتەدی و بەبێ کەس بواردن دەوڵەتی عوسمانیی دەبێتە هاوەڵی هەموو لایەك".

بە سەرۆکایەتی میر سەباحەدین کۆمەڵەی (تورکیای لاو) لە ساڵی (1909) بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی بەرچاو لە نوێنەران و نمایندەی ئەرمەن و نوینەری عەرەب و

---

مالسیانز: القومیة الکردیة، و د.عبدالله جودت في المطلع القرن العشرین، ترجمة شکور مصطفی، ص15، نفس المصدر، ص194-195

250 - بانگەشە و پیادەکردنی بیرۆکەی مەرکەزییەت لە داهێنانی سوڵتان مەحمودی دووەم (1808-1838) بووە، سوڵتانەکانی دوای ئەویش لەسەر ئەو رێڕەوە رۆیشتوون، بە سوڵتان عەبدولحەمیدیشەوە، ئەو بیرۆکەیە کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی داهێنەری نەبووە. "وەرگێڕ".

کورد و ئەلبانی و بە پیرۆزبایی دەوڵەتەکانی ئەوروپی و پێگەی ماسۆنی لە سۆلانیك و پاریس، کۆنگرەی خۆی بەست، هەر ئەوانیش لەگەڵ ئەرمەن خەرجیی کۆنگرەکەیان گرتە ئەستۆ، لە پێش لە ساڵی (1907) کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی لە دەستووری خۆیدا بڕیاری مسۆگەرکردنی ماف گەلانی دابوو لە خوێندنی قۆناغی سەرەتایی بە زمانی ناوچەیی خۆیان[251].

لە دوای کۆدەتای (1908) کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی وەکو پارتە نازی و مارکسیەکانی ئەوروپا گۆڕا بۆ پارتێکی گشتگیر، لە لایەك داوای هێشتنەوەی سوڵتان عەبدولحەمیدیان کردووە وەکو خەلیفە و لە لایەکی ترەوە لە هەموو دەسەڵاتێکی راستەقینە دایاندەماڵی، لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجومەنی نوێنەران کرایەوە و ئەنجومەنی پیاوماقولان پێکهێنرا، هەتا بۆ مسوڵمانان ببێتە دەرفەتێك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئازادیی، بەڵام ئیتیحادیەکان دەستیان لە ئاکامەکانی هەڵبژاردن وەرداو سەرکەوتنیان بۆ لایەنگرانی خۆیان مسۆگەر کرد، هەروەها زۆربەی ئەرکە سەربازیی و سیاسییی و رۆشنبیرییەکانیان سپارد بە لایەنگرە تازە و ناکامڵەکانی خۆیان، لە ئەستەنبوڵ بە ئاشکرا رۆژنامە هەبوون هێرشیان دەکردە سەر شەریعەت و برەویان بە سنووربەزاندن و بیری ماسۆنییەت دەدا، بەتایبەت رۆژنامەی (تونەین)ی فەرمیی کە (حوسێن جاهید) دەریدەکرد[252]، دەوڵەتی عوسمانیی لە چەندین لاوە تووشی داڕووخان و تێکشکان هات، بە هۆی پەیوەندیی پتەویی نێوان بزووتنەوەی زایۆنیی و سەرکردەکانی ئیتیحادو تەرەقی کۆچی جولەکە بۆ فەلەستین زیادی کرد، بەتایبەت تەلعەت بەگی وەزیری ناوخۆ و جاوید بەگی جولەکەی نوێنەری سالۆنیك لە ئەنجومەنی نوینەران و وەزیری دارایی و قەرەسۆ و داود کۆهین[253].

جەماوەر لە خراپەکاری ئیتیحادیەکان بێزار بوو، بۆیە بە ناچاریی لە دەوری بەیداخی کۆمەڵەی سەربەخۆی وەکو (یەکیەتی برایەتی موحەممەدی= اتحاد جمعیتی محمدی) کۆبوونەوە کە حافیز دەروێش وەحدەتی سەرۆکی بوو، رۆژنامەیەکی بە ناوی

---

[251] - Elie kedourrie “young Turks’ Freemasons, and Jews ”middle East Studies ’N. o3,1973’pp

[252] - توفيق علی بیرو: العرب و الترك ص84-88.

[253]-Elie kedourrie’PP.96-97.

(بورکان)ەوە بڵاودەکردەوە، ئامانجی پاراستنی دەستوور و ئازادیی و پێکەوە گونجانی نێوان چاکسازیی و ئیسلام و سنووردانان بووە بۆ دیکتاتۆریی و دڵڕەقی دەسەڵاتی ئیتیحادیەکان، لە نیسانی (1909) هەندێ لە یەکە سەربازییەکانی ناو ئەستەنبوڵ شەپقە ئەوروپیەکانی سەری خۆیان فڕێ داو دەستیان کرد بە خۆپیشاندان بە بژی سوڵتان و شەریعەت، دەبێت ئیتیحادیەکان لە بەرپرسیاریەتی سوپاو ئیدارە و رۆژنامە دووربخرێنەوە، ئەم راپەرینە لە لایەن زۆربەی خەڵکی و زانایانەوە پێشوازیی لێکرا، بەڵام ئیتیحادیەکان بە هۆی باڵادەستی بەسەر سوپاو رۆژنامەکانەوە، بە پشتیوانی یەکە سەربازییەکانی سالۆنیك و بە فەرماندەیی ئەفسەری عەرەبی (مەحمود شەوکەت) هێرشیان بردە سەر ئەستەنبوڵ و راپەڕینەکەیان سەرکوت کرد، ئیتیحادیەکان ئەو راپەڕینەیان بە (بزووتنەوەی کۆنەپەرستیی) ناوبرد، سوڵتان عەبدولحەمیدیش بەوە تاوانبار کرا بۆ مەبەستی لە کار خستنی دەستوورو ئازادیی گشتیی لە پشت راپەڕینەکەوە بووە، بۆیە لە شوێنی خۆی لایان برد و موحەممەد رەشادی نەخۆشیان بە ناوی سوڵتان موحەممەدی پێنجەمەوە لە شوێنی دانا[254].

نوشستی ساڵی (1909) قۆناغێکی نوێیە لە دیکتاتۆریەتی ئیتیحادیەکان، نازم بەگی گەورە ئیتیحادی ئەو سەردەمە دەڵێ: "ئێمەی عوسمانیی ئایین فڕێ نەدەین بۆ پشت خۆمان و زاناکان لە قاڵب نەدەین و هەنگاو هەنگاو لە دوای فەڕەنساوە نەڕۆین، پێش ناکەوین"[255]. لێرەوە بە ڕاشکاوی بانگەوازی بە تورککردنی دەوڵەت و دوورخستنەوەی سەرکردە ناتورکەکانی پێشووی ناو ئیتیحادیەکان بەدیارکەوت، چەندین سەرکردەی نەوەکانی کورد و عەرەبی ناو ئیتیحادیەکان وەلانران، هەموو قوتابخانە و کۆمەڵە و رۆژنامەکانی گەلانی ناتورك داخران، حوسێن جاهید هەڵگری پەیامی تورکیزم لە ڕۆژنامەی (تونەین)دا نووسیبووی: "تورك خاسیەتی رزگاریکەریان هەیە، خاوەنی ئیمتیازاتی بەرزن، بۆیە نابێت مافیان لەگەڵ گەلانی تر یەکسان بێت، دەستووری عوسمانییش لە کۆتاییدا هەر دەستووری تورکیا دەبێت"[256].

---

[254] - محمد فريد بك: تاريخ الدولة العلية، ص711-713، جريدة المعظم،20نيسان 1909.

[255] - المنار، جزء (4)، ص 1911.

[256] - Kutlay'p.203

بیرۆكەی تۆرانییەت زاڵ بوو بەسەر ئایدۆلۆژیەتی دەوڵەت و زیا كۆك ئەلپ و یوسف ئاكچرا وەك ناودارترین بانگەوازكارانی ئەو بیرۆكەیە دەركەوتن، دامەزراوی تورك ئۆجاغی (یانەی نەتەوەیی توركی)یش دەستی كرد بە گەشەپێدانی بنەماو خاسیەتەكانی بیری نەتەوایەتیی، هاوپەیمانییەتی پتەوی ئیتیحادیەكان بۆ وەرگرتنی ئەم دەمارگیریە وەكو بەدیار دەكەوێ ئەڵمان بووە، ولیەم (ئیمپراتوری ئەڵمانی) لە وتارێكی دا بۆ ئیتیحادیەكان وتبووی: ئێوە پێویستان بە گەلانی ئەوروپی نییە، دەتوانن دەوڵەتێك درووست بكەن پێكبێت لە گەلانی توركیا و ئێرانو بوخارا و توركستان و قەوقاز، ئەو دەوڵەتە تۆرانییە دەبێتە زیاتر لە (180) ملیون تورك[257].

## رۆڵی كورد لە بزووتنەوەی دەستووریی

كردەوەكانی ئیتیحادو تەرەقی كاری لە نمایندەی گەلانی ناتورك كرد، لە سایەی پارتی ئازادیی و ئیئتلاف بە سەرۆكایەتی میر سەباحەدین و پارت و كۆمەڵە بەرهەڵستكارەكانی تر كۆببنەوە، پارتی ئازادیی داوای لیبراڵیی دەكرد لەگەڵ ماف خویندن بۆ گەلانی عوسمانیی بە زمانی خۆیان و هەروەها لامەركەزییەت بۆ عەرەب و كورد و ئەرمەن، ئیتیحادیەكان بەوپەڕی توانا كەوتنە لێدانی ئەو پارتە، ئەوانیش ناچار لە تەمووزی ساڵی (1912) كۆدەتایەكی سەربازییان ئەنجامدا، بەڵام ئیتیحادیەكان لە ساڵی دواتر كۆدەتای سێیەمیان كردەوە و گەڕانەوە سەر حوكم، كۆدەتا سەربازییەكانی كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی و سیاسەتی كوشتن و دەرپەڕاندن و لەناوبردنی خەڵكانی ناتورك هاوتای دەسەڵاتی خوێناویی (جاكۆبین) بووە لە فەڕەنسا، ئەوەی لە ماوەی تەمەنی دوو ساڵی دەسەڵاتی ئیتیحادیەكان كرا سوڵتان عەبدولحەمید لە (40) ساڵی دەسەڵاتی خۆیدا نەیكردبوو، لە كاتێكدا سوڵتان ناحەزەكانی خۆی دوور دەخستنەوە و نەیدەكوشتن، كەچی راگەیاندنی رۆژئاوا ناوی نابوو سوڵتانی سوور، چونكە كەنیسەی ئەوروپی بە پاڵپشتی ئەرمەن و قونسوڵیەكانی وڵاتانی ئەوروپیی لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی و رۆژئاوا وێنەی سوڵتانیان وەكو جەلادی ئەرمەنیان پیشان دابوو، دوای كۆدەتاكەی (1913) سەردەمی سێكوچكەی دیكتاتۆریەت، ئەنوەر پاشا و تەلعەت

[257] - Kutlay'p.197

پاشا و جەمال پاشا هات، زۆربەی پایە کارگێڕییە گەورەکانی دەوڵەتی عوسمانیان وەکو وەزارەتی دارایی و دەرەوە و ناوخۆیان دەستبەسەرا گرت، وای لێهاتبوو زۆربەی کاربەدەست و ئەفسەرە بچووکەکان لە پێناو گەیشتن بە دەسەڵات پەیوەندییان بە سێکوچکەی دیکتاتۆریەت و پێگە ماسۆنییەکانەوە کرد، ئەم دیاردەیە گەیشتە هەرێمەکانیش[258]، هەتا کار گەیشتە ئەوەی پەیوەندییکردن بە ماسۆنییەت لە لای نەوەی چینی خانەدان و رۆشنبیران لە هەریەك لە بەغدا و دیمشق و قاهیرە و قودس شتێکی ئاسایی بێت.

کورد لە سەرەتای سەرهەڵدانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی لە بوارەکانی فیکریی و سیاسییی رۆڵی رێبەرایەتی بینی، بەڵام هەر زوو تۆرانییەکانی تورك "ووردتر بەتورك کراو"، دەستیان بەسەر بارودۆخەکەدا گرت و دەستیان کرد بە چەوساندنەوەی ئەو هاوڕێ کوردانەی پێیان دەوترا (کوردستانی لاو)، عەبدوڵڵا جەودەت و ئیسحاق سکۆتی لە دامەزرێنەرانی ئیتیحادی عوسمانیی بوون، دواتر گۆڕا بۆ ئیتیحادو تەرەقی، عەبدوڵڵا جەودەت رووناکبیری بنەڕەتیی و سەرنووسەری چەند رۆژنامەیەك بووە کە پڕوپاگەندەیان بۆ فیکری ئیتیحادیەکان کردووە، بەتایبەتی رۆژنامەی (عوسمانی)و گۆڤاری (ئیجتیهاد)، هەردووك لە ئەوروپاو دواتر لە قاهیرە بە متمانەی ئیدارەی بەریتانیی و بە پاڵپشتی دارایی و سیاسییی ئەوان دەرچووە، کە بانگەوازیان بۆ لەسەرکار لابردنی سوڵتان عەبدولحەمید دەکرد، ئەم دوو رۆژنامەیە بە هاوکاری لەگەڵ رۆژنامەی (کوردستان) کە لە جنێف و قاهیرە لە لایەن مەدحەت و عەبدوڕڕەحمان بەدرخانەوە دەرچوو، هەرسێ بڵاوکراوە بۆ پوچەڵکردنەوەی هاوکاریی نێوان سەرۆکە کوردەکانی ناو سوارەی حەمیدیە و سوڵتان عەبدولحەمید جەختیان دەکردەوە سەر برایەتی کورد و ئەرمەن[259].

سەرەڕای پەیوەندیی پتەوی نێوان عەبدوڕڕەحمان بەدرخان و ئیتیحادیەکان، ناوبراو چەندین وتاری لە ڕۆژنامەی (عوسمانیی) زمانحاڵی ئیتیحادیەکان نووسیووە، هەروەها ژەنەراڵ شەریف پاشای کوڕی سەعید پاشای خەڵکی سلێمانی و وەزیری دەرەوەی

---

[258]-Elie Kedoure, pp.96. vol,2,pp.299-301 -

[259]-مالمیسانیز: ل20-22

عوسمانیی پێشوو، له سه‌ره‌تای دامه‌زراندنی ئیتیحادو ته‌ره‌قی له سوید و پاریس له رووی دارایی و رێکخستنه‌وه رۆڵی گرنگی گێڕا، شه‌ریف پاشا به‌ردی بناغه‌ی پته‌وکردنی په‌یوه‌ندیی نێوان ئیتیحادیه‌کان و ئه‌ڵمانیای داڕشت، که دواتر له شه‌ڕی یه‌که‌می جیهانیی گه‌شه‌ی کردو بووه هاوپه‌یمانیی دووقۆڵیی، سه‌ید عه‌بدولقادری شه‌مزینی له ساڵی (1896) په‌یوه‌ندی کرد به لقی ئه‌سته‌نبوڵی ئیتیحادو ته‌ره‌قی و رۆڵی رێبه‌رایه‌تی گێڕاو کاریگه‌ریی زۆری هه‌بووه له‌سه‌ر رێکخستنی زانایانی ئاینی بۆ ئه‌و کۆمه‌ڵه‌یه، له سه‌ره‌تای ساڵی (1900ز) سوڵتان عه‌بدولحه‌مید پیلانێکی داڕێژاوی تیرۆرکردنی خۆی ئاشکرا کرد، بۆی ده‌رکه‌ت شه‌مزینی و خزمه‌کانی چوونه‌ته ناو ئه‌و تیپه‌ی بۆ ئه‌و مه‌به‌سته ته‌رخانکرابوو، ئه‌ویشی دووری خستنه‌وه بۆ مه‌دینه، هه‌روه‌ها کورد رۆڵی کاریگه‌ریی هه‌بووه له لقی میسری ئیتیحادو ته‌ره‌قی، کوڕانی به‌درخان ئه‌و لقه‌یان به‌ڕێوه‌ده‌برد[260]. حیکمه‌ت بابان و عه‌بدوڕڕه‌حمان به‌درخان له کۆنگره‌ی یه‌که‌می ئیتیحادو ته‌ره‌قی ساڵی (1902) وه‌کو نوێنه‌ری کورد رۆڵی به‌رچاویان بینی و له کۆنگره‌ی دووه‌میش عه‌بدوڕڕه‌حمان به‌درخان له ساڵی (1907) به‌شداریی کرد، به‌ڵام عه‌بدوڵڵا جه‌وده‌ت بۆ ئه‌و کۆنگره‌یه بانگ نه‌کرابوو، به خیانه‌تکار تاوانبار کرابوو، چونکه له‌گه‌ڵ سوڵتان عه‌بدولحه‌مید یه‌کتریان بینیبوو، کرابووه باڵیۆزی عوسمانیی له ڤیه‌ننا[261]، سوڵتان په‌یوه‌ندیی تایبه‌تی هه‌بووه له‌گه‌ڵ بنه‌ماڵه‌ی به‌درخانییه‌کان و هه‌ندێکیان له نزیکه‌وه له‌گه‌ڵ سوڵتاندا بوون و له خۆی نزیك کردبوونه‌وه و پله‌ی گرنگی پێدابوون، به‌ڵام له ساڵی (1906) ریزوان پاشای پاسه‌وانی تایبه‌تی سوڵتان عه‌بدولحه‌مید تیرۆرکرا، شامیل به‌گ به‌درخان و عه‌بدوڕڕه‌زاق به‌درخان به‌و کاره تاوانبار کران، لێره‌وه نه‌گبه‌تیی به‌درخانییه‌کان ده‌ستی پێکرد، سوڵتان له بارودۆخێکی زۆر ناڕه‌حه‌تدا (100) پیاوی له خانه‌واده‌ی به‌درخانییه‌کان دوور خسته‌وه بۆ ته‌رابلوس‌و فه‌ززان له‌لیبیا، به‌مه‌ش کورد بوونه به‌شێکی کاریگه‌ری بزووتنه‌وه‌ی به‌رهه‌ڵستکاری ناوخۆ[262]، لێره‌وه تێده‌گه‌ین سوڵتان له ژیانی خۆی زۆر مه‌ترسیی له‌سه‌ر بووه،

260 - Naci Kutly. Ittihat Terakki Ve Kurtle (Ankara Rebun Yayinlari) S, pp.82-85.

261 - مالمیسانیز: ل17-18-31.

262 - هه‌مان سه‌رچاوه: ل27-28.

زۆرترین جێ متمانەكانی لە ناتوركەكان بە عەرەب و كورد، بووە، كوتلای لەسەر زاری سوڵتان عەبدولحەمیدەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لەسەر پشتبەستنی من بە كوردان، بەتایبەت بە كوڕانی بەدرخان، لە ئیدارەی ئەستەنبوڵ رەخنەم زۆر لێدەگیرێ، بەڵام من باوەڕم بەو سیاسەتە هەیە[263]. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ناڕەزایی دەوروبەری سوڵتان لەو هەموو كوردانەی دەستیان بەسەر ئیدارەی حكومەتدا گرتوە بەتایبەت (بەڕیوەبەرایەتی مابین)و (بەڕێوەبەرایەتی دیوان) و (تەشریفات)، ئەم بەڕێوەبەرایەتیە گرنگانە پڕبوون لە نەوەی بابانیی و بەدرخانییەكان، خەڵكی ئێرەیی و دڵڕەق كەوتبوونە خۆ بۆ بەدەستهێنانی دەرفەتێك هەتا كاریان لە سوڵتان كرد بەو دڵڕەقیە مامەڵە لەگەڵ بەدرخانییەكان بكات، لەو بارەیەوە لازاریف دەڵێ: "قەناعەتیان بە سوڵتان كرد مەترسیی كوردی لەسەرە، ئەویش چی تر پشتی بە كورد نەبەست، تەنانەت قوتابخانەكانی عەشیرەت مەكتەبلەری "كە تایبەت بووە بە نەوەی هۆز و شێخەكانی عەرەب و كورد لە ئەستەنبوڵ و شارە كوردیەكان"، داخست، دەرچوانی ئەو قوتابخانانە وەكو ئەفسەر و ئیداریی لە ناوچەكانی خۆیان دادەمەزران[264].

لە ساڵی (1908) بەدواوە وردە وردە ئیتیحادو تەرەقی گۆڕا بۆ رێكخراوێكی تۆرانییەت و نوخبەی كوردیش وای لێهات بە دوو ئاراستە كار بكات. یەكەمیان: پێكهێنانی رێكخراوی كوردی و دووەمیان: لەناو رێكخراوەكانی بەرهەڵستكاری ئیتیحادو تەرەقی كار بكات.

---

[263]-- Ittihad’ Terakki Ve Kurtler pp.203-204

[264] كێشەی كورد، ل189. قوتابخانەی هۆزەكان (عشیرت مكتبلری) لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە لە ساڵی (1892) دامەزرا، ئەمەش بۆ پێگەیاندنی كادیری سیاسییی و ئیداریی لە ناو ئەو هۆزە عەرەبی و كوردیانەی سیاسەتی جامیعەی ئیسلام لە خۆی دەگرتن، لە ویلایەتەكان كاریان دەكرد، ماوەی خوێندن حەوت ساڵ بوو، خوێندكار سەرەڕای زانستی شەرعیی، زانستەكانی ئیدارە و سەربازیی و زمانەكانی توركی و عەرەبی و فارسی و فەڕەنسی دەخوێند، لەسەر قسەی (یوگین رۆگمان)ی توێژەرەوە "ئەزموونێكی سەركەوتوو بووە لە دروستكردنی كادیر لەو ویلایەتانەی دۆستایەتیەكی بەهێزیان هەبووە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی".

Eugene L. Ragman Asiret Mektebi: Abdul amid Its School for Tribes (1982-1907) International Journal of Middle 28 (1996) 107-183 .

لێرەدا کورد هەندێ جار ڕۆڵی سەرەکیی و سەرکردایەتی بزووتنەوەی بەهەرڵستکاری بینیوە، لە ناودارترین ئەو کەسانە مەولانا زادە ڕەفعەت، ژەنەراڵ شەریف پاشا، زەینەلعابدین فانی زادە ڕەواندزی، عەبدوڵڵا جەودەت، لوتفی فیکری، خاوەنی کتێبی ژیانی شەریف پاشا "روحات" پێیوایە شەریف پاشا لە بەهێزترین و هاندەرترین بەرهەڵستکاری ساڵانی (1909ـ 1918ز) سێکوچکەی دیکتاتۆریەتی ئیتیحادو تەرەقی بووە لە تورکیا، بۆیە لە لایەن ئیتیحادیەکانەوە چەندین جار هەوڵی تیرۆرکردنی دراوە، شەریف پاشا لە داماڵینی ڕووی ڕاستەقینەی ئیتیحادیەکان درێغی نەکردوە و ببووە دڕکی چاویان، شەریف پاشا لە ساڵی (1909ز) وازی لە ئەندامیەتی ئیتیحادو تەرەقی هێنا، توێژەرەوان هۆکاری جیاواز بۆ ئەم وازهێنانە دەهێننەوە، لەوانە:

1ـ لە ئیتیحادیەکان نیگەران بووە و وازی هێناوە، چونکە نەیانکردووە بە باڵیۆزی حکومەتی تازە لە پاریس، یان لە لەندەن.

2ـ گوایە ئەحمەد ڕەزای سەرۆکی ئیتیحادیەکان گومانی لێی هەبووە و هەوڵی تیرۆرکردنی داوە، بەڵام بە خوێندنەوەی یاداشتەکانی شەریف پاشا بە ڕوونیی هۆی ئەو وازهێنانەمان بۆ بەدیار دەخا کە دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئەو ناکۆکییە سیاسییە جەوهەریانەی هەبووە لە نێوان بۆچوونی جیای ئەو و ئیتیحادیەکان لەسەر چۆنییەتی دەسەڵات، لەو بارەیەوە نووسیویەتی:

پێویستە بە تەواوی سوپا لە سیاسەت و دەستێوەردانی کاروباری کارگێڕیی جیا بکرێتەوە، ئەنجومەنی بە ئازادی هەڵبژێردراو لە جیاتی سەرکردایەتی ئیتیحادو تەرەقی بکرێتە سەرچاوەی دەسەڵات لە کارگێڕیی و فەرمانڕەوایەتی، پێویستە دان بنێین بە خاسیەتە تایبەتەکانی هەموو لایەك و ئەو فرەلایەنییەی لە کۆمەڵگای عوسمانیدا هەیە قبوڵ بکرێت، مافی هەموو لایەك بدرێت، سوپا هی هەموانە و نابێت بەتەنیا لە ژێر دەسەڵاتی یەك حیزبدا ربێت[265].

[265] - Rohat Alakom Bir KurtDiplomatinin Firtanali Yellari:General Serif pasa (Stokholm: Apec1 995)’pp44-45

لازاریف ئەوەمان بیر دەخاتەوە (حیزبی موجەدید) کە (لوتفی فیکری) دایمەزراندبوو، کە ئەندامی ئەنجومەنی پیاوماقولآن و پیاوێکی نادینی بووە، بانگەشەی بۆ جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت و هەڵوەشاندنەوەی سەڵتەنەت کردووە، زۆربەی ئەندامانی حیزبەکەی لە ئەستەنبوڵ نوخبەی کوردی بوون[266].

شەریف پاشا لە وازهێنانییەوە هەتا شەڕی یەکەمی جیهانیی، سەرکردایەتی بزووتنەوەی بەرهەڵستکاری کردووە دژی ئیتیحادیەکان، لە ساڵی (1909) لە پاریس تیپی چاکسازیی بنەڕەتیی دامەزراندووە، ژمارەیەکی زۆری رووناکبیرانی تورکیای لاو لەو پارتە کۆبووونەوە، وەکو عەلی کەمال، مەولانا زادە رەفعەت، بیرتف تۆفیق، رەفیق نەوزاد، کەمال عەونی بەگ، بە ماوەیەکی کەم ئەم تیپە لە ناوەوەش توانی خۆی رێکبخات کە پێیان دەوت (کۆمەڵەی نهێنی). رەزا نوور یەکێك بووە لە سەرکردەکانی بزووتنەوەی سەربەخۆیی و بزووتنەوەی کەمالی، ئەندامی نهێنی ئەو کۆمەڵەیە بووە، لە ساڵی (1910) ئاشکرا بوو و گیرا، تیپی چاکسازیی عوسمانیی لە ساڵی (1911) چوونە پاڵ تیپی ئیئتیلاف و ئازادیی بەرهەڵستکار لە ئەستەنبوڵ، شەریف پاشاش بووە سەرۆکی کردەیی ئەو پارتە و پاڵپشتی دارایی لە دەرەوە، ئەو پارتە تازەیە ببووە مینبەری بانگەوازکارانی دیموکراتی لە تورکیا و پاڵپشتی بنەڕەتیی بۆ مافی نەتەوەیی گەلانی ناتورك، کەسایەتیە کوردیەکانی بەرهەڵستکاری ئیتیحادیەکان رۆڵی بەرچاویان گێڕا لە دامەزراندنی ئەو پارتە، سەید عەبدولقادری نەهری یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی تیپی ئازادیی، شەریف پاشاش رۆژنامەی (مەشروتیە)ی زمانحاڵی پارتەکەی دەرکردووە[267]. زانای گەورە سەعیدی کوردی (دواتر بە سەعیدی نەورەسی ناسرا) بەر لە هاتنی حوکمی ئیتیحادیەکان و دوای هاتنیان رۆڵی گەورەی گێڕا لە پوچەڵکردنەوەی بیری رەگەزپەرستیی ئەوان، لە بەرانبەردا بیرۆکەی جامیعەی ئیسلامیی پێشنیار کردووە، هەتا ببێتە چوارچێوەیەکی فیکری عوسمانیی، سەعید دەیوت: "بابەتی بیری ناسیونالستی و رەچەڵەك و خوێنی پاکی ئیتیحادیەکان، پێچەوانەی یاسای زانستییە و

---

[266] - لازاریف: سەرچاوەی پێشوو، ل226-227.

[267] مالیسانز: ل50،

روون بۆتەوە ئەسڵی نییە و ئەفسانەیە"، سەعید وتارەکانی لە گۆڤاری (بورکان) مینبەری بەرهەڵستکاری ئیتیحادیەکان بڵاودەکردەوە[268].

وتارەکەی زیا کۆك ئەلپ لە دیاربەکر کە گۆڤاری (پیمان)ی سەر بە ئیتیحادیەکان بۆی تۆمارکردووین، پوختەی بۆچوونی ئیتیحادیەکانی بەدیار خستووە لە بابەت دەسەڵات لە کوردستان:

(سەربازی کردن ئەرکێکی ئاینییو پیرۆزە و ناونیشانی جیهادە و بۆ کەس نییە ئەمەی قبوڵ نەبێت، دەیەك و باجی مەڕانە شەرعین، لە ئێستاوە کورد گۆڤار و رۆژنامەی بە زمانی خۆی دەبێت و بەزمانی خۆیان لە قوتابخانە دەخوێنن. بڕیار و یاسا جێبەجێ دەکرێت و بکوژ دەکوژرێتەوە و هەڵاتووی سەربازیی سزا دەدرێت، مەرجە نازناوی ئاغا و شێخ و عەشیرەت هەڵبوەشێتەوە و عەشیرەتی هەموومان ئێستا "عوسمانییە")[269].

# کۆمەڵەو یانە کوردییەکان

## - کوردستانی لاو

هەندێ لە توێژەرانی نوخبەی کوردیی درکیان بەوە کرد کە تۆرانییەکان وەکو سەری رم بۆ لابردنی سوڵتان عەبدولحەمید بەکاریان هێناون، ئەمە لە کاتێکدا سوڵتان ئەندازەیەك لە لامەرکەزیی دابوونێ و بە مەبەستی دەستبەسەراگرتنی ناسنامەی نەتەوەیی و شاڵاوی مەبەستدار نەبووە، ئیتیحادیەکان سیاسەتی ئاگر و ئاسنیان گرتبووە بەر بۆ تواندنەوەی هەستی نەتەوەیی، مامۆستا موحەممەد ئەمین زەکی بەگ هاوزەمانی ئەو رۆژگارە بووە و لە پێشەکی کتێبەکەی (خولاسەی تاریخی کورد و کوردستان)دا دەڵێ: (دەرهەق بە ئەسڵ و تاریخی کوردان هیچم نەدەزانی ... چونکە تا

---

[268].. عەبدوررەزاق لە یاداشتنامەکەی دا دەڵێ: کە پەیوەندیی بەهێزم هەبووە لەگەڵ شەریف پاشا لە پاریس و بە رەزامەندیی حکومەتی رووسیی بەشداریی کۆنگرەی ساڵی (1911)ی پارتی ئیئتلافی دەسەڵاتدار بووم لە پاریس و سێ مانگ لە پاریس ماومەتەوە، (بڕوانە: بیرەوەری عەبدوررەزاق بەدرخان، خرکردنەوە و ئامادەکردنی جەلیل جەلیلی، ل30-31 --kutlay.pp.82-85

[269] - مالمیسانز: ل34-37

ئەو وەقتە نە لە مەکتەبدا فکرێکی وامان درابویە، نە لە دواییش ... کلیمەی جامیعەی عوسمانیی ئەعصابی هەموومانی تا ئەندازەیەك خاو کردبۆوە..)[270]. جەمیل قەدری پاشاش لە هەمان سەردەم ژیاوە و لەسەر نەتەوەکانی دی و سیاسەتی بە تورککردنی ئیتیحادیەکان جەخت لەسەر هەمان بۆچوون دەکاتەوە و دەنووسیٚ: (خەڵکە ئیسلامیەکەی غەیری تورك ناچارکران بیر لە خۆیان بکەنەوە، لە ئاکامی ئەو چەوسانەوە و تەنگ پێهەڵچنینەی لە بەرانبەر کورد و عەرەب و ئەلباندا کرا، بە ناچاریی رێکخراوی تایبەت بە خۆیان دامەزراند)[271].

زۆربەی نووسەران ئاماژەیان کردووە بۆ کۆمەڵەی (ورەی بەهێز بۆ چاکسازی کوردستان = العزم القوی للاصلاح کردستان)، وەکو یەکەم کۆمەڵەی کوردی لە قاهیرە دامەزرابێت لە لایەن فیکری دیاربەکری، بەڵام زانیاری باشمان لەسەر سروشت و ئامانجی ئەو کۆمەڵەیە لەبەردەستدا نییە، لە دوای کۆدەتای ئیتیحادیەکان لە ئەیلولی (1908) روناکبیرانی کورد لە ئەستەنبوڵ ئەمین عالی بەدرخان، شەریف پاشا، شێخ عەبدولقادری نەهری (کۆمەڵەی هاریکاریی و پێشکەوتنی کورد = کرد تعاون و ترقی جمعیتی)یان دامەزراند، لە دەستووری کۆمەڵەدا هاتووە بڵاوکردنەوە و گەشەپێدانی مەعریفەت، گۆڤارێکیان بە ناوی (کورد) دەرکردووە، کە بە بەرفراوانیی لە کوردستان بڵاودەبۆوە، هەر لەو ماوەیەدا لە ئەستەنبوڵ رێکخراوێکی رۆشنبیریی بە ناوی کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی مەعاریفی کورد (کرد نشری معارف جمعیتی) کرایەوە، ئەو کۆمەڵەیە لە گەڕەکی (وتاشنبرلی)ی ئەستەنبوڵ قوتابخانەیەکی بۆ فێربوونی زمانی کوردیی بەڕێوەبردووە[272].

سلێمانی مەلا خدر و دکتۆر نوری (کۆمەڵەی دۆستانی کوردستان)یان دامەزراندووە، هەر لە هەمان ساڵ (کۆمەڵەی رێنومایی) لە ئەرزڕۆم دامەزرا، (کوتلی)یش ناوی کۆمەڵێك دەبات لە دیاربەکر، بە ناوی (کۆمەڵەی بەرگریی لە هەژاران)[273]، یاریدەدەری قونسوڵی

---

[270] -ئ دم دەقەم وەکو خۆی لە پێشەکی کتێبی خولاسەی تاریخی کورد و کوردستانی ئەمین زەکی بەگ وەرگرتووە. "وەرگێڕ".

[271] -جمیل قدری پاشا: فی سبیل کردستان، ترجمە/ علی، بیروت1987، ص25.

[272] - Kutlay’p.134-135

[273] - Ittihat Terakki Ve Kutler, ‘p.135

بەریتانیش لە دیاربەکر ناوی کۆمەڵەیەکی تری بردووە بە ناوی (برسیەکان = اجیلر)، قونسولێیە دەڵێ: (ئەشراف دیاربەکر کە لە دەسەڵاتی ئیتیحادیەکان بێزاربوون بۆ ئاژاوەنانەوە ئەو کۆمەڵەیان دامەزراندووە)[274]، دەگونجێ هەردوو ڕێکخراوی دۆستانی هەژاران و برسیەکان ڕێکخراوبن، (ملیمسانیز) ناوی کۆمەڵەیەکی تر دەهێنێ لە ئەستەنبوڵ بە ناوی (کۆمەڵەی دۆستایەتی کوردی) کە هۆزانڤان و ئەدیبی نەتەوە کەمال فەوزی بەدلیسی، سکرتێری بووە[275].

یەکەم کاری یانەی کوردی ناردنی یاداشت بووە بۆ کامیل پاشای سەرۆك وەزیرانی نوێ کە داوای چاکسازیی کردووە بۆ کوردستان لەسەر ئەو شێوازە چاکسازیەی وەکو بەڵێن لە ڕێکەوتننامەی بەرلینی ساڵی (1878) درا بوو بە ئەرمەن، یانەی کوردیی توانیبووی لە بەدلیس و دیاربەکر و موسڵ لق بکاتەوە، یانەی بەدلیس لە هەموان بەهێزتر بوو، ژمارەی ئەندامانی یانەی ئەرمەنی لە بەدلیس (50) ئەندام و هی یانەی ئیتیحادو تەرەقی (90) ئەندام، بەڵام ئەندامانی یانەی کوردیی (680) ئەندامی هەبووە[276]، بە پێی ڕاپۆرتی قونسوڵی رووسیی بەر لە داخستن یانەی کوردیی ژمارەی ئەندامانی گەیشتبووە هەزاران ئەندام[277].

لە ناوەڕاستی ساڵی (1909) بە فەرمیی یەکگرتنی یانەی کوردیی و یانەی ئیتیحادو تەرەقی تورکیی ڕاگەیەنرا، بەڵام ئەم ڕاگەیاندنە ململانێیەکی تاڵی نێوان ئیتیحادیەکان و کوردی لە ژێر سەرا بوو، ئیتیحادیەکان بە داخستنی یانەکە نەوەستان، بەڵکو ئەو قوتابخانە کوردیانەشیان داخست کە ببووە دوانگەی ڕووناکبیرانی کورد لە ئەستەنبوڵ، یانەی کوردیی دەیویست قوتابخانەی لەو جۆرە بۆ فێربوونی زانستی نوێ و زمانی کوردیی لە شارە کوردیەکان بکاتەوە، هەروەها ئیتیحادیەکان بەکارهێنانی وشەی (کوردستان)یان قەدەغە کرد و لە جێی ئەوە (ویلایەتی خۆرهەڵات)یان کردە فەرمیی بۆ ناوچە کوردیەکان، ڕاپۆرتێکی درێژ هەیە لەسەر ناکۆکیی نێوان یانەی کوردیی و ئیتیحادیەکان کە یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لە دیاربەکر نووسیویەتی و

---

[274] - Fo 195/2317 No.9 March 9’1909’British vice Consul Diarbekir

[275] - Bitlisli Kemal Favzi Istanbul ‘Firat yayilari’p.15

[276] - Kutlay’p.178-179

[277] - لازارف: کێشەی کورد، ل233-234.

دەڵێ: یانەی کوردیی لە دیاربەکر ئاهەنگێکی گەورەی گێڕاو چەندین بڕگەی تێدابوو، هەموو دەروێشەکانی شار ئامادەی ئاهەنگەکە بوون، هەر ئەوان گەیشتنە مزگەوت و سوێندی گوێڕایەڵیان بۆ سوڵتان عەبدولحەمید و شەریعەت خوارد، والی وتارێکی کورتی داو تیپی مۆسیقای عەسکەریی پارچە مۆسیقایەکی هەڵبژاردەی لێدا، دوایی لە لایەن (3000) کەس لە ئامادەبوانەوە بەڵگەنامەی گوێڕایەڵی بۆ سوڵتان و شەریعەت واژۆکرا، بۆ ئەوەی بەڵگەنامەکە راستگۆیی و جددیەت بەخۆوە بگرێ، یانەی کوردیی هەموو ئاغا و شێخەکانی ئەو ویلایەتەی بانگ کردبوو بۆ ئەو کۆبوونەوەیە، ژمارەی ئامادەبووان لە (10) هەزار کەس تێدەپەڕی، ئەمەش رەنگدانەوەی رۆشنی هەبووە و سەلماندی یانەی کوردیی زۆر لە لقی ئیتیحادیەکان بەهێزترە، هەر لەو کۆبوونەوەیە لە دیاربەکر زۆربەی ئەندامانی وازیان لێهێنا. بە بۆچوونی دارغومان (وەرگێڕی فەرمیی لە قونسولیە) گەشەکردنی ئەم دواییەی بزووتنەوەی کوردایەتی دەگەڕێتەوە بۆ گەرموگوڕنەبوونی کورد لەگەڵ رژێمی تازە، ئەمەش بە هۆی سەپاندنی یاسای مەدەنیی، چونکە هیچ گومانی تیا نییە زۆربەی جەماوەری نەفامی کورد بایەخ بە شەریعەت دەدەن[278].

لازاریف لەسەر ئەو کۆبوونەوەیەی نووسیووە: (یانەی کوردیی لە دوای ئەو کۆبوونەوەیە رێککەوتن لەسەر رێکخستنی بەرگری چەکداریی لە شار و ناوچەکانی دەورووبەر لە پێناو گەڕاندنەوەی سوڵتان عەبدولحەمید)[279].

(دگردسشیان) لە دیاربەکر لە شوێنی یاریدەدەری قونسولی بەریتانی کاری کردووە، لەسەر هەمان بابەت دەڵێ: (وای لێهات دوژمنکاریی و تێکگیران لە نێوان هەردوو یانەی

[278]--Fo195/2317 Enclosure in Mr. Heads Dispatch of January 3rd 1909 (Beruit(

[279] - لازاریف: کێشەی کورد، ل233-234. توێژەرەوەی کورد سیامەند عوسمان لە دامەزراندنی رێکخراوە کوردیەکانی ئەو ماوەیە زیاتر جەخت دەکاتەوە سەر لایەنی سەربازیی لە دامەزراندنیان و دەڵێ: (ئەو رێکخراوانە لەسەر شێوازی نیمچە سەربازیی دامەزراون، ئەمەش بە چاولێکەریی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی تورکی، کە ئەویش لە لای خۆیەوە لاسایی رێکخراوی کاربۆناری ئیتالی کردبۆوە و کە سیاسییی چەکداری بووە) بڕوانە: Siyamend Othman (Kurdish Nationalism: Instigators and Historical Influences) Armenian Review, Spring (1989) .volume 42 Number 1\65, p.49

کوردیی و ئیتیحادوتەرەقی بووە مەسەلەیەکی ئاشکراو هەریەك بەیاننامەی لەسەر ئەوەی تر دەردەکرد)، لە کاتێکدا ئیتیحادیەکان لە چەندین لاوە کوردیان تاوانبار دەکرد، یانەی کوردییش بەم دواییە بەیانێکی دەرکردبوو بەرگریی لە سەروەریەتی خۆی دەکرد و دەیوت کاری ئێمە وەکو کۆمەڵە بابەتێکە و دەستووری تورکیا دانی پێدا ناوە، هەروەها بەرگریی لە بەژەوەندی کورد شتێکە و لە دەستووری تورکیادا هاتووە، یانە داوای لە مەسیحیەکانی ویلایەتەکەی کردبوو بۆ بەرگریی لە بەرانبەر دوژمنکاریی چاوەڕێکراوی ئیتیحادیەکان، لەگەڵ کورد یەکبگرن[280]، بزووتنەوەی (پشتیوانانی موحەممەدی) لە نیسانی ساڵی (1909) دەیانویست ئیتیحادیەکان دەربکەن و دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمید بگەڕێننەوە، ئیتیحادیەکان دەستیان بەسەرداگرتن و یانە کوردیەکانیان داخست، بە بەشداریی کردن لەو بزووتنەوەیە تاوانباریان کردن[281]، ئەگەر ناوەڕۆکی راپۆرتەکانی قونسوڵ بە جددیی وەربگرین، بەتایبەتی ئەو بەڵگەنامانەی سەرەوە، بەدووری نازانین یانەی کوردی رۆڵی هەبووبێت لە بزووتنەوەی گێڕانەوەی دەسەڵاتی سوڵتان، وەکو (دیکسۆن)ی یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لە (وان) دەربارەی هەڵوێستی کورد لە بەرانبەر بزووتنەوەی دەستووریی دەڵێ: (بە شێوەیەکی گشتیی کوردەکان هەستی خۆیان ناشارنەوە لە بەرانبەر رژێمی تازە، زۆر بە ڕوونیی شەریعەتیان دەوێ، نەك یەکسانیی و برایەتیی و ئازادیی ئیتیحادیەکان، یانەیەکی سەر بە ئیتیحادیەکان لێرە هەیە و زۆر لاوازە)[282].

زۆربەی ئەندامانی ئیتیحادو تەرەقی لە دیاربەکر لەو کاربەدەستە تازانەی تورکن کە بە گەندەڵی ئیداریی و بەرتیلخۆری ناسرابوون و لای خەڵکی دیاربەکر خۆشەویست نەبوون، زیا کۆك ئەلپ کوڕی تۆفیق ئەفەندی (یەکێك بوو لە کوردە ناسراوەکانی شار) بەبێ دین و بانگەشەکاری تۆرانییەت ناسرابوو، ئەمە سەرۆکی لقی ئیتیحادو تەرەقی بووە[283].

---

280 - F,O,195/2317 Enclosure in Mr. Heads Dispatch of January 3rd 1909(Beruit(

281 - لازاریف: ل227.

282 - F.O 195/2317 No.12 Diarbekir April 7'1909 Enclosure No.3 "General Notes Between Van and Mosul "B. Dickson

283 Bitlisli Kemal Favzi Istanbul, 1992, pp.69-70.

بە هەڵوێستەی کورت لە ناوەڕۆکی ئەو دوو بەڵگەنامە بەریتانییەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، روون دەبێتەوە، یانەی کوردیی لە دیاربەکر دوو هێڵی تەریبی پیادە کردووە: هێڵی بەرگریی لە بەرژەوەندی کورد و بەرەنگاربوونەوەی تۆرانییەت، لەگەڵ هێڵی بەرگریی لە شەریعەت و سوڵتان عەبدولحەمید، هەروەها راپۆرتەکانی بەریتانی لە ناو جەماوەری کورد لە شارەکانی بەدلیس، وان، سەعرەت، جەزیرە، ناوچەی بادینان، سلێمانی، خوی، ماکۆ، سەلماس، موکریان لەسەر هەمان تێڕوانین دواون، زانایانی ئاینیی و شێخەکانی تەریقەت دەستیان بەسەر ئەو بزووتنەوە بەربڵاوەدا گرتبوو، (بێرترام دیکسۆن) سەردانی ناوچە کوردیەکانی لە ویلایەتی وان و موسڵ کردووە و دەڵێ: (کورد یەکدەنگن لەسەر پێویستیی پیادەکردنی شەریعەت و پێیانوایە سەرکردەکانی رژێمی تازە بێدینن)، ئەم بزووتنەوەیە مەلا سەلیمی بەدلیسی، رەشید ئاغای سلێڤانی، عەبدوڕڕەحمان شەرناخی، شێخ نووری بریفکانی، شێخ عەبدوسسەلامی بارزانی، سەرکردایەتی دەکەن)[284].

## FO 195\2317

## 31ـ حوزەیران ـ 1909، وان

## هێژا گیرارد لۆتر، باڵیۆزی حکومەتی بەریتانیای گەورە

شەرەفێکی گەورەیە بۆ من لەسەر ئەو بابەتانەی لە کاتی گەشتەکەمدا بینیومن هەندێ سەرنج بدەمە بەڕێزتان، گەشتەکەم بۆ وان، سلێمانی، موسڵ و ناوچە سنووریەکانی تورکیا ـ ئێران تا ڕادەیەکی درێژ بوو، لە کاتێکدا گۆڕانکاریی زۆر و خێرا هەیە لە ناوچەکەدا، وادەبینم هەندێ لەو ڕووداوانەی لە ڕاپۆرتەکەمدا باسم کردووە بە هۆی ڕووداوی تازەتر بایەخی نەمابێت.

ئاسان نییە لێرەدا بە درێژیی باسی ئەو گەشتەمتان بۆ بکەم کە خەڵکم لە زۆربەی توێژە جیاوازەکان بینیوە، بەڵام ئەوەی لە گەشتەکەم تێبینیم کردووە راستیەکی ئاشکرایە، کورد هەموو پێکەوە بە خەڵکی دۆڵە بەرزەکان و ناوچە نزمابیەکان، بە

---

[284] - F.o195/2317 No.12 Diarbekir April 7'1909 Enclosure No.3"General Notes Between van and Mosul "B. Dickson.

کۆچەر و مەڕدار و گوندنشین و خەڵکی شار، هەموو ناڕازین لە دەسەڵاتی ئیتیحادو تەرەقی، هەندێکیان بە ئاشکرا دەریان دەبڕی کە دەیانەوێ شەریعەت پیادەبکرێ و باوەڕیان بە پێشنیازەکانی ڕژێم لە یەکسانیی و برایەتیی نییە و نایانەوێ. لە ویلایەتی موسڵ کێشەیەك نییە، بە ناوی (مەسیحیەکان)، ژمارەیەکی کەم کلدان لە ناوچە سنووریەکانی نێوان موسڵ و ئێراندا هەن، لە بنەڕەتدا خەڵکی ویلایەتی وان بوون و بەم دواییە هاتوونەتە ناوچەکە، بەرژەوندیی بازرگانیی و قەرزدانی بەسوو نەبێت، هیچ شتێك لای ئەوان بایەخی نییە و ئەوانە بەم حاڵەتەی ئێستا شادمانن.

بە کورتی: کوردستان ئامادەی شۆڕشی دەستووری نییە، هۆیەکەشی حکومەت خۆیەتی، بەڕێوەبردنی کوردستان ئەستەم نییە، بە مەرجێك کاربەدەستی کارامە و پاك و دڵسۆزی هەبێت، بەداخەوە نە دڵسۆزیی و نەپاکیی لە ناو بەرپرسان و فەرمانبەرانی ئێرەدا نییە، ئەگەر خەڵکی پسپۆڕ و کارامە و دڵسۆز لە جیاتی کاربەدەستە ناکارامە و گەندەڵەکان دابنرێ باری کارگێڕیی لە هەموو ناوچەکوردیەکان یەکگرتوو و توند و تۆڵ دەبێت، بە جۆرێ سنوورێك بۆ ڕێگری شێخەکان دابنرێ و ئیدارەی ناوچەکە جێی ڕەزامەندیی بێت، ئیدارەی توندوتۆڵ پێویستی بە هێزێکی سوارە هەیە لە دەرەوەی کوردستان هێنرابێت و ئامادەبێت بەبێ دوودڵیی ئیدارەی دەوڵەت لە ناوچەکە بسەپێنێت، ئەگەر ئەم مەرجانە هەبن دەتوانرێ ناوچەکە لە زەوییەکی وشك و برینگەوە بکرێتە بەهەشتێکی سەوز و ئاوەدان کە توانای هەبێت ئاکاری لیبراڵیی تێدا بڵاوبێتەوە، بەدیهێنانی ئەو ئامانجەش پێویستی بە بنیاتنانی نەوەیەکی نوێ هەیە، لەم بارودۆخەدا منداڵێکی زۆری ناوچەکە نەخوێندەوارن، ئەوانە دەبێت ڕەوانەی شوێنی تایبەت بکرێن هەتا فێربن، یان بۆ شوێنی چاککردن هەتا باش ئامادەبکرێن، ئەم ژمارە زۆرە لە لاوانی نەخوێندەوار تاوانی خۆیان نییە، بەڵکو بەرپرسیاریەتی دەکەوێتە ئەستۆی بەرپرسان لە دامەزراوەی پەروەردەیی.

ئەو شێوازەی ئێستا پیادە کراوە لە سزادانی ئەو کاربەدەستانەی هەڵەیان کردووە لە دەوڵەتی تورکیا دەگوازرێنەوە بۆ کوردستان و لەوێ بەرپرسیاریەتیان پێدەدرێ، ئەمە کاریگەریی خراپی هەیە لەسەر ئیدارەی ویلایەتەکە، لە جیاتی ئەوەی حکومەتی تورکیا یەکە سەربازیەکانی ئێرە هان بدات بۆ داگیرکردنی خاکی ئێرانی لە (سەلماس) و

(خوی) بۆ بڕەودان بە دەستوور لەو شوێنانە، واباشترە ئەو هێزەی بۆ چارەسەرکردنی کاروباری ویلایەت لێرە بهێڵێتەوە.

داگیرکردنی تەورێز لە لایەن رووسەکانەوە بۆتە فاکتەری ئەو هەڵچوونە توندەی تورك و داگیرکردنی خوی و سەلماس لەناو خاکی ئێران، ئەوەش لە مامەڵەی سەربازە تورکەکان لەو دوو شارە هەستی پێدەکرێ، لەگەڵ ئەو باوەڕەم ناکرێ، رووبەڕووبوونەوەی چاوەڕوانکراو هەر روودەدات لە نێوان هێزەکانی تورکیا و هێزەکانی ئێرانی لە ناوچە سنووریەکان.

شادمان دەبم ئەگەر بەڕێزتان ئەو راپۆرتە بنێرن بۆ بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگریی لە وەزارەتی جەنگ، لە ئاییندەش ئەو نەخشانەشتان بۆ دەنێرم کە لە گەشتەکەمدا ئامادەم کردووە.

دڵسۆزتان: یاریدەدەری قونسوڵی برتردام

## FO 195\ 3217

## پاشکۆی راپۆرتی هێرد، (3)ی کانوونی دووەمی (1909).

یانەی کوردیی لە مزگەوتی گەورە ئاهەنگێکی گێڕاو چەندین بڕگەی تێدابوو، هەموو دەروێشەکانی شار ئامادەی بوون، لەگەڵ دەرێشەکان گەیشتنە مزگەوت، سوێندی گوێڕایەڵیان بۆ سوڵتان و شەریعەت خوارد، والی وتارێکی کورتی داو تیپی مۆسیقای عەسکەریی پارچە مۆسیقایەکی هەڵبژاردەی لێدا، دوایی لەلایەن (300) کەسەوە لە ئامادەبووان بەڵگەنامەی گوێڕایەڵی بۆ سوڵتان و شەریعەت واژۆ کرا، بۆ ئەوەی ئەو بەڵگەنامەیە جددیەت و راستگۆیی بەخۆوە بگرێ، یانەی کوردیی هەموو ئاغا و شێخەکانی ئەو ویلایەتەی بانگ کردبووە ئەو کۆبوونەوەیە، ژمارەی ئامادەبوان لە (10) هەزار کەس تێدەپەڕی، ئەو کۆبوونەوەیە رەنگدانەوەی رۆشنی هەبوو، سەلماندی یانەی کوردیی زۆر لە لقی ئیتیحادو تەرەقی بەهێزترە کە لە دیاربەکر زۆربەیان وازیان لێهێنا بوو، لە (25)ی ئەو مانگە حاجی مەقسود بەرەو مەککە رۆیشت، بەپێی زانیاری (رۆجیسیدتشیان)، لەوێ کۆنگرەی پیاوماقوڵانی دەوڵەتی عوسمانیی دەبەسترێ بۆ وتووێژ لەسەر بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانیی، بە بۆچوونی دارغۆمان (وەرگێڕی فەرمی قونسوڵیە) ئەو گەشەکردنە گەورەیەی بزووتنەوەی کوردایەتیی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی

هاوسۆزی کورد لەگەڵ رژێمی تازە، ئەمەش بە هۆی سەپاندنی یاسای مەدەنییەت بەسەریاندا، گومانی تیا نییە زۆربەی جەماوەری نەفامی کورد بایەخ بە شەریعەت دەدەن.

لێرە ئەندامانی یانەی کوردیی دەیانوت رێنومایمان لە لقی سەرەکیی سەرکردایەتی لە ئەستەنبوڵەوە وەرگرتووە پەیوندیی باش لەگەڵ مەسیحیەکان دابمەزرێنین، بەڵام رەوتی ئیسلامیی موحافیزکار لە یانە یارمەتی دامەزراندنی پەیوەندیی لەو جۆرە نادەن.

هەتا ئێستا دەفتەری (وێرانشار) گەنم و خواردەمەنی لێرە بەسەر زیان لێکەوتووە برسیەکاندا دابەش نەکردووە، وەرگێڕی قونسوڵیە بە والی وتووە: چاو بەو بەڵێنەدا بخشێنێتەوە کە فەرمان هاتووە بۆ دەفتەردار ئەو پیتاکە بەسەر نەداران دابەش بکرێ، بەر لەوەی ئەوێ بەجێبهێڵم والی دڵنیای کردمەوە بەوەی زانیاریی روون و خێرای بۆ دەفتەردار ناردووە و داوای لە من کردووە لەو بارەیەوە ئاگاداری بکەمەوە. هەروەها بەڕێز والی بە توندیی سکاڵای هەبووە لە مامەڵەی ئەو بەرپرسە حکومیەی هیچ ئەخلاقێکی نییە، بەڕێز والی ئاخی هەڵدەکێشا بەوەی هیچ دەسەڵاتێکی نییە بەسەر حاڵەتێکی لەو جۆرە هەتا بیداتە دادگا، ئەگینا بەڵگەی لەسەر دەفتەردار زۆرە، چی بکات دەسەڵاتی ناوەند لە ئەستەنبوڵ دایناوە، ئەگەری ئەوەش هەیە هەتا ئەو دەفتەردارە بمێنێ کۆسپ دەخرێتە بەردەم دابەشکردنی خۆراك، وەرزی چاندنی گەنم بەسەرچووە و بەمەش زۆربەی زەویە کشتوکاڵیەکانی وێرانشار بە دانەچێنراوی دەمێنێتەوە، ئەرکی لیژنەی فریاگوزاریی و یارمەتیدان بۆ ساڵی ئاییندە قورستر دەکات، باشە ئەگەر حکومەت بە کردەوەش یارمەتیی خەڵك بدات، سامانی ئاژەڵیی لە زستاندا بەشێکی دەمرێ و بەشەکەی تر تووشی تاڵانی و زەوتکردن دەبێت.

هێژا رۆجسیدتشیان بە مێژووی (12)ی کانوونی دووەمی (1908) دانەیەکی لەو راپۆرتە لە وەزیری جەنگەوە بۆ فەریق (مشیر) یاریدەدەری فەرماندەی سەربازیی لە ویلایەتەکە و یاریدەدەری والی ناردووە، کە لەوێ حکومەت بەڵێنی هەزار لیرەی داوە بە هەرکەسێك ئیبراهیم پاشای میللی بگرێ، هەروەها لەو برووسکەیەدا لێبووردنی گشتیی هەیە بۆ ئەو لایەنگرانەی ئیبراهیم پاشا کە بە چەکەوە خۆیان بدەنە دەست حکومەت، دیارە جیاوازیی روونیش نەکراوە لە نێوان ئەو هۆزانەی پشتیوانی هەڵگەڕانەوە بوون،

یان پشتیوان نەبوون، لە ڕاستیدا هۆزە بەشدارنەبووەکان ئازاری زۆریان چەشتبوو، چونکە چەکیان نەبووە بەشداریی بکەن، ڕۆجسیدتشیان باسی دانەیەکی ئەو راپۆرتەی کردووە و لەو بارەیەوە دەڵێ: (چەند بەڵگەیەك لەو بارەیەوە هەیە، بەڵام تا ئێستا نەمدیووە و دەگونجێ دزرابێت، یان ون بووبێت). عەبدولکەریم بەگ سەرۆکی هۆزی میرانە و سەرۆکی کەرتێکی هێزی حەمیدیە، تا ئێستا دەست بەسەرەو لە سەربازگەیەك گیراوە، ئەمە لە کاتێکدا عەبدولکەریم دوژمنی زۆرە و دۆستی کەمە، دەگونجێت لە تۆڵەی تاوانە زۆرەکانی گەورەترین سزای بدەن.

دڵسۆزتان ب، هێرد

## خاسیەتی دەسەڵاتی ئیتیحادیەکان لە کوردستان

ئیتیحادیەکان سیاسەتە نەرمەکەی سوڵتان عەبدولحەمیدیان هەڵوەشاندەوە لە بەرانبەر کورد، بۆ نموونە سوارەی حەمیدیەیان نەهێشت، لە ڕۆژانی سوڵتان عەبدولحەمید ژەنەراڵ زەکی پاشای نزیکی سوڵتان کرابووە پەیوەستی نێوان کورد و حکومەت، بە قسەی قونسوڵیەکانی بەریتانی لە کوردستان "زەکی پاشا جێگەی متمانەی کورد بووە، چونکە هەمیشە بەرگریی لە بەرژەوندیەکانیان کردووە و بە ڕووی ئەو ئامرازە کارگێڕییە گەندەڵە وەستاوە کە لە هەوڵی ئیستغلالکردنی کورددا بوون"[285]. زەکی پاشا بەبێ بەرهەڵستیی ئەرمەن و ئاشووریی و بە پاڵپشتی قونسوڵیەکانی ئەوروپی دەسەڵاتی بەسەر ناوچەکەدا هەبووە، ئیتیحادیەکان هاتنە سەر حوکم و ئەرمەن بە پاڵپشتی حکومەتی بەریتانیی و ڕەوسیی و فەڕەنسیی کەوتنە داواکاری چاکسازیی کارگێڕیی لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، دوای ئەوە لیستیان بۆ سەدان سەرۆك هۆزی کورد ئامادە کرد، بەوەی تاوانباری جەنگن دژی ئەرمەن، سەدان گوند و کێڵگەی کشتوکاڵیی بەو حیسابەی خاکی ئەرمەن بووە درایە ئەوان[286]، دوایی ئەندازەیەك لە دەسەڵاتی کارگێڕیی و نوێنەرایەتی ناوچەکە درا بە ئەرمەن، بە جۆرێك

---

[285] - F.O. 195/2317 Enclosure No.3,Report on Affairs in Sulaimania, 13 Jun 1909; No.21 from British Vice Consul' Van 15 December 1909 J.Morgan
[286]-- Kutlay'p.159

لەگەڵ ڕێژەی دانیشتوانیان تێك نەکاتەوە، بۆ قەرەبووکردنەوەی رابردوو و نەهێشتنی چەوسانەوە، بە فشاری حکومەتی بەریتانیی و دامەزراوە ئیتیحادیەکان بەشێك لە داواکاریی ئەرمەنیان بەجێهێنا و کوردستانیش بە ئاگر و ئاسن حوکم دەکرا، دەیان سەرۆکی کورد درانە دادگای رووکەشانە و دەست بەسەر سامانیاندا گیرا، رێگە بەو چەکدارە ئەرمەنیانە درابوو کە لە رووسیا مەشقیان کردبوو بکەونە تۆقاندن و تۆڵەسەندنەوە لە کورد، لە ڕاپۆرتێکی قونسوڵی بەریتانی لە (وان) زانیاری ورد هەیە لەسەر چۆنییەتی مامەڵەی لیژنەی ئیتیحادو تەرەقی لە سەرخستنی (فرامیان بابازیان) سەرۆکی دەستەیەکی چەکداریی ئەرمەنییەکان لە ویلایەتی وان لەسەر حیسابی پاڵێوراوێکی کورد[287].

حکومەت باجی زیادەو نەگونجاوی سەپاندبوو بەسەر داهاتی کشتوکاڵ و مەڕو ماڵاتی ناوچە کوردیەکان، پیت بە پیتی یاسای باجی مەدحەت پاشای ساڵی (1858ز) لە دەوڵەتی عوسمانیی جێبەجێ دەکرد، لە کاتێکدا یاسای ناوبراو کاتی خۆی لە ویلایەتە ئەوروپییەکانی دەوڵەتی عوسمانیی سەرکەوتنی بە دەست هێنابوو، بەڵام ئێستا بۆ ویلایەتەکانی ئاسیا بە تایبەتی بۆ کوردستان نەدەگونجا، لە ئاکامە خراپەکانی تێکدانی رایەڵەی پەیوەندییە کلاسیکیەکانی هۆزایەتی بووە، هەموو ئەندامانی گوندەکانی دوێنێی بە یەکسانیی کردە کۆیلەی سەرۆك هۆز و سەرۆك هۆزیشی گۆڕی بۆ خاوەندارێکی ئیستیغلاکەر، یان دەرەبەگێکی دیکتاتۆر، خراپیی ئەو سیستمە گەیشتە رادەیەك حکومەت لە بەرانبەر دەرەبەگەکان بەهێز نەبوو، نەیدەتوانی نەهێڵێ ئەوانیش باج بسەپێنن، بەمەش گوندنشینەکان دوو باجیان دەدا، دووبارەکردنەوەی شێوازە هەڵەکەی سەردەمی عەباسی بووە کە بە ساختەیی ئیلتیزام ناسرابوو، جوتیار بۆ ئەوەی باج نەدا ناچار کراوە گوندەکەی بەجێبهێڵێ، هەتا باج نەدات و ئەمنییەتی زیاتر پارێزراو بێت بە ناوی یەك لە دەرەبەگەکانەوە زەویەکە تۆمار بکات و بۆ خۆی لەلای دەرەبەگەکە بە کرێ کار بکات، لێرەوە دەرەبەگەکان بوونە گەورەترین خاوەن زەوی، هەروەها ئیتیحادیەکان باجی زیادەیان بەسەر داهاتی کشتوکاڵ و مەڕوماڵاتدا سەپاند،

[287] - F.O 195/2317'No.4 Enclosure No.2..Despatch' March13 1909 British Vice Consulate Van

ڕێژەکە لە زەوی خاوەندارێتی دەیەك و لە زەوی خەراجی (زەوی دەوڵەت) کە بەپێی تاپۆ بە ناوی جوتیارانەوە تۆمارکرابوو لە سێیەکی تێدەپەڕی. بۆ نموونە ئیتیحادیەکان لە ویلایەتی دیاربەکر ڕێژەی باجی کۆدە (کە باجێکە لەسەر مەڕوماڵات دادەنرێ)ی بەرز کردەوە بۆ پێنج پیاستەر (دراوێکی عوسمانییە و لە لیرە کەمترە)، ئەمەش ڕێژەیەکی گەلێك بەرزە، بۆیە جوتیاری کوردی ناچارکرد مەڕوماڵاتی بفرۆشێ و زەویە کشتوکاڵیەکەی بەجێبهێڵێ، حکومەت بەمەشەوە نەوەستا، بەڵکو بەبیانووی ئەوەی ئیدارەی حەمیدیە نەیتوانیووە ئەندازەی پێویست باج کۆبکاتەوە، یان باجێکی شیاو و پێویست کە دەبێت یەکسەر بیدەن، سەرانەی زیاتری سەپاند.

ئیلتیزام بەو پڕۆسەیە دەڵێن حکومەت دێت کۆکردنەوەی باجی ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراو دەداتە کەسێکی بە توانا وەکو بەڵێندەر، گوندنشینەکان پێیان دەوت (مولتەزیم)، ئەو مولتەزیمە دێت لە ماوەیەکی دیاریکراو هەتا دەکرێ باجی قورس دەسەپێنێ بەسەر جوتیارانی ناوچەیەك و بەشی حکومەت لەگەڵ بەشەکەی خۆی کۆدەکاتەوە، بەمەش باج بە خێرایی کۆدەکرێتەوە و جوتیارانیش دەخرێنە ژێر باری قورسەوە[288].

ئەو سیاسەتەش هەندێ جار پشت بە خەمڵاندنی پێشوەخت دەبەستێ، بە جۆرێك هەندێ جار خەمڵاندنەکە نابابەتیی دەبێت و دەرناچێ و زیادەڕۆیی تیا دەکرێ، بەر لە هەڵگرتنی خەرمان مولتەزیم لەگەڵ کۆمەڵێك پۆلیس دێن و ئەو باجە داوا دەکەن کە پێشتر خەمڵاندویانە، ئەگەر جوتیارەکە نەیدات ئەوە تووشی لێدان و ئازار دەبێت و سامانەکەی دەستی بەسەردا دەگیرێ[289].

مەبەستی بە تورککردن و بەرەو عەلمانیبردنی ناوچە کوردیەکان کاربەدەستانی تورکیا لە بەڕێوەبەرایەتیە حکومیەکان و ئیدارە و پۆلیس و سەربازیی "جەندرمە"و زەبتکەری خراپ دادەنێن و ئەوانەش قسەی سووك بە جوتیاران دەڵێن، وەکو حەیوانی کێوی بە شێوەیەکی تۆقێنەر مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن، لەو دوو ساڵەی دوایی

---

[288] - F.O 195/2317'No 12'April 7'1909 British Vice Consul' ;Salih Haider "land Problems of Iraq,, Doctoral Dissertation; London University,1942pp 288-291"

[289]- Noel, p.10

ئیتیحادیەکان زۆر کەم و هەندێ جار بە چەند مانگێك موچەیان نەدەدا، حاڵی فەرمانبەرەکان لە جەندرمە و هەیتەکان باشتر نەبوو، بەڵام فەرمانبەرە گەورەکان وەکو والی، دەفتەردار (بەرپرسی خەزێنە لە ویلایەت)، بەڕێوەبەری تاپۆ، بەڕێوەبەری دارایی، تابوور ئاغاسی (بەڕێوەبەری پۆلیس)، ئەمانە زۆربەیان ناکارامە و گەندەڵ بوون، بەرتیل و بەخشش لە ناویاندا بڵاوبۆوە، ئەو پایەی وەریان گرتبوو، یان بە هۆی لایەنگریی ئیتیحادو تەرەقی، یان لە فرۆشتنی موزایەدەی ئاشکرای پایە حکومیەکان دەستیان دەکەوت کە بە ڕژێمی تازەی ئیلتیزام ناسراوە، فەرمانبەر بەپێی ئەو پرۆسەیە پایەیەکی کارگێڕیی بە بڕێك پارە دەکڕیێ، ئەمەش بە زۆریی لە یەکێك لە بازرگانەکانی ئەستەنبوڵ، کرێکار (مولتەزیم) بە زۆریی لە ماوەی کارەکەیدا "زیاتر ماوەی ساڵێك یان چەند مانگێك دەبێت" هەوڵ دەدات زۆرترین باج بسەپێنێ بەسەر خەڵکی پیشەکار و جوتیار و بازرگان، هەتا بتوانێ بەشێکی لێبدات بە حکومەت و بەشێکی تر بۆ ئەو بازرگانەی لێی کڕیوە و بەشێکی بۆ گیرفانی خۆی، چونکە مەرج نەبووە بۆ ماوەیەکی زۆر لەو پایە بمێنێتەوە[290].

ئەو سیاسەتە کارگێڕییە زاڵمانەیە قورسایی خستبووە سەر شانی جوتیاران و بە زۆریی ناچاری کردبوون کێڵگەکانیان بەجێبهێڵن و وێرانیی و برسیەتی بڵاوبێتەوە و باری ئابووریی خراپ بێت، هەروەها گەڕەلاوژەیی ئیداریی و نەمانی ئاسایش و ئارامیی لە زۆربەی ناوچەکە درووست ببێت و شەپۆلێك ناڕەزایی لێبکەوێتەوە، وای لێهات لەبەر بارودۆخی سەختی ئەوکاتەی کوردستان، شێخی تەریقەت وەکو سەرکردە و ئیسلام و سۆفی سادە و ساکار وەکو ئایدولۆژیا بوونە تاکە پەناگەی زۆرینەی خەڵك، شتێکی سروشتی و چاوەڕێ کراوە خەڵکی سۆزیی بۆ سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید ببزوێ، سەیر نەبووە کورد لە دەوری ڕاپەڕینەکانی دژ بە ئیتیحادیەکان کۆبێتەوە !

دەرهاویشتەی ئەو حاڵەتە سیاسیی و ئابووریی و کارگێڕییە هەڵە و گەندەڵەی لە کوردستان زەمینەی خۆش کرد بۆ لە دایکبوونی کوردایەتیەکی بە ناوەڕۆك ئیسلامیی.

---

[290] - Martin van Businessmen Agha, Shaikh and state:Other Social and Political Organization of Kurdistan (Utrech:1978), p,211, pp.54-57،

د.كمال مظهر: كردستان في سنوات حرب العالمية الاولى، ص83-86، صديق دملوجي: امارة بهدينان، موصل198-69.

نوخبەی کوردیی لە دەرەوە و ناوەوەی کوردستان بۆچوونی تریان هەبووە بۆ چاکسازیی، بۆچوونی ئەمانە نادینیی و لیبرالّیی بووە و لە فیکر وەکو دژەکەی خۆی لە ئیتیحاد و تەرەقی لە ژێر کاریگەریی بیری رۆژئاوادا بوون.

لە سالّی (1910) خوێندکارانی کورد لە ئەستەنبولّ رێکخراوێکی نەتەوایەتیان بە ناوی (هیوا) پێك هێنا، یەکەم جار گۆڤاری (رۆژی کورد)، دوایی (هەتاوی کورد)یان دەرکرد، گۆڤارەکە و رێکخراوەکە ببووە بلّندگۆی کوردانی بە تەمەن و پیشەی جیاجیاوە لێی کۆبوونەوە، ناودارترین ئەندامانی رێکخراوەکە خەلیل خەیالّی، جەمیل قەدری پاشا، مەمدوح سەلیم، عەبدوللّا جەودەت بوون، (رۆژی کورد) لە سەروتارەکەیدا نووسیبووی: (پێویستە دان بەوەدا بنێین کورد ماوەیەکی زۆرە لە شارستانییەت دابڕاوە و تائێستاش دوورن لە زانست و رۆشنبیریی و بێبەشن لە زانیاریی و مەعریفەت)، گۆڤارەکە فیکر و شارستانییەتی ئەورووپیی بلّاودەکردەوە و کاری دەکرد بۆ ژیانەوەی کەلەپووری نەتەوایەتیی کورد)[291]. لە وتارێکی گۆڤارەکەدا خەلیل خەیالّی نووسیبوی: (لە سەردەمی پێش ئیسلامدا کورد ئەدەبێکی دەولّەمەندی هەبووە، بەلّام دوای مسولّمانبوونی، بەتایبەتی ماوەی دەسەلّاتی سولّتانەکانی عوسمانیی ئاکامی پابەندی توندی بە ئیسلام و خۆیەکلاییکردنەوەی بۆ خەلافەت زۆر لە تایبەتمەندیەکانی خۆی لە بیر کرد). عەبدوللّا جەودەت لە وتارێکی تردا داوای بەکارهێنانی ئەلفبای لاتینی کردووە بۆ نووسینی زمانی کوردی، هەروەکو دەلّێ: "دەنگەکانی پیتی عەرەبی نەگونجاوە"، لە ژمارە سێی گۆڤارەکە ئیسماعیل بابان زادە وەلّامی داوەتەوە و بانگەوازی گۆڕینی ئەلف و بێی عەرەبی بۆ ئەلف و بێی لاتینی بە پێویست نەزانیوە، چونکە بە چەند گۆڕینێکی سادە لە بزوێن و نیشانەکانی دەتوانرێ هەروەکو خزمەتی زمانی فارسی پێکراوە خزمەتی زمانی کوردیشی پێبکرێ، ئەمە کورد دادەبڕێ لە شارستانییەتی ئیسلامیی کە مولّکی هەموو لایەکە، نەك وەکو تاوان سەیری بکەین و دژی شەرع بێت[292].

---

[291]- رۆژی کوردستان، ژ1,6، حوزەیرانی 1329| 1913

[292] - رۆژی کوردستان، ژ3,1ی حوزەیرانی 1329\ 1913

له وتارێکی تردا به ناونیشانی (زەمانی باپیرانمان و زەمانی ئێمه و زەمانی تۆ) نووسەر به ڕاشکاویی داوای کردووه واز له ئیسلام بهێنن، به ڕای ئەو "بۆته دابەشکردنی کورد"، له کاتی هاتنی مەسیح، کورد و مەسیحیەکان یەك گەل بوون، بەڵام له دوای بەدیارکەوتنی ئاینی موحەممەد ﷺ هەندێ له ئاشووریەکان باوەڕیان پێهێناو چوونه چیاو زمانێکیان بەناوی کرمانجیی پێکهێنا، بەڵام ئەوانەی له دەشتەکان مانەوه پێیان وترا مەسیحیەکان"[293].

له ساڵی (1912) ڕۆژی کورد وەستاو لەژێر ناوی (هەتاوی کورد) بەردەوام بوو، بەڵام هەمان ناوەڕۆکی (ڕۆژی کورد) بووه.

عەبدوڕڕەزاق بەدرخان ئەدەبی فەڕەنسیی خوێندبوو، به بیری شۆڕشی فەڕەنسیی و چاکسازییەکانی ڕووسیای سەدەی نۆزدەهەم که بووه هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی (1905) گۆش کرابوو، باوەڕی وابووه کورد دەتوانێ ئەو چاکسازییانه وەربگرێ و لەسەر واقیعی کوردستانیی جێبەجێی بکات، له ساڵی (1913) له شاری (خوی) کۆمەڵێکی کوردی به ناوی (جیهانزانی) دامەزراند، دەیوت ئامانجی کۆمەڵه ناردنی لاوی کورده بۆ ڕووسیا بۆ فێربوون و بڵاوکردنەوەی زمانی کوردی به پیتی لاتینی، "هەتا کورد ئاگاداری ڕۆشنبیریی ڕووسیی پێشەنگ بێت"، میسۆ کاریت میسیۆنەری ڕۆژهەڵاتناسی ناسراوی فەڕەنسی پەیوەندیی بەو قوتابخانەیه کردبوو که عەبدوڕڕەزاق دایمەزراند بوو، دەبوایه فێرخوازەکانی ئەو قوتابخانەیه فێری ئەبجەدیەتی سریالی ڕووسیی بکرێن و بەرگی ئیفرەنگی بپۆشن[294]، له سەرەتاوه سمکۆ یارمەتیی دارایی و مەعنەویی داوه، هەروەها زانا کوردەکانیش کۆمەکی زەکاتیان بۆ کۆمەڵه و قوتابخانەکه کۆکردۆتەوه، له کاتێکدا عەبدوڕڕەزاق لەو ماوەیەدا لەگەڵ ڕووسەکان کاری کردبوو، پێشتر و له کاتی شۆڕشی دەستووریی ئێران، له ساڵی (1907) که ڕووسیا ئازەربایجانی کوردستانی داگیرکردبوو، ئەو هیوای هەبوو حکومەتی کوردیی له ژێر چاودێریی ڕووسیی بۆ دابمەزرێنن، چاك دەیزانی ڕووس چاوی بڕیوەته لکاندی ئازەربایجان و کوردستان به ڕووسیاوه، بۆیه بەرۆژئاوایکردن و سەپاندنی ڕۆشنبیریی

---

[293] - جلیل جلیلی: نهچه الکرد الپقافیه، ص1329\1913

[294] - هەمان سەرچاوه، 45-142.

رووسیی بە باشترین ڕێگە زانیووە، رووسەکان بە پارە یارمەتی هەوڵەکانی عەبدوڕڕەزاقیان داو داوایان لە هۆزە کوردەکانی دۆستی خۆیان کردبوو هاوکاریی بکەن، ئەو دەیویست بە درێژایی سنووری دەوڵەتی عوسمانیی لەگەڵ رووس و ئێران قوتابخانەی لەو جۆرە دابمەزرێنێت، بەڵام مەلایەکان پێیان زانی و ئەو هەنگاوەیان بە بەگاورکردن و بڵاوکردنەوەی بیری بێدینیی دانا لە ناوچەکەدا، بە روویدا راپەڕین و عەبدوڕڕەزاق ناچار بوو ناوچەکە جێبهێڵێ[295]، مامۆستا موحەممەد رەسوڵ هاوار، خاوەن ژیاننامەی (سمکۆ) دەڵێ: داخستنی قوتابخانەی (خوی) بە هۆی ناکۆکیی نێوان سمکۆ و عەبدوڕەزاقەوە بووە، چونکە ئەمیان ویستوویەتی پارەی کۆمەڵە لە ئەسڵدا بۆ قوتابخانە کۆکرابۆوە و پارەی زەکات بووە، خەرج بکرێ بۆ کڕینی چەك بۆ شەڕی دەوڵەتی عوسمانیی، سمکۆ رازی نەبووە، وتوویەتی زەکات ئەمانەتە دەبێت بە تەنیا بۆ قوتابخانە خەرج بکرێ[296]، ئەوەی تا ئێستا دەرکەوتووە هەندێ ناکۆکیی لە نێوان سمکۆ و عەبدوڕەزاقدا هەبووە لەسەر سروشتی پەیوەندیی لەگەڵ رووس.

بە چاوخشاندنێکی خێرا بە ناوەڕۆکی هەردوو گۆڤاری (رۆژی کورد)و (هەتاوی کورد) کە بە قەڵەمی پێشەنگی ئەوکاتەی رووناکبیرانی نەتەوەییەکانی کورد نووسراوە، چەند راستیەکمان بۆ روون دەبێتەوە.

یەکەم: نەتەوەخوازانی کورد وەکو هەموو نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتی رۆژئاوا وەکو نموونە سەیری ئەوروپاو شارستانییەتی ئەوروپیان کردووە، خۆیان وەکو قەزەم هاتۆتە پێش چاو، ئەوروپاش بە ژیاری بنەڕەتیی، ئەمەش هەڵوەشاندنەوەی ئەو هەموو بەرهەمەی شاعیران و نووسەرانی کورد بووە کە بە گشتیی هاوبەشییان کردووە لە شارستانییەتی ئیسلامیی، بەتایبەتی لە بەرانبەر مێژوو و کەلەپووری کوردیی.

دووەم: هەروەکو لە فیکری ناسیۆنالستی عەرەبی و تورکدا هەیە دەبینین فیکری ناسیۆنالستی کوردییش هاوسۆزە بۆ زیندووکردنەوەی شارستانییەت و واقیعی دێرینی کورد، بانگەوازکردن بۆ بانگەشەی بەکارهێنانی پیتی لاتینی لە جیاتی ئەلفو بێی کوردی، ئەمە باوبووە لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە سۆماڵ لە ئەفریقیا و ئەفغانستان، بە هۆی ئەمەوە دابڕانێکی تەواو لە ژیاری رابردوودا درووست دەکات.

---

[295] – م.س لازاریف، کێشەی کورد، وەگێڕانی د. کاوس قەفتان، بەغدا، ل530-531.

[296] – حەمە رەسوڵ هاوار، سمکۆ (سمایل ئاغای شکاك)، ستۆکهۆڵم، 1995، ل168.

## بزاڤی کورد دژ بە ئیتیحادیەکان

کوردستان لە ساڵانی (1905ـ 1914ز) توندترین ڕووبەڕووبوونەوەی خوێناویی نێوان کورد و ئیتیحادیەکانی بە خۆوە بینیووە، بەڵام ناتوانین لە خواست و نوشستی بزاڤەکانی ئەوکات حاڵی بین، ئەگەر هەڤپەیڤین نەکەینە چوارچێوەی پەیوەندییەکانی عوسمانیی ـ ئێرانیی و ململانێی ڕووسیی ـ بەریتانیی ـ ئەڵمانیی لەگەڵ خۆسەپاندنی ئەوان بۆ دابینکردنی پێگە لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانیی، شوێنی کوردستان لە ڕووی جوگرافیەوە وای کردووە لەئەو ململانێیانەدا کارتێکراو و کارتێکەر بێت، لازاریف لە کتێبی (کێشەی کورد) بە تێروتەسەلی لە ئەو بابەتە دواوە، پێمان چاکە بە کورتی هەندێ لە ڕێڕەوی کاریگەرییە نێودەوڵەتیەکان باس بکەین.

ڕژێمی جیهانی لە سەدەی نۆزدەهەمەوە هەتا شەڕی یەکەم لەسەر هاوسەنگیی نێوان زلهێزەکانی ئەوروپا وەستابوو، ئیمپراتۆریەتی بەریتانیاش ڕۆڵی ڕاگرتنی ئەو ڕژێمەی بینیووە و نەیهێشتووە هێزێکی تر لە جیهان ڕکابەرایەتی بکات، لە سەدەی نۆزدەهەمەوە ئیمپراتۆریەتی ڕووسیی ویستوویەتی، یەکەم لە بەلقان و دووەم لە ئەنادۆڵ لەسەر حیسابی دەوڵەتی عوسمانیی خۆی فراوان بکات، چونکە ئارەزووی ڕووس بۆ گەیشتن بە ئاوە گەرمەکانی کەنداوی فارس پێویستی بە داگیرکردنی ئێران و ئەرمینیا و کوردستان هەبووە، بەریتانیاش پێی وابوو ئەم فراوانخوازییەی ڕووسیا هەڕەشەیە بۆ سەر ئیمپراتۆریەتی هیندیی ـ بەریتانی، هەروەها پێیوابووە فراوانبوونی پێگەی ڕووسی لە ئێران و دەوڵەتی عوسمانیی دەبێتە تێکدانی هاوسەنگیی هێز لە ئەوروپا. ئەڵمانیاش لە سەرەتای سەدەی بیستەم وەکو هێزێکی ڕکابەری ڕووس و ئینگلیز لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست هاتە سەر شانۆی ئەوروپی، ئەمە ڕووسیا و بەریتانیای لە ساڵی (1905ز) لە هاوپەیمانییەتیەکی دووقۆڵیی بەیەك گەیاند، ئەو هاوپەیمانییەتیە زۆر کێشەی نێودەوڵەتیی چارەسەر کرد و هەردوولا پێگەی خۆیان لە ناو ئێران دیارییکرد، هەروەها هەردووکیان ڕێککەوتن لە سەر تێکنەدانی یەکێتیی خاکی عوسمانیی، فەڕەنسا لە ساڵی (1909ز) پەیوەندیی کرد بە هاوپەیمانییەتی دووقۆڵیی، هەرسێ هێزی ئەوروپی فەڕەنسا و بەریتانیا و ڕووسیا هاریکاریی یەکتری بوون بۆ دابەشکردنی پێگەی خۆیان لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی و لە ململانێی یەکتری دوورکەوتنەوە، سوڵتان عەبدولحەمید لە بەرنامە و قۆناغبەندیی نەخشەی ڕووس و

ئینگلیز تێگەیشت بوو بۆ دابەشکردی خاکی عوسمانیی، بەریتانیا میسر و قوبرسی داگیرکرد و رووسیاش هانی جوداخوازیی ویلایەتەکانی عوسمانیی دەدا لە ڕۆژهەلاتی ئەوروپا، فەڕەنساش بەشێك لە باکووری ئەفریقیای داگیرکرد، بۆیە سوڵتان بۆ بەربەرەکانی پێگەی ئەوان ئەڵمانیای هێنایە ناوەوە، بەو حیسابەی ئەڵمانیا چاوی نەبڕیوەتە خاکی عوسمانیی، هەوڵەکانی سوڵتان عەبدولحەمید چەندین رێکەوتننامەی نێوان دەوڵەتی عوسمانیی و ئەڵمانیای لێکەوتەوە، ئیمتیازی هێڵی بەغدا ـ بەرلین لە گرنگترین نیشانی ئەندازەی لێکنزیکی ئەڵمانیا بووە لە دەوڵەتی عوسمانیی[297].

حکومەتی بەریتانی بەوپەڕی نیگەرانییەوە دەیڕوانییە هاوپەیمانییەتی عوسمانیی ـ ئەڵمانیی، چونکە ئەم فراوانخوازییەی پێگەی ئەڵمانیا لە ئەنادۆڵی رۆژهەلات و عێراق، مەترسیی بوو بۆ بەرژەوەندییە ئەمنیی و ئابوورییەکانی بەریتانیا لە عێراق و کەندا و، لە کاتێکدا کانە نەوتیەکانی باشووری ئێران بایەخی خۆی بۆ ئیمپراتۆریەتی بەریتانی سەلماندبوو، هەروەها داهاتی هێڵی بازرگانی بەغدا۔ خانەقین سالانە (3.250.000 پاوەندی ئیستەرلینی بووە، لۆرد کێرزۆنی بەرپرسی ناوداری بەریتانیی و بانگەوازکاری فراوانخوازیی بۆ سەپاندنی پێگەی بەریتانی لە داگیرگەکان لە ساڵی (1903ز) لە لێدوانێکیدا بۆ ئەنجومەنی لۆردات وتبوویی: (90٪)ی ئەو بازرگانییەی دەچێت بۆ بەغدا هی بەریتانیایە، یان لە ئیدارەی بەریتانیا لە هیند و بەغداوە هاتووە، ئێمە زیاتر لە (100) ساڵە موقیمی بازرگانیمان هەیە و لە کەس قبوڵ ناکەین هەڕەشە لە بەرژەوەندییەکانمان بکات[298].

رووسیاش لە لای خۆیەوە ئەم لێکنزیکبوونەوەی عوسمانیی ـ ئەڵمانیی بە مەترسیی داناوە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی، سوڵتان عەبدولحەمید لە ساڵی (1905)وە بە پشتیوانی ئەڵمانیا و بە ناوی جامیعەی ئیسلامیی لە ئازەربایجان و کوردستان هەوڵی فراوانخوازیی دەدا، رووسیاش هەر فراوانخوازییەکی لە ئێران و ئازەربایجان و ئەرمینیا

---

[297] - E.M. Earl Turkey, Great Powers and the Bag Company (New York: Mac Milan Company,1923(

السلطان عبدالحميد: مذكرات السلطان عبدالحميد، ترجمة وتقديم، محمد حرب القاهرة، دار الانصار، 1978.

[298] - House of Lords, Parliamentary Debates,5th Session,2'(1911)'pp586-587

به هەنگاوی سوڵتان عەبدولحەمید زانیووە بۆ بەدەستهێنانی خەونی سوڵتان لە وروژاندنی گەلانی ئیسلامیی لە ئاسیا بە ناوی جامیعەی ئیسلامی لە دژی رووسیا، بۆیە بە هەموو توانای خۆی ویستویەتی لە بەرانبەر فراوانخوازیی عوسمانیی بوەستێ لەسەر حیسابی ئێران[299]. ئەم سیاسەتەی عوسمانیی دەسەڵاتدارانی رووسیای لە قەوقازیا راسپارد کە چاودێریی چالاکییەکانی عوسمانیی بکەن لە سنووری ئێرانیی ـ تورکیی، هێزەکانی عوسمانیی لە ساڵی (1905ز) زۆربەی خاکی ئێرانی لە ئازەربایجانیان داگیر کرد، ئیتیحادیەکانیش کە دەسەڵاتیان گرتە دەست بەردەوام بوون لەسەر سیاسەتی فراوانخوازیی لە ناو ئێران[300].

لە ماوەی ساڵانی (1907ـ 1911ز) بەهۆی شۆڕشی دەستووریی، پەشێوی کەوتە ناو دەسەڵاتداریەتی هەموو ئێران، بەتایبەت لە ئازەربایجان و کوردستان، ئیتیحادیەکان بۆ زیاتر فراوانخوازیی لە ناو خاکی ئێران، ئەمەیان بە دەرفەت زانی، ئەفسەرە ئەڵمانەکانیش لە ئاسانکاریی گرێدانی کوردستان بە دەوڵەتی عوسمانیی رۆڵی گرنگیان گێڕا، لە ساڵی (1906) دەوڵەتی عوسمانیی بۆ لابردنی شاو سەپاندنی حکومەتێکی ئێرانیی دۆستی ئەڵمان لە تاران، پشتیوانی سالار دەولەی عەهدی ئێرانی و دوژمن بە شای کرد، کە ئەو کات پێگەی لە ناو هۆزە کوردەکاندا هەبووە، هیچ کام لە ڕووس و ئینگلیز رازی نەبوون بە ئەو فراوانخوازییەی عوسمانیی لە ئێران و ئەمەیان بە بەرژەوەندیی ئەڵمان دەزانی، بۆیە هەردوو دەوڵەت لە هەوڵی پاراستنی ئاسایش و ئارامی کوردستاندا بوون، بەو حیسابەی ناوچەیەکی سنووریی گرنگە، بۆ ئەو مەبەستە کەوتنە هاندانی هەریەك لە ئێران و تورکیا بە ئەوەی رێگە نەدەن بە کورد گرفت بۆ بەرانبەرەکەی درووست بکات، رووسیاش بە زەبری هێز ئازەربایجانی داگیرکرد و رۆڵی کارای لە ناوچە سنوورییەکاندا پەیدا کرد[301]، سەرەڕای مۆرکردنی رێککەوتنامەی دووقۆڵیی لە نێوان رووسیا و بەریتانیا لەسەر پاراستنی ئارامی سنووری عوسمانیی،

---

[299]-لازاریف: سەرچاوەی پێشوو، ل177-178، 203-205.

[300] - F,O 195/2317, (Report on Frontier Question in Around Urmia and Salmas 13 June, 1909, British Vice Consulate, Van.

[301] - British Document on Foreign Affairs(BDFA),''The Near and Middle East'',vol..17,pp.383-385

بەڵام بێمتمانەیی و ناكۆكیی شاراوە هەر مابوو، بەتایبەتی لە نێوان بەرپرسان و قونسوڵیە چالاكەكانی ناوچە سنووریەكانی كوردستان، وەكو ئامرازێك بۆ بەدەستهێنانی دەسكەوتی سیاسیی و پێگەی خۆیان لە ناوچەكە، هەردوولا خەریكی سەرنجراكێشانی سەرۆكە كوردەكان بوون، لازاریف لەسەر زاری قونسوڵی فەرەنسیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە: (ئەگەر قونسوڵی رووسیی لە ناوچە سنووریەكانی ئێرانی ـ عوسمانی سەردانی ئاغایەكی كوردی بكردایە، ئەوە قونسوڵی بەریتانیش سەردانی هەمان ئاغای دەكرد)[302]. هۆزەكانی كورد و سەرۆكەكانیان پشگیرییان لەو ململانێیە كردووە، بۆ نموونە سمكۆ چەندین جار لە نێوان ئێران و عوسمانیی و رووسیی دۆستایەتی خۆی گۆڕیوە، بە گشتیی كورد لە پەیوەندیی رووسیی ـ كوردیی بێمتمانە بووە، ئەمەش بە هۆی سیاسەتی چەند ساڵەی تەقلیدی رووس لە بێمتمانەیی بە كورد و پشتگیرییكردن لە ئەرمەن و ئاشووریی لە بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەكانی رووس لە ناوچەكەدا، ئەو سیاسەتەش هەتا ساڵی (1970) گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە[303].

## 1ـ بزووتنەوەی ئیبراهیم پاشای میللیی

ئیبراهیم پاشا نموونەیەكە لەسەر بەدیاركەوتنی دەسەڵاتی خانەوادەكانی كورد، كە بە هۆی رووداوە هەرێمیی و نێودەوڵەتییەكانەوە گەیشتە دەسەڵات، هەروەها نموونەیەك بووە لە هێز و توانای كورد لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید و كارەساتی رۆژگاری ئیتیحادیەكان، ئیبراهیم نەوەی ئەیوب پاشای میللیی سەرۆكی هۆزی گەورەی (میللیی)ی بووە، زێدی دێرینی ئەوان لای باشووری دیاربەكر بە ئاراستەی سنووری سوریا و توركیایە، شاری وێرانشار لە باشووری دیاربەكر مەڵبەندی هۆزی میللیە، ئەویّ لە سەدەی هەژدە شوێنی میرنشینێكی گەورە بووە كە تەیمورخان سەرۆكایەتی كردووە، چەندان هۆزی كورد و عەرەبی كۆچەر لە ویلایەتی وان و دیاربەكر و جەزیرە و حەلەب گوێڕایەڵیان كردووە، هەتا دەسەڵاتدارانی عوسمانیی لە ساڵی (1791) بە فەرماندەیی سلێمان پاشای (والی بەغدا) هێرشێكیان كردە سەری، تەیمور پاشا

---

302 - لازاریف: ل157.

303 - Bell.p.41

ماوەیەك لە قەڵاكەی بەرگریی كرد و دوایی دەستی كرد بە شەڕی پارتیزانی، بەردەوام بوو هەتا لە ساڵی (1800) سوڵتانی عوسمانیی لەگەڵیدا ئاشت بۆوە و كردیە والی ئورفە، دوایی كردیە هی سیواس، لە كاتی شالاوی ئیبراهیم پاشای كوڕی موحەممەد پاشا بۆ سوریا، لە ساڵی (1833ز) تیماوی پاشای نەوەی ئەیوب پاشا لەگەڵیاندا ڕێككەوت و ماردینی گرت و بەشێك لە شكۆی میرنشینی میللیی گەڕاندەوە، لە دوای كشانەوەی هێزەكەی میسر، عومەر پاشای والی دیاربەكر هێرشی هێنایە سەر ماردین و مەحمود بەگی باوكی ئیبراهیم پاشای گرت، ئەویش هەڵات بۆ لای خدێوی ئیسماعیلی والی میسر لە ئەستەنبوڵ، هەتا داوای لێخۆشبوونی بۆ بكات لە لای سوڵتان عەبدولعەزیز (1961ـ 1976ز)و ئازادی بكات، لە كاتی ئەو هەوڵەدا عومەر پاشا تەمەنی (17) ساڵان بووە، خۆزگەكانی پێش مەحمود بەگی خستبوو، ئیبراهیم پاشا كە هێشتا لاو بوو خێزانەكەی كچی سەرۆكی هۆزی (تەی) بوو، كە دەبووە سەرۆكی هۆزی میللیی و وەكو سەرۆكێكی بە توانا و بە ماوەیەكی كەم بە هۆی دەوڵەمەندیەكەیەوە توانی شكۆی هۆزی میللیی بگێڕێتەوە304. دكتۆر عوسمان ئەبوبەكر لەسەر زاری مارك سایكس كە ماوەیەك میوانی ئیبراهیم پاشا بووە، ئەوها باسی كردووە: (پیاوێكی بالابەرز و ناوقەد باریك و رووخسار كوردانە بووە، دوو چاوی كاریگەر و وریا و درەوشاوەی هەبوون، چەناگە بەرز و زار فراوان، لە كاتی قسەكردنیدا تێگەیشتم پاشا بە وردیی ئاگاداری كاروبار و رووداوەكانی ئەوروپایە، لەوانە پەیوەندیی ئینگلتەرە و ئێرلەندە و شتی تر، دیارە لە چەندین سەرچاوەوە زانیاریی پێدەگات، سەرەڕای ئەمە ژمارەیەكی زۆری رۆژنامەكانی توركیای لابوو، ئەو خەڵكانەش لە دەوری بوون لە ڕەگەز و مەزهەبەكانی توركیا بوون، ئیبراهیم پاشا كەسایەتیەكی سەرنجڕاكێش بوو، فەرماندەیەكی ئاسایی و پیاوێكی زۆر بە توانا بوو بەسەر خۆیدا، ئەمەش بە خەسڵەتی ئەو پیاوانە دەچوو كە زۆر لە لایەنە قورس و دژوارەكانی ژیانیان تاقی كردبێتەوە، بە خاسیەتە زیندووەكانی ئەلوەرویكی ئینگلیزی (بارون)مان پێوە دەبینی، لەو كەسانە بووە شوێنێكی نزیكیان بۆ خۆیان هەتا لە توركیاش دەست نەكەوتووە، بارونی دەرەبەگ و دیكتاتۆری رۆژهەلاتی و سەرۆكی كۆچەرانم لەو پیاوەدا بەدی كرد، لە نێو خێوەتگای ناو

ـ304 احمد عثمان ابوبكر: اكراد الملی و ابراهیم باشا، بغداد 1973، ص32-25.

سەربازگەکەیدا هەندێ لایەنی ژیانی سەربازگەکانی تەیمور و ئەتیلامان دەبینی، لە بەرزبوونەوەی بۆ سەرۆکایەتی هەندێ رووخساری عوسمانییەکانی بەرایی پێوە دیاربوو، لە هێز و لاوازیی هەندێ خاسیەتی بە میرداد دەچوو)[305].

ئەستێرەی ئیبراهیم پاشا لە دوای شەڕی عوسمانیی - رووسیی بە درەوشاوەیی بەدیار کەوت، بۆ بنیاتنانی میرنشینەکەی پشتی بە سێ کۆڵەکە بەستبوو، ئەوانیش: راستگۆیی لەگەڵ بەهێز، رازیکردنی لاواز، ترساندنی زۆر لاواز هەتا رادەی سەرپێشۆڕ کردن، بۆ نموونە بە هاوپەیمانییەتی چەرکەسەکانی (سەرووکانی - راس العین) سەدان کەس لە باشترین چەکداری رۆژهەڵاتی بۆ ئەو هێزە حەمیدیە زیاد کرد کە لە ژێر فەرمانیدا بوون) دوایی کەوتە پیادەکردنی سیاسەتی گۆچان و لاواندنەوە لەگەڵ هۆزە کورد و عەرەبەکانی نێوان دیاربەکر و ئۆرفە، بەڵام دەستی بە کوشتن و دەرکردنی کۆچەر و هۆزە عەرەبیە کۆچەریەکانی وەکو عەترە و شەممەڕ، لە بەرانبەردا کچی شێخی (تەی) ئازاو گورج و گۆڵی خواست، بەمەش پڕۆژەی ئەو هۆزە کوردیی و عەرەبییانەی لە باریەك برد کە بەربەرەکانیان دەکرد، بەتایبەت هۆزی بەرازی، رێگەی لە پیاوماقوڵانی دیاربەکر و ئورفە و حەلەبی ناحەزی گرت کە بۆی لە سەنگەردابوون و باجیان نەدەدا و باجیشیان سەپاندبوو بەسەر کاروانەکان، بەپێی راپۆرتی قونسوڵیەکانی رووس و ئینگلیز، ئیبراهیم پاشا لە ناوچەکە تاکە دەسەڵاتداری ویلایەتەکانی دیاربەکر و ئورفە و حەلەب و ماردین بووە، فەرماندە ئیدارییەکان بە ڕەزامەندیی ئەو دانراون و کەس غیرەتی نەکردووە لە گوێڕایەڵی ئەو دەرچێت[306]. لە کۆی (7) لیوای حەمیدیە سەرکردایەتی (5) لیوای کردووە، ئەمەش هێزێکی گەورە بووە، هەر لیوایەکی حەمیدیە لە (1000) تا (1200) چەکداری هەبووە، بۆیە سوڵتان عەبدولحەمید نازناوی (میری میران)ی لێنابوو، پەیوەندیی تایبەتی هەبووە بە کۆشکی یەڵدز (بارەگای سوڵتان)و بەڕێوەبەرایەتی مابینی بە بایەخ[307]. سەرەڕای ئەمانە لە

[305] - احمد عيمان: المصدر السابق، ص41.

[306] - لازاريف: ل62.

[307] - Sevket Beysanogu Diyarbekir Tarihi (Diyarbakir: Diyarbakir Kultur Ve Sanat Yayinlari'1996),2 Cilt'pp.747-748.

دوای سوڵتان، دووەم دەوڵەمەندی عوسمانیی بووە، خواستی سیاسییی و سەربازیی و ئابووریی بەهێزی هەبووە، بۆ بنیاتنانی میرنشینەکەی[308]. بە پێچەوانەی ئەو قسانەی لەسەر دەمارگیریی ئیبراهیم پاشا کراوە، ئەرمەن و یەزیدیی و عەلی ئیلاهیەکانی دەرسیم، هەموو لێی نزیکبوونەوە و هانیداون لە ویرانشارو گوندەکانی دەوروبەری نیشتەجێ بن کە گەشەسەندنێکی گەورەی پێوە دیار بووە، ئیبراهیم پاشا (400) گوندی ئاوەدانی لە دەوروبەری ویرانشار رازاندبۆوە، پێگەی لە هەندێ لە گوندەکانی ئازربایجانیش نزیك ببۆوە، بە پێچەوانەی ئەوەی دەوترێ لەسەر رێگریی و تالآنیی و سەپاندنی باج بەسەر کاروانەکاندا، ئەم زۆر سوور بووە لەسەر ئاسایش و ئۆقرەیی ناوچەکە، لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان خەڵکی هێناوە و لە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی خۆی نیشتەجێی کردوون و کار و کاسبی بۆ دۆزیونەتەوە، یان ئامۆژگاریان لێوەرگرتووە. دکتۆر ئەحمەد عوسمان لە (بەهجەت ئەسەری)یەوە دەگێڕێتەوە، کە لەو کاتەی هەواڵی دادگەریی گەیشتە مەدائن و رەها (ئورفە)و داربەکر، رۆڵەی مەسیحی و موسڵمان پۆل پۆل بە منداڵەوە بەرەو وێرانشاری ناوەندی گردبوونەوەکەی رۆیشتن و لەوێ نیشتەجێ بوون، بە دڵنیایی لە سەروەت و سامانەکانیان بازرگانیان کردووە[309].

پەیوەندیی نێوان ئیبراهیم پاشا و سوڵتان عەبدولحەمید زۆر بەهێز بووە، بە ئەندازەیەك پەیوەندیی راستەوخۆ هەبووە لە نێوانیاندا، سوڵتان، ئیبراهیم پاشای بە نزیکترین کەس لە خۆی زانیوە و پێیوتووە: "ئیبراهیم پاشای کوڕم". کاربەدەستانی تورك و پیاوماقوڵانی دیاربەکر سەرسەختترین دوژمنی ئەو بوون، فڕوفێڵیان بۆ دانابوو بەلای خۆیانی رابکێشن، بەڵام بێئاکام بووە، بۆ نموونە خەڵکیان هانداوە خۆپیشاندان لە دژی ئەو بکەن، لە ساڵی (1907) نووسینگەی (والی)یان داگیر کرد لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی پۆستە، داوایان لە حکومەت کرد سنوورێك دابنێ بۆ ئەو شاڵاوی تالآن و فڕاندانەی تووشی کاروانە بازرگانییەکانی نێوان حەڵەب و دیاربەکر هاتووە لەسەر دەستی سوارەکانی حەمیدیەی سەر بە ئیبراهیم پاشا، سوڵتان لیژنەیەکی بۆ

---

[308] - احمد عثمان: المصدر السابق، ص48.

[309] - احمد عثمان: سەرچاوەی پێشوو، ل49.

لێکۆڵینەوە نارد و دەرکەوت لایەنگرانی ئیبراهیم پاشا بێتاوانن، لە بەرانبەر ئەمەدا سوڵتان ڕێزی لێنا و دیاریی و نازناوی پێدا، دوایی دەرکەوت ئەندامانی ئیتیحادو تەرەقی بە سەرۆکایەتی زیا کوک ئەلپ بە نهێنی خەڵکیان لە دژی ئیبراهیم پاشا هانداوە، چونکە پەیوەندیی بەهێزی هەبووە لەگەڵ سوڵتان[310]. قونسوڵی بەریتانی دەڵی: "دوای ئەوەی ئیتیحادیەکان سوڵتان عەبدولحەمیدیان لابرد، لە کارە پێشینەکانینان زاڵ بوون بووە بەسەر ئیبراهیم پاشا[311].

هەندێ پێیان وابووە ئیبراهیم پاشا ئامرازێك نەبووە بەدەست سوڵتان بۆ ترساندنی ئەرمەن و ناحەزەکانی سوڵتان، بەڵکو لە سایەی سوڵتان هەوڵیداوە حکومەتێکی کوردیی بە سەرۆکایەتی خۆی دابمەزرێنێ، بۆ نموونە لە ساڵی (1908) لەو کاتەی مارك سایکس پسپۆڕی بەریتانی سەردانی ناوچەکەی کردووە، ئیبراهیم پاشا پێی وتووە: پشتیوانیتان لە شێخی کوێت کرد بۆ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی، بۆچی پشتیوانی لە منیش ناکەن، خۆ هەمان هەڵوێستم دەبێت، ئێمەی کورد ئامادەین لەگەڵتان کار بکەین و من ئامادەم لەگەڵتان بێم بۆ بەریتانیا هەتا هەڵوێستی خۆمان بۆ پاشای بەریتانیا ڕوون بکەمەوە[312]. ئیبراهیم پاشا ڕازی نەبوو هێزی حەمیدیەی خۆی بنێرێ بۆ یەمەن و هەڕەشەی کردبوو ئەگەر ئەو فەرمانەی بەسەردا بسەپێندریت هەڵدەگەڕێتەوە، بە پێی ڕاپۆرتەکانی قونسوڵی رووسیی لە دیاربەکر کورد بە گشتیی رێز و خۆشەویستیان بۆ ئیبراهیم پاشا زیاتر بووە لە سوڵتان[313].

لە کاتی هاتنی ئیتیحادیەکان و ڕاگەیاندنی دەستوور و سنووردانان بۆ سوڵتان، ئیبراهیم پاشا بەڕێوەبوو بۆ دیمەشق بۆ سەرکۆنەکردنی ئەو هۆزانەی گرفتیان درووست دەکرد بۆ هێڵی ئاسنی سوریا ـ حیجاز، لەو کاتە هەستی بە بەرپرسیاریەتی کرد بەرانبەر شەریعەت و سوڵتان و شۆڕشی دژی ئیتیحادیەکان ڕاگەیاند، ئەو دەیویست سوریا بکاتە بنکەی چالاکیەکانی دژ بە ئیتیحادیەکان، پێنج هەزار سوارەی حەمیدیەی لە دەوری

---

310 -Beysanogu Diyarbekir Tarih,2 Clit,sayfa'.748.

311-- Fo.881/9458j.No.11693

312 - Cabinet 27/206 “British Desiderata in Turkey in Asia Minor”Report.Appendex iv ‘March 15’1915’p.101

313 - لازاریف: ل183

خۆی کۆکردەوە، لە تەواوکردنی گەشتەکەی دا بوو، لە حەلەبەوە بۆ دیمەشق، خەڵکی شار بەو پەڕی ڕێزەوە پێشوازییان لێکرد، بە چەند ڕۆژێك ناوچەکانی نێوان ئازەربایجان و دێرئەلزوور کەوتنە بن دەستی ئیبراهیم پاشا، بەڵام حکومەت هانی هۆزە عەرەبەکان و هێزێکی گەورەی حەمیدیەی دا هێرش بەرنە سەر وێرانشار، ئەویش بڕیاری گەڕانەوەی دا و هەواڵی بە کوڕەکانی گەیاند بە هێزێکی حەمیدیەوە لە دەرەوەی وێرانشار پەیوەندیی پێوە بکەن، شەڕێکی گەورەیان لە نزیك وێرانشار تووش بوو، هێزەکانی حکومەت شکان و (300) کوژراو و بریندارایان بەجێهێشت، دوای گەیشتنی هێزی پشتیوان، ئیبراهیم پاشا لە چەند لاوە گەمارۆ درا، ناچار بوو بە ئاڕاستەی چیاکانی دەوروبەری ژەنگار بکشێتەوە و لەوێ سەنگەر بگرێ، ئەو چاوەڕوانی پشتیوانیی بوو لە یەزیدیە هاوپەیمانەکانیی، بەڵام ئەوان خیانەتیان لێکرد، ناچار بە ئاڕاستەی ئورفە گەڕایەوە و لەوێ لە ناوچەیەك بە ناوی عەبدولعەزیز لەگەڵ هێزەکانی حکومەت تێکگیران و ئیبراهیم پاشا لەوێ مرد، هەیە دەڵێ: دڵی وەستاوە و گێڕانەوەی تر هەیە دەڵێ تووشی (دیزانێری) بووە، هەیە دەڵێ: لە شەڕەکەدا کوژراوە، یان لە بارێکی لێڵدا دەرمانخواردو کراوە، لە دوای مردنی (5) هەزار کەس لە سوارەکانی تەسلیم بوونەوە[314]. لێرەدا لە دەستنووسەکەی رەحمەتیی (بەهجەت ئەسەری) هەندێ بڕگەی درێژ دەهێنینەوە کە دکتۆر ئەحمەد عوسمان هێناویەتەوە:

ئیبراهیم پاشای خوا لێخۆشبوو لە دوای سوڵتان دووەم پیاوی دەوڵەمەندی خۆرهەڵات بووە، باڵی کێشا بوو بەسەر هەموو هۆزەکانی عەرەب و کوردەکانی میللیی لە میزۆپۆتامیا و کوردستان، هەموو ساڵێك دیاری بە نرخی وەکو رۆن و توتن و زێڕ کە بەهاکەی دوو هەزار جونەیهی بووە ناردۆتە کۆشکی یەڵدزی سوڵتان، بەڵام چاوچنۆکان ئارەزوویان بووە لە دەرفەتێکدا دەست بەسەر خەزێنەی خوا لێخۆشبوودا بگرن و لە نێوان خۆیاندا دابەشی بکەن، سکیان لە ئاڵتوونی ناسك پڕ بکەن، بەڵام خۆشەویستیی سوڵتان عەبدولحەمید بۆ ئەو پیاوە بە جۆرێ بووە لە بۆنە فەرمیی و شوێنە تایبەتیەکاندا بە کوڕی خۆی ناوبردووە، ئەمە بەس بووە بۆ بەرپەچدانەوەی ئەو چاوچنۆکانە، کەچی ئیتیحادیەکان دوای دانانی میزانییەی حکومەت بەشی ئارەزووی

---

[314] - كمال مظهر احمد: كردستان فى سنوات الحرب العالمية الاولى، ص97-98.

خۆیان دیاریکرد و دەستیان کرد بە دزی لە دارایی دەوڵەت، ئیبراهیم پاشا بە فەرمانی سوڵتان عەبدلحەمید لەگەڵ هەشت سەد لە سوارەکانی دەچووە پاراستنی هێڵی حیجازی حەمیدیە.

ئیبراهیم پاشا سیاسییەکی شارەزا بوو بۆیە لە شەڕی حکومەت دڵنیا نەبوو، لەگەڵ خۆیدا بە پێنچ هەزار سوارەی تیر بە دەست هەموو خاکی وێرانشار و شاری رەهاو تەرابلسی بڕی، کە چووە ناو شاری حەلەب لە لایەن والی و خەڵك و پیاوماقوڵانی هەرێمەکەوە پێشوازیی گەرم کران... لەوێ دڵی خەبەری دابوو شتێك روو دەدات، پازدە رۆژ بەسەر گەشتەکەیدا تێنەپەڕی بوو دوو نامەی لە نەزارەتی جەنگ و ناوخۆوە پێگەیشت، داوای لێکرابوو بە خێرایی بەرەو دیمەشق بڕوات، لەوێ ئاهەنگی بەخێرهاتنی بۆ رێکخراوە..بەڵام هەردوو باڵیۆزخانەی دەوڵەتی گەورەی ئینگلتەرا و فەڕەنسا لە ئاستانە لە فێڵی کۆمەڵەی ئیئتیلاف ناوبراو ئاگاداربوون، بە تەلەگراف قونسوڵیەتی خۆیان لە شام ئاگادار کردەوە کە بە جوفرەی نهێنی ئیبراهیم پاشا ئاگادار بکرێتەوە... بۆ رۆژی دووەم ئیبراهیم پاشا چووە خانەی هەردوو قونسوڵیە، لەوێ مەبەستی خراپی کۆمەڵەی بەرانبەر خۆی بۆ دەرکەوت... بیری کردەوە چۆن خەتی گەڕانەوە بۆ نیشتمان و ناو هۆزەکەی دیاریی بکات و خۆی ئامادە بکات بۆ شەڕ و بەرگریی بەرانبەر هێزەی ئامادەکراوی ئیتیحادیەکان، بەشێك لە سوارەکانی ناردەوە بۆ وێرانشار، رای سپاردن هەواڵی مەبەستی ئیتیحادیەکان بدەنە منداڵەکانی و خۆیان بۆ دەربازبوون لە شەڕی ئیتیحادیەکان ئامادە بکەن، لە کاتێکدا لە وێرانشار کۆگایەکی پڕ لە چەك و جبەخانەی شەڕی هەبوو، خۆی و ئیسماعیل بەگی کوڕی لە شام بیست و چوار رۆژ مانەوە.... هەتا حکومەت دڵنیا بێت لەسەر فەرمانی خۆیەتی و لە دوای چەکدارکردنی چوار سەد لە سوارە کوردەکانی بە تفەنگی (ماوزەڕ) رەوانەی حیجازی کردن... لە نیوەی شەودا ئەو دوو قونسوڵیەی ئاماژەمان پێدان هەواڵیان دایە کە والی ناوبراو بەیانی لە بارەگای حکومەت لە خزمەت خۆی و کوڕەکەی دایە بۆ قاوە خواردنەوە، بەڵام کاتێك بەرەو شوێنی دیارییکرا و چوو بینی سەربازەکانی کۆمەڵە بە چەکەوە و بە سواری ئەسپەوە لەوێن... خۆی و کوڕەکەی و سوارەکانی کە ژمارەیان چوار هەزار و پێنچ سەد سوارە دەبوو گەڕانەوە و شامیان بڕی.. کاتێك گەیشتنە گوندێکی رۆژهەڵاتی حەڵەب تووشی بەدرخان بەگ و ژمارەیەکی کەم لە سەربازەکانی بوون، ئەو سوێندی بۆ

خواردن كه باشترین یارمەتیدەری دەبێت لای حكومەت، بەو مەرجەی چەكەكانی تەسلیم بكات، گوێی بە قسەكانی نەدا و ڕێگەی بڕی و گەیشتە مەسكەنە، لە فوراتەوە پەڕیەوە و بە (ڕەها)دا تێپەڕی، تووشی هۆزی بەرازی و سوپا بوو، شەڕ لە نێوانیان روویدا، لە جەزیرەوە گەیشتە مندالەكانی، لە خێوەتگایەكی دەرەوەی وێرانشار تووشی چوار هەزار سەربازی تورك بوو، دوو هەزار لە دیاربەكر و دوو هەزار لە سیواس، ئەوانە بە دوای بەگەكانی عەبدولحەمیدەوە بوون، خەلیل و عەبدوڕڕەحمان كوڕانی پاشا بۆ دیارخستنی ئەو زێڕەی لە ناو سندوق دانراوە.. شەڕی گەرم لە نێوان هەردوولا هەڵگیرسا، پێكدادانی دوورو درێژ پێنج شەو و ڕۆژی خایاند، ناچاری چەك تەسلیم كردن بوون و لە ناوچەكە دەرچوون، بە نووشستی و تێكشكاوی چوار سەد كوژراویان دا، نامەیەكی بۆ والی دیاربەكر نارد و ئاكامی شەڕەكەی بۆ باس كرد، والی هەواڵی دا بە كۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی كە بە ڕێگەی برووسكە فەرمانی دا بە فەرماندە سەربازییەكان بە سی و پێنج هەزار سەربازەوە بۆی بچن كە ئەوانیش سی و پێنج تفەنگیان پێبوو، كاتێ كەوتنە هێرش بردن كوڕانی پاشا شەش سەد جەنگاوەریان لەگەڵ بوو، لە لای رووباری جەرجیب لە نێوان وێراشار و نەبی ئەیوب بە یەكگەیشتن، رووی چەكەكانیان كردە یەكتر و تەواوی ئەو ڕۆژە شەڕ بوو، كوشتاری زۆر لە هەردوولا هەبوو، سوارەكان دوو ڕۆژی تەواو بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشتن و سەربازەكان بە دوایانەوە بوون هەتا گەیشتنە رووباری زوركان لە نێوان قەسری حوسەین و گردە ڕەشەی سەر ڕێگەی ژەنگار، هەروەها لە ڕێگە بەرەنگاری شێخی شەممەری یاخی بۆوە، لە دوای شەڕ و تێكشكانی ئەمان دوو ڕۆژی تر بەڕێوە بوو هەتا گەیشتە رووباری سەیفیەی نێوان گردە ڕەشە و حەسبە لەوێ ئیبراهیم پاشا مردێ، سوپایەكەی پاشا بەڕێوە بەرەو گردە ڕەشە و خاتوونییە خۆیان سازدابوو بگەنە چیای ژەنگار، بەڵام هۆزی یەزیدیەكان بەرەنگاریان بوونەوە و زۆریان لێ كوشتن، هەتا بەرەو باكوور ڕۆیشتن و گەیشتنە ئەوێ، سەربازەكان بە چەكەوە گەیشتن و دەورەیان دان و ناچاركران خۆ بەدەستەوە بدەن)[315].

گریمان ئەو دەستنووسە ڕاستە، بەڵام كۆمەڵێك پرسیار دێتە پێشەوە، ئەویش بۆچی ئیبراهیم پاشا سوریای نەكردە بنكەیەكی گرنگی جوڵانەوەكەی؟ بۆچی هەردوو

---

[315] - احمد عثمان: سەرچاوەی پێشوو، ص48-56.

قونسوڵی بەریتانی و فەڕەنسی پێکەوە هەواڵی پیلانی ئیتیحادیەکان دەدەنە ئیبراهیم پاشایەك کە ناسراوە بە ملکەچیی بۆ سوڵتان؟، لە دوای مردنی ئیبراهیم پاشا هۆزی میللیی تووشی ئەوپەڕی وێرانیی بوو، هێزی ئیتیحادیەکان ئەو هەموو زێڕ و پارە هەڵگیراوەی ئیبراهیم پاشایان زەوت کرد کە لە ناو سندوق لە ژێر زەوی شاردبوویەوە، هەروەها لەگەڵ زیاتر لە (1500) سەر مەڕ و سەدان ئێستر و قەڵا دەستیان بەسەردا گیرا، خزم و کەسی ئەویان لە تاڕاوگەش لە شارەکانی موناستەر و سولانیك و ئەستەنبوڵ دەرپەڕاند، هەروەها دادگایی رووکەشانەیان دانا بۆ کوڕەکانی ئیبراهیم پاشا و زۆربەیان هاویشتنە گرتووخانە، عەبدولحەمیدی کوڕیان لە گرتووخانە دەرمانخواردو کرد، گەورە و بازرگانەکانی دیاربەکر و حەلەب و ئورفە و ماردین کە لە سیاسەتی ئیبراهیم پاشا زەرەرمەندبوون، ئەمەیان بە دەرفەت زانی کەوتنە تۆمارکردنی سکاڵا لەسەر کوڕەکانی ئیبراهیم پاشا، بە ئاماژەی ئیتیحادیەکان لە ساڵی (1909ز) هۆزە کوردیەکانی وەکو بەرازی و کراکاجی و هۆزە عەرەبیەکانی وەکو سایە و شەمەڕ و عەترە و جەیس هێزێکی (10000) کەسیان پێکهێنا و هێرشیان کردە سەر هۆزی میللیی و گوندەکانیان تاڵان کردن، جارێکی تریش کوڕەکانی برانەوە گرتووخانە و لە بەرانبەر دادگای عورفیی دادگایی کران، دیارە قونسوڵی بەریتانی لە دیاربەکر ئەوپەڕی ناڕەزایی لەو کارە دەربڕیوە و داوای لە بەرپرسان کردووە سنوورێك بۆ ئەو دەستدرێژیانە دابنێن. هەروەها داوای کردووە یارمەتی بەسەر زیانلێکەوتوانی وێرانشاردا دابەش بکرێ، خەنسە خانمی خێزانی ئیبراهیم پاشا لە دوای مێردەکەی سەرکردایەتی پاشماوەی هۆزەکەی کردووە و داواکاریی نووسیبوو بۆ بەڕێوەبەرایەتیە رەسمیی و قونسوڵیەکانی ئەورووپی و داوای بەردانی کوڕەکانی کردووە[316]. لە ساڵی (1912ز) کوڕە گەورەی ئیبراهیم پاشا لە بێرچك بە سەرۆکایەتی (4000) سوارەی حەمیدیەوە وەکو فەرماندەیەکی کورد و بەرهەڵستکاری ئیتیحادیەکان بەدیار کەوت، لە حەلەب ڤۆنتای قونسوڵی بەریتانی باس لە کوڕەکەی ئیبراهیم پاشا دەکات و زۆر لە باوکی بە رۆشنبیرتر و کارزانتر و بە تواناتری داناوە بۆ سەرکردایەتی کورد[317]. لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیی مەحمود پاشای ئیبراهیم پاشا یەکێك بووە لە گرنگترین پاڵێوراوەکانی

[316] - Fo 195/2317No.12Diarbekir,April 7,1909 British Vice Consul

[317] - Fo 195/2445,Kurds,Aleppo,December 1,1912; Enclosure. In Consul

بەریتانیا بۆ سەرکردایەتی کردنی دەوڵەتی کوردیی ئەگەر پێکبهێنرێ[318]. یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانیی لە دیاربەکر لەو باوەڕەدا بووە کەوتن و مردنی بزووتنەوی ئیبراهیم پاشا پشتیوانی مەعنەویی گەورە بووە بۆ دەسەڵاتی ئیتیحادیەکان لە کوردستان و فەوتانی کۆسپێکی گەورەی بەردەم رژێمی تازە بووە لە تورکیا[319].

بەڵگەنامەی سێیەم بایشان ئۆغلو لە کتێبی مێژووی دیاربەکر بڵاویکردۆتەوە و عارف بەرزنجی زادەی نوێنەری ئیتیحادیەکان لە دیاربەکر و ئەندامی ئەنجومەنی ئەو شارە ئاماژەی پێداوە، پێشتر لەگەڵ هێزەکانی حکومەت لە هێرش بۆ سەر ئیبراهیم پاشا لە وێرانشار بەشداریی کردبوو، ئەمە راستگۆی دەستنووسەکەی ئەسەریە، بەڵام لە چارەنووسی سامانەکەی ئیبراهیم پاشا جیاوازیی هەیە، عارف ئەفەندیی پڕوپاگەندەی ئەوە دەکات هێزەکانی عوسمانیی لە وێرانشار لەگەڵ ئیبراهیم پاشا بینیویانە، بەڵگەنامەکانیش دڵنیامان دەکەنەوە کە لە هەڵگەڕانەوەکەی دژی حکومەت دەستی لەگەڵ ئینگلیز و ئیتاڵیی و فەڕەنسیی تێکەڵ کردووە، ئایا ئەمە پشتگیریی نییە بۆ قسەکانی (ئەسەری)؟، کە ئەو دوو قونسوڵیەی باسمان کردوون پشتیوانییان لە ئیبراهیم پاشا کردووە، بەڵام حکومەتی ناوەندیی ئەو بەڵگەنامانەی لە بەرپرسانی وێرانشار ویستووە و سلێمان پاشا لەمە کەمتەرخەم بووە و خوی لێ گێل کردووە[320]. تاوانبارکردنی ئیبراهیم پاشا بە پیلانگێڕان لەگەڵ دەوڵەتانی ئەورووپیی دژی ئیتیحادیەکان لە مێژووی بزووتنەوەی کوردایەتی شتێکی تازە نییە، ئەمە لە کاتێکدا عارف ئەفەندیی ئەم شاهیدیەی لەو کاتە بۆ ئەنجومەنی نوێنەران داوە کە دەوڵەتە ئەوروپیەکان دوورگەی کریتیان داگیرکردووە و یارمەتیی گەلانی بەڵقانیان داوە بۆ جیابوونەوە لە دەوڵەتی عوسمانیی، لەو کاتەدا دەوڵەتی عوسمانیی نیگەرانیی زۆری هەبووە لە دەوڵەتانی ئەورووپیی و عارف ئەفەندیی ئەمەی بۆ دژایەتیکردنی دژەکانی بەکار هێناوە کە تاوانباری کردوون بە دزینی سامانێکی زۆری وێرانشار، بە قسەی عارف ئەفەندیی دوو ملیۆن لیرەی زێڕ و بەهای ملیۆنێك لیرە لە زێڕ و گەوهەر لە خەزێنەی وێرانشاردا بووە، خەنسەخانم و کوڕەکانی بەر لە گەیشتنی هێزەکانی حکومەت

---

[318] - Brueinessen

[319] -- F.O, 195/2317, EnclouserNo.1,ViceConsul Diarbekir,7, April, 1909

[320] - Sevket Beysanoglu Diyarbakir Taihi,2 celt Diarbekir: Kultur Ve Sanat Yayinlar 1996,p.751

شاردبوویانەوە، هەزاران تەن گەنم و کەرەستەی خۆراکی ئەمبارکراو لە (150) گوندی دەوروبەری وێرانشار هۆزە عەرەبەکان لەگەڵ هێزەکانی حکومەت لە کاتی هێرشەکەی سەر ئیبراهیم پاشا تاڵانیان کردووە[321]. ئەسەری بە دڵنیاییەوە دەڵێ: "هەموو شتەکان تاڵان کران، بەڵام بە هیچ شێوەیەك چاوەڕوانیی ئەوە لە سلێمان پاشای دڵڕەق لەسەر ئیبراهیم پاشا ناکرێ، ئەو بەڵگەنامانەی دوژمنەکەی ریسوا دەکەن بیانشارێتەوە، سەرەڕای ئەمە لە کاتی بزووتنەوەی ئیبراهیم پاشا پەیوەندیی ئیتیحادیەکان و بەریتانیا و فەڕەنسا لە مانگی هەنگوینیدا بووە، چاوەڕوانیی ئەوە ناکرێ ئەو دەوڵەتانە پشتیوانیی لە ئیبراهیم پاشایەك بکەن کە لای ئەوان بە کوشتنی ئەرمەن تاوانبار بووە، هەموو ئەو سەرچاوانەی باسمان کردن لە ناویاندا دەستنووس و بەڵگەنامەکانیش، ژمارەی جیاوازیان داوە لەسەر ژمارەی جەنگاوەر و کوژراو و برینداری هەردوولا. من هەموو نامە و بەڵگەنامەکانی بەریتانی پێوەندیدار بە ئەو بابەتەم تاوتوێ کرد و نەمتوانی سروشتی پەیوەندیی نێوان ئینگلیزو ئیبراهیم پاشا دیاری بکەم.

ئەگەر ویستمان بزووتنەوەی ئیبراهیم پاشا هەڵبسەنگێنین دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کە بزووتنەوەیەك بووە گوزارشتی لە قبووڵ نەکردنی کورد کردووە لە بەرانبەر سەپاندنی ئاکاری عەلمانییەتی ئیتیحادیەکان لە جیاتی شەریعەت و دەسەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمید لە کوردستان. بە هۆی تیپەکانی حەمیدیەوە کورد توانیبووی نەهێڵێ حکومەت مەرکەزیەت و تورکچیەتی بەسەر کوردستاندا بسەپێنێ، بۆیە تیپەکانی حەمیدیە بە ئاڕاستەی دژایەتی بزووتنەوەی کورد نەبووە، بەڵکو ئامرازێکی گرنگ بووە بۆ بەدەستهێنانی ئەندازەیەك لە حوکمی زاتی. بەبڕوای هەردوو مامۆستایان پرۆفیسۆر ئۆڵسنو وان برۆنسن ئیبراهیم پاشاو زۆربەی سەرکردەکانی ئازادیی (1923ـ 1925) سوارەی حەمیدیەن، لەگەڵ باوەڕی هەردوو مامۆستایان پرۆفیسۆر ئۆڵسن و ڤان برۆنسن ئەو لەشکرە ژمارەیەکی زۆری سەرکردەی مێژوویی (سیاسیی و سەربازیی) هاوچەرخی بۆ کورد پێگەیاندووە[322]. هەروەها زۆر لایەنی وێکچوو هەیە لە نێوان بزووتنەوەی ئیبراهیم پاشا و بزووتنەوەی مەلا سەلیم (1913)و شێخ عەبدوسسەلامی

321 - Beysanoglu,pp752-754

322 - Robert Olson, The Emergence of The Kurdish Nationalist Movement (Austin: Texas Univ. Press 1989, pp.211, Bruinssen. Pp.179-278
state, Utrecht, 1979,pp.278-27

بارزانی (1908ـ 1914) و شێخ سەعیدی پیران (1925)و مەلا خەلیلی مەنگوڕی بەوەی هەر هەموویان کۆکبوون لەسەر بەرگری لە شەریعەتو مەزلومیەتی کورد، هەموو ئەوانە بە سەرکردایەتی زانایانی ئیسلام و شێخانی تەریقەتی سۆفی بە شێوەیەکی ئێرتیجالی بووە لە دەوری کەسایەتی سەرکردە کۆبوونەتەوە و بە نەمانی سەرکردەش بزووتنەوەکەیان کۆتایی پێهاتووە.

## بەڵگەنامەی ژمارە (1)

عەریزەیەك بۆ/ غازی ئەدهەم پاشا، سەرۆکی بەڕێوەبەری نووسین لە کۆشك (کۆشکی سوڵتان عەبدولحەمید). لە کتێبی بێشان ئوغلو لاپەڕە (447) وەرگیراوە.

بەر لە دامەزراندنی سوپای نیزامیی عوسمانیی، بابو باپیرانمان لە خزمەتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوون (خوا تەمەنی درێژ بکاتەوە) بە سیفەتی سوارە (سباهی: هێزی سوارەی عوسمانی = دانەر)، لەو ماوەیەدا هۆزی میللیی شوانکارە و بە کولەمەرگیّ بە دوای بژێویدا بوون، بەڵام لە دوای راگەیاندنی سەربازی ئیلزامیی هەموومان وەکو سەرباز چووینە خزمەتکردن، ئێستاش هەندێکمان وەکو سەرباز خزمەت دەکەین و بەشێکی ترمان وەکو خۆبەخش لە پلە و پایەی جیاوازی سوپاو هەندێکی ترمان وەکو سەربازی یەدەك لە خزمەتداین، نەوەکانیشمان بە سیفەتی جیاواز لە هەموو سەربازگەکانی دەوڵەت خزمەت دەکەن، ئێستاش خۆمان و باپیرانمان هەر سەربازی دڵسۆزی دەوڵەتین، دڵسۆزیی و فیداکاریی لە پێناوی دەوڵەتی عوسمانیی بە دەمارماندا تێدەپەڕیّ و خۆشەویستیی نیشتمان لەگەڵ خوێنمان تێکەڵ بووە، ئەم نیشتمانە بەم خوێنە نەبێت پێش ناکەوێت، هەرکاتێکیش پێویستی بە ئێمە هەبێت وەکو سەربازی دڵسۆز لە خزمەتیداین، بەڵام ئێستا هۆزی میللیی وا ناسراوە کە بە تاڵان و زەوتکردنەوە خەریکە و لەسەر ئەو خزمەتەوە بوونەتە لەکەی شوورەیی بۆ لەشکری عوسمانیی، ئەوانە لەسەر تاڵانو زەوتکردن دەژین و چەکی ئەمانەتی حکومەتی پاشایەتی لە دژی سەربازی نیزامیی بەکاردەهێنن، ئەوانە گروپێکی یاخیی و شایانی نازناوی سەربازیی و شەرەفی سەربازیەتی نین.

ئیبراهیم پاشا لای ئێوە خۆی وەکو سەربازێکی دڵسۆز نیشان داوە، کە شاهید و پشتگیریی راپەڕینی هۆزە یەزیدیەکانی رۆژهەڵاتە، ئەو یەزیدیانەی بە خوێنی موسڵمانان

تینوون و بکوژی ئەفسەر (یۆزباشی)و بیست کەسن لە فەسیلەی سوارەی سەر بە ئۆرفەی ساڵی (1321)، هەروەها (حوسێن قونجو) لە هۆزی دینان (یەکێکە لە پشتیوانانی ئیبراهیم پاشای میللیی) پێشتر حەوت کەسی لە سەربازانی نیزامی ماردین لە (1328) کوشتووە. هەموو ئەو تاوانانەی لە تۆمارەکانی دەروازەی باڵا تۆمارکراوە، پێش دوو رۆژ دەستدرێژیان کردۆتە سەر جەندرمە و مەفرەزەیەکی ئێمە، هەموو ئەو دەستدرێژیە چەپەڵانەش لای شەرەفداران قبوڵ نییە.

ئیبراهیم پاشا دوژمنی ئاسایشی گشتیی و دوژمنی شێخ و سەید و زانا و هەموو خەڵکە، لەشکرە تایبەتیەکەی پەیرەوی نەرێتی پلەو پایەی سەربازیی ناکات و بە هیچ نیزامێکەوە پابەند نین، ئەمانە دزن و بێ دوودڵیی چەك لە دژی خەڵك و سوپای نیزامیی بەکاردەهێنن، لەبەر ئەم هۆیانەیە ئیبراهیم پاشا بە پاسەوانی نەفامیی دەژمێردرێت، بەڵکو خراپترە لە ئەبوجەهل.

ئیبراهیم پاشا منداڵەکانی نەناردۆتە قوتابخانە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دواکەوتوویی فیکریی و رێزی ئەو بۆ زانست و رۆشنبیریی، زۆر جار کوڕەکانی بەر لە تەمەنی نۆ ساڵیی کردۆتە فەرماندەی هێزێکی گەورە، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر دواکەوتوویی.

زاناو پیاوچاكو شێخەکان زۆر نیگەرانن لە هەڵسوکەوتەکانی ئیبراهیم پاشاو بە هەڕەشەی دەزانن بۆ سەر ئاسایش و ئاشتی ویلایەتەکانی ئورفە و دیاربەکر و ماردین، ئەو رێزە ناشایستەی لە ئیبراهیم پاشا دەگیرێ جێی گاڵتەو ناڕەزایی هاووڵاتیە دڵسۆزەکانە، وا لە ئیبراهیم پاشا دەکات لەسەر کارە دوژمنکارییەکانی بەردەوام بێت، بۆیە ئێمەی سەرباز و نەوەی سەربازان و کەسانی رووناکبیر وەکو فەرماندەی سوپا پیرۆزەکەمان داواتان لێدەکەین بۆ نەجاتی کەسایەتی سوپاو شەرەفی ئومەت خۆ لە ئیبراهیم پاشاو کوڕەکانی بە دوور بگرن.

بە ئیمزای (250) کەسایەتیی خەڵکی دیاربەکر،

لە ناویاندا زیا کۆك ئەلپ هەیە

ساڵی (1907ز)

# بەڵگەنامەی ژمارە (2)

گوتاری عارف ئەفەندی بەرزنجی زادە، نمایندەی دیاربەکر لە ئەنجومەنی نیشتمانی تورکی لەسەر بزووتنەوەی ئیبراهیم پاشای میللیی. ـ لە کتێبەکەی بیشان ئۆغلو وەرگیراوە.

هەر یەك هەفتە دوای راگەیاندنی شۆڕشی دەستووری (23ی تەموزی 1908ز دانەر) ئیبراهیم پاشای میللیی یاخیبوونی خۆی راگەیاندوە، لە کاتی راگەیاندنی دەستوور ئیبراهیم پاشا بەڕێوە بووە بچێت بۆ مەدینە، بەڵام لەگەڵ بیستنی هەواڵ ئاڵای یاخیبوونی بەرزکردەوە و گەڕایەوە وێرانشار، لەوێ سوپای نیزامیی عوسمانیی گەمارۆداو هەوڵی دا دەستی بەسەرا بگرێ، خەڵکی دیاربەکر بەم هەواڵە زۆر سەریان سوڕما، یەکسەر وەزیری جەنگی عوسمانیی ئاگاداریی دەرکرد بۆ سوپای یەدەك لە دیاربەکر، هەتا کات بەفیڕۆ نەدەن و چارەسەری گرفتی پێویستیەکانی وەکو پارەو تەقەمەنیی و پۆشاك بکەن بۆ بەتەنگەوەچوونی هێزە گەمارۆدراوەکەی وێرانشار، لەوکاتەدا هێزی یەدەك پێویست بوو، لەسەر ئارەزووی خەڵکی دیاربەکر و والیش هەر وای پێ چاك بوو رێوشوێنی خێرا بگیرێتەبەر، بۆ ئەو مەبەستە لەسەر داوای فەرماندەی سەربازیی لە ویلایەت و لقی دیاربەکری کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی سەرپەرشتیی ئامادەکردنی ئەو هێزە بۆ سەر ئیبراهیم پاشای یاخی بە من سپێردرا. رێکەوتین ناحیەی دێرك کە هەشت سەعاتەڕێ لە وێرانشارەوە دوورە، بکەینە مەڵبەندی ئەو هێزە حکومیانەی کار دەکەن بۆ سەر ئیبراهیم پاشا، ئەشراف و فەرمانبەرانی دیاربەکر بۆ بەجێهێنانی ئەو ئەرکە یارمەتیاندام، بە ماوەی دوو رۆژ توانیمان ئەو ئەرکە گرنگە ئەنجام بدەین و هێزی چەکدارمان لە خۆبەختکەران و سوپایەك بە قەوارەی (2000) چەکدار کۆکردەوە، ناسنامەو مەزبەتە تایبەتیەکانی خۆبەختکارانمان ناردە بەڕێوەبەرایەتی تەجنید، ئەوەی من ئاگادارم نوسخەی ئەسڵیی ئەو نووسراوانە لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوراقە لە ویلایەت، لە دوای ئاگاداریی بەرپرسان، بڕیاری ناردنی هێزەکانی یەدەك و خۆبەختکاران و پۆلیس لەگەڵ چەك و تەقەمەنیی پێویست دەرچوو بۆ دێرك.

لە دوای بڕیاری وەزارەتی جەنگ نزیکەی (3500) سەربازی خۆبەختکار و یەدەك کۆبوونەوە بۆ ئەوەی هێرش بەرنە سەر وێرانشار، ئەو هێزانە پێکهاتبوو لە (800)

سوارەی حەمیدیەی سەر بە کەتیبەی (47) لە نەوەی هوزی (تەی)و (200) خۆبەختکار لە سوارەی هۆزی (ئەزنناوەر)و (2500) سەرباز لە دیاربەکر و دێرك، هیچ پارە و گەنم لە ئەمباری دێرکدا نەبوو، بۆیە بە خێرایی دەستم کرد بە گەنم کڕین، دەسەڵاتدارانی حکومیی پێیان وتین پارەتان لە ماردینەوە بۆ دەنێرین، هەتا گەیشتنی ئەو پارەیە داوایان لێکردم کارەکان ڕێکبخەم.

لە دیاربەکرەوە یەك ئۆقچەش نەگەیشت، ئەو هەموو سەربازەش کۆببۆوە و پێویستیان بە کەسێك هەبووە پارەیان بۆ دابین بکات، بڕیارمدا بەرەنگاریی ئەو کێشەیە ببمەوە و بە عەزیمەت بووم هەتا بۆ ئەو مەبەستە هەندێ کۆمەکیی خەڵك گەیشت.

دوو ڕۆژ دوای گەیشتنی سەرتیپ ئەمین پاشا بۆ دێرك و لە ژێر فشاری هێزەکانی نیزامیی حکومەت، ئیبراهیم پاشای یاخیی ناچار کرا لە ژێر فشار هەڵبێ و لە گوندی (قەسری حوسێن قۆنجۆ) کە چوار سەعاتەڕێ لە دێرك دووره سەنگەر بگرێ، دوایی سەرتیپ ئەمین پاشا بەو هێزە نیزامیەی لەگەڵیدا بوو هێرشی کردە سەر گوندی (دێشێ)ی نزیك گوندی (هیلالی)، لەوێ نامەیەکی بۆ ئیبراهیم پاشا نووسی و داوای لێکرد بە هەموو ئەو چەکە حکومیانەی لەلایەتی خۆی بەدەستەوە بدات، لە وەڵامی نامەکەدا وتبووی: (من ئامادەی دادگایی کردنم لە بەرانبەر ئەنجومەن ـ پەرلەمان ـ ی ئەستەنبوڵ، بەڵام ئامادە نیم چەکەکان بدەمەوە). دوای دوو سەعات لە وەرگرتنی ئەو وەڵامە ئیبراهیم پاشا لەگەڵ (1000) لە چەکدارەکانی وێرانشاری بەجێهێشت و بەرەو شەنگال چوو.

دوای دوو ڕۆژ هێزەکانمان گەیشتنە قەڵای (حوسێن قۆنجو)، ئەمین پاشا دوو فەسیلەی نارد بۆ پاسەوانی (100) ڕەشماڵ نشینانەی ئەو ئێزیدیانەی دوو سەعاتەڕێ لە هیلالییەوە دوور بوون، بەڵام بە فەرمانی وەزارەتی جەنگ هێزەکانی حەمیدیەی فەسیلەی (44)ی سەر بە هۆزی قەرەقاج و هەزاران چەکداری عەرەب لە هۆزە چەکدارەکانی عەرەبی وەکو شەممەر و عەترە کەلوپەل و مەڕ و ماڵاتی وێرانشار و دەورووبەریان تاڵان کرد، بۆ ڕۆژی دوایی هێزەکانی یەدەك کەوتنە تاڵانکردنی ئەو ڕەشماڵە ئێزیدیانەی لە سەرەوە باسمان کرد، کارێکیان بەسەر هێنان مەڕو ماڵاتیان لە بیر نەما، ئەمین پاشا دەستبەجێ فەرماندەی ئەو یەکە سەربازیانەی کۆکردەوەو داوای

لێکردن کەلوپەلو تالانییەکان بگەڕێننەوە، بەشێکی سامانو ئەسپە گرانبەهاکان درانەوە بە خاوەنەکانیان.

بە پسولە لە سندوقی ژیاندنەوەی تایبەتی (الاعاشه الخاصه) نانو یارمەتیی و خۆراکم دا بە هێزەکانی نیزامی و پسولەکەم لێوەرگرتنو گەڕامەوە دێرك، لەوێ کۆبوونەوەمان لەگەڵ (تیپی هێزی نیزامیو هێزی یەدەكو چوار تیپی سوارەی نیزامی کە لە وێرانشار دەگەڕانەوە) کرد، سەربازەکان بەرپرسیاربوون لە قەدەغەکردنو گەڕانەوەی دەستکەوت، دەبوایە لە پێش هەموان لەشکرەکە لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکرایەو من لەوەدا بەرپرسیار نەبووم.

بڕیارماندا دەستکەوتەکان بگەڕێنینەوە، ئەمەش جێی داخ بوو، بە هۆی بەرپرسیایەتیەکەمەوە لەسەر رووداوەکە نامەم بۆ قەڵەمی ویلایەت نووسیو نوێنەرێکم بۆ خۆم داناو گەڕامەوە بۆ دیاربەکر، ئەمەش (20) رۆژی خایاند، قەڵەمی ویلایەت لە (16)ی ئەیلولی (1908) دانەیەکی لەو کاغەزەو بەڵگەنامەکان بە لاسلکیی نارد بۆ وەزارەتی ناوخۆ، بە فەرمانی هەردوو وەزارەتی ناوخۆو جەنگ چەندین لیژنەیان نارد بۆ گەڕاندنەوەی (مەڕو ماڵاتو سامان)ە تالانکراوەکان.

لەگەڵ ئەوەدا من رۆڵم هەبووە لە وەرگرتنی ئەو دەستکەوتانە، بەڵام ئازا نەبووم لە خستنەڕووی سکاڵانامە لە دژی ئەو ئەفسەرو ئاغا کوردانەی کە هاوبەشییان کردبوو لە تالان و زەوتکردن.

لە دوای گەڕانەوەم لە دێرك، هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نوێنەران دەستی پێکرد، لە کۆی (58) دەنگ (42) دەنگم بەدەستهێنا، بە زۆرینەی دەنگ دەرچووم بۆ ئەنجومەنو بەرەو خانەی بەختیار (دار السعاده) لە ئەستەنبوڵ بەڕێکەوتم، لە دوای هەڵبژاردنم کۆمەڵێك سکاڵام لە دژی تۆمار کرا، هەندێ لەو کەسانەی سکاڵایان تۆمارکردبوو لەو زیانلێکەوتوانە بوون لە کاتی بەرپرسیاریەتیم لە سەرۆکی شارەوانی دیاربەکر تا تەمووزی ساڵی رابردوو لێپرسینەوەم لەگەڵدا کردبوون، هەندێکی تر لەوانەی سکاڵایان نووسیبوو لەو هێرشەی کردمانە سەر ئیبراهیم پاشای یاخیی بەشداربوون لەگەڵمدا، بەڵام دەنگی پێویستیان بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران نەهێنابوو، نەمویست وەڵامیان بدەمەوە، چونکە خۆم نەهێنایە ئاستی ئەوانو بۆ کاتی گونجاو وازم لێهێنان، شتێکی ئاساییە گەندەڵو دەروون نەخۆشەکان بۆ تێکشکاندنی من یەکبگرن.

سەبارەت بەقسەی من لەسەر میوانەکانی جەزیرەو چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا، کە پێشتر ئاماژەم پێدا بوو ئەوانە چۆن هاتوونەتە دانیشتنی ئێمە بۆ دۆزینەوەی کۆمەڵێك بەڵگەنامە لە بارەگای ئیبراهیم پاشا لە وێرانشار کە ئاماژە هەیە بە پەیوەندیی نێوان ئیبراهیم پاشاو سەرانی دیکتاتۆر "مەبەست لە لایەنگرانی سوڵتان عەبدولحەمیدە"و هێزە داگیرکەرەکانی دورگەی کریت "ئیتالیاو بەریتانیاو فەڕنسا"، هەر لەو کاتە من داوام لە والی کرد کەمتەرخەمیی نەکاتو ئەو بەڵگەنامانە بنێرێ بۆ ئەستەنبوڵ، بەڵام ئەو لە وەڵامی داوایەکەی ئەنجومەنی نوێنەراندا وتبووی: "هیچ بەڵگەنامەیەکی لەو جۆرەی تیا نییە کە عارف ئەفەندی ئاماژەی پێداوە"، داوای لە ئەنجومەنی کارگێڕییو خەڵکی وێرانشار کردبوو لەو بارەیەوە سکاڵا بنووسن، بەڵام ئەوان دۆستو لایەنگری من بوون و وەڵامی ئەو قسانەی ئەویان نەدابۆوە، کە لە بنەڕەتەوە پێچەوانەی راستیەکان بووە.

وەکو دەڵێن (قەدری پاشا)ی قائیمقامی وێرانشار ئەو بەڵگەنامانەی دەستکەوتووە، بەڵام نازانم ئێستا ئەو بەڵگەنامانە لە کوێن، هەموو لایەکیش شاهیدی پاکیی و بێتاوانیی منن، سەرتیپ ئەمین پاشاو والی نامەیان بۆ وەزارەتی جەنگ و ناوخۆ نووسیووەو منیان تاوانبار کردووە، بەڵام بێئاکام بووە، لە کاتێکدا وەزیری ناوخۆ (هەقی بەگی) کردووە بە والی دیاربەکر، ئێستا پیاوێکی عەسکەریی و دیکتاتۆرەو دانانی ئەو پیاوە کارێکی چاك نەبوو کە دەتوانن راستیی ئەو مەسەلەیە لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی پیاوماقوڵان ببیستن، تا سەر ئەو راستییە ون نابێت و لای هەموو کەس ئاشکرایە بە درێژایی چالاکییە سەربازییەکان نەچووم بۆ وێرانشارو بە درێژایی ئەو ماوەیە لە گوند ماومەتەوەو ئێستا ئەم بوختانە لێ دەگەڕێم بۆ رای گشتیی، لە بەردەم دادگا ئامادەم بەرەو رووی هەموو ئەمانە ببمەوە، ئەوەی شایانی باسە سلێمان پاشای والی، دە رۆژ دوای جوڵانەوەی ئیبراهیم پاشا گەڕاوەتەوە، بە گوێرەی زانیاریی مومتاز ئەفەندی لە بەرانبەر لیژنەی حکومیی وتوویەتی: ئیبراهیم پاشا بەر لە بزووتنەوە یاخیبوونەکەی، ملیۆنێك لیرەی زێڕو کەلوپەلی بەنرخی بایی ملیونێك لیرەی هەبووە. لیژنەی حکومیی لە پیاوانی یاساییو دارایی پێکهاتبوو، سەردانی وێرانشاری کرد، لەوێ (50) رۆژ مانەوەو خەرجیی رۆژانەیان (500) قرش بووە، بەڵام بەر لە گەیشتنی دەستەی لێکۆڵینەوە بۆ وێرانشار، خەنسە خانم خێزانی ئیبراهیم پاشای میللییو هەر سێ

کوڕەکەی توانیبوویان زێڕو زیوو کەلوپەلەکان بشارنەوە، ئەوەی جێی بە بیرهێنانەوەیە (150) گوندی ئاوەدان لە دەوروبەری وێرانشار بەشدارییان لەو هەڵگەڕانەوەیە کردبوو، هەر گوندێك بە تەنیا (40) هەزار کیلۆ گەنمو خواردەمەنی وشکی هەبووە، لەگەڵ بەرهەمی چاوەڕوانکراوی ئەو ساڵە کە بە (150) تا (180) کیلۆ تەخمین دەکرێ، سەرەڕای داواکاریی موتەسەڕیف و قائیمقام بۆ دابینکردنی پاسەوان بۆ ئەو گوندانە، والی ئەمەی جێبەجێ نەکردووە، هۆزە عەرەبیو کوردیەکانیش هێرشیان کردە سەر ئەو گوندانەو هەموویان تاڵانکردن، هەتا لە ناکاو ئەو گوندانە تووشی برسێتی و نەبوونیی بوون و کێڵگە کشتوکاڵیەکانیان لە چاندن کەوت، هەرچەندە حکومەت بەشێك لەو بەرهەمە تاڵانکراوەی بۆ گەڕاندنەوە، بەڵام هەتا ئێستاش ناوچەکە برسیەو لە قەیرانێکی سەختدا دەژی، بەداخەوە وێرانشار هەر(20) سەعاتەڕێ لە دیاربەکرەوە دوورە، کەچی والی تا ئێستا سەردانی ناوچەکەی نەکردووە، ئەگەر والی سەردانی ناوچەکەی بکردایە حکومەت زۆر لەو سامانەی دەست دەکەوت، لێرەدا دەرفەتم نییە هەموو ئەو بوختانانەی دژی من کراوە بخەمەڕوو، بە هیوام سەدری ئەعزەم، حەسەن حیلمی پاشا، چاوێکی بەو قسانەی مندا بخشاندایەوە.

زیا کۆك ئەلپ

## 2- شێخ سەعیدی حەفید

بەدیارکەوتنی شێخ سەعید وەکو ناوەندێکی هێز لە کوردستانی رۆژگاری سوڵتان عەبدولحەمید، بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەو سیاسەتە لامەرکەزییەی سوڵتان عەبدولحەمید کە بەرانبەر کورد پەیڕەوی دەکرد*، ئەمە پێچەوانەی ئەو سیاسەتە مەرکەزییە توندە بووە کە سەردەمی تەنزیمات بەر لە سوڵتان عەبدولحەمید پەیڕەو کراوە،

*- لە راستی دا توێژینەوە لە ناکۆکیی نێوان شێخ سەعیدو ئیتیحادیەکان زیاتر لە چوارچێوەی ناکۆکی بێت وەکو دوو دەسەڵات، نەك وەکو دوو ئاڕاستەی فیکریی جیاواز،، هیچ پرەنسیپێکی لامەرکەزیی کارگێڕیی لە لایەن سوڵتانەوە نەدراوە بە شێخ سەعیدی حەفید، ئەم ناکۆکییە ئەگەر نەخنکێنرایە لەوانە بوو بزاڤێکی بەرچاوی لێ بکەوتایەوە، بەڵام ئێمە قسە لە ئەوە دەکەین کە رووی داوە. "وەرگێڕ".

ئیتیحادیەکانیش دەیانویست بەسەر کورد دا بیسەپێنن *، لێرەدا نامانەوێ بە درێژیی بچینە ناو بارودۆخی ئەو کاتەی خانەوادەی بەرزنجی (سادات)و چۆنییەتی سەرهەڵدانی ئەو رووداوە لێڵەی کە شێخ سەعیدی تیا کوژرا، چونکە لێکۆڵینەوەکەی موحەممەد رەسوڵ هاوار لەسەر شێخ مەحمود کە پشتی بەستوو بە هەندێ دەستنووس‌و یاداشتنامەی هاوزەمان ـ بەتایبەتی یاداشتەکانی شێخ رەوف کوڕی شێخ سەعیدو کتێبی گەنجینەی مەردانی وەفایی لەسەر شێخ سەعیدو شێخ مەحمودی کوڕی ـ لێکۆڵینەوەی گشتگیرو بابەتیانەن، بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا دەمانەوێ تیشکی بخەینە سەر واقیعی رووداوەکانە، لەگەڵ باسێکی کورت لەسەر ئەو هۆکارانەی ئیتیحادیەکانی ئەو باوەڕەی شێخ سەعید بۆ موسڵ دووربخەنەوەو دواتر بیکوژن، ئەمانە لەبەر رۆشنایی هەندێ بەڵگەنامەی بەریتانیی و عوسمانیی کە لە کۆتایی ئەم وتارە بۆ خوێنەرانی بڵاو دەکەینەوە.

شێخ سەعید کوڕی کاك ئەحمەدی زاناو سەرۆکی تەریقەتی (قادری)یە و لە خانەوادەی سەیدەکانی بەرزنجەیە، کە لە بنەچەدا دەچنەوە سەر دوو برا (عیساو موسا)، سەیدەکان پێیانوایە دەچنەوە سەر خانەوادەی ئەبوموسای کازم، شێخ سەعید چەند کوڕی لە دوای خۆی بەجێهێشتووە، لەوانە شێخ مەحمود کە رۆڵی بەرچاوی گێڕاوە لە بزووتنەوەی کوردایەتیی (دواتر باسی دەکەین). وەکو شێخەکانی تری تەریقەت، شێخ سەعید رۆڵی گرنگی گێڕاوە لە شەڕەکانی سوڵتان عەبدولحەمید دژی رووسیا، بەتایبەتی شەڕەکانی ساڵانی (1876ـ 1878ز)، لەسەر خۆئامادەکردن‌و سەرکردایەتیکردن کورد. سوڵتان رێزی لێگرت‌و چەند پارچە زەویەکی سونی (حکومیی) لیوای سلێمانی پێدا بە هۆی ئەو ناکۆکییەی نێوان ئەو و تاڵەبانییەکان لە ساڵی (1889ز) بانگی کردە ئەستەنبوڵ‌و لەوێ سوڵتان لەسەر نەریتی خۆیی لە خۆیی‌و دەست‌و پەیوەندو شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی نزیك کردەوە، وارێکەوت یەکێك لە

* ـ سوڵتان عەبدولحەمیدیش لەسەر هەمان سیاسەتی مەرکەزیی پێش خۆی رۆیشتووە، لە رووی کارگێڕییەوە لەوانەی پێش خۆی زیاتر ویستوویەتی سیاسەتی مەرکەزیی پەیڕەو بکات، بە زەبری هێز بەرەنگاریی بزوتنەوەی شێخ عوبێدوڵڵا بۆوە کە دەیویست دەسەڵاتی لامەرکەزیی بۆ ناوچە کوردیەکانی ژێردەسەڵاتی عوسمانیی و ئێرانیی دابین بکات. "وەرگێڕ".

کوڕەکانی سوڵتان نەخۆش بووەو شێخ سەعید دوعای بۆ کردووەو چاك بۆتەوە، هەروەها دوعای (تەلیسمان)ی بۆ سوڵتان خوێندووە کە لای خومان بە (گوللەبەند) ناسراوە، دەڵێن سوڵتان لە سەرەتای سەدەی بیستەم بە هۆی پیلانی ئەرمەنییەکانەوە لە مەترسییدا بووەو بە هۆی دوعای شێخ سەعیدەوە لە مەترسیی ڕزگاری بووە، پێشتریش، شێخ خاڵی جوفرەی لەگەڵ سوڵتاندا هەبووەو لە کاتی قەیران‌و ناخۆشی داوای لە شێخ سەعید کردووە دوعای بۆ بکات[323].

شێخ بە هۆی گەورەیەکەی، نەك بەتەنیا لەلای سەیدەکانی لیوای سلێمانی، بەڵکو لە هەموو ویلایەتی موسڵ ببووە خاوەنی پێگەیەکی گەورە، بۆ نموونە لەو کاتەی لە ئەستەنبوڵ بووە داوای لە سوڵتان کردووە نازناوی پاشا بداتە حاجی موحەممەدی سابونچی کە یەکێك بووە لە خانەدانەکان‌و ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی شارەوانی موسڵ بووە، لە لیوای سلێمانیش ڕاپۆرتی بەریتانی‌و عوسمانییەکان دەڵێن: (بۆ ماوەیەکی زۆر بەبێ ڕکابەری حاکمی کردەیی بووە)، بە هۆی پێگەی سیاسیی سەیدەکان، خێرا هێزی ئابوورییشیان زیادی دەکرد، چونکە سوڵتان بە بەردەوامیی گوندەکانی دەوڵەتی پێدەبەخشین.

سەرەڕای ئەمە، سەیدەکان (وەکو شێخ‌و سەیدو ئاغاکانی کوردستانی باشوور) سیستمی تاپۆیان بە دەرفەت زانی بوو بۆ تۆمارکردنی زەوی بە ناوی خۆیان‌و کڕینەوەی زەوی لە جووتیاران، لەگەڵ ئەوەشدا سوڵتان ساڵانە ئەندازەی (40000) لیرەی ئاڵتوونیی تەرخان کردبوو بۆ مانگانەی شێخ سەعیدو تەکیەی قادری، سامان‌و زەوییەکانی ئەوان لە زۆر باج و میرانە بەخشرابوون، بۆیە وای لێهات سەرەڕای پێگەی گەورەی ئایینی، ببوونە ئەرەستۆکراتی[324].

شێخ سەعید لە دوای هاتنی ئیتیحادیەکان لە کۆتایی ساڵی (1908) کەوتە بەر مەترسیی، وەکو هەنگاوێك بووە بۆ سەپاندنی مەکەزییەت لە کوردستان و کۆتایی

---

[323] - FO 195\2317,,Report on Affairs in Sulaimani,, 10 January,1909 B. Dickson; \FO2308 No. 2 January 14,1909,B.Dickson.

بناغەی پەیوەندییەکانی سوڵتان پێموایە زۆر لەوە سیاسییانەتر داڕێژراوە کە نووسەر باسی دەکات، "وەرگێڕ".

[324]\21 ،102\1311 - o3\311,;Y.M.TV. 278 T07 left 1,30\03\321

هێنان بە پێگەی ئیسلام و شێخ و زانایانی ناو دەوڵەتی عوسمانیی(325)، مانەوەی شێخ لە سلێمانی کۆسپ بووە لە بەردەم ئەو سیاسەتە، شێخ سەعید لە ناو شاری سلێمانیو لە دەرەوەی شار دوژمنی زۆری هەبووە، بەرژەوەندیی ئەوانو ئیتیحادیەکان تێك دەگیرا، بۆیە بە دوژمنی خۆیان دەزانی، لە پێشەوە کاربەدەستو فەرماندە سەربازییەکانی تورك، بەتایبەت لە ناویاندا فەهمی ئەفەندیی و دکتۆر زیا، ئەم دوانە شێخ سەعیدیان بە کۆسپ دەزانی لە بەردەم سەپاندنی ویستی دەوڵەت، خراپەی زۆریان لە بەرانبەر ئەنجام داو دەیانویست بەدیلێکی دەسەڵاتی ئەو بدۆزنەوە بۆ ئاسانکاری سەپاندنی سیاسەتی دەمارگیریی لە بەرانبەر کورد، لە لایەکی ترەوە دەیانزانی شێخ پەیوەندیی لەگەڵ سوڵتان هەیەو جورئەتیان نەدەکرد لەگەڵ سوڵتان قسە بکەن، بەڵام رقو قینیان لێ داگرتبوو، لەگەڵ ئەمەشدا زۆربەی کاربەدەستە بچووکەکانی دەوڵەت خۆیان لە شێخ سەعید نزیك دەکردەوە، بەو هیوایەی لە زوڵم و تاغوتیەتی خەڵکی بیانپارێزێ(326)، بۆیە هەر رووداوێکی کوشتنو تاڵانیی رووی بدایە پەنایان دەبردە بەر پیاوانی شێخ[327]. بەپلەی سێیەم ئاغا کوردەکان رکابەرایەتی شێخ سەعیدیان دەکرد، هەتا شێخ لە ناو سەیدەکانیش دوژمنی هەبووە، زۆربەیان دەیانویست موریدو هۆزەکان بەلای خۆیاندا رابکێشنو دەست بەسەر سامانی تەریقەتی (قادریی)دا بگرن، لەو ململانێیەش پەنایان بردبووە بەر لێپرسراوانی حکومیی، هەتا لە بەرانبەر شێخ سەعید پشتیوانیان لێ بکات، سەرەڕای ناکۆکیی نێوان سەیدەکانو شێخەکانی تاڵەبانی لەسەر دەسەڵات، شێخ بە سەرۆکایەتی خۆی لە ساڵی (1894) هێرشێکی گەورەی کردە سەر گوندە تاڵەبانییەکانو گوندەکانی سوتاندن، ئەوانیش ناچاربوون لای سوڵتان سکاڵا لە شێخ بکەن، سوڵتانیش بانگی کردە ئەستەنبوڵو

---

[325] - مەترسیی بۆ سەر ئیسلامو شێخەکانی تەریقەت هاومانای یەکتر نین، چونکە ئیسلام وەکو فیکر لە بندەستی ئیتیحادیەکان لە بارێکی خراپدا بووە، بەڵام لە سایەی سوڵتانو شێخەکانی تەریقەتیش لەو ئەندازە باشیەدا نەبووە کە بەڕێز کاك دکتۆر باسی دەکات، کە ئێرە جێگای زیاتری روونکردنەوە نییە. "وەرگێڕ".

[326] - (.. شێخ سەعید کاربەدەستانی حکومەت لە تاغوتیەتی خەڵکی بپارێزێ..)، ئەم دەربڕینە گوزارشتە لەسەر ئەوەی شێخ لە بەرەی گەل و کۆمەڵگا دابڕاوە. "وەرگێڕ".

[327] - هاوار: ل203-204.

ماوەیەك لەوێ هێشتیەوە. لایەنگرانی شێخ هێرشیان کردە سەر گوندەکانی تاڵەبانیو هەندێکیان سوتاندنو چەند کەسیان کوشت، حافیزی مەحمود پاشای جاف لە سەرسەخترین دوژمنەکانی شێخ بووە، ناکۆکیی نێوان ئەم دوانە لەسەر دوو خاڵی بنەڕەتیی بووە:

یەکەمیان: هەتا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای سەدەی بیستەم بەشی زۆری جاف کۆچەر بوون و لە کاتی تێپەڕبوونی کاروانی رەوەندەکانی جاف بە شارەزووری نزیك سنووری ئێرانی ـ عێراقیدا، کێڵگە کشتووکاڵیەکانیان وێران دەکردو جووتیارەکان دەستخەڕۆ دەبوون.

دووەم: مەحموود پاشا سەرۆکی هۆزی جاف باجی زۆری بەسەر هۆزەکەی دا سەپاندبوو، بەشێکی هۆزی جاف (بەتایبەت روغزایی) موریدی شێخ سەعید بوونو سکاڵایان دەبردە لای ئەو، شێخیش سکاڵای ئەوانی دەناردە لای بەرپرسانی حکومیی، مەحمود پاشا بەمە زۆر نیگەران بوو، بەسەیدەکانی وتبوو با ئەوان خەریکی نوێژی خۆیان بنو دەست لە کاروباری خەڵکی وەرنەدەن[328]. لە برووسکەیەکی مەحمود پاشادا هاتووە، کە سکاڵای لای بابی عالی کردووەو دەڵێ:

.. بەڵام شێخ سەعیدو نەقیبی برای لەو ناکۆکیی و ئاژاوەی نێوان خۆیانو شێخەکانی سلێمانی داوایان لە من کردووە یارمەتیان بدەم، شێخ دەیەوێ من لای دەروازەی باڵا ناشیرین بکاتو دوایی بڵێ یارمەتیم بدە هەتا لای سوڵتان داوای لێبووردنت بۆ بکەم، ئەگەر یارمەتی نەدەم خەریکی کۆکردنەوەی مەزبەتە دەبێت بۆ مابینی هەمایۆنی، ئەو هەڕەشەی لێکردووم کە لێرەم دوور دەخاتەوە، لەو بارەیەوە مەزمەتە لەخەڵکی وەردەگرێ، ئەو شێخانە لە کۆنەوە پێویستیان بە سۆز و لوتفی باب و باپیرانی من بوون، پەروەردە و چاکسازیی ئەوانەی بە خۆیان و خزمەکانیان لە سەد خێزان زیاتر نین، ئەگەر لەبەر خواستی سوونی ئێوە نەبێت هیچ باکمان پێیان نییە ...[329]

ئیدارەی عوسمانیی لە کوردستان لە ڕۆژانی سوڵتان عەبدولحەمید لەو ململانێیە پشتگیریی شیخ سەعیدی کردووە، مەحمود پاشا بەوە تاوانبار کراوە کێشەو ئاژاوە

[328] - هاوار: ل203-204.

[329] -Y.MTV 114\31 وێنەی ئەو برووسکەیەی لە ویلایەتی موسڵەوە هاتووە:

دەنێتەوە بۆ بەدەستهێنانی سەرۆکایەتی هۆزی جافو هەوڵی داوە لە جێی برایەکەی ببێتە قایمقامی گوڵعەنبەر[330].

هەر کە ئیتیحادیەکان هاتن دەسەڵاتی عەبدولحەمیدیان سنووردار کرد، ناحەزەکانی شێخ سەعید لقێکی ئیتیحاد و تەرەقییان لە سلێمانی کردەوە، مەحمود پاشای جاف بووە سەرۆکی لقو داوای لە شێخ سەعید کرد ببێتە ئەندامی لق، بەڵام شێخ ئیتیحادیەکانی بەبێ دینو دوژمن بە شەریعەت دەزانی و نەبووە ئەندام، بە هاوکاریی ئەوانەی رقیان لە شێخ سەعید بوو، بە هەموو توانا نەخشەیان دارِشت لە سلێمانی دووری بخەنەوە، بەر لە مانگێك لە دوورخستنەوەی خۆی و هەردوو کورِەکەی (شێخ ئەحمەد و شێخ مەحموودی، یان گرت، بە بیانووی ئەوەی قەرزی زۆری حکومەتیان لەسەر کۆبۆتەوە، بە ناوی خەڵکەوە چەندین سکاڵا لە سلێمانی نووسرا و شکایەتیان لە سەرەرِۆیی شێخ سەعید کردبوو، بەوەی دژی خەڵکی سلێمانی و دوژمنی ئیتیحادیەکانە، ناحەزەکانی شێخ سێ رۆژ پێش دوورخستنەوەی لە سەرا کۆبوونەوەو خەڵکیان ناچار کرد ئەو سکاڵایانە واژۆ بکەن کە حکومەت دەیەوێ شێخ لە سلێمانی دوور بخاتەوە، لە سلێمانی سێ رۆژ ئاژاوە بەردەوام بوو هەتا شێخ سەعیدیان دوورخستەوە بۆ شاری موسڵ، لە دوای ئەو قەسابخانەی بۆ سەیدەکان دانرا، لە موسڵ دەرکەوت موتەسەرِیفی لیوا و هەندێ لە بەرپرسان و ناحەزانی شێخ (1500) لیرەی عوسمانییان وەکو بەرتیل ناردووە بۆ بەرپرسانی موسڵ، دەروازەی باڵا بەو حیسابەی سلێمانی شوێنێکی ئارام نییە داوای کرد بیگوازنەوە بۆ موسڵ، داوا لە ئیبراهیم ئەدهەم سەرۆکی هێزی سوارە لە سلێمانی کرا لەگەڵی بچێت بۆ موسڵ، لە دوای دوورخستنەوەی شێخ لە سلێمانی کەوتنە تەنگپێهەڵچنینی سەیدەکانو دەست بەسەر سەروەتو سامانیاندا گیرا، یەك لەو سکاڵایانە باسی لە دوورخستنەوە کردووە و دەڵێ: "بەداخەوە بەشێوەیەکی گشتیی بەرپرسانی ئێستای لیوای سلێمانی کەسانی ناشایستە و بەرژەوەندییخوازن و بە دوای ئارەزووی گەندەڵیی خۆیان کەوتوون، لە هەر هەنگاوێکی دەیهاون مەبەستیانە دژایەتی شەریعەت و ئاکاری ئیسلامیی و نەریتی ئێرە بکەن، ئەوانە بە هەر رێگەیەکی بگونجێ خەریکی خۆش رابواردنن"[331].

---

[330] - سەرچاوەی پێشوو

[331]- چەند بەڵگەنامەیەکی مێژوویی، و/ مستەفا نەریمان، رامان (2,2)، دهۆك، 2001. گۆڤاری (الإرشاد) بەناوی ئیتیحاد و تەرەقی لقی بەغدا دەرچوو، ژمارە 19، نیسانی 1235. کۆمەڵێك

له مانگی کانونی یەکەمی ساڵی (1908) شێخ سەعید و کوڕەکانی شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەد و هەندێ لە خزم و خزمەتکارەکانیان گەیشتنە موسڵ، لەوێ بوونە میوانی حکومەت، موحەممەد پاشای سابوونچی لە نزیك سەرایە بە دووری تەنها (4) یارد ماڵێکی بۆ تەرخان کردن، لە دوای چل رۆژ لە ئاکامی ئاژاوە و کارەساتێکی لێڵدا، شێخ سەعید کوژرا، لێرەوە لە ڕێگەی کتێبی (الضحايا الثلاث) و یاداشتەکانی زێوەر و کتێبەکەی موحەممەد رەسوڵ هاوار لەسەر شێخ مەحمود، لەگەڵ راپۆرتی قونسوڵی بەریتانی لە موسڵ، دەچینە ناو درێژەی رووداوی کوشتنەکە، جیاوازییەکی کەم نەبێت، هەموویان لەسەر چۆنێتی کوژانی یەکدەنگن، هەر لێرەوە داوای لێبوودن لە خوێنەران دەکەم بە درێژ کردنەوەی ئەم باسە.

لەوکاتەی هەریەك لە شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەدی برای و گەنجێکی تر بە ناوی بەهائەدین عەبدوڵڵا کە هەموویان گەنج بوون، لە (5)ی کانوونی دووەمی ساڵی (1909ز) بە بۆنەی جەژنەوە لە ماڵی مستەفا بەگ دانیشتبوون، بەپێی گێڕانەوەی کتێبی (الضحايا الثلاث) بەهائەدین چۆتە بازاڕ "بەپێی گێڕانەوەی راپۆرتی قونسوڵیەی بەریتانی لە موسڵ، بەهائەدین یەکێك لە سوارە کوردەکانی ناردووە"، ئەم پیاوە لە بازاڕ سەرخۆش بووە و لەگەڵ ئافرەتێکی موسڵاوی "دەڵێن رەوشتی باش نەبووە" بۆتە دەمەقاڵێیان، موسڵاویەکان لە تۆڵەی ئابڕووی ئافرەتەکەیان کۆبوونەوە، سوارە کوردەکەش "لە ئەسڵدا خەڵکی کەرکووك بووە" تەقەی لە خۆپیشاندەران کردووە و شەڕ کەوتۆتە نێوان سوارەی کورد و جەندرمە موسڵاویەکان و (10) جەندرمە کوژراوە، "راپۆرتی قونسوڵی بەریتانی دەڵێ: (30 ـ 50) کەس کوژراوە". بۆ رۆژی دوایی زانایانی موسڵ و موسڵاویەکان داوایان کردووە هەموو سوارەی کورد خۆبەدەستەوە بدەن و بدرێنە دادگا، لە دوای بەرگرییەکی کەم، هێزەکانی کەرکووك خۆیان تەسلیمی حکومەت کرد، والی نایەڵێ دادگایی بکرێن، ئەو جەماوەرەی کوببوونەوە داوای شێخ سەعید و کوڕەکانی دەکەن و والی وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێ: ئێوە دەزانن ئەوان لە کوێن، بچن چی دەکەن بیکەن. کۆبوونەوە جەماوەرییەکە لە ژێر فەرماندەی پیاو

---

پڕوپاگەندەی دژ بەو دوو شێخەی تیدایە، گۆڤارەکە رای خۆی دەربڕیوە، بەوەی دەستبەسەراگرتنی ئەو شێخانە واتە: (لایەنگرانی سوڵتان عەبدولحەمید)، بە لەناوبردنی رەمزی تاکڕەوی دەزانێت.

خراپێکدا بووە بە ناوی "ئەبوجاسم"، کۆبوونەوە و هێرشیان بردۆتە سەر بەڕێوەبەرایەتی زەبت و دۆسیەکانی حکومەتیان سوتاندووە، بۆ ڕۆژی سێیەم ئەبوجاسم و جەماوەری هێرشکار، ئەو ماڵە گەمارۆ دەدەن کە شێخ سەعیدی تێدابوو، شێخ نیگەرانیی خۆی بۆ والی بەدیار خستووە، والیش لە ڕووی سەلامەتیەوە دڵنیای کردۆتەوە، لەوکاتەدا شێخ ئەحمەد (کوڕی شێخ سەعید)و یەکێك لە پاسەوانەکانی شێخ دەکوژرێ، شێخ ئەوکات تەمەن (80) ساڵ دەبوو، لە ماڵ دێتە دەرێ و قورئانێك بەدەستەوە دەگرێ، هەندێ سەربازی حکومیی لە پشتەوەی بوون، ئەو مەبەستی بوو بگاتە بارەگای والی، "هەندێ دەڵێن دائیرەی سەرا" تەنیا (40) مەترێك لەماڵی شێخەوە دوور بووە، بەڵام پاسەوانەکان دەرگای لێ ناکەنەوە، لەو کاتەدا بەردێکی گەورە بە سەری شێخ کەوت و مرد، ئەبو جاسم و گروپەکەشی هێرشیان کردە سەر لایەنگرانی شێخ و (17) کەسیان لێ کوشتن و ماڵی شێخ تالان کرا[332].

هەتا ئێستاش ئەو بارودۆخەی شێخ سەعیدی تیا کوژا نادیار و لێڵە، کێ بەرپرس بوو لە کوشتنی؟ ئایا بە ئاماژەی ئەستەنبوڵ، یان بە پیلانی لقی موسڵی ئیتیحاد و تەرەقی، یان بە پیلانی بەرپرسانی ئەوێ؟ ئایا ئەبو جاسم و گروپەکەی لە بارێکی بێ سەروبەرە و بێ ڕووخسەت خواستن، کوشتیان؟ (هاوار) لە لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلەدا هەوڵی داوە وەڵامی ئەو خاڵانە بداتەوە، لە کۆتایی دا پێیوایە شێخ سەعید بە دەستی عەلی سەعیدی سەرۆکی ئەرکانی جەنگ لە موسڵ کوژراوە و ئەو ویستویەتی شێخ هانبدات لە ماڵ بێتە دەرێ، بەرەو سەرا بچێ، لەوێش پاسەوانەکانی ئاگادار کردۆتەوە، کە دەرگای لێ نەکەنەوە هەتا خۆی و ئەندامانی خێزانەکەی و دەورووبەرەکەی دەکوژرێن. هاوار ئەمەی لە یاداشتەکانی شێخ قادری حەفید وەرگرتووە و ئەویش دەڵێ: عەلی سەعید بەگ دانی بەو تاوانەدا ناوەو وتویەتی بە ڕێنومایی ئیتیحادیەکان ئەمەی کردووە[333].

---

[332] - FO.195\2310 No.2January 14,1909 British Vice Consul Mosul, Bell, p43,Edmonds,Kurds, Turks, and Arabs,p77-78

عبدالمنعم الغلامی: الضحایا الثلاث، موصل1952،ص7-33و هاوار: ص148-151

[333] - هاوار: ل 151-171.

هەریەك لە هاوار و شێخ قادر پشتیان بە گێڕانەوەی زارەکیی بەستووە و دەڵێن: عەلی سەعید بەگ ئەندازیاری کوشتنی شێخ سەعید بووە، ئەمە پێویستی بە بەڵگەی نووسراو هەیە و یەکلاکەرەوە نییە، یان دەبێت لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیی، یان عوسمانیی، یان لە دانپیانانی نووسراوی یەکێك لە بەشداریکاران یەکلایی بکرێتەوە، لە کاتێکدا چەندین بەڵگەی تر هەیە و لە چەندان بۆنەدا عەلی سەعید نکۆڵی کردووە دەستی لەو کوشتنەدا هەبووبێت، ئەوەی جێی باسە قونسوڵیەکانی بەریتانیی چەندین پرسیار دەورووژێنن لەسەر والی، کە شێخی دڵنیا کردۆتەوە و زەمانەتی پێویستی نەداوەتێ... باشە بۆچی سەرا دەرگای لێ نەکردەوە؟ والی لە کاتی گەمارۆدانی شێخ لە کوێ بوو؟ راپۆرتی قونسوڵیەتی بەریتانی دەڵێ: والی بە ئاژاوەچیەکانی وتووە: "چی دەکەن لەگەڵ شێخ، بیکەن"، خۆ والی هەر بە هەشتا مەتر لە ماڵی شێخەوە دووربووە و هەشت سەد سەربازی لە ژێر فەرماندا بووە، بۆچی نەیتوانیوە شێخ بپارێزی؟[334].

ئەمانە هەمووی پرسیاری گونجاون و دەریدەخەن کە بە تاوانبارکردنی تەنیا یەك کەس لە ناو دەزگای ئیداری موسڵ، چارەسەری ئەو مەتەڵەمان بۆ ناکات کە پەیوەندیی بەو قەسابخانەوە هەیە. ئەوەی شایانی باسە رۆژێك بەر لەو رووداوە والی هەواڵی دابوو برووسکەی لەسەر بێتاوانی شێخ لە ئەستەنبوڵەوە پێگەیشتووە، لە بەیانییەوە دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی، ئایا ئەمە دڵدانەوە بوو، یان بەڕاستی والی نییەتی رزگارکردنی هەبووە، یان ئاگادار بووە بە پیلانی دوژمنانی شێخ و ویستوویەتی رزگاری بکات؟ ئایا لە ماوەی دەسەڵاتدارێتی سوڵتان عەبدولحەمید بە کردەیی ئەوانە لە ناو دەزگای ئیدارەی عوسمانیی لە موسڵ هەبوون هەندێك پشتگیری ئیتیحادیەکان بکەن و هەندێکی تر لە سوڵتان؟ هاوار هۆکاری ئەم قەسابخانەیە دەباتەوە بۆ پیلانێك بۆ دەرپەڕاندنی زەکی پاشای حەلەبی والی، چونکە ناوبراو لە ئیتیحادیەکانەوە نزیك نەبووە[335]، بەڵام هاوار لە عەبدولمونعیم غولامی خاوەنی کتێبی "الضحایا الثلاث"و عێزەت کاکەی سکرتێری تایبەتی شێخ سەعید، لە شێخ قادری کوڕی دەگێڕێتەوە کە باوەڕیان وابووە لە ناوبردنی شێخ سەعید بەشێك بووە لە نەخشەی ئیتیحادیەکان بۆ لێدانی سەرانی

334 - FO 195 2310 No.2 January 14,1909. Vice Consul Mosul

335 - هاوار: ل145-147، 171.

دیکتاتۆر، یان به دەربڕینێکی تر بۆ زاڵبوون بەسەر لایەنگرانی سوڵتان عەبدولحەمید[336]، ئەمە قەناعەتی نووسەری ئەم وتارەشە.

لە دوای لێکۆڵینەوەی دوورو درێژ لە کانونی یەکەمی ساڵی (1909) لەسەر دۆسیەی ئەوانەی دەستیان هەبووە لە سازدانی ئەو قەسابخانەیە، رەشید پاشای والی تازە، فەرمانی گرتنی (140) کەسی دەرکرد و دای بە دادگا، بەڵام زانایانی موسڵ ناڕازی بوون و (100) کەسیان بەردا، لێکۆڵینەوە و دەستبەسەرکردنی هەندێکیان چەند مانگێك بەردەوام بوو، شێخ عەبدولقادری نەهریش داوای لە سوڵتان کردبوو زەمانەیەك هەبێت بۆ درووستیی دادگایی کردن. دادگا لە دوای چەند مانگ گەیشتە دەرخستنی بێتاوانیی سەیدەکان و گرتنی (50) کەس بۆ ماوەی سێ ساڵ و لە سێدارەدانی سێ کەسی تر، بەڵام ئیتیحادیەکان لە ئەستەنبوڵ بەم بڕیارە رازی نەبوون و تەنیا یەك کەس لە گرتووخانەدا مایەوە[337]. هەروەها (میلکی یۆنگ)ی یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی "بێلایەنانە" ئاماژەی بە رۆژنامەکانی ئەو کاتەی ئیتیحادیەکان کردووە لە ئەستەنبوڵ کە زیاتر بە دژایەتی شێخ سەعید باسی ئەو قەسابخانەیان کردووە، بۆیە هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری دادگا کە لە بەرژەوەندیی شێخ بووە، لەگەڵ باسکردنی رووداوەکە بەم شێوەیە، دەمانخاتە ئەو هزرەی کە ئیتیحادیەکان لە ئاستی بەرز دەستیان لەو قەسابخانەدا هەبووە، لازاریف بڕوای وایە ئینگلیز لە پشت ئەو قەسابخانەوە بووە بۆ درووستکردنی ئاژاوە لە موسڵ لە نێوان کورد و ئەو عەرەبانەی داوای لامەرکەزییان کردووە لە دەوڵەتی عوسمانیی[338]. بەڕوونی دیارە ناحەزی هەبووە لە نێوان ئەفسەرانی ئینگلیز، وەکو: مێجەرسۆن و ئەدمۆنس بەرانبەر سەیدەکان بە گشتیی و شێخ سەعید بەتایبەت. بیرترارد دکسۆن، یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لە وان لە ساڵی (1909) سەردانی سلێمانی کردووە، لەسەر شێخ سەعید دەنووسێ: (خراپترین پیرەمێردی دەوڵەتی عوسمانییە و دەستێکی باڵای هەیە لە تاڵانیی و

[336] - هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان، ل147-150.

[337] - FO 195/2312 No.37 Milkier Young, Vice Consul Mosul Feruary 19,1909

[338] - FO 195 2310 No.37 Milkier Young, Vice Consul Mosul Febuary 19,1909

بەکارهێنانی هێز بۆ زەوتکردنی سامانی خەڵکیی، شارەزایە لە فێڵ و ورووژاندن و هەڕەشە.. کەمترین وەسف بۆی ئەوەیە بڵێی پیاوێکی نەگریسە)[339].

سەرەڕای هەڵوێستی دوژمنکارانەی ئینگلیز بەرانبەر شێخ سەعید، هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەر دەستێوەردانی ئەوان لەو قەسابخانەیە، بەڵکو هەمووی ئاماژەیە بۆ دەستێوەردانی بەرپرسانی حکومیی، ئەو ئەگەرەی لازاریف باسی کردووە ناگونجێ لەگەڵ سیاسەتی بەریتانیایەك کە پشتیوانیی لەگەڵ عروبەی وڵاتی شام و عێراق کردووە.

شێخ سەعید هەموو بەشەکانی کوردستانی تووڕە کرد، شێخێکی تەمەن هەشتا ساڵ بەو بێ ویژدانییە شەهید بکرێت، کە کورد بە پیرۆزترین پیاوی ناو دەوڵەتی عوسمانیی دانابوو، هەستی هەموو کوردانی دژی دەوڵەت بەتایبەتی دژی موسڵاویەکان بزواند، هۆزی هەمەوەندیی دۆستی شێخ سەعید شۆڕشیان بەرپاکرد و چەکدارەکانی هەمەوەند بە تەواوی گەمارۆی فەرمانگە حکومیەکانی سلێمانیان دا، لە کەرکووکیش هۆزەکانی کورد کۆبوونەوە و رێککەوتن لەسەر پێکهێنانی هێزی عەشایەریی و هێرشکردنە سەر موسڵ بۆ تۆڵەسەندنەوەی شەهیدی کورد (شێخ سەعید)، رێگەی نێوان کەرکوك و سلێمانی گیراو ژیانی سەرباز و کاربەدەستانی حکومیی کەوتە مەترسییەوە، والی موسڵ خێرا برووسکەیەکی بۆ موتەسەڕیفی سلێمانی کرد، بە خێرایی شار بەجێبهێڵێ و بێت بۆ کەرکووك، هەروەها موتەسەڕیفی کەرکووکیش برووسکەیەکی بۆ والی کردو وتی: ئەگەر شێخ مەحمودی کوڕی شێخ سەعید بە سەلامەتیی و خێرا نەگاتەوە کەرکوك ئەوە ژیانی موسڵاویەکانی ئێرە دەکەوێتە مەترسیەوە[340]. ئیدارەی ئیتیحادیەکان بە تەواوی لە کوردستان کەوتبووە مەترسیەوە و سەربازەکانی حکومەت لە لیوای سلێمانی چەکەکانیان فڕێ دەدا و هەوڵیان دەدا بگەنە کەرکووك، لە ڕاپۆرتی قونسوڵی بەریتانی دا هاتووە کە ئیدارەی بەریتانیی[341] لە کوردستان تووشی هەرەسێکی لە ناکاو هاتووە،

---

[339] - FO.95\2317,,Report on Affairs in Sulamani,, 10 June1909 B.Dickson.

[340] -FO.95\2317,,Report on Affairs in Sulamani,, B. Dickson..January 10,1909-.

[341] - دەبێت ئیدارەی عوسمانیی بێت. "وەرگێڕ".

چونکە زۆربەی سەربازەکانی لیوای سلێمانی و کەرکووک و بەڕێوەبەری قەزاو ناحیەکان لە ژێر کاریگەریی شێخ سەعیددا بوون، هەروەها قونسوڵ دەڵێ: (ئەگەر نا چۆن هێزێکی (4000) کەسیی ناتوانێ بەرگەی هێزێکی بچووکی (400) کەسی هەمەوەندان بکات)[342]. حکومەت خێرا ڕێوشوێنی یەکلاکەرەوەی دانا، بۆ ئەو مەبەستە خۆی لە بەرپرسیارێتی کارەساتی موسڵ دوورخستەوە و ڕایگەیاند کە لە ئاکامی هەڵسوکەوتی هەراسانکاری لایەنگرانی شێخ سەعیدەوە بووە، هێزەکانی لەشکری چوار و شەشی عوسمانیی خرانە حاڵەتی ئامادەیی. هەروەها زەکی پاشا لە جیاتی ڕەشید پاشا وەکو والی دانراو والی تازە هاوەڵیەتی شێخ مەحمودی کرد بۆ سلێمانی و کەرکووک کە لە کاتی کارەساتەکە لە ماڵی یەك لە بەرپرسە کوردیەکانی حکومەت لە موسڵ پارێزرابوو، لەگەڵ گەیشتنەوەی ئەوانەی لە قەسابخانەکەی موسڵ ڕزگاریان ببوو بۆ سلێمانی، پێشوازییەکی گەرمیان لێکرا، هەتا تاڵەبانییەکانی دوژمنی تەقلیدی سەیدەکان دەماری کوردایەتیان بزووت و لە ماڵەوە بەخێرهاتنەوەی سەیدەکانیان کرد، والی لە سلێمانی کەوتە چالاکیی لەگەڵ سەیدەکان، بە بەستنی کۆبوونەوەی گەورەی جەماوەریی بۆ سەیدەکان و پیاوماقوڵانی شار، بێجگە لە دوژمنەکانی شێخ سەعید، ئەوانی تر هەموو ئامادەبوون، والی تازە موتەسەڕیف و زۆربەی بەرپرسە گەورەکانی سلێمانی لەوێ گواستەوە، هاتنی والی لەگەڵ سەیدەکان بۆ سلێمانی و بەڵێندان بە سزادانی ئەوانەی دەستیان لەو کارەساتەدا هەبووە وەکو پۆزش هێنانەوەی فەرمیی بووە بۆ سەیدەکان، بەمەش ناحەزەکانی بنەماڵەی شێخ شەعید لە سلێمانی نیگەران بوون[343]. هەروەها ئەو مەرگەساتە زەمینەی خۆش کرد بۆ شێخ مەحمود وەکو سەرکردەیەکی کوردستانی باشوور بەدیار بکەوێ، ئەو بە تەنگەوە هاتنەی ئیتیحادیەکان بەرانبەر ڕووداوەکانی کوردستان لە گواستنەوەی موتەسەڕیف و گرتن و دادگاییکردنی تاوانبارانی ئەو مەرگەساتەی موسڵ، لە نییەت باشی ئەوانەوە نەبووە لە بەرانبەر سەیدەکان، یان کورد، بەڵکو لە پێگەی بەرچاوی سەیدەکان تێگەیشتبوون و پێویستیان بە هێورکردنەوەی ئەو بارودۆخە هەبووە کە دەسەڵاتی ئەوانی شلۆق کردبوو، دوایی هەر

[342] - FO.95\2310 No.19 Teleg. British Vice Consul Mosul, October 17,1909

[343] - FO.95\2310 No.19 Teleg. British Vice Consul Mosul October 17,1909

ئەوان بڕیارەکانی دادگای موسڵیان خستەلاوە، ئەمەش باشترین بەڵگەیە لەسەر قسەکەمان.

بە کورتی: شەهیدکردنی شێخ سەعیدی حەفید، وەکو شەهیدکردنی ئیبراهیم پاشای میلليی لاپەڕەیەکی بەرەنگاریی خویناوی کوردی ئارەزوومەند بوو، بۆ پارێزگاری لە سەربەخۆیی خۆجێی بەرانبەر ویستی ئیتیحادیەکان کە سووربوون لەسەر سەپاندنی ئیدارەی مەرکەزیی.

## بەڵگەنامەی ژمارە (1)، Y.MTV. 112/ 31

لە برووسکەیەکی مەحمود پاشای جاف دا بە نووسراوی (3)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (310\ 1893)ز دا هاتووە: هەندێ پیاوی خراپ بڕوبیانوو دەدۆزنەوە بۆ خراپەکانیان، ئەگەر داوام لێ بکەن بە درێژیی دەیخەمە بەردەستتان، بۆ مەبەستی هەقیقەتی ئەو حاڵەتە نووسراوێکم نووسی و بە برووسکە لە بەرواری (1)ی کانونی ساڵی (1310)ك ناردم، باس لە هۆی ناکۆکیی و رکابەری بەردەوامی نێوان شێخەکانی سلێمانی شێخ سەعید و نەقیبی برای کردووە، داوای یارمەتیان لێکردووە، لەگەڵ هەندێ هەڕەشە، ئەو کارە خراپانەی ئەوان دەیکەن پەشێوییان لە ناو هۆزەکاندا بڵاوکردۆتەوە و بوونەتە هۆی گەڕەلاوژە لە ئیدارەی لیوا، لە وەڵامی ویلایەت و هەردوو برووسکەی ناوبراو دەردەکەوێ پاشای ناوبراو هەوڵدەدات لایەنگر بۆخۆی دابین بکات و سکاڵا لە دژی عوسمان پاشای برای کۆدەکاتەوە کە قائیمقامی گوڵعەنبەرە، ئەم دەیەوێت لەسەر کاری لاببات و بۆخۆی بچێتە شوێنی و بە سەرۆك هۆزیش بمێنێتەوە، کار وا بڕوات بارودۆخەکە دەگۆڕێت بۆ مەسەلەیەکی سیاسیی و چارەسەر ناکرێت، بۆیە من وای دەبینم گرژیی لە ویلایەتەکە نەهێڵێن و ئەو لە ویلایەتی موسڵ دوور بخەینەوە هەتا کاری جەرگبڕانە روو نەدات، لە یەکێك لە ویلایەتەکانی بەغدا بیکەن بە قائیمقام، فەرمانی دوایی هەر چۆنێك بێت هی گەورەمان وەلی عەهدی هەموو لایەکە.

(5)ی شەعبانی ساڵی (312) (31ـ 01 ـ1895)

و(18) کانونی دووەمی ساڵی (310)

یاوەران بەڕێز حەزرەتی مەولانا سوڵتان دەروێش

## بەڵگەنامەی ژمارە (2) Y.MTV. 11l\31

بۆ حـەزرەتی دەروێش پاشا یاوەری بەڕێز مەولانا سوڵتان،

ج (7) کانونی یەکەمی ساڵی (310)

مەبەستم لە هەردوو برووسکەی پێشوو بۆ دەربڕینی ئامادەیی بوو لەگەڵ براو کوڕ و هۆزەکەم لە خەرجکردنی هەموو توانام بۆ رێزی سوڵتان، ئەوە پێنچ ساڵە خۆم و باب و باپیرم پابەندین بە خزمەتکردن لە سنووری دەوڵەتی عیللی عوسمانیی، ئەمەش بۆ هەمیشەییە، بەڵام شێخ سەعید و نەقیبی برای داوایان لە من کردووە یارمەتیان بدەم لەو ململانێ و ئاژاوەی ئێوە لێی ئاگادارن لە نێوان شێخەکانی سلێمانی، شێخ وای دادەنێ یارمەتیی بدەم هەتا ئەگەر چارەگران بم لە لای پایەی باڵا، ئەوکات داوای لێبوردنم بۆ بکات، ئەگەر یارمەتیشی نەدەم ئەوە هەوڵبدات عەریزە بداتە مابینی هەمایونی بۆ ئەوەی من دووربخەنەوە، هەروەها هەڕەشەی کۆکردنەوەی نووسینی عەریزەی خەڵکی تریشی لێکردووم، لە کۆنەوە ئەو شێخانە پێویستیان بە سۆزی باب و باپیرانی من بووە، پەروەردە و مەنسووبەکانی ئەوانە بە خۆیان و خزمانیانەوە لە سەد خێزان زیاتر نین و لە ئاست ئیرادەی سونی دا هیچیان لە باردا نییە، سەرەڕای بەردەوامیی لەسەر ئاژاوەگێڕیی، ئێستا سەغڵەتن و بیردەکەنەوە داوای پاسەوان بکەن، ئەوانیش لەسەر ئاژاوەگێڕیی و گەندەڵیی هەر بەردەوام بن و دەیانەوێ تابوورێکیش سەرباز بە خۆیانەوە سەرقاڵ بکەن و ئاڕاستەی رەزامەندیی هەندێ کەسیش لە بەرانبەر گەورەیتان بگۆڕن، ئەو کاتەی لە خانەی بەختەوەری (دار السعادە) بە هۆی خزمێکی سوڵتان بە ناوی ئەمین بەگ بە ئامادەبوونی پاشا و کاتبی یەکەم ئەو بابەتەم خستە بەردەم بەڕێز مەقامی خەلافەت، خراپیی باری عێراق رۆشنە لە لای هەموو ئەو بەرپرسانەی سەردانی ناوچەکەیان کردووە، بۆ ئەو کۆسپە ئاژاوەگێڕیی و گەندەڵیی قسەم لەگەڵ ئەو هۆزانە کردووە کە ئەو هانیداون و بوونەتە هۆی خراپیی باری گشتیی ئیداری لیوا، زۆر شت هەیە پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە و ناتوانم بە هۆی نەبوونی کلیلی جوفرەوە روونی بکەمەوە، هەروەکو دواکەوتنی برووسکە بە هۆی ئەوەوە بووە. تکایە ئاگاداربن.

(1)ی کانوونی دووەمی ساڵی (310) (13ی کانوونی دووەمی 1895)

سەرۆک مەحمود جاف

# بەڵگەنامەی ژمارە (3)

Za.1311\101. 16 Irade –Hususi

کۆشکی یەڵدزی هەمایونی

سەرۆکایەتی بەڕێوەبەری نووسین.

داوا دەکرێ (زاویە)ی پیرۆزی شێخ سەعید ئەفەندی کوڕی کاك ئەحمەدی شێخ لە باجی میرانە و ئیملاك و زەوی و مەڕ و میرانە ببەخشرێ، کە خوا لێخۆش بوو کاك ئەحمەدی شێخ لە سەیدە بەرێزەکانە و هەنگاوی نابوو بۆ بڵاوکردنەوەی زانست و پیرۆزیی تەریقەت، هەوڵی دابوو بۆ ئەوەی بەربەست بێت لە بەردەم پەرەسەندنی مەزهەبی شیعە لە هەموو لایەکی وڵاتەکەی، خزمەتی بەرچاوی مەملەکەت و دەوڵەتی عوسمانیی کردووە، شێخ سەعیدی کوڕیشی لەسەر ڕێڕەوی باوکی دەڕوا، هەوڵی بانگەوازی خێرە بۆ حەزرەتی مەولانا سوڵتانی خاوەن بەرزی و شکۆ، ئەو پیاوە بەڵێنی داوە بە هەموو توانای، زانست و فێربوونی بنەمای ئایینی پاك بڵاوبکاتەوە بۆ بەرهەڵستی مەزهەبی شیعە، حەزرەتی خاوەن موقامی خەلافەت بە گونجاوی بینیوە لەگەڵ ئەو خانەوادەیە و ئەو زاویەیە بە لوتف و سۆزەوە بجولێنەوە، بەڵام ئەوە تێکەڵ نەکەین لەگەڵ ئیستغلالکردن. لەسەر ئەندازەی ساڵانەی باجی ئیملاك و تاپۆ و مەڕ و میرانەی پەیوەست بە شێخ سەعید ئەفەندیی و براکانی و ئەو زاویە پیرۆزەی ڕێنومایی و روونکردنەوەی هەیە کە دەکاتە بیست و هەشت هەزار و پێنج سەد قوروش، بە خواستی ئیرادەی سوونی حەزرەتی خاوەن موقامی خەلافەت کە لەو بارەیەوە هاتووە ئەنجومەنی وەکلای تایبەت بەو بابەتەی هانداوە، ئاکامی ئەمە بۆ گلەیینامەی باڵا کۆنووسی ناوبراوی ناردووە بۆ موقامی سەدارەتی باڵا. ئەمەش بە فەرمانی خاوەن فەرمان.

(28) زولقەعیدەی ساڵی (1311) ك/

(2) حوزەیرانی (1894ز) سەرۆکی

بەڕێوەبەرایەتی نووسین سورەییا.

## بەڵگەنامەی ژمارە (4)

Irade – Husui 16 .s.1323

کۆشکی یەلدزی هەمایونی

سەرۆکایەتی بەڕێوەبەری نووسین.

بیرخەرەوەی تایبەتی بۆ مەقامی سەدارە بە مێژووی (7) سەفەری ساڵی (1323) (12نیسانی 1894) بەرزکراوەتەوە لەسەر برووسکەیەك کە لە موسڵەوە هاتووە، کە بە هۆی شاڵاوی ئەوان بۆ سەر هۆزەکانی سلێمانی و کەرکووك و هێرشکردنە سەر هەمەوەندەکان بە ناوی تۆڵەسەندنەوە، پێویستە شێخ سەعید ئەفەندی سلێمانی و کوڕەکەی بۆ خانەی بەختەوەری (دار السعادە)و ژمارەیەك لە شێخەکان لە سلێمانی، دووربخرێنەوە. ئەوەی گومانی تیا نییە رووداوەکان بە هۆی گەندەڵیی کارگێڕیی ئیداری کاربەدەستانی محەلیەوەیە، گوێڕایەڵیی شێخ سەعید و راستگۆیی داوامان لێ دەکات بایەخ بە زامنکردنی چاودێریی و زیادکردنی خۆشەویستیی خەڵکیی و موسڵمانانی ناوچەکە بدرێ. ویستی ئیرادەی سوونی حەزرەتی خاوەن مەقامی خەلافەت هەندێك راسپاردە بۆ ویلایەت دەردەکات بۆ دیاریکردنی ئەوانەی داواکراوە بگۆڕێن لە موتەسەڕیف و والی. فەرمان بۆ حەزرەتی خاوەن فەرمانە.

(19) سەفەری (1323) (24نیسانی 1905)

سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی نووسین

## بەڵگەنامەی ژمارە (5)

MV.84.35

کۆنووسی تایبەت بە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی راسپێردراو (الوکلاء) لە بەرواری (24) شەوالی ساڵی (311) (2نیسانی 1895ز) بە کورتی: ئەنجومەن هەڵگیرا بە نووسینی بیرخەرەوەیەکی فەرماندەی سوپا بە مێژووی (14)ی شەوالی ساڵی (312) بە هاوپێچی برووسکەیەکی موشیریەی هەمایونی شەشەم، لەسەر ئەوەی فەرماندەی موسڵ لە ویلایەت بایەخ بە چاککردنی نەوەکانی خوالێخۆش بوو کاك ئەحمەدی شێخ نادات، لایەنگریی زۆردار دەکات و مامەڵەی خراپی موفتی پێشوو بە درێژایی سنووری

سلێمانی خەڵکێکی زۆر چەکیان هەڵگرتووە، هەروەها خێڵەکانی ئێرانی سوونی دەستیان لە کاروباری ئەوێ وەرداوە،، ئەمەش زیانی سیاسیی لێکەوتۆتەوە، ئەوەمان لەگەڵ برووسکەی رۆژی (24)ی ئازاری ساڵی (311) گرێداوە کە واژۆی سەید حەسەن و سەیدەکانی بەرزنجەی لە سلێمانی پێوەیە، دانپێدانانیان لەسەر بڕیارە هەیە.

ئەگەر هەوڵ بدرێت بە ناوبژیوانیی ناکۆکیی نێوان سەیدەکانی سلێمانی نەمێنێت، ئەوە خواستی ئاینیی سوونی مەزهەب و خاوەن مەقامی خەلافەت دێتەدی، ئەوەی ئاگاداریە بەردەوامەکانی سلێمانی نەدەگەیشتە ویلایەتی موسڵ، هەندێ جار هەندێکیان گەیشتنە ویلایەتی موسڵ و ئاشتکرانەوە، بەڵام بەپێی قسەکانی فەرماندەی موسڵ کە باسمان کرد، هێشتا خەڵکێکی زۆر بە درێژایی سنووری سلێمانی چەکیان هەڵگرتووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هێشتا ناکۆکیەکە کۆتایی پێ نەهاتووە، برووسکەکانی سلێمانیش پشتگیریی قسەکەمانن، بە هۆی بەردەوام بوونی ئەو ناکۆکییانە ئاسایی نەبوونی نێوانیان، ئەنجومەن بە پێویستی دەزانێ ئاگاداری ویلایەتی موسڵ بکاتەوە و کاری تێبکات رێوشوێنی کارا لەو بارەیەوە بگرێتە بەر بۆ بنبڕکردنی ناکۆکیی و رێگەگرتن لە کارەسات، کە جێی ڕەزامەندی پایەبڵندانە.

واژۆی بەڵگەنامەکان

## بەڵگەنامەی ژمارە (6)و (7)

Lef 3 رووی یەکەمی لاپەڕە.

شێخ سەعید کوڕی کاك ئەحمەدی سلێمانی، سەرۆکی سەیدەکانی ئەو ناوچەیە، بە هۆی ئەو پەیوەستیە بیروباوەڕەی لە خوا لێخۆشبوو کاك ئەحمەدی شێخەوە بۆی ماوەتەوە، خۆی بە سەرۆکی هۆزی جاف و هۆزەکانی تر دەزانێ، لەو کاتەی پێویستی بە هۆزەکانی دەوروبەری سلێمانی دەبێت پەنا دەباتە بەر حکومەتی سوونی و پڕووپاگەندە لە ناو ئەو هۆزانە بڵاودەکاتەوە کە لە ژێر گوێڕایەڵی ئەودا نین، وەکو هۆزی هەمەوەند و ئەوانی تر، سەیدەکانی سلێمانی و هۆزەکانی دەورووبەری و ئەو هۆزانەی ناومان بردن، ئەگەر چەکدار بکرێن هێزێکی بایی هەڵگەڕانەوەیان لێ پێکدێت، هەموو فەرماندە و موتەسەڕیف و فەرمانبەرانی هاتوونەتە سلێمانی و داواکاری ئەویان

قبوڵ نەکردووە و بە ناڕەوایان زانیوە، ئەو کارانە زیان بە خەزێنەی دەوڵەت دەگەیەنێ و تێکدەگیرێ لەگەڵ یاسا و سیستم و بنەماکان و بوختان و ساختەن و هیچ بنەمایەکیان نییە، دۆستانی و شەریکە بەشەکانی خۆی وا لێکردووە سامانی حکومەت تالان بکەن و دەست بەسەر موڵکی گشتییدا بگرن، دەتوانێ لە لای موقامی باڵا فێڵ بکات و هەوڵی لابردن و دوورخستنەوەی خەڵکیی بدات، بەمەش وای کردووە هەموو لێی بترسن و ناچاریان بکات بە ڕەزامەندیی ئەو بجوڵێنەوە، لە ڕاگەیاندنی حکومەتی تازە دەتوانێ هەرچی مەبەستی بێت بەدەستی بهێنێت، بەڵکو لە حکومەتی رابردووش حاکمی بێ رکابەر بووە، هەروەها شێخ توانیبووی سۆز و بەزەیی حەزرەتی مەولانا سوڵتان، سێبەری خوا لەسەر زەوی و خەلیفەی مسوڵمانان و عوسمانییەکان بە تایبەتی، بەدەست بهێنێ، موچەیەکی مانگانەی بۆ ببڕنەوە، بە نزیکەی چل هەزار قورش، ئەمە سەرەڕای سوود وەرگرتن لە پێگەکەی دۆستانی خۆی، کە بە کاربەدەستی دامەزراندوون، جگە لەوە بە ئەندازەی حەوت، یان هەشت لەو موچەیە داهاتیان لێوەردەگرێ و بەشێکی زۆر کەم نەبێت نایگەڕێنێتەوە بۆ خەزێنە، هەروەها لە باجی مەڕ و ئیدارەی سەربازیی و شتی تر بوێردراون، لەگەڵ خەرجییە پێویستەکان، هەتا لە زەمانی دەیەکیش وا مامەڵەی لەگەڵ کراوە کە لیوای سلێمانی تووشی هەژاریی و پێویستی بوو. دووەم کاتێك حکومەت پەنا دەباتە بەر سەرکۆنەی ئەوانەی ناکۆکن لە نێوان خۆیاندا نابێت ئەو دەستی یارمەتی و دەسەڵاتیان بۆ درێژ بکات. ئەو کات تاوانباران لە دەستی زەبت و دادگەریی دەردەچن، ئەو سیاسییانە مامەڵە دەکات و بکوژان دەپارێزێ، ئینجا حکومەت دەستەوستان دەوەستێ بەرانبەر بیرخەرەوە و هەزاران شاهید، ئەوکات سام و هەیبەتی حکومەت نامێنێ و سام و هەیبەتی ئەو زیاد دەکات، لێرەدا شێخی ناوبراو سەردەکەوێ لە باوەڕی خەڵکی لە تاوانبارکردن و بوختان بۆ هەڵبەستن بە شایەدی بەدرۆ بۆ ئەو کاربەدەستە مەدەنی و سەربازیانە، ئەوانە بە ڕێگەی حکومەتەوە سەر شۆڕ دەکەن و لە لایەکی ترەوە لە دەستی حکومەت رزگاریان دەکات، هەتا ئەگەر گەورەترین شۆڕشیان کردبێت، ئیتر وردە وردە پەیوەندیی مەعنەویی خەڵکیی پێوەی چەند هێندانە بەهێز دەبێت، هەتا خەڵکی رەش و رووت داننانێن بە گوێڕایەڵیی بۆ حکومەت و لە ترسان دەبنە کۆیلەی شێخ، شێخی ناوبراو لە کاتی دوورخستنەوەی هەمەوەندەکان هەندێ زەوی بێ تاپۆی لە حکومەت کڕی بوو،

کاتێ هەمەوەندەکان لە دەستبەسەری هەڵاتن و گەڕانەوە سەر زەویەکانی خۆیانو دەستیان کردەوە بە کشتوکاڵ کردن، بە هۆی ئەو زیانەی بە گەڕانەوەی ئەوان پێی کەوت بوختانی بۆ هەڵدەبەستن، هەر لەو ماوەیەدا زوڵمێکی تری لێ بە دیار کەوت، ئەویش بە کوشتنی سەید نوری سەید حەسەنی کانی کەوالی، ئەوان خوێنەکەیان داوا دەکرد و کار گەیشتە لای مەقامی حەزرەتی سوڵتان، بە جددیی مەفرەزەیەك سازدراو کەوتنە دووی گرتنی زۆراب و هیدایەت لە تیرەی سەفەرەوەندی سەر بە هۆزی هەمەوەند، بەڵام ئەو بەڵێنانەی بە شوێنکەوتووانی داوە کە سەر بە ڕەچەڵەکی سەیدانن، لە سایەی ئەودان لە لای خەڵکی سلێمانی ناسراون بە دزیی و هەموو جۆرەکانی بەدڕەوشتی، هەتا هەندێکیان بە سووك و ناتەواو ناسراون. لە هۆزەکانی جاف و روغزایی هەوڵی داوە بە سامان و دەسەڵات و چەك و تەقەمەنی، ئەو ماڵە تاڵانییەی لە کاتی شەڕدا دەستیانکەوتووە توانیویەتی هەڵیان بخەڵەتێنن و نزیکەی هەزار سوارە و پیادە کۆبکەنەوە و بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود بینێرن بۆ گوندی داریکەلی، کە چوار تا پێنج سەعاتەڕێ لە سلێمانییەوە دوورە، هەروەها لەو گوندەوە دووسەد کەسی لەو هێزەی کە شێخ سەعیدی بەڕێوەبەری قەرەداغ کۆی کردبۆوە، یەکێك بووە لە خزمەکانیان و لە لیوای سلێمانی بە زاڵم ناسراوە، وا بە دیار دەکەوێ بۆ سووتاندنی گوندەکانیان سوورن لەسەر هێرشکردنە سەر هەمەوەند، زوو پەیوەندییمان کرد بە موتەسەڕیفی سلێمانییەوە، بابەتەکەمان خستەڕوو و برووسکەیەکمان لەو بارەوە کرد، ئامادەیی وەرگیراو بەرەو ئەو داوایە پاڵیان نا، بەڵام ئامۆژگاریی ئەو مەفرەزە سەربازییەی لە چەمچەماڵەوە رەوانەی گوندی داریکەلی کرابوو، بە سەرۆکایەتی بەگباشی مستەفا ئەفەندی بۆ لای شێخ مەحمود ئەفەندی شایستەی وەرگرتن نەبوو، چونکە ئەو مەفرەزەیە نەیتوانیوە بە زەبری هێز کاری وا ئەنجام بدات، لە کاتی گەڕانەوەی ئەو مەفرەزەیە بۆ چەمچەماڵ بە هۆی زیادبوونی ژمارە و ئەو تۆپەی لەوێ بووە لەگەڵ ژمارەیەکی کەمی هەمەوەندان لە گوندی بەگەجانی تێکگیران و شێخ نەجمەدینی برای سەید نوری کوژرا، کە برایەکەشی پێشتر کوژرا بوو، بەگباشی مستەفا ئەفەندی لە کاتی گەڕانەوەی لە چەمچەماڵ لێکی جیاکردنەوە و پێکدادانەکەی وەستاند، کاتێ بینی شێخ سەعیدی سلێمانی بەو ئاگادارییانە وازناهێنێ و هێز کۆدەکاتەوە، ئەمیش ناچارە هێز بەکاربهێنێ، بە برووسکەی رۆژی (7)ی ئازاری ساڵی

(321) کە ناردم بۆ دەروازەی باڵا، ویلایەتی پایە بڵندم ئاگادارکردەوە، ئەگەر بیهێنییە ژێر باری گوێڕایەڵیی چار نییە بێجگە لە بەکارهێنانی هێز، مەقامی سەدارەتی باڵاش ئاگادارە بە ناوەڕۆکی ئەو برووسکەیە، ئەگەر ئەمە ناگونجێ لەگەڵ ڕەزامەندیی ئێوە و بەکارهێنانی چەك لە دەرەوەی دەسەڵات، من ویلایەتی پایە بڵندم ئاگادارکردەوە کە بەگیاشی مستەفا بەگم لە چەمچەماڵ گەڕاندەوە، ئەمە گونجاو بووە لەگەڵ ڕەزامەندیی باڵا و ئێمەش ڕێنومایی حەکیمانەی ئەو هێزانەمان کرد کە پابەندن، ئەوە بە باشیی بەرژەوەندیی دێتە دی و ئۆقرەیی و ئاسایش زامن دەکات.

لە لایەکی ترەوە بە فەرمانی حەزرەتی مەولانا سوڵتان، سێبەری خوا لەسەر زەوی، بە ویستی سوڵتان لە لایەن سەرۆکایەتی بەڕێوەبەری هومایونی، لە بەرواری (17)ی ئایاری (321) ئاگادارم کردەوە کە دەرفەت نەدرێ خوێنی موسڵمانان بڕێژێ، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی خێرای ئەو قەرەباڵغیە، شێخی ناوبراو لەوە ئاگادارە، بە زمانێکی گونجاو تێگەیەنراوە کەکارکردن بەئەمە نیشانەی دڵسۆزیو گوێڕایەڵیە، بەڵام ناوبراو بەپێچەوانەوە هێزەکانی بڵاوە پێنەکردووە، بەڵکو لە هەوڵی زیادکردنی هێزی تر دابوو لە هۆزەکانی پشدەر و شوان و شێخ بزێنی، بەڵام خوا دەستی نەدا. پێمان وابوو بەو هێزەی کۆی کردۆتەوە دەتوانێ بەسەر هەمەوەند زاڵ بێت یان هەموویان بەچەکەوە بگرێ، لە دووەم ڕۆژی ئاگادارکردنەوەکەی کە ڕاستەوخۆ بە ویستی سوڵتان ئاگاداریی درایە، بەڵام ئەم لە داریکەلیەوە هێرشی کردە سەر هەشت گوندی هەمەوەند، وەکو سورتکە، ئەڵڵایی، بازیان، سەروچاوە، تەکیە، کڵاشکەران، جولومەك، ئەحمەدە ڕەش، وەکو حەیوان هەموو کشتوکاڵی ئەو گوندانەیان کوێرکردەوە و زیانی زۆریان لێدان، کاتێك ئەوانە ڕێگەی بازیانیان گرت هەمەوەند ناچار بوون لە گوندی پیربادی و موزەفەری نزیك قەزای بازیان پەنابەرن بۆ ئەو هێزە سەربازیەی ناو قەزا، موتەسەڕیفیەتی سلێمانی و فەرماندەکانی لە ڕێگەی فەرماندەی بازیان میر ئالآی تۆفیق بەگ لەسەر ئامادەیی بۆ قبوڵکردنی داواکارییەکانی سەیدەکان و شێخی ناوبراومان ئاگادار کردەوە، بەڵام وەکو لە وەڵامی پێشووتر ڕوونکراوەتەوە ئەو ڕازی نەبووە، بەوەندەش وازی نەهێنا، بەڵکو لێکدانەوەی سەیر و سەمەرەی بۆ قەدەغەکردنی سەربازیی سوڵتانی کردووە و بە جۆرەها بوختان و ساختە کەسایەتی میر ئەڵڵایی لەکەدار کردووە، ئەو ڕۆژی بیست و پێنجی ئازار خۆی ئامادە دەکرد بۆ هێرشکردنە

سەر چەمچەماڵ، لەو کاتەدا نزیکەی چل کەسی هەمەوەند بۆ بەرەنگاریی سوارەکانی هۆزی روغزایی و گەڵاڵی چووبوون، لەو شەڕەدا سەرۆکی روغزائی کوژراو هەندێك بریندار بوون، ئەوانە ناچاربوون بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان و پچنە لای سەیدەکان، هێزەکە تەقەی چڕیان کردە سەر هەمەوەند، بەڵام ئەو چل هەمەوەندە بە هۆی کارامەیی لە شەڕ و باش ئاگاداربوونیان لە خاکی ناوچەکەیان کە شوێن و زێدی خویانە بەرەو رووی ئەو هێرشە نارەوایە بوونەوە و هێرشکاران پەرت و بڵاویان لێکرد، هەر لەو ماوەیەدا پاشماوەی هێزی هەمەوەند لە هەردوو گوندی پیربادی و موزەفەر کە ژمارەیان دووسەد و پەنجا کەس بووە بەرەو شەڕگەکە هاتن، کە بینیان ئەوانە دێن هەتا سەنگەری قایمیشیان پێبەجێهێشتن، ترس و تۆقاندنی ئەو هەمەوەندانە کە ژمارەیان لە سێ سەد کەس زیاتر نەدەبوو، گەڕانەوە بۆ گوندی داریکەلی، هێزی هەمەوەند بە دوایانەوە بوو، هەندێکیان لەوێو بەشەکەی تریان لە شوێنی خۆی کەوتنە شەڕ، تێکشکانی ئەوان لە لایەن ئەو هێزەی هەمەوەند کە بە کەمتر لە یەك لەسەر پێنچ دادەنرێ، ئەمە بە هۆی بێ ڕێزیی شێخ سەعید ئەفەندی بووە لەوەی بەهای بۆ خواستی سوڵتان دانەناوە، بڵاوەی بە هێزەکەی نەکردووە، بە پێچەوانەی رەزامەندیی پایەبڵند جوڵانەوەتەوە، بۆیە تووشی ئەمە بووە، بێگومان ئەمە کەرامەتی حەزرەتی مەولانەمان سوڵتانە، کاتێك شێخی ناوبراو جاف و هەموو هۆزەکانی تری لە سلێمانی لە بەرانبەر کۆشکەکەی خۆی بینی و لە ڕوو وەرگێڕانی لە هەمەوەند، گوێی لەو هۆزانە بوو کە گلەییان لە چەك هەبووە، بەڵام سەیدەکان بۆ فریاکەوتنی ئەوان هیچیان نەکرد، ناردنی بۆ شەڕ هەتا هیچیان پێنەمێنێ، هەستی بە پەشیمانی کردووە، کە گوێی بە ویستی سوڵتان نەداوە، لە لایەکی ترەوە کەسایەتیی و پایەی لای خەڵك نەماوە، لەگەڵ ئەوەشدا رایگەیاندووە بەو هێزەی بەسەر هێزە هێرشبەرەکاندا سەکەوتووە و ئیرادەی سوڵتانی بەجێهێناوە، بەڵام ئەو لوتی شکاوە و بەخراپی تێکشکاوە، کەچی هەر زوو دەستی بە درۆ و ناڕاستیی کردووە، داوای کردووە هێزی سەربازیی بۆ بنێرن بۆ پاراستنی داچێنراوەکانی داریکەلی کە ناوەندی رووبەڕووبوونەوەی هێزە هێرشبەرەکانی سەیدانە کە بەپێی تاپۆ بوونەتە خاوەنی ئەوێ و گوندەکانی دەورووبەری، ئەمەش بۆ ئەوەی هەمەوەند نەیسوتێننو خراپی نەکەن، فەرماندەی بازیان و قائیمقامی ئەوێ بۆیان دەرکەوتووە هەمەوەند زات ناکەن تۆڵە لە شێخ خۆی بکەنەوە، بەڵام بە پێی ئەو زانیارییانەی پێمانگەیشتووە داوا

له حکومەت دەکەن نەهێڵێ شێخ زوڵمیان لێبکات، بەڵام فەرماندەی ئەو تیپە وەڵامی برووسکەی داونەتەوە کە ئەو جۆرە شاڵاوە سەربازیانە مەترسی نییە و هێزی پاسەوانی ناداتێ، کە داوایان کردبوو، لەگەڵ ئەوەش شێخ مەحمودی کوڕی و شێخ شەعید و بەڕێوەبەری قەرەداغ لەگەڵ سەد کەسێك لەو شوێنە ماونەتەوە، لەو بارودۆخەی پێشتر باسمان کرد دەردەکەوێ پڕوپاگەندە لای بەڕێوەبەرایەتیە باڵاکان هەبووە، کە شێخ بە هۆی هێزی شێخایەتی خۆیەوە دەتوانێ خەڵك بە شێوەیەکی گشتیی لە هۆزە جیاجیاکانی لیوای سلێمانی کۆبکاتەوەو چی بوێ پێیان بکات، هەر کارێکی مەبەستی بێت بەدەستی بهێنێت، بوختان و تاوان درووست دەکات و کاربەدەستە سەربازیی و مەدەنییەکان ئاڕاستەو ڕێنومایی دەکات، نموونەی وا زۆرە، بە گشتیی ترس و بیمی لە ناو خەڵکی سلێمانی بڵاوکردۆتەوە، کە ناوێرن لە فەرمانی دەرچن. هەروەکو تێڕوانینی گەورەمان سوڵتانە کە ئەمە لە ئەهلی گوێڕایەڵیی و ساغبوونەوەیە و دەبێت پایە و گۆشەی شەریفی هەبێت، لێرەش دەتوانێ زیاتر زوڵم بکات و خواستە شەخسیەکانی بەدەست بهێنێت، لە هەمانکاتدا پێچەوانەی ڕەزامەندیی پایەدار و یاسا تاوانی گەورەی ئەنجام داوە، وەکو چەکدارکردنی بەشێکی خەڵکەکە و بەگژابردنی ئەوانی تر، ئەوان فێری کوشتن و سوتاندنی ماڵ و سامانی خەڵك و وێرانکردن و دزی و زەوتکردن دەکات، ئەمەش پێچەوانەی گوێڕایەڵیی گەورەمان خاوەن تاج و سوڵتانە. لە واقیعدا بە ناڕەحەتیی نەبێت ئەو ناتوانێ هەزار پیاو کۆبکاتەوە.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ بە جۆرێ لە کەس شاراوە نییە، ئەو هێزەی نییە وەکو بانگەشەی بۆ دەکات، شەرمەزارە و تووشی تێکشکان بووە، پوختەی قسان ئەوەیە ئەو بارودۆخەی خستمانەڕوو زیان بە دارایی لیوای سلێمانی و توندوتۆڵکردنی دەگەیەنێ و ڕێگە لە خەڵك دەگرێ کە گوێڕایەڵیی حکومەت نەکەن و قبوڵی فەرمانی لێپرسینەوەی ئەو بن، لە ڕاستیدا راستگۆیی وەفادارییمان و گوێڕایەڵیمان بۆ حەزرەتی مەولانا سوڵتان وامان لێ دەکات دڵنیا بین بە هەر شێوەیەك بێت دوورخستنەوەی شێخ و کوڕەکانی و خزمەکانی لە لیوای سلێمانی پێویستە. فەرمانیش لای حەزرەتە و ئەو خاوەن فەرمانە.

(30) ئایاری ساڵی (321)

موتەسەڕییفی لیوای سلێمانی – ئەمیر لیوای (22)

ئەحمەد تۆفیق سالح سالم

## FO 195\2308
## سەعادەتی. ج. لۆتر باڵیۆزی حکومەتی گەورەی بەریتانی- ئەستەنبوڵ (14)ی کانونی دووەم (1909) موسڵ

گەورەم:

شەرەفمەندم راپۆرتێکتان لەسەر رووداوەکانی رۆژی سێشەممە و چوارشەممەی رێکەوتی چوار و پێنجی ئەم مانگە بۆ بنێرم، ئەمە لە کاتێکدا زانیارییەکانمان زۆریان پەیوەستن بەو راستیەوە، پێشتر راپۆرتێکم لەسەر ئەو بابەتە بۆ ناردن، بەڵام هەتا ئێستاش هەندێ لێڵی لەسەر ئەو رووداوە هەیە.

لێرە خەڵکەکەی دوو بەشن: بەشێك لەگەڵ سەیدەکانن و بەشێکی تر دژیانن، بۆیە هەندێ جار زەحمەتە زانیاریی بابەتیانە و بێلایەن دەست بکەوێ.

وەکو بەدیار دەکەوێ ئەم کارەساتە بەم شێوە بووە:

بۆ رۆژی پێنجەم کە دەیکردە سێشەممە، سێ گەنج مانەوە، ئەوانیش: شێخ مەحمود و ئەحمەد بەگ کوڕی مستەفا بەگو بەها کوڕی حاجی عەبدوڵڵا، لەبەردەم ماڵی مستەفا بەگ کە لەسەر شەقامەکە هەڵکەوتبوو، دانیشتبوون، بەها بەگ ئافرەتیکی موسڵاوی بینی لە ناو خەڵکەکە داخزاوە و سوارەیەکی کوردی دەستی دەگرێ و رایدەکێشێتە ماڵەوە، ئەو رۆژە هەوا خۆش و سێیەم رۆژی جەژنی قوربان بووە، لە کاتێکدا ئەو مەیدانەی ژنەکەی لێ سوڕاوەتەوە نزیك بانکی عوسمانیی و لە شوێنە قەرەباڵغەکانی موسڵە.

بەها لەناو کۆمەڵە ئافرەتێکی موسڵاوی تردا چاوی بەو ئافرەتە دەکەوێ، داوای لێکردبوو لەگەڵی دا بچێتە ماڵەوە، بەڵام ئەو ئافرەتە قبوڵی نەکرد و بە دەنگی بەرز هاواری کرد، ئافرەتەکانی تریش لەگەڵی دا هاواریان کرد، بە خێرایی هەواڵ بڵاو بۆوە، سەربازە کوردەکانی سەر بە تیپی چوارەمی پیادە، ئابڕووی ئافرەتێکی موسڵاویان بردووە، بە هۆی ئەمەوە هەندێ موسڵاوی لە شوێنی رووداوەکە کۆبوونەوە و سەربازە کوردەکانیش تەقەیان کرد، هەندێ بە خراپی پێکران، مەفرەزەی سوپا هەر زوو گەیشتە شوێنی رووداوەکە، بەڵام ئەوەی زیاتر کارەکەی ئاڵۆز کرد ئەو سێ لاوە کوردەی ناومان هێنان لە پەنجەرەوە تەقەیان لە ئاپۆڕای جەماوەرەکە کرد.

ئەندامانی تیپی چوارەم لەگەڵ ئاگاداربوونی بەسەرهاتی برادەرەکانیان گەیشتنە شوێنی رووداوەکە، لە هەمانکاتدا ئاپۆڕای خەڵکی موسڵ زیادی کردو ژمارەی چەکدارەکان لە شوێنی رووداوەکە زۆر بوو، لەو کاتە زۆربەی ماڵەکانی موسڵ چەکیان هەبوو، ئەو تیپە سەربازیەی کەرکووك هەر زوو کە زانیان ژمارەی ئەوان لە بەرانبەر ئاپۆڕای جەماوەر کەمە کشانەوە بۆ پێگەیەکی سەربازیی نزیك رووداوەکە و لەوێ سەنگەریان گرت، بەڵام ئەو پێگەیە تەلارێکی کۆن و خراپ بوو، قاتی سەرەوەی نەمابوو، تەلاری بانکی عوسمانیی و تەلاری شارەوانیی و تەلارەکانی تری دەورووبەری بەسەریاندا دەیڕوانی، سەرباز و چەکدارە موسڵاویەکانیش لە پێگە سەربازییەکەی نزیك بە سوارە کوردە کەرکووکیەکانەوە سەنگەریان گرت و دەستیان کرد بە تەقە، ماوەی سێ سەعات شەڕ بەردەوام بوو، هەتا کاتی سەردانی والی و یاریدەدەری قونسوڵی فەڕەنسیش، تەقە هەر هەبووە، دیارە لەدوای گەڕانەوەی قونسوڵی فەڕەنسیی شەڕ وەستاوە، ئێوارە سەربازە کەرکووکیەکان خۆیان بەدەستەوەداو وەکو بارمتە لە سەربازگەکەدا گیران، هەر لە ڕۆژی یەکەمدا ژمارەی کوژراو لە نێوان (30ـ 50) کەسدا بووە، لە ناویاندا ژمارەیەك ژن و منداڵ هەبوون، کاتی نیوەڕۆ والی و فەرماندەی حامیە زۆر بە درەنگەوە گفتوگۆیان دەستپێکرد بۆ چارەسەری کێشەکە، بەڵام هەتا ئێستاش باسەکانی گفتوگۆیەکە نازانین چی بووە، فەرماندەی عەسکەریی نزیکەی (850) سەربازی لەبەر دەستدا بووە، والیش لە سەرەتاوە هەتا گەرم نەبووە، هەڵوێستی جددیی لەو کارە نەنواندووە، لەو کاتەی والی گەیشتە حامیەکە، لەوێ بوو کە قازی و فەرماندەی لیوا ئەنیس بەگ (سەرۆکی هێزی سوارە) و نەقیب راشیح بەگ و نەقیب سەعید بەگ (ئەفسەری ئەرکانی جەنگ لە موسڵ) و مولازم ناتیق ئەفەندی و ژمارەیەك لە زانایان و پیاوماقوڵانی شار لە داڵانی ناوەوەی نزیك بە سەربازگەکە کۆببوونەوە و چارەسەریان لانەبوو چۆن دەست بەسەر قەیرانەکەدا بگرن، ئەفسەرانی جەندرمە (400) مەتر لە حامیەی نزیك بە سوارە کوردە گیراوەکانەوە پاسەوان بوون، کە کارەساتەکە روویدا، گفتوگۆیەکی بێ بەرهەم دەبیسترا لە نێوان والی و زانایانی شار، ئەوان داوایان لە والی کرد رێگەیان بدا بچنە شوێنی رووداوەکە، بەڵام والی بەر لە گەڕانەوەی رێوشوێنی بۆ پاراستنی پیاوانی قونسوڵیەتی بەریتانی لە موسڵ و ماڵەکانیان و کومپانیای (لینج) دانا، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ مەترسییەك لەسەر

بەرژەوەندییەکانی بەریتانی نەبووە، من داوام لە والی کرد رێوشوێنی پێویست بگرێتە بەر، چونکە فەوزا هەموو شاری گرتبووەوە، بەڵام والی لەگەڵ ئەوەشدا هێزی نارد بۆ پاسەوانی قونسوڵیەتی بەریتانیی و فەرەنسیی و نەی نارد بۆ دابینکردنی ئاسایشی کۆمپانیای لینج، چونکە دوور بوو لە شوێنی رووداوەکەوە، لە دوای رۆژئاوابوون شار ئارام بوو، بەیانییەکەی شەشی کانونی دووەمی (1909)ی رێکەوتی چوارشەم زانرا کە سەربازە کەرکووکیەکان خۆیان بەدەستەوە داوە و لە حامیەکە دەستبەسەرن، دواتر هەواڵ بڵاوبۆوە کە وەفدێکی زانایانی موسڵ چوونەتە سەردانی والی و داوایان لێکردووە سەربازە کەرکووکیەکانیان بداتە دەست ئەوان، چونکە دەستدرێژیان کردۆتە سەر ئابرووی ئافرەتی موسڵاوی، والی ئەمەی قبوڵ نەکردووە و هەر لە بارەگای خۆی ماوەتەوە، جەماوەرەکەش بێئومید بوون و بەو حاڵەتەوە بە رێنومایی و دەمڕاستیەتی ئەبوجاسم ناوێك، بەرەو دەرگای ئەو ماڵە رۆیشتن کە شوێنی حەوانەوەی شێخ سەعید و خزمەکانی بووە، شوێنی حەوانەوەی شێخ لە بارەگای ئیدارەی حکومەتەوە تەنیا (100) هەنگاو دەبوو، بۆیە وا چاوەڕوان دەکرێ بەرپرسانی حکومیی لەوێوە چاودێریی رووداوەکەیان کردبێت.

ئاپۆرای جەماوەر بە سەرۆکایەتی ئەبوجاسم ئاڵای سەوزیان بەرزکردەوە و هێرشیان کردە سەر ماڵی شێخ سەعید، ئەوانە دەرگای ماڵی شێخیان شکاند و بەمەش تاوانێکی قێزەونیان ئەنجام دا، لە کاتی گەمارۆدانی ماڵی شێخ چەقۆ و خەنجەریان بەدەستەوە بوو، هاواریان دەکرد: "بژی غیرەت، بژی ئەبو جاسم".

(13) کەس لە دەستو پەیوەندەکانی شێخ هەر لە ناو ماڵەکەیدا کوژران، شێخ ئەحمەدی کوڕی هەنگاوێك لە نزیك ماڵەکەی پێکرا، شێخ بە تەمەنی هەشتا ساڵیەوە قورئانی بەدەستەوە گرت و لە ماڵ هاتە دەرەوە لەگەڵ هەندێ لەو پاسەوانانەی والی بۆی دانابوو بەرەو بارەگای والی نزیك خۆیان چوو، شێخ لەوێ و لە بەردەم بارەگای حکومەت راوەستابوو، بەردێکیان لە سەریداو کوشتیان، ئەو گروپە سەرەڕۆیە کەوتنە داماڵینی پۆستاڵی مردووەکانی هاوەڵانی شێخ، لە (53) کەسی هاوەڵانی شێخ سەعیدی پێش دوو مانگ تەنیا شیخ مەحمود و سێ کەس رزگاریان بوو، پێنج لە لایەنگرانی شێخ لە بیرێکی نزیك شار خۆیان شاردبۆە کە دۆزیاننەوە دوویان کوژران و ئەوانی تریش هەڵاتن، دوایی ماڵی شێخیان هەموو تاڵان کرد، لە بەرماڵ و رایەخ و سەعاتی دیوار و

دەروازە و هەندێ کەلوپەلی گرانبەها، هەتا ئەو گروپە بێسەرەوبەرە دەرگا و پەنجەرەی ئاسنیشیان لە ماڵەکەی کردەوە.

بەو بیانووەی (سابونچی) ئەو سامانەی بە هۆی شێخ سەعیدەوە لە لای سوڵتان دەستکەوتووە و نازناوی (پاشا)ی پێ دراوە، ئەو کۆمەڵەیە چوون و کۆگاکەی ئەویشیان تالآن کرد و هەموو شتەکانیان برد، سابونچی پێشتر خەریکی ناوبژیوانی والی و سەرۆکە کوردەکان بووە لە موسڵ، دەڵێن هەموو گەنم و دانەوێڵە و خوری کۆگاکەی سابونچیان تالآن کرد، ئەمە لە کاتێکدا سابونچی لە دەرەوەی موسڵ بووە و کە گەڕایەوە خۆی گۆشەگیر کرد و بە شەو (30) کەسی بۆ پاسەوانی ماڵەکەی دانابوو.

ژمارەی کوژراوەکان لە (70) کەس زیاتر بووە، بەشێکیان ئافرەت و منداڵ بوون، بەڵام زەحمەتە ژمارەی قوربانیانی ئافرەت بزانرێ، چونکە خانەوادەکانیان بە شایستەیان نەزانیوە دان بە کوژراوی ئافرەتدا بنێن و بزانرێ لەوکاتە لە دەرەوە بوون، یان چۆنەتە شوێنە گشتیەکان، بە نهێنی پرسەیان بۆ داناوە و شارەوانی نەیتوانیوە سەرژمێریان بکات، بەڵام بۆ پیاوان بە هیواین ئەو ژمارەی نەخۆشخانەکان دیارییان کردووە بنەڕەتێکی باش بێت بۆ درووستی ژمارەی کوژراوەکان، کوژرانی شێخ بەو جەرگبڕیی و دڵتەزێنییە رووداوێکی نامۆ و غەریبە بۆ شارێکی موسڵمان و لە ڕۆژانی جەژن، بەڵام ناتوانین سەرکۆنەی ئەو موسڵاویانە بکەین کە بەرگرییان لە ئابڕۆی خۆیان کردووە، هەروەها سەرکۆنەی ئەو کەرکووکیانە ناکرێت لە کاتی ناخۆشیدا بەرگرییان کردووە، موسڵ شارێکی عەرەبیە و کوردان لەوێ نامۆن، بەڵام بۆ رووداوێکی لەو جۆرە گونجاوە بڵێن: ناکۆکیی رەچەڵەك و بڵاوبوونەوەی چەك لە بەردەستی خەڵکیی رۆڵی بەرچاوی هەبووە، هەندێ سەرکۆنەش دەکەوێتە سەر دەسەڵاتدارانی مەدەنیی و سەربازیی کە هیچ رێوشوێنێکیان نەگرتۆتە بەر بۆ بەرهەڵستی رووداوی لەو جۆرە. هەندێ رێوشوێنی کاریگەر وەرگیرا، بەڵام هەر زوو سەربازەکان گەڕانەوە شوێنی خۆیان و باروودۆخەکەیان بەو مەترسیەوە بەجێهێشت، دەڵێن والی فەرمانی داوە سەربازە کوردەکان گوێڕایەڵیان کرد و موسڵاویەکان بە قسەیان نەکرد، تەقەیان راگرت و بەردیان دەهاویشت، هەتا دەڵێن تەقەشیان دەکرد، مشتومڕی زۆر هەبووە لەسەر بەرپرسیاریەتی دەسەڵاتداران لەو رووداوە و ناکۆکیی گەرم هەبووە لە ناو شار لەسەر ئەوەی کێ پشتگیریی لە شێخ کردووە و کێ لەگەڵ کوشتنیدا بووە، تەنها

ئەوروپییەکانی نیشتەجێی موسڵ بێلایەن بوون، زۆر سەختە کەسێك بۆچوونێکی بابەتیانە بداتێ لەسەر ئەو رووداوە.

بەڵام رووداوەکانی رۆژی دووەم، لە شەشی کانوون زۆر جیاواز بووە لەگەڵ رووداوەکانی رۆژی یەکەم لە پێنجی کانوون، ناتوانین بڵێین هی دووەم بێبەرنامە بووە، بەر لەوەی زانایانی موسڵ بچنە لای والی، سەربازە کەرکووکیەکان خۆیان بەدەستەوە دابوو بارودۆخ زۆر هێمن بووە، دەستێوەردانی زانایانی موسڵیش لەو مەسەلە سەربازییە هیچ بڕوبیانوویەکی نەبووە، چونکە ئەوە سەرلەنوێ گرژیەکەی گەرمتر کردووە، ئەمە هاوکاریی بوو بۆ خەڵکەکە بە سەرکردایەتی ئەبو جاسم بە ئاڵای سەوزو بە دەف لێدانەوە بەرەوماڵی شێخ بچن و ئەو حاڵەتە درووست بکەن.

بارودۆخی رۆژی یەکەمی رووداوەکە رێگەی خۆشکرد بۆ کارەساتی رۆژی دووەمی ماڵی شێخ سەعید، ئێستاش زۆر گرانە لە وردەکاریەکانی درووستبوونی کارەساتەکە ئاگادار بین، زۆر شت هەیە پێویستی بە روونکردنەوە هەیە و قسەی شایەتحاڵەکان لە زۆر شوێن تێکدەگیرێ، بەتایبەت لەسەر پەیوەندیی نێوان زاناکان و والی کە لایەنێکی دەسەڵاتدار بووە و گلۆپی سەوزی بۆ کوشتنی شێخ هەڵکردبوو... هتد. بۆ نموونە دەڵێن بە زاناکانی وتووە چی دەکەن بە ئارەزووی خۆتان بیکەن، ئەوانیش داوایان لە خەڵك کردووە هێرش بکەنە سەر ماڵی شێخ سەعید، ئەمەش هەتا ئێستا گوتەیە و بڵاونەکراوەتەوە، بەڵام ئەوەی بە دڵنیایی دەیڵێین والی و دەسەڵاتدارە سەربازیی و مەدەنییەکانی شاری موسڵ بە ئەرکی خۆیان هەڵنەستاون و ئاژاوەچیەکانیان بەرەڵڵا کردووە کە کارەساتی لەو جۆرە درووست بکەن، هەروەها روونە کە زاناکان سەرکردایەتیی ئاژاوەچییەکانیان کردووە بۆ سەر ماڵی شێخ سەعید، کارەساتەکەش بە دووریی (40) مەتر لە ماڵی فەرماندەی سەربازیی موسڵەوە رووی داوە، هەتا ئێستاش هۆکاری ئەو هێرشەی سەر ماڵی شێخ سەعید دیار نییە، لە کاتێکدا شێخ بە هۆی هەڵسوکەوتی تاکڕەوانەی خۆی و منداڵەکانی لە سلێمانییەوە دوور خرابۆوە بۆ موسڵ (بڕوانە برووسکەکانی تشرینی یەکەم و کانوونی یەکەم).

ماوەی ئەو دوو مانگەش شێخ وەکو میوان مامەڵەی لەگەڵدا کراوەو خانوویەکی شایستەی سابوونچییان دابوویە و حکومەتیش سەرقاڵی بڕیاری گەڕاندنەوەی بووە بۆ سلێمانی، دەڵێن سێ رۆژ بەر لەو کارەساتە، سابونچی توانیبووی والی رازی بکات ئەو

(80) پاوەن ئیسترلینییەی بۆ خەرج بکرێ کە پێشتر دەوڵەتی عوسمانیی بۆی بڕیوەتەوە، لە هەمانکاتدا سوڵتان عەبدولحەمید زۆر ڕێزی لێگرتووە و ناو بەناو برووسکەی بۆ ناردووە، داوای لێکردووە دوعای بۆ بکات.

هەتا ئێستا چەند ئەگەرێك هەیە لەسەر هۆکاری ئەم کوشتنە، ئەگەری یەکەمیان ئەوەیە کە ئاژاوەچیەکان نەهاتبوون بۆ کوشتنی شێخ سەعید، بەڵکو هاتبوون بۆ گرتنی شێخ مەحمودی کوڕی، چونکە یەکێك بووە لەو سێ گەنجەی لە بەردەم ماڵی شێخ تەقەیان لە جەماوەر کرد بوو و ئەم ڕووداوەیان خوڵقاند، بەڵام دواتر شێخ مەحمود توانیبووی بە سەلامەتیی و بە ئاشکرا بژی و چەندان کەس سەردانی بارەگای حکومەتیان کردووە لە موسڵ و هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەوە نابینرێ، بۆیە ئەم بیردۆزە بەڵگەی بڕوا پێهێنان نییە لەسەر هۆکاری ئەم کارەساتە، خەڵکی موسڵیش هیچ ناکۆکییەکیان لەگەڵ شێخ سەعید نەبووە، هەروەها ناگونجێ بڵێین بە هەڵە بووە، چونکە شێخ و باڵای شێخ دیار و بەچاو بووە، دەڵێن لە کاتی کوشتنی هەندێ پۆلیسی لەگەڵدا بووە، هەتا نەگەیشتە بەردەمی دەرگای سەرەکیی نەکوژرا، کوژرانی بە نوێژی نیوەڕۆ و بە بەرچاوی خەڵك و بەو وەحشیگەرییە و بۆ پیاوێکی بەساڵاچووی کەسایەتی ئاینیی ناسراو لە خانەوادەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، قورئان بەدەست و لە شارێکی پڕ لە دەمارگیری ئاینیی وەك موسڵ، تا بڵێی کارێکی سەیرە".

ڕووداوەکان زیاتر بەرەو ئەو ئەگەرەمان دەبەن کوژرانی شێخ بەرنامەڕێژیی پێشتری بۆ کراوە، یان هەندێ لایەن ویستوویانە سوود لەو گەڕەلاوژەیە وەربگرن و نەخشەکەیان جێبەجێ بکەن و بیانوو بۆ کوشتنی بەدەست بخەن، دەشگونجێت ئەو برووسکەیەی بەر لە ڕۆژێك لە ڕووداوەکە بۆ والی هاتبوو، کە ڕێگە بە شێخ بدرێت بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی، دوژمنەکانی ئەو شانۆگەریەیان سازدابێت بۆ کوشتنی، هەتا نەگەڕێتەوە.

ئەگەرێکی تریش هەیە دەڵێ: بەر لە هاتنی شێخ پیاوماقوڵانی موسڵ ویستوویانە ئاژاوەیەك بخوڵقێنن و والی تێوەبگلێنن، دوایی خۆیانی لێ دەرباز بکەن، ئەم ئەگەرەش نزیکە ڕاست بێت.

زۆر شت هەیە لەسەر ئەو ڕووداوە و پرسیاری زۆر هەڵدەگرێ و لێڵی و ژەنگ و ژاری لەسەرە، بۆچی حکومەت بە (850) سەربازەوە نەیتوانی لە ناو موسڵ کێشەیەك چارەسەر بکات و نەیەڵێ (70) کەس بکوژرێ، لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەی ڕووداوەکان

حکومەت بە چەند کاتژمێرێك دەیتوانی کۆنترۆڵی بکات؟ لە لاوازیی والی بووە، یان فەرماندەی سەربازیی، یان شەرمەزارکردنی والی بووە لە لایەن فەرماندەی سەربازییەوە کە دوژمنی سەرسەختی یەکتر بوون؟ حکومەتی ناوەندیش تێگەیشتبوو بێئاگایی لە سروشتی پێکهاتەی موسڵ هەڵەیەکی کوشندە بووە، دانانی زەکی پاشاش وەکو والی لە موسڵ هەڵەیەکی تر بووە لە درك نەکردنی حکومەت بە هەستی خەڵکی موسڵ، دانانی لقی ئیتیحادو تەرەقی موسڵیش هەمان هەڵەی دووبارە کردەوە و زیانی بە ئیتیحادیەکان گەیاند، چونکە سروشتی موسڵ لەگەڵ هی هەموو عێراق جیاوازە، بەرپرسانی خاوەن بیری لیبراڵ خەڵکی موسڵ بریندار دەکات و زیاتر دوور دەکەونەوە، سەیرە حکومەت لەو رووداوە زاناکانی سەرپشك کردووە. رۆژی یەکەم پشتگیری لایەك و رۆژی دووەم پشتگیری لایەکەی تری کردووە، پێنج ساڵ بەر لەو رووداوە زانایانی موسڵ ئاژاوەیەکی لەو جۆرەیان خولقاند، لە ئاکام والی (نوری پاشا)یان دەرپەڕاند، لە ساڵی (1906ز) ئەبوجاسم سەرکردایەتی شاڵاوێکی لەو جۆرەی کرد و بووە هۆی گواستنەوەی مستەفا بەگی والی، لە (6)ی تشرینی دووەم شتێکی تری لەو جۆرە رووی دا، بەڵام خۆشبەختانە بە ئاشتیی کۆتایی پێهات، ئەوەی جێی سەرنجە لە مێژووی نوێی کورد شتی لەو جۆرە رووی نەداوە، وەکو ئەوەی لە شاری موسڵ روویدا بە دەستی ئەبوجاسم، کە ئەویش ئامرازی دەستی زاناکان بووە، هەستێکی لەو جۆرە هەیە هەموو ناکۆکیەکی نێوان موسڵمان و گاورەکان بە تراژیدی کۆتایی پێهاتووە، لەو ماوەیەدا بارودۆخەکە گرژ بووە و ئەمەش هۆکارێکی تری نائارامیی ناوچەکە بووە، بە جۆرێ بازرگانەکان لە بەردەم دوکانەکانی خۆیان چەکیان بەدەستەوەیە، رێوشوێنی پێویست هەبووە بۆ پارێزگاری لە ماڵی دەوڵەمەند و ناوداران، کوشتنی شێخ لە لایەن ئاژاوەچیەکانەوە زۆر مانا هەڵدەگرێ، ئەو ئاژاوەیەی هەندێ جار موسڵمان و هەندێ جار نەسرانی دەبێتە قوربانیی.

زەحمەتە لەو بارودۆخەدا لە ڕووداوێکی لەو جۆرە ورد بینەوە، دەبینین هەمووی پەیوەستە بە ئەندازەی دەسەڵاتی حکومەت بەسەر موسڵ و بۆ ئەو مەبەستەش دەبوایە یەکێك لەم رێوشوێنانەی بگرتایە بەر:

1- گۆڕینی فەرماندەی ئەو سەربازگەیە بە فەرماندەیەکی تر.

2- دادگایی ئەوانەی دەستیان لەو کارەدا هەبووە و سزای توند بۆ ئەنجامدەران.

3ـ دوورخستنەوەی بە لایەنی کەمەوە (6) کەس لەو مەلایانەی دەستیان لە ڕووداوەکەدا هەبووە.

4ـ دانانی والیەکی بەهێز.

گرتنە بەری ڕێوشوێنی تۆکمە، بۆ ئەوەی ئەو باوەڕە بخاتە بیری زۆربەی خەڵکەوە کە بنەڕەتەکانی دەسەڵاتی کۆن کەوتن و ئەڵتەرناتیڤی بنەماکانی بارودۆخی تازە نییە، ئەوەیە بارودۆخی ئێستای موسڵ، سەبارەت بەهەڵویستی هۆزەکانی دەورووبەری، ئەوەیە بەدیلێك نابینم بۆ ئەو پێشنیازانەی لە سەرەوە ئاماژەم پێدا نییە، ئەگەر ئاشتیی و ئارامیی لە لیوا جێگیر نەبێت.

دڵسۆزتان

میلیکی یونگ

## 3 - بزووتنەوەی مەلا سەلیمی خیزانی لە بەدلیس (1914)

لە مانگەکانی ئادار و نیسانی ساڵی (1914)، ناوچەکانی کوردستانی باکوور شۆڕشێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی کە زانایانی تەریقەتی نەقشبەندیی لە بەدلیس سەرکردایەتیان کردووە، مەلا سەلیم و شێخ شەهابەدین و سەید عەلی لە سەرکردە بەناوبانگەکانی ئەو شۆڕشە بوون، گڕەکەی لە خێزانەوە بۆ بەدلیس بڵاوببۆوە، کوردی هەموو پارچەکانی کوردستان پشتگیریی خۆیان بۆ ئەو شۆڕشە دەربڕی، لەگەڵ هەموو مەڵبەندەکانی تەریقەتی نەقشبەندیی، ئەم شۆڕشە ئیتیحادیەکانی زۆر نیگەران کرد، چونکە هۆکارە هەرێمی و خۆیی و نێودەوڵەتییەکان لە باربوون بۆ هەڵگیرسانی شۆڕش لە دژی ئیتیحادیەکان، بۆیە چەندین تیپی سەربازیان نارد بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی.

هەتا ئێستا ئامانج و هۆکارەکانی ئەو بزووتنەوەیە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە، ئێمە لێرەوە ئەم ئەگەرانەی خوارەوە هەڵدەبژێرین:

1– شۆڕشەکە کاردانەوەی گرتنی مەلا سەلیمی بەدلیسی بووە لە لایەن هیزەکانی حکومەتەوە.

2– لە بەرنامەی رووسەکان بووە هەتا بیکەنە بیانوو بۆ دەستتێوەردان و داگیرکردنی کوردستان.

3– شۆڕشی مەلا سەلیم بەشێك بووە لە بەرنامەی بزووتنەوەی کوردیی، کە یانە کوردیەکانی ئەستەنبوڵ و کوڕانی بەدرخان و شێخەکانی شەمدینان نوێنەرایەتیان کردووە.

سەرکردەکانی شۆڕشی بەدلیس هیچ یاداشت، یان هەڵسەنگاندیان بەجێنەهێشتووە و بەڵگەنامەکانی عوسمانییش دەست کەس نەکەوتووە، بە هیواین توێژەرەوانی تر بتوانن لە ئاییندەدا زیاتری لەسەر بنووسن.

سەبارەت بە ئەگەری یەکەم بەوەی شۆڕشەکە لە خۆوە بووە، ئەم دوو بەڵگەنامەی قونسوڵی بەریتانی کە لە خوارەوە دەیخەینە روو باس لەو ئەگەرە دەکات:

## بەڵگەنامەی یەکەم.

FO 2458 \195 – ژمارە (8) بەدلیس (16)ی نیسانی (1914).

بەڕێز سیر لویس مالیت، باڵیۆزی حکومەتی بەریتانیی لە ئەستەنبوڵ، لەبەر رۆشنایی رێنوماییەکانی بەڕێزتان کە لە (11)ی نیسان لە بەدلیس گەیشتە دەستم، پێمخۆشە دڵنیاتان بکەم ئەو زانیاریانەی لە ڕاپۆرتی ژمارە ـ7ـ بۆم ناردن و لە مەودوا والی هاوکاری کردووم، تا ئەندازەیەك درووستن.

مەلا سەلیم چەند مانگە خەریکی هاندانی کوردانە لە ناحیەی خێزان و قارچغان بۆ ئەوەی لە حکومەت یاخی بن، مەلا سەلیم بانگەوازی هەندێ لە شێخانی وەکو شێخ شەهابەدینو یەکێك لە نەوەکانی سەید عەلی کردووە، کە ئەم دوو کەسایەتیە لە بەناوبانگترین کەسایەتیەکانی ناوچەکەن، لە کاتێکدا ئەوە بزانین کە شێخ بەهائەدین یەکێکە لە کوڕانی شێخ جەلالەدینی خێزانی و سەید عەلیش برازایەتی، بەڵام وا بە دیار دەکەوێ سەید عەلی رۆڵێکی دوولایەنەی هەیە، لە لایەك خەڵکی هانداوە بۆ ئامادەکاریی لە دژی حکومەت و بە نهێنیش پشتیوانی لە حکومەت کردووە.

بە پێی ئەو زانیاریانەی پێمان گەیشتۆتە ئامادەکاریی بۆ راگەیاندنی شۆرش لە دژی حکومەت گەرمە و کاریگەریی ئەو ئامادەکارییانەش گەیشتۆتە ناوچەکانی دەوروبەری، دەسەڵاتدارانی حکومەت هەتا مانگی ئازار هەستیان بەو مەترسییە نەکردووە، لەو کاتەدا موزەفەر بەگی والی فەرمانێکی بۆ قەرەسۆی قائیمقام دەرکردووە، مەلاسەلیم

بگرێ و ڕەوانەی بکات، لەو کاتەی مەلا سەلیم لە لایەن (40) کەس لە هێزەکانی حکومەت بە گیراوی دەگوازرایەوە، هێزێکی کوردەکان کە لە (40) کەس پێکهاتبوون هێرشیان هێنا و قائمقامیان ناچار کرد ئازادی بکات، بە چەند ڕۆژێك لە دوای ئەو ڕووداوە، شێخ شەهابەدین پاداشتنامەیەکی دا بە والی و داوای کردبوو شەریعەت لە کوردستان جێبەجێ بکرێت و ئەو کاربەدەستە تورکە گەندەڵانە لە ناوچەکە دوور بخرێنەوە، وەکو خۆی دەڵێ ئەوانە کافرن و ئارامـمان لە بەرانبەریان نەماوە، جۆرەها باجیان لەسەر خەڵك داناوە و ئۆقرەمان نەماوە، شەهابەدین والی ئاگادار کردەوە، ئەگەر وەڵامی داوایەکەی نەدرێتەوە ئەوە موجاهیدەکان هەڵدەکوتنە سەر بەدلیس و کاربەدەستەکان دەگرن و پێستی لەشیان دادەماڵن و ورگیان هەڵدەدڕن.

والی دوای گەیشتنی ئەم یاداشتەی چەند ڕێوشوێنی بەپەلەی گرتە بەر، بەڵام بەتالوینی (101)ی هێزەکانی حکومەت بەتەنیا بەس نەبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسیی کوردە شۆڕشگێڕەکان، بۆیە والی برووسکەی بە پەلەی کرد بۆ هەریەك لە موش و وان و ئەرزڕۆم هەتا هێزی زیاتری بۆ بنێرن، هەروەها والی وەفدێکی لە پیاوماقوڵانی ناوچەکە نارده لای (خێزان) هەتا بەڕێگەی ئاشتیانە کۆتایی بەو قەیرانە بهێنن و داوای لە موجاهیدە کوردەکان کرد بڵاوەی لێبکەن و حکومەت نەخەنە پەشێوی، بەڵام حکومەت لێرەدا دەیویست بە ڕێگەی وەفدەکەوە بیانخافڵێنێ هەتا دەگاتە ئاکام و هێزی زیاتری بۆ دێت.

لە (24)ی ئازار مەزهەر بەگ لە پایەی خۆی لابراو عەبدولخالق بەگی کۆنە والی سەعرەتی لە جێی دانرا، دوای چوار ڕۆژ کوردەکان یاداشتنامەیەکی تریشیان دایە حکومەت، بەڵام لەو کاتەدا چوار تیپی حکومیی تریش گەیشتنە بەدلیس، والی تازە بڕیاری دا هێرش بکرێتە سەر ئەو هێزە کوردیەی دوو سەعاتەڕێ لە باشووری بەدلیسەوە دوورن، هێزەکانی حکومەت لە بارودۆخێکی زۆر سەختی ئاو و هەوای نیسان و لە ناو گەرداوی بەفردا هێرشیان بردە سەر شۆڕشگێڕان، هێزەکانی حکومەت ناچاری پاشەکشەکران بۆ ناو بەدلیس، کوردەکان بەوەوە نەوەستان کەوتنە دوای هێزەکانی حکومەت و هەر ئەو شەوە گەیشتنە گەڕەکەکانی دەرەوەی شار، لە دووی نیساندا (3000) کەس لە شۆڕشگێڕە کوردەکانی دەرەوەی شار و بەشێك لەوانەی لە گەڕەکەکانی لای ڕۆژهەڵاتی شار نیشتەجێ ببوون هەواڵیاندا بە گەڕەکی ئەرمەنییەکان

که دوژمنکاریان لەگەڵ ئەواندا نییە و هیچ مەترسییەك بۆ سەر ئەوان نابێت، شەڕی شەوان بە تەنها دژی حکومەتە، هەروەها مەلا سەلیم نامەیەکی بۆ سەرۆکی روحی تایەفەی ئەرمەنیی لە بەدلیس نارد و دڵنیای کردەوە کە لایەنگرانی هێرش ناکەنە سەر ئەرمەن و کاریان بەسەر ئەوانەوە نییە.

پەیدابوونی شۆڕشگێڕانی کورد لە ناو بەدلیس وا لە ناکاوو بەم ژمارە زۆرەوە، دەسەڵاتدارانی تووشی نووشستی کرد، بەرپرسان و فەرمانبەرە گەورەکان، لە ناویاندا بەڕێوەبەری پۆلیس لە شار هەڵهاتن و بە تەنیا بۆ بەرەنگاری شۆڕشگێڕە کوردەکان و کاربەدەستە بچووکەکان مابوونەوە، هەروەها (70-80) جەندرمە لە بەدلیس مانەوە، چونکە کورد و هاوسۆزی شۆڕشگێڕەکان بوون و جێی متمانە نەبوون، (10) کەس لە پۆلیسی ناوخۆ لە بەدلیس هاتنە ناو قونسوڵیە، زۆر دەترسان و تۆقیبوون و چەکەکانیان دایە قونسوڵیە و فەرماندەیەکی ئەرمەن لەوێ داڵدەی دان، بەڵام لە دوای گفتوگۆ لەگەڵ نمایندەی قونسوڵی لە بەدلیس، ئەو مەفرەزەیە نێردران بۆ کۆمەڵەی میسیونەری ئەمریکی (التبشيرية الامريكية) لە شار، هەر لەو ماوەیە والی هەواڵی پێدام کە بارودۆخەکە گەیشتۆتە قۆناغێکی ناسك و ئەو کاربەدەستانەی لای خۆیەتی نایانناسێ و گومانی لە ئەوان و هێزەکانی پۆلیس هەیە، چونکە کوردن و هاودینی ئەوانن، هێزەکانی حکومەت پێکهاتبوون لە پێنج تیپی پیادە، بە چوار رەشاش و دوو تپی شاخی کۆنەوە کە ژمارەی هەموویان دەگەیشتە (900) چەکدار، لە چەند شوێنێکی شار بەرگرییان لە قەڵای سەنتەری شار و کۆشکی پێگە سەربازیەکان دەکرد، لەسەر گردێکی بەشی رۆژئاواش بەرگرییان لەو گەڕەکە دەکرد کە بەدەست کوردەکانەوە بووە، لە کاتژمێر شەشی بەرەبەیانەوە تەقە دەستی پێدەکرد و هەموو رۆژێ هەتا شەو دەهاتەوە بەردەوام دەبوو، تەقەمەنیی زۆر بەکاردەهێنرا، بەڵام لە هەردوولا زیان کەم بووە، تەنیا (300) کەس لە موجاهیدە کوردەکان چەکی هاوچەرخیان پێبوو، ئەوانی تر شمشێر و چەقۆ و داسیان هەڵگرتبوو، بەو هیوایەی دەست بگرن بەسەر مەڵبەندی تەقەمەنیی شار و بەو چەکانە خۆیان چەکدار بکەن، هەندێ لە خەڵکی بەدلیس پەیوەندیان بە شۆڕشگێڕانەوە کرد، بەڵام بەو ئەندازەیە نەبوو کە مەلا سەلیم چاوەڕێی دەکرد، هەموو خەڵکی بەدلیس چاوەڕوانی رووداوەکەیان دەکرد، هەتا لایەنێك لە شەڕەکەدا سەرکەوێ، چەکی رەشاشی هێزەکانی حکومەت لەو

شەڕەدا رۆڵی یەکلاکەرەوەی بینی، چونکە نەیهێشت شۆڕشگێڕان پێشڕەویی بکەن بۆ ناو شار و پەیوەندیی راستەوخۆ بگرن لەگەڵ خەڵکی بەدلیس، ئەوان بچنە پاڵ شۆڕشگێڕان، هەروەها چەکی هێزەکانی حکومەت لە هی شۆڕشگێرەکان چاکتر بوو، بە هۆی ئەمەش ورەیان بەرزتر بوو، لە کاتێکدا هێزەکانی حکومەت تەواو مەشقیان پێنەکرابوو، بە شێوەی بێسەرەوبەرە تەقەیان دەکرد، ئەگەر شۆڕشگێڕان بەشەو بهاتبانایە ناوشار بە زەحمەت هێزەکانی حکومەت دەیانتوانی بەرگریی بکەن و گیانی بەرگرییان دەفەوتا.

مەلا سەلیم دوای کاتژمێر پێنجی دوای نیوەڕۆ بۆی دەرکەوت هێزەکانی ناتوانن ئامانجەکانی خۆیان بپێکن و خەڵکی بەدلیس وەکو چاوەڕوان دەکرا پەیوەندییان پێوە نەکرد، بۆیە ئەویش داوایەکی نارد بۆ قونسوڵیەتی بەریتانی کە بیپارێزن، بەڵام وەڵامیان دایەوە کە ناتوانن و با بچێت بۆ قونسوڵیەتی رووسیی، هەوەها رەشاشیش رۆڵی هەبووە لە کوتانی شوێنی شۆڕشگێڕان و بڵاوکردنەوەی ترس و بیم لە ناویاندا، هەتا ناچاری کردن شوێنی خۆیان بەجێبهێڵن، هەندێکیان خۆیان خزاندبووە کەنیسەی ئەرمەنیی، مەلا سەلیم بە شەو داوای لە هێزەکانی کرد پاشەکشە بکەن.

ئەگەر بەراوردی قەبارەی تەقەمەنیی و چەکە بەکارهاتووەکان بکەین لە ماوەی شەڕەکە، ئەوە ژمارەی قوربانییەکان کەم بووە، زیانی هێزەکانی حکومەت لە نێوان (8) کوژراو و (16) بریندارابووە، بەڵام زیانی لایەنی کوردی لەو شەڕەدا بە ئاسانیی دیاریی ناکرێت، چونکە ئەوان کوژراو و برینداری خۆیان لەگەڵ خۆیان بردووە، گەرچی ژمارەی کوژاوی ئەوانیش لە (60) پێکراو تێناپەڕێ، ژمارەی پێکراوە مەدەنییەکانی ئاکامی تەقەی بێ ئامانجی نێوان هەردوولا (4) کوژراو و (18) بریندار بووە.

بۆ رۆژی دوایی هێزەکانی حکومەت لە گردەکانی دەرووبەری شار شوێنی خۆیان گرت و لە بەرانبەر هێرشی لە ناکاوی شۆڕشگێڕان ئامادەباشی خۆیان وەرگرت، حکومەت بە فەرماندەیی ئیحسان پاشای فەرماندەی تیپی (34) بە چوار تۆپ و (8) رەشاشەوە بەشی زۆری هێزەکەی بەرەو (خێزان) بەڕێکرد، هەر ئەو کاتە لە ناوچەکانی تریشەوە هێزەکانی حکومەت گەیشتن، بەڵام حکومەت گوندەکانی خۆیان بەجێهێشت و ئافرەت و منداڵەکانیان ناردە ناوچە کوردیەکانی تر و مەڕوماڵاتەکانیشیان بۆ شوێنە سەختەکان دوورخستەوە.

هێزەکانی حکومەت لە (14)ی نیسان گەڕانەوە، بێجگە لە هێزی بەدلیس نەبێت، کە ماوەیەك لە (خێزان) مانەوە. لە (خێزان)یش (8 ـ10) دیلیان لەگەڵ خۆیان هێنا، سەید عەلی و کوڕەکانی لە ناو ئەو دیلانە بوون، حکومەت دوای ئەوە هیچ بڕیاری لەسەر نەدان، ئایا دادگایییان دەکەن، یان وەکو بارمتە بە مەبەستی سەرهەڵنەدانەوەی شۆڕش دژی حکومەت بەکاری دەهێنن، هەتا ئێستاش شەهابەدینی فەرماندەی شۆڕشگێڕان نەگیراوە و هەڵاتووە بۆ ئێران.

هێزەکانی حکومەت لەو هێرشانە بە حیکمەتەوە مامەڵەیان کرد و هیچ حاڵەتێکی تالان و زەوتکردن لەو گوندانەی هێرشیان کرابووە سەر ئەنجام نەدرا، هەتا هیچ کەس خراپەی بەرانبەر تەکیەی شێخ شەهابەدینیش نەکرد.

بەرپرسانی حکومەت و عەسکەرییەکانیش باوەڕیان وابووە ئەوەی رووی داوە سەرکردە کوردەکان لێی بەرپرسیارن، نەك خەڵکی گوندەکان، چونکە ئەوان نەفامن و لە ژێر کاریگەریی سەرکردە ئاینەیەکانیاندان و ناتوانرێ بەوەی رووی داوە تاوانبار بکرێن، لێرە بۆ ئەندازەی دواکەوتوویی کوردان، نموونەیەك دەهێنمەوە. زۆر لەو خەڵکە باوەڕیان وابوو مەلا سەلیم دەتوانێ گوللەی چەکەکان هەڵگێڕێتەوە بەرەو ئاسمان، یەکسەر بە هۆی پەیوەندیی و هاواری بۆ خوا دەتوانێت تۆپی هێزەکانی دوژمن خراپ بکات، حکومەتیش ڕێگەی نەرمیی هەڵبژارد لەگەڵ گوندنشینەکان، لە گرتنە، بەری ڕێوشوێنی توند لە بەرانبەر لێپرسینەوەی لادێیەکان خۆیان بەدوور گرت، سەرکەوتوو بوون لە گێڕانەوەی گوندنشینەکان بۆ گوندەکانیان هەتا لە کێڵگەکانیان بە کشتوکاڵەوە خەریك بن.

مەزهەر بەگی والی پێشوو بەرپرسیارێتی ئەو راپەڕینەی دەکەوێتە ئەستۆ، چونکە چەندین جار ئاگادارکراوەتەوە بەوەی کوردەکان دەیانەوێ راپەڕن دژی حکومەت، بەڵام ئەو هیچ ڕێوشوێنێکی گونجاوی نەگرتۆتە بەر.

حکومەت قەناعەتی وابوو شۆڕشی کوردیی ڕووداوێکی لە ناکاو و گۆشەگیر و کۆتایی پێهاتووە و سەرکوتکراوە و لە ئاییندەدا دووبارە نابێتەوە، بەڵام زۆربەی لەو بڕوایەدایە شۆڕشی کوردیی لە بەدلیس بەشێکە لەو نەخشە بەرفراوانەی کورد کە بڕیار بووە لە بەدلیس بقەومێ و ئەوەی بەدلیس بەر لە کاتی دیاریکراوی خۆی هەڵگیرسا، گرتنی مەلا

سەلیم و ئارەزووی تۆڵەکردنەوەی حکومەت لێی، خەڵکی (خێزان)ی بەر لە کاتی خۆی ڕاپەڕاند، بە هۆی ئەمەوە شۆڕشەکە دابڕاو بوو لە ناوچەکانی دەوروبەری، چاوەڕوانی ئەوە دەکرا کوردەکانی دانیشتووی خۆیەش و مودکان و چەقور لە ڕۆژئاواوە هێرش بهێنن بۆ سەر بەدلیس، بەڵام نوشستی بەرەی (خێزان) وای لێکردن پەشیمان ببنەوە لەو هێرشە، نکوڵیی لەوە ناکرێ هەردوو هێرش پێکەوە بکرایە بێگومان بەدلیس کەوتبوو و عەبدورڕەزاق بەدرخانیش دەستی لەو هەڵگەڕانەوەیەدا نەبووە، ئێستا ئەو لە ئێران دادەنیشێت، ساڵی پار بە سەرۆکایەتی خۆی دەستی هەبووە لە هەڵگەڕانەوەی هۆزە کوردەکان، مەلا سەلیم چەندین جار سەردانی ئەستەنبوڵی کردووە و دەڵێن پەیوەندیی هەبووە بە بەرهەڵستکارانی پارتی دەسەڵاتدار لە تورکیا، هەروەها دەڵێن (عەزیم بەگ) کە دەستی هەبووە لە کوشتنی مەحمود شەوکەت، ئێستا لە (خێزان) خۆی شاردۆتەوە، بەڵام کەسێك لە ناوچەکە نەیبینیوە، یان هەستی بە بوونی نەکردووە.

سەرەڕای دڵنیا نەبوونمان لەوەی بەرهەڵستکارانی ئەستەنبوڵ دەستیان لەو هەڵگەڕانەوەیەدا هەبووبێت، ئاماژە هەیە بەوەی کوردەکانی دەرەوەی (خێزان) دەستیان لەو هەڵگەڕانەوەیەدا هەبووە، ئەگەر هێرشی سەر بەدلیس ئامانجی پێکابایە ئەوە زۆربەی کورد دەبوونە هاوکاری شۆڕش و لەوانە بوو شۆڕش ببوایە بەرەنگارییەکی گەورە لە دژی حکومەت، یەکگرتنی کورد بە تەنیا لە یەك ویلایەت زەحمەت بوو ئەو مەترسیە گەورەیە درووست بکات، تیپە سەربازییەکانی حکومەت لە ناوچەکەدا لە بارێکی زۆر خراپدا بوون، لە ڕووی چەك و مەشق و خۆراك و تۆکمەییەوە تووشی ناتەواوی ببوون و ژمارەشیان زۆر کەم بوو، یەکە سەربازییەکان لە (250) سەرباز تێنەدەپەڕی، هێزە یەدەگەکان و تیپەکانی تۆبخانە سنووردار بوون و خزمەتگوزارییش تا ڕادەیەك هەر نەبوو.

ئەم بەشەی تورکیا و بارودۆخەکەی زۆر پێویستی بە چاودێریی و بایەخ پێدانە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا زۆربەی کوردەکان نەچوونەتە پاڵ هەڵگەڕانەوە دژ بە حکومەت، هەست بە سۆز و خۆشەویستیی حکومەت ناکەن لەگەڵیانداو بە ناچاریی گوێڕایەڵن، چونکە ئەو باجە نوێیانەی حکومەت لەسەری داناون، نەشیاوە و جێی نارەزایی زۆربەی

خەڵکیە، بەتایبەتی ئەو باجەی لەسەر ئاژەڵ و وردتر لەسەر مەڕ دانراوە مایەی ناڕەزایی کوردانە و ئەوان حکومەت بە تەنیا وەکو باجگر دەناسن.

بە بەراورد لەگەڵ ئەرمەن، کوردان لە ژیانێکی خراپدا دەژین، زۆربەی کورد ژێردەستی زوڵمی دەرەبەگایەتی و لە بندەستی سەرۆك هۆزەکاندا بوون و دەبوایە جوتیارەکان بۆ بەرژەوەندیی سەرۆك خێڵەکان کار بکەن و دەرفەتی باشکردنی ژیانیان نەدەدرا، لە کاتێکدا سامانی جوتیاران بە دەست سەرۆك هۆز و شێخەکانەوەیە، ئەم بارودۆخەش بەردەوام بووە، پیلانێك هەیە لە نێوان سەرۆك هۆزەکان و باری هەڵگەڕانەوە، کوردان گوێڕایەڵی سەرۆك هۆزەکانیانن و هاوسەنگیی بۆ ئەم گوێڕایەڵییە هەیە، لە کاتی هەڵگەڕانەوەش لە حکومەت بێ زیانن، چونکە ئارامیی و ئاشتی نییە، لە هەرجێگەیەك هەڵگەڕانەوە سەرکوت بکرێ لە جێگەیەکی تر و لە پارێزگایەکی تر سەرهەڵدەداتەوە، وادەزانم تاکە چارەسەر ڕزگارکردنی کوردانە لە کۆتو پێوەندی ئەو کۆیلایەتیەی سەرۆك هۆزەکان بەسەریاندا سەپاندوون، لەگەڵ دابەشکردنی زەوی بەسەر جوتیاراندا.

والیەکانی ئێستای هەریەك لە وان و بەدلیس تەواو ئاگادارن کە دەبێت ئاستی بژێوی کوردەکان باش بکرێ، کاری پێشینە ڕێگەوبان و کردنەوەی قوتابخانە بێت، بەڵام ئەگەر حکومەت پارەی بۆ تەرخان نەکات ئەوانە پارەی پێویستیان لەبەردەستدا نییە بۆ جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیە، بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی و سنووردانان بۆ دەسەڵاتی سەرۆك هۆزەکان بەردی بناغەی ئارامیی ناوچەکەیە.

مەلا سەلیم نامەیەکی ناردووە بۆ سەرۆکی روحیی گاورەکان و جەختی کردۆتە سەر ئەوەی شۆڕش بە تەواوەتی دژی حکومەتە، نەك دژی ئەرمەن. لەو نامەیەدا دەڵێ: "لای بەرێزتان شاراوە نییە ئێمە فیداکارانی ئیسلامییمان ئامادەکردووە، بەڵام ئاگادارتان دەکەمەوە هەرگیز نامانەوێ خراپە بەرانبەر گەلی ئەرمەن بکەین، لەو بارەیەوە ڕێنومایی توندمان بۆ لایەنگرانمان ناردووە، داوا دەکەین ئێوەش بە لایەنگرانتان بڵێن با بێلایەن بن و خۆنەخەنە ناو ڕووداوەکانەوە، ئەگەر لایەنگرێکی ئێوە شۆڕشگێڕێکی راپەڕیوەکانیان بینی وابزانێت نەیبینیوە، ئێمە سەرقاڵی مەسەلەیەکی ترین و هیچ پەیوەندیی بە ئەرمەنەوە نییە".

پەیوەندی کوردو ئەرمەن ئێستا لە هەموو کاتەکان باشترە، مەلا سەلیم و چوار لە هاوڕێکانی ئێستا لە قونسوڵیەتی رووسین و لە لایەن سەربازە تورکەکانەوە لە ژێر چاودێریی توندداں، میستەر م. شیکۆی رووسی پێی راگەیاندم کە ڕێنومایی لە باڵیۆزخانەی رووسیی وەرگرتووە و داوای لێکراوە هەتا دەرفەتی هەڵاتنی بۆ دەڕەخسێ چاودێریی مەلا سەلیم و هاوڕێکانی بن..

بەم دوایەش هەریەك لە بەدلیس و ناهی، خرانە ژێر ئەحکامی عورفی، فەرماندەی سەربازیی لە ناوچەکە پێی وتم فەرمانی وەرگرتووە ئەوانەی دەستیان لەو هەڵگەڕانەوەیە هەبووە بە زوویی دادگایی بکرێن، بەڵام ئێستا لە سەرکردەکانی ئەو هەڵگەڕانەوەیە سەید عەلی نەبێت کەس نەگیراوە، ئەویش لەو هەڵگەڕانەوەیە بەشدار نەبووە.

دڵسۆز و خزمەتکاری گوێڕایەڵتان

سێر سمیت/ ی، قونسوڵیەتی بەدلیس

## بەڵگەنامەی دووەم

ئەرزڕۆم / 6ی مایسی 1914 پاشکۆی ژمارە (2): سێر

بەختەوەرم ئێستا لەگەڵ نامەکەم ناوەڕۆکی ئەو دوو نامەت بۆ دەنێرم کە لە لایەن (ریفرن می نارد) میسیۆنەری ئەمریکی سەرقاڵ بە کاروباری قونسوڵیە لە بەدلیس لە (30و 31) نیسان نێردرا بوو، ئەو دوو برگەی هەردوو نامەکەی ئەوان کە بۆ منیان ناردبوو تەواوکەری ئەو زانیاریانەیە کە مولازم (ئەیان مسیس) لە پاشکۆی ژمارە (8)ی (16)ی نیسان ناردبووی، چەند تێبینییەك لە ناوەڕۆکی راپۆرتەکە بەدی دەکرێ. (می نارد) دەڵێ: ئەو چەکدارە کوردانەی پەنایان بردبووە بەر قونسوڵیەکە چەکەکانیان لای خۆیانە، بەڵام ئەیان سمیس دەڵێ: بەر لەوەی بچنە ژوورەوە چەکەکانیان داوە بە یاریدەدەری قونسوڵیە، ئەو زانیاریانەی لەسەر گرتنی شێخ بەهائەدیندا هاتووە، روون نییە کە گوایە لەسەر سنوور گیراوە.

## له نامەی -3- نیسانی (1914) وەرگیراوە

کەنیسە (سورب کافرون) لە ناوچەیەکی نزمایی هەڵکەوتووە و گردێك بەسەریدا دەڕوانێت، ئەویش لە بەرانبەر پێگەیەکی سەربازیی و بازاڕە، دوێنێ (3)ی نیسان نزیکەی دووسەد کورد دەجەنگان و لە هەوڵی ئەوەدا بوون ئاگری چەکەکانیان بکەنە هێزەکانی حکومەت، ئەمە مەسەلەیەکی سەرنجڕاکێش بوو، ئێمەش لە شوێنی خۆمانەوە لە پشت گردەکەوە تەماشای پێگە سەربازییەکان و کوردەکانمان دەکرد، جووتیارە کوردەکان بەرگی شڕیان لەبەردابوو، چەکی سادە و کەمیان پێبوو، یەکیان پەنجەی لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگەکەی بوو سەردەکەوتە سەر گردەکە و بێ ئامانج چەند تەقەیەکی کرد و بەرەو شوێنی خۆی هەڵات، پێموابوو ئەو تەقانە کەسی لە سەربازەکان، یان خەڵکی مەدەنیی بریندار نەکرد، ژمارەیەکی ئەوانەی کەنیسە چەکدار بوون، بەڵام هێزەکانی حکومەت رووی چەکەکانیان تێکردن و زۆر سەغڵەتیان کردن، زیانێکی سووك بەر رەشاشەکە کەوتبوو، هەروەها دەڵێن بەشێك لە دیوارەکە رووخا، چەند ئارپێچییەك لە گۆڕەپانی بەرانبەر کەنیسە کەوتەوە و (7) کەسی کوشت و هەندێکی تری بریندار کرد، تەلارەکە بە ئامانج گیرابوو بۆیە بۆردومانی چڕ و بەردەوامی لەسەر بوو، لە کاتی نیوەڕۆ هێزەکانی حکومەت چوونە ماڵی موفتی، وا دیارە موفتی هاوسۆزیی لەگەڵ شۆڕشگێڕان هەبووە، ئەوەش کە هاتنە ماڵەکەی لەسەر داوای موفتی خۆی بووە بۆ ئەوەی پارێزگاری لێ بکەن، یان بۆیە هاتن، چونکە ئەو پێی ناخۆش بووە، لە کاتێکدا ماڵی ناوبراو لەسەر هێڵی ماڵی ئێمە و کەنیسەی (وەکورب کفرك) دوور نییە، بە بەردەوامیی شۆڕشگێڕە کوردەکان لە بەشی راستەوە و بەتایبەتیش لە ماڵی موفتیە پێگە سەربازیەکەوە تووشی بۆردومان بوون، لە دەمی ئێوارەش لە ماڵی موفتیەوە تووشی بۆردومانی چڕ هاتن، شوێنی کەنیسەکە نزم بوو، بە تەواوی نەمانزانی بوو ئێمە لەو شوێنە وەستاوین کە بۆردومان کردنی لەلای ماڵی موفتیەوە ئاسانە، هەتا کاتژمێر پێنج لەوێ مابنەوە، ئەو کاتە کەنیسە و قوتابخانە و ماڵی ئێمە بە ئامانج گیران و بە چڕیی بۆردومان کران، لە هەر دەقیقەیەکدا فیشەك لە لامان دەکەوتەوە، هەر زوو عەسرەکەی ئەو رۆژە هەندێ بەردم خستە بەردەم ئەو دەلاقەی دەکەوێتە بەشی سەرەوەی شوێنی دانیشتن، بۆ ئەوەی لە کارەسات بە دوور بم، چوومە ژوورەوە و

لەگەڵ ژنەکەم قسەم دەکرد فیشەکێك هات و جامی پەنجەرەکەی شکاند، بەڵام پەردەکەی دیوی ژوورەوە گێڕایەوە، دوایی فیشەکێکی ترمان لە هەمان شوێن دۆزیەوە، گوللەیەك پەنجەرەی ژووری نووستنی خراپ کرد و دیوارەکە گوللەیەکی تریشی گێڕابۆوە، گوللەکەی دوایم هەر بۆ بیرەوەری هەڵگرت، لە کاتژمێر هەشت و نیو، تەقە وەستا، وا دیارە چەکدارە کوردەکان لە کەنیسەکە هەڵاتن‌و ئەمەش ئەزموونێکی تاڵ بووە لەسەر دڵیان، بە زۆر دامان نابوون، بەڵام دیار بوو تەنیا یەك دوانێك بوون.

ئەمڕۆ هەر زوو کوردەکان تەقەیان لە بنکەیەکی پۆلیس کرد لە گەڕەکێکی مەدەنیی، هەروەها تەقە لای گردی (شەربێل)ی لای مەکەزەوە دەهات، پۆلیسەکان ترسان، هەر زوو هەڵاتن بەرەو بارەگای قونسوڵیەی لای شەقامەکەی موساو گریگۆر، لەوێ ڕێگەیان دا بچنە قونسوڵیەکە، کاتێ من ئەوەم زانی نەمویست قونسوڵیەکە ببێتە پەناگەی پەنابەران، بەڵام ئەم پۆلیسانەمان بە بیانووی پاراستنی بەڕێوەبەرایەتیەکەمان قبوڵ کرد، لە ناو پەنابەرانی قونسوڵیە مفەوەزێکی پۆلیس و دە کەسی لە هێزەکانی پۆلیس لەگەڵدا بوو، پێشتریش والی (4) پاسەوانی بۆ ناردبوون، بەمەش هێزەکەی لای ئێمە بوو بوونە (14) چەکداری پڕ چەك، بەمەش هێزەکەمان پەرەیسەند،،راستە ئەمانە لای ئێمە پەناهێندەن، بەڵام لە کاتی پێویست دەتوانین بۆ بەرگریی لە خۆمان بەکاریان بهێنین، بە توندیی فەرمانمان بەو چەکدارانەی لای خۆمان دابوو لە تەقە کردن دەست پێشخەری مەکەن، هەتا ئەوان یەکەم جار هێرش نەهێنن، نزیکەی سەعات چوار بوو، چوار سەرکردە هاتنە لامان، مەلاو ئاغاو فەقیر "موریدی شێخ ـ وەرگێڕ" وەفدێك بوون داوایان لە قونسوڵیە کرد پێشوازیی و پارێزگارییان لێ بکاتێ، ئەو سێ شێخەش بریتی بوون لە سەید عەلی خێزان کە دیار نەمابوو، لەگەڵ ئەو مەلا سەلیم گیرابوو، چونکە پڕوپاگەندەی دژی حکومەت کردبوو، بەڵام لایەنگرانی لە ڕێگەی بەدلیس ئازادیان کرد پێشتر لە (9)ی مانگ قسەم بۆ کرد بوون لەگەڵ شێخ شەهابەدین کە بڕیاربوو لە کاتی سەرکەوتنی شۆڕشگێڕان بکرێتە حاکم، پێموتن: (من قونسوڵی نیم و بەتەنیا لە کاروباری دارایی بەرپرسم لەگەڵ بەڕێوەبردنی کاروباری ئەم تەلارە)، ئێستاش ناتوانم برووسکە بکەم بۆ باڵیۆزخانەی بەریتانیی لە ئەستەنبوڵ هەتا لە بۆچوونی ئەوان تێبگەم، چونکە پەیوەندیی پچڕاوە، ئەگەر دەتانەوێ حکومەتی بەریتانیی بتانپارێزێ، من پێتان دەڵێم ناتوانێت ئۆباڵی ئێوە لە ئەستۆ بگرێت، چونکە ئێستا ئێمە خۆمان لە

ژێر ڕەحمەتی دەسەڵاتدارانی ئەم دەڤەرەین لەو شارەدا، ئێوە بێنە لای قونسوڵیە ژیانتان باش نابێت و مەترسیی کەمتر نابیت لە ئەو کاتەی ئێستا تێیدان.

ئەو کوردانەی ڕژابوونە شار بە شێوەیەکی گشتیی چەکدار نەبوون و شمشێریان هەڵگرتبوو، چونکە موحەممەد کاتی خۆی هەڵیگرتبوو بۆ لە ناوبردنی دوژمنەکانی، ئەوانە سەرکەوتنیان لە خوا دەویست و ببوونە قوربانی وتارە کاریگەرەکانی شێخەکانیان، هەرگیز شێخ شەهابەدین و سەید عەلی نەهاتوونەتە بەدلیس، لە سەرەتاوە شۆڕشگێرانی کورد ڕایانگەیاند دژی حکومەت شەڕ دەکەین و گاورەکانیان دڵنیا کردەوە کە پارێزراون، باوەڕم وایە ئەمە تاکتیکی ئەوان بێت بۆ بێلایەنکردنی ئەرمەن، چونکە بە گشتیی ئەرمەنەکان چەکدارن و دەیانتوانی لە پەنجەرەی ماڵەکانیانەوە تەقە لە شۆڕشگێڕان بکەن و زیانی گەورە بە لایەنی کوردیی بگەیەنن، بۆیە گەڕەکە ئەرمەنییەکان بۆ هاتوچۆی شۆڕشگێڕان لە گەڕەکە کوردییەکانی ناوچەی بەدلیس زیاتر ئەمین بوون، یازدە کەس لە شۆڕشگێڕان هاتنە ماڵە کوردێکی دراوسێمان هەتا بیکەنە بنکەی هێرشبردنە سەر هێزەکانی حکومەت، بەڵام دراوسیێ کوردەکە نیگەران بوو، دەترسا ببێتە ئامانجی هێزەکانی حکومەتو ماڵەکەی بدەنە بەرتەقە، ئەو کوردانە لە ڕێڕەوی ماڵی ئێمە پەڕینەوە، لە ڕێی گەڕەکی ماڵە ئەرمەنەکانەوە هەموومان تەماشای ئەو هەموو شۆڕشگێڕەمان دەکرد، ئەمڕۆ (2)ی نیسان نزیکەی (3) کەس لە پیاوانی جەندرمە و سوپا کوژران، پێدەچێت هەتا ئێستا ژمارەی پێکراوان گەیشتبێتە نزیکەی (10) کوژراو و ژمارەیەك بریندار لە کوردان هەبووە، ئێستا حکومەت هەموو ئەو کوردانە دەگرێ لە شۆڕشگێڕان بیت، یان نا، بریندار بووبێت خەڵکی مەدەنیی بێت.

## ئەمە بەشێکە لە نامەی -30-ی نیسانی (1914)ز:

بارودۆخی شار ئارامە و هێزەکانی حکومەت سەرقاڵی چالاکین، لە ناوچەی شۆڕشگێڕەکان چەندین کەسیان گرتووە و هێناویانەتە بەدلیس، وادەزانم ئێستا ژمارەی کوژراوان گەیشتۆتە (100) کەس، لەسەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە بیستوومە گیراوەکان بە شێوازێکی وەحشییگەرانە لێیان دەدرێ، هەر گیراوێك دەبێت (100 ـ 1500) جەڵدەی لێبدرێ، ناوبەناو پزیشکی سەربازیی دەچێتە لایان هەتا دڵنیابێت ماون و بەرگەی لێدانی تر دەگرن، یان نا... ڕۆژی پێجشەممەی رابردوو بڕیاری گرتنی

شێخ بەهائەدین درا، لە بۆنەی پیرۆزبایی هاتنی سوڵتان بۆ عەرش بینیم و ئەو هەواڵەی پێدام، دەبوایە ئاگاداری ئەوە بین ئەگەر شۆڕش سەرکەوتووبوایە شێخ شەهابەدین حاکم دەبوو، هەتا ئێستا مەلا سەلیم لە قونسوڵیەتی رووسیی پەناهەندەیە، گوێم لێبوو هەندێ لە لایەنگرانی لە هەوڵی هەڵاتندا بوون، بەڵام بێئاکام بوو، واچاوەڕوان ناکرێ قونسوڵیە لە بەدلیس بیهێڵێتەوە، چونکە من پێموایە ئەو بارودۆخە شتی وا قبوڵ ناکات....

دڵسۆزتان

خزمەتکاری زۆر گوێڕایەڵتان ج. ایج، ماینهان. ی،

قونسوڵیەتی بەریتانی.

## پاشکۆی (11)

وان 16– مایسی 1914

لە دەستپێکردنی بزووتنەوەی مەلا سەلیمەوە جۆرێك لە گەڕەلاوژە هەبووە، بە پێی بەڵگەنامەی یەکەم راپەڕین وەکو بەشێکی گشتیی شۆڕشی کوردان دەبوایە لە مانگی نیسان دەستی پێکردبایە، بەڵام هیچ کام لە بەڵگەنامە و سەرچاوەکان ئەوەی دیاریی نەکردووە، کێ ئەو شۆڕشە بەرفراوانە بە ئەستۆ دەگرێ، پەیوەندیی لەو ئاستە لە نێوان کوردان وا ئاسان نەبوو کە قونسوڵی بەریتانی لێی بێئاگا بێت، چونکە ئەو پەیوەندیی لەگەڵ هەموو هێزە کوردیەکان هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دوو بەڵگەنامەیە زۆر بە درێژیی چوونەتە ناو رووداوەکان.

مەکدواڵ بڕوای وایە راپەڕینی مەلا سەلیم بەشێکە لە نەخشەی رووسیی بۆ درووستکردنی پەشێوی لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی، هەندێ لە نووسەرە تورکانیش پشتگیریی ئەو بۆچوونە دەکەن، چونکە مەلا سەلیم و هاوڕێکانی خۆیان داوەتە دەست قونسوڵیەتی رووسیی و ئەوانیش نەیانهێشتووە بکەونە دەست دەسەڵاتدارانی عوسمانیی، لەسەر ئەو بنەڕەتە بڕوایان وا دامەزراندووە[344]، بەڵام ئەو بەڵگەنامەی سەرەوە ئەوە دەگەیەنێت ئەو کارەی مەلا سەلیم بێ نەخشە بووە و لە ئاکامی

[344] - The Kurds, p.101; Jwaideh, p.328

بێپشتیوانیی هۆزە کوردەکان "هەتا خەڵکی بەدلیس"یش پەنای بۆ ئەوێ بردووە. لە بەڵگەنامەی یەکەمدا بەدیار دەکەوێ کە مەلا سەلیم یەکەم جار پەنای بردۆتە بەر قونسوڵیەتی بەریتانیی، بەڵام ئەوان رازی نەبوون پەنای بدەن و بە ناچاریی بڕیاری داوە بچێ بۆ قونسوڵی رووسیی و بیپارێزین، لە کاتێکدا قونسوڵی بەریتانیی چاودێری قونسوڵی رووسیی کردووە، بە بایەخەوە لە کاری ئەوان ورد بۆتەوە، هەردوو بەڵگەنامەی پێشوو پشتگیریی ئەو بۆچوونە ناکەن بەوەی کە ئەم جوڵانەوەیە دەستکردی رووس بێت، گەرچی باس نەکردنی رۆڵی رووس لەو دوو بەڵگەنامەیە نیشانەی تەواوی دەستتێوەرنەدانی رووس نییە لەو مەسەلەیە.

بە وردبوونەوە لەو بۆچوونەی باس لە دەستێوەردانی رووسیی لەو راپەڕینە دەکەن با یەکەم جار بۆچوونی لازاریف وەربگرین کە پشت دەبەستێت بە بەڵگەنامەی رووسیی، لە ناوچەیەکی نزیك خێزانی سەر بە بەدلیس بەرپرسانی تورك مەلا سەلیم دەگرن و موریدەکانی تەریقەتی نەقشبەندیی دەتوانن رزگاری بکەن، ئەمە لە ماوەیەکی کەم بووە هۆی راپەڕین لە هەموو بەدلیس، ژمارەی شۆڕشگێڕان گەیشتە (8) هەزار موجاهید و بەرەو بەدلیس بەڕێککەوتن و داگیریان کرد، داوایان دەکرد "شەریعەت جێبەجێبکرێ‌و حوکمی ئیتیحادیە تورکەکان لابرێ، بە ڕای کورد دیکتاتۆرن و ناتوانن بەرگریی لە خاکی ئیسلامیی بکەن و سەرشۆڕی کافرانن". هەروەها لازاریف دەڵێ:

لە سەرەتای راپەڕینەکە ئیتیحادیەکان هەڵوێستیان وەرنەگرت و چاوەڕێ بوون، خۆیان لێ پاراست بەو هیوایەی بزووتنەوەی کورد بە ئاراستەی دژایەتیی بزووتنەوەی چاکسازییەکانی ئەرمەندا بڕوات، بەڵام هەرزوو بۆیان دەرکەوت بۆ دژایەتیی ئەوانە و بەوپەڕی توندیی سەرکوتیان کرد، لە ناوەڕاستی مانگی ئازار شۆڕشگێڕەکان توانیان هەموو ویلایەتی بەدلیس رزگار بکەن و شاری بەدلیس لە هەموو لایەوە گەمارۆ درابوو، ئەمە ناچاری کردن لەگەڵ شۆڕشگێڕان بکەونە گفتوگۆ، بەڵام بێئاکام بوو، حکومەت بە رێنومایی تەلعەت پاشای وەزیری ناوخۆ ئەوپەڕی هەڵوێستی توندوتیژی وەرگرت و والی گۆڕی و هێزی تری لە ئازەربایجانەوە هێنا بۆ سەرکوتکردنی کوردان.

کوردەکان توانیبویان ئەو هێزە تێکبشکێنن و لە (30)ی نیسان چوونە شارەوە و شەرێکی گەورە لە نێوان هەردوولا رووی دا، حکومەت ناچار بوو لە موشەوە هێزێکی تر

بهێنیٚ، شۆڕشگێڕان (60) کەسیان لیٚ کوژراو (4) کەسیان لە هێزەکانی تورك کوشت، مەلا سەلیم و سیٚ لە هاوڕێکانی خۆیان دایە دەست هێزەکانی رووسی لە بەدلیس، حکومەت بەوپەڕی بێویژدانیی کەوتە وێزەی شۆڕشگێڕان، زۆربەی سەرکردەکانی لە سێدارەدان و دەیانی لێگرتن، ئەو وەحشیگەرییەی حکومەت بۆیە بوو گوایە کورد خیانەتیان کردووە، بەڵام لە ورەی کوردانی دانەبەزاند، یەکێك لە سەرکردەکانی شۆڕش لە بەردەم پەتی سێدارە دەڵیٚ: (ئێمە دڵخۆشین و مردنی ئێمە نزیکبوونەوەی تەمەنی تورکانە). ئەم هەڵویستە بێشەرمانەیە بەرانبەر کورد بە لە سێدارەدانی سەرکردەکانی، بەتایبەت شێخ شەهابەدین کە پیرۆزترین شێخی کوردستان بووە، دەنگی ناڕەزایی لە هەموو گۆشەیەکی کوردستان دژی تورك بەرزبۆوە[345].

هەروەها ئەو گێڕانەوەی سەرەوەی لازاریف ئەوە ناگەیەنێت رووس رۆڵی هەبووبێت لە بزووتنەوەی مەلا سەلیم، رووس و عەبدوڕڕەزاق نەخشەیان بۆ ئەم شۆڕشە دانەڕشتووە، بەڵکو ئەم شۆڕشە بەشێك بووە لە شۆڕشێکی بەرفراوانی کوردیی کە لایەنە کوردیەکان نەخشەیان بۆ داڕشتبوو "بەو پێیەی لە بەڵگەنامەکاندا هاتووە". لەو ئەدەبیاتە نووسراوە سنووردارانە سروشتی پەیوەندیی نێوان لایەنە کوردیەکان و شێخەکانی خێزانی تێدانییە، زیاتر وا چاوەڕوان دەکریٚ جۆرێك لە پەیوەندیی هەبووبێت لە نێوان نەوەکانی بەدرخان و مەلا سەلیم و شێخ شەهابەدین و سەید عەلی، ساڵی (1913) ـ وەکو دواتر باسی دەکەین ـ ساڵی نەخشە داڕشتنی شۆڕشی کوردان بووە دژی ئیتیحادیەکان، پەیوەندیی نێوان شێخەکانی خێزان بە بزاڤی کوردی دژ بە ئیتیحادیەکان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (1908). (باسل نێکتین) کە ئەو کاتە قونسوڵی رووسیا بووە لە کوردستان دەڵیٚ: "مەلا سەلیم ئەندامی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی بوو"[346]. دەگونجیٚ ئەمە راست بێت، چونکە بەدلیس مەڵبەندی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی و لەبەهێزترین مەڵبەندی ئەو کۆمەڵەیە بووە لە کوردستان، هەر لە بنەڕەتەوە لەویٚ شێخانی تەریقەت و زانایانی ئیسلام دەورەیان لێدابوو، وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا کۆمەڵە کوردیەکانی ئەستەنبوڵ زۆر مەبەستیان تەکیە و مەڵبەندە ئیسلامیەکان و

---

345 - کێشەی کورد، ل340-341.

346 - Kutlay,p.163.

مزگەوتەکان بووە، چونکە ڕێگەیەکی کاریگەر بووە بۆ کوردایەتیی لە ناو جەماوەری کورد.

بەڵگەنامەی یەکەم باس لە نەخشە سەرنەگرتووەکەی کوردانی کردووە لە بەشی ڕۆژئاوای بەدلیس، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر نەخشەی لە پێشتری شۆڕشگێڕان لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەر، راپۆرتی قونسوڵی بەریتانیی بە نووسراوی (7)ی کانونی دووەمی (1914) باسی لە سەردانی هەریەك لە مەدحەت بەگ و حوسێن بەگ و عەبدولکەریم بەگ نەوەکانی بەدرخان کردووە بۆ لای پیاوماقوڵان و شێخانی کورد و لە ناویاندا بۆ لای شێخانی بەدلیس، هەتا هانیان بدەن بۆ بەرپاکردنی بزووتنەوەیەکی بەرفراوان دژی ئیتیحادیەکان، دوای لە ناوچوونی شۆڕشەکە تەلعەت پاشا داوای لە حکومەتی رووسی کرد عەبدوڕڕەزاق تەسلیم بکات و سزای سمکۆ بدات، چونکە دەستیان هەبووە لە بزووتنەوەی بەدلیس[347]، دوور نییە شێخ شەهابەدین و مەلا سەلیم و کوڕانی بەدرخان و شێخ عەبدولقادری نەهری لەسەر ئەوە رێککەوتبن، بەڵگەنامەی یەکەمیش ئەوەی تێدایە مەلا سەلیم چەندین جار چۆتە ئەستەنبوڵ هەتا چاوی بە بەرهەڵستکارانی ئەوێ بکەوێ، کەچی بزووتنەوەکەی لەبەر هۆکاری خۆیی تەقیەوە "هەروەکو بەڵگەنامەی یەکەم ئاماژەی پێدەکات"، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە سەعاتی سفر هەبووە لە نێوان شێخانی خێزان و کوڕانی بەدرخان، بەڵکو زیاتر رێککەوتنی گشتیی بووە.

هەمان ئیشکالیەتیش لەسەر ئامانجی راپەڕینەکە هەیە، توێژەرەوە رۆژئاوایی و رووسەکان و نووسەرە کوردە عەلمانییەکان پێکەوە ئەم ئشکالیەتەیان درووست کردووە، (کۆلا)ی بە پشتبەستن بە ڕای جەلیلی دەڵێ: "بزووتنەوەی مەلا سەلیم چوارچێوەیەکی ئیسلامیی و بەناوەرۆك نەتەوەیی هەبووە[348]. ئەم خوێندنەوە

---

[347] - FO.195\2447\45; Kutlay, p.170.

[348] - Kutlay,p.193

بەڵام قەدری جەمیل پاشا (زنار سلۆپی) تێڕوانینێکی تری هەیە لەمەڕ جوڵانەوەکەی مەلا سەلیم و پشتگیریی لە رای کوتلای و جەلیلی ناکات،. سلۆپی لە وەسفی بزاڤی مەلا سەلیم دەڵێ: "مەلا سەلیم دژی ئەفکاری پێشکەوتووخوازی داهێنراوی عەلمانیەت وەستابۆوە...لە ساڵی (1913) لە ویلایەتی سیرت دژی حکومەت شۆڕشی کرد، لە دوای ئیمزاکردنی رێکەوتن لەگەڵ هەندێك لە زانایان و سەرۆك

عەلمانییە بۆ جیهادی شێخانی تەریقەتی نەقشبەندی، وەکو شێخ شەهابەدینو مەلا سەلیمو شێخ سەعیدی پیران بەوەی بە تەنیا بەرگریان لە بیروباوەڕ کردووە نابابەتیانەیە، چونکە ئیسلام و کوردایەتی لەو رۆژگارە وەکو دوو دیوی یەك دراو وابوون، پێشتر ئاماژەمان بە ڕاپۆرتی (بیرترام دکسۆن)ی قونسوڵی بەریتانی کرد لە سەردانەکەی ساڵی (1909ز) بۆ کوردستان دەڵێ: "لە کوردستان ناڕەزایی لە سلێمانییەوە هەتا وان هەبووە لەسەر لابردنی سوڵتان عەبدولحەمید و گۆشەگیرکردنی رۆڵی شەریعەت لە لایەن ئیتیحادیەکانەوە". (لازاریف)یش لەمە پشتگیریی لە هێژا دکسۆن کردووە[349]، ئەمەش لە هەنگاوی یەکەمدا بەڕوونی لە داواکاریی شۆڕشگێڕاندا هاتووە:

1ـ دەرکردنی کاربەدەستە خراپەکانی تورك لە ویلایەتی بەدلیس.

---

هۆزەکان... بە هۆی بایەخ نەدانی هاوپەیمانەکان بە بزاڤەکەی لە بازنەی هۆزەکانی خێزان تێنەپەڕی، حکومەتی تورکیای لاویش زۆر بە لەناوبردنیەوە ماندوو نەبوو". بڕوانە (فی سبیل کردستان، ل34).

349 - FO 195\2310, No. 2 January 14, 1909, Vice Consul Mosul, No, 12, Enclosure, No,3

لازاریف، ل319، لەسەر زاری یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لە وان دەڵێ: "کاتێك مەلا سەلیمو هێزەکەی گەمارۆی بەدلیس دەدەن، مەزهەر بەگ، والی عوسمانیی نامەیەك بۆ مەلا سەلیم دەنێرێ و داوای لێدەکات بێتە شار هەتا وتووێژی لەگەڵدا بکات لەسەر ئامانجی شۆڕشگێڕەکان، بەڵام مەلا سەلیم لەسەر داوای خۆی سوور دەبێت و داوای وەفدی والی قبوڵ ناکات و دەڵێ دەبێت والی تەسلیمی موجاهیدان بێت، ئەوان بە هەموو چەکەکانیانەوە بچنە ناو شار، بە ڕای قونسوڵی بەریتانی ئەو نەیویستووە دەست بگرێ بەسەر بەدلیس، بەڵکو ویستوویەتی ئیتیحادیەکان بە زەبری هێزی خێزان ناچار بکات، مەزهەر بەگی والی کە بە ئاماژەی ئەنوەر پاشای وەزیری ناوخۆ بڕوای بە بەکارهێنانی هێز هەبووە، هەتا لە جیاتی ئەو، سیرت عەبدولخالق بکەنە والی، ئەمەش بە ئیشارەتی ئەنوەر پاشای وەزیری ناوخۆ کە سوور بوو لەسەر چارەسەری یەکلاییکردنەوەی سەربازیی لەگەڵ کورد، والی تازە هێزێکی میللی لە (800) چەکدار لە خەڵکی بەدلیس پێکهێنا بۆ بەرگریی لە شار، ئەم هێزەش لە مووش و وان بە هێزی سەربازی پشتیوانیی دەکرا، کوردەکان ناچار بە ئاراستەی خێزان کشانەوەو هێزەکانی توورکیا دوایانکەوتن".

.FO 371/2130, British Vice Consul Van 22 March 1914:FO 371/2130, British Vice Consul Van,No7, April 4, 1914 .

2ـ گەڕانەوەی تەواو بۆ پیادەکردنی شەریعەتی ئیسلامیی.

خراپیی ئیداریی خەمی گەورەی شێخەکان و هەموو خەڵکی بووە. (مالمسانیز) لە لاپەڕە (63ـ 64)ی کتێبی ناوبراودا لەسەر زاری سەید مستەفای نوێنەری ئەرزڕۆم لە ئەنجومەنی تورکی ساڵی (1923) دەگێڕێتەوە: مەلا سەلیم بەر لە سێدارەدانی وتوویەتی: (ئەی تورك لە سێدارەم دەدەن، لە سێدارەم بدەن، بەڵام ئێوە شایستە نین بە بەڕێوەبردنی وڵاتی من، هەموو زەمینەیەکمان بۆ ڕەخساندن چۆن ئیدارەی وڵاتی من دەگێڕن؟ ئێوە چاك ئاگادارن بە سروشتی بەڕێوەبردنی ئەم سەردەمە، ئێوە لە لای ئێمە خۆتان بە ناتەواو نازانن، کێ زیانی لێدەکەوێ؟ بەڕێزان ئێوە بەدلیس بدەن بە ئێمە و دەسەڵاتی خۆتان بکێشنەوە، ئەگەر لە ئێوە باشتر بەڕێوەمان نەبرد لە گەردنمان بدەن".

(مالیسانیز) لە هەمان کتێبو لە لاپەڕە (6)، کارۆساسونی نووسەری کتێبی (پەیوەندیەکانی کوردو ئەرمەن) بۆمان دەگێڕێتەوە: کە مەلا سەلیم پێشتر چاوی بە (وارتانی راهیب) ئەندامی لیژنەی ناوەندیی پارتی تاشناقی ئەرمەنی و کەسایەتیەکانی تری ئەرمەنی کەوتووە، لەسەر ئامانجی شۆڕش لەگەڵیاندا ڕێککەوتبوو:

1ـ ئەم وڵاتە تایبەتە بە کورد و ئەرمەن.

2ـ کوردستان حوکمی زاتی فـراوانی هەبێت.

3ـ ئەرمەن و کورد ئیدارەی کوردستان بگێڕن.

لەبەر دوو هۆ دەگونجێت ئەمە راست بێت: یەکەمیان ئەمە لەگەڵ راپۆرتی یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی (بەڵگەنامەی دووەم)، تێك دەکاتەوە کە لە کاتی هێرشی سەر بەدلیس جۆرێك لە لێکتێگەیشتن هەبووە لە نێوان کورد و ئەرمەن. دووەم ڕێڕەوی بەرنامەی شێخ عوبێدوڵڵاو سەرکردەکانی تری جوڵانەوەی کوردان لە سەدەی نۆزدەهەم بەو شێوە بووە، سوور بوون لەسەر دۆستایەتی ئەرمەن "هەر هیچ نەبێت لە ململانێی لەگەڵ ئیتیحادیەکان بێلایەن بن"، سیاسەتی مەلا سەلیم لەسەر نەخشەی کۆمەڵە کوردیەکان بووە کە ئامادەبوون هەموو زەمانەیەك بدەن بە مەسیحیەکانی کوردستان و رایانگەیاندووە ئامانجی بزووتنەوەی کوردایەتی رزگار بوونە لە زوڵم، نەك کوشتاری مەسیحیەکان، سەرەڕای ئەمەش کولای لە مێژوونووسی تورکیی دەگێڕێتەوە

که ئەرمەنەکان لە سروشتی ئیسلامەتی بزاڤی مەلا سەلیم نیگەران بوون و لە کاتی شەڕ بۆ بەرگری لە دامەزراوەکانی حکومەت لە ناو شاری بەدلیس چەکیان هەلگرتووە و پشتگیرییان لە حکومەت کردوووە، (IttihatteterrakiP169) لە بەلگەنامەی یەکەمدا لایەنی ئابوورییش هەبووە، ئیتیحادیەکان باجی زیاتریان خستبووە سەر مەڕومالاتی کوردستان، ئەمە بۆ کومەلگای ئەو کاتەی کوردستان زۆر جێی بایەخ بووە، چونکە کۆمەلگای کشتوکالی ئەوکاتەی کوردستان سامانی ئاژەلیی بڕبڕەی پشتی ژیانی ئابووریی بووە، هەروەها نابێت خۆ لەو راستیە ببوێرن کە تەکیەکانی نەقشبەندیی لە خێزان مەلبەندی دەسەلات بوون لە کۆمەلگای کوردستان و ئیتیحادیەکان بەرنامەی لەناوبردنی هەموو ناوەندەکانی هێزی تەقلیدیی ناو دەولەتی عوسمانییان دارشتبوو، لەگەل بنیاتنانی دەولەتی شێوە رۆژئاوایی زیادڕەویی لە مەکەزیەت، ئیتیحادیەکان لە دوای گەڕانەوەی دەسەلات بۆ بەدلیس، بەربوونە شالاوی کوشتن و کوشتاری شۆڕشگێڕ و هاوولاتیە بێچەك و گوندنشینەکان بەبێ جیاوازیی، ئەحکامی عورفیان راگەیاند، هەموو مەلبەندەکانی تەریقەتی سۆفیگەری لە کوردستان داخست و راستەوخۆ بەستیانەوە بە وەزارەتی ئەوقاف[350].

بە چاوخشاندنێکی خێرا دەگەینە ئەو ئاکامەی هەردوو جولانەوەی شێخ سەعیدی پیران و مەلا سەلیمی بەدلیسی یەك سروشتو ئامانجیان هەبووە، لەوەی هەردووکیان لە لایەن شێخانی تەریقەتی نەقشبەندییەوە سەرکردایەتی کراون و ئامانجیان بەرگری لە شەریعەتی ئیسلام بووە، لە لایەن هێرشی عەلمانییە تورکانەوە وەحشیگەرانە سەرکوتکراون، هەروەها هەردوو بزووتنەوەکە توێژە نیشتیمانییەکان لەگەل شێخانی تەریقەتو زانایانی ئیسلام پێکەوە کۆبوونەوە بۆ سازدانی بزووتنەوەیەك کە مەزلومیەتی کوردو شەریعەتی ئیسلام پێکەوە گرێ بدات، سەرەڕای زۆر خالی تری هاوبەش، هەردوو جولانەوەکە بە ناوی جیهادەوە بووە، لای مەلا سەلیم (خۆبەختکارانی ئیسلام = فدائی ئیسلام) ناوی راپەڕیوەکان بووەو بە شێخ سەعید دەوترا (میری موجاهیدان) یان وەکو خۆی دیوت: (خزمەتکاری موجاهیدان)، هەردوولا دەسەلاتی

---

[350] - FO 193\2317,,General Notes on A Journey Between Van and Mosul,, B Richardson. June 1o,1909 Diyar Bakir..

مەرکەزیان بەبیّ دین‌و دوور لە شەریعەت ناوبردووە، هەردوولایان لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیان سەرنەکەوتن، هەردوو بزووتنەوە بەر لە کاتی دیاریکراوی خۆی تەقیەوە، هەردوو بزووتنەوە بە هۆی نابەرانبەریی چەك‌و تەقەمەنیی لە بەرانبەر دەسەڵاتی تورکیی نوشستیان هێنا، هەردووك سیمای لادیّ یان بەسەرەوە بووە، مەلا سەلیم نەیتوانی پشتگیریی تەواوی خەڵکیی بەدلیس بەدەستبهێنیّ، ئەمەو دوای (12) ساڵ شێخ سەعدیش لە ڕزگارکردنی شاری دیاربەکر نوشووستی هێناو نەیتوانی پشتگیریی خەڵکی شار مسۆگەر بکات، هەردوو سەرکردەش دوای هەوڵی سەرنەکەتوانە هەڵاتن بۆ ئێران، بەڵام گیران و لە سێدارە دران.

ئەمانە بەڵگەن لەسەر بێسەرەو بەرەیی هەردوو جوڵانەوەکە و نەبوونی ڕێککەوتن و ڕێکخستنی پێشتری نێوان ئەوان و قسەڕۆیشتوانی شارەکان، ئەم دیاردەیە بە درێژایی سەدەی بیستەم وەکو نەخۆشییەکی درم هەروا مایەوە، سەرکردە و مورید و شێخانی تەریقەتی نەقشبەندیی باجی زۆریان دا لە پێناو کوردایەتیی، نەیانتوانی شتێك بە شتیّ بکەن، بەداخەوە لەم بیست ساڵەی دوایی تەکیە و ڕێڕەوی سۆفیگەری لە (بنگۆل) لە کوردستانی باکوور خیانەتی گەورەیان لەو کەلەپورە جیهادییە کرد، کە دەبوایە بە ئاوی زێڕ بنووسرابایەوە، مەڵبەندەکەیان کردە بلّندگۆی بانگەوازی تۆرانییەت، هەروەها هەندیّ لەو مەڵبەند و تەکیانەی کوردستانی عێراقیش ببوونە سەرچاوەی هەڵخلیسکان و دواکەوتوویی و فاڵچیەتی.

## 4 - بزووتنەوەی شێخ عەبدوسسەلامی بارزان

بزاڤی شێخ عەبدوسسەلامی بارزان ڕووبەڕووبوونەوەیەکی گەورە بووە لە بەرانبەر دەسەڵاتی ئیتیحادیەکان لە کوردستان، سەرەڕای ئەمە جوڵانەوەی بارزان بەرەنگاربوونەوەی گەورەی کوردانە بووە لە بەرانبەر دەوڵەتی تۆرانی و دەگونجا گاریگەریی هەبوایە بەسەر هەموو پارچەکانی کوردستان و ببێتە هۆی جۆشدانی عەرەبەکان "هەر هیچ نەبێت عەرەبەکانی عێراق"، بەوەی کورد مەترسیی گەورە درووست دەکەن لەسەر قەوارەی عوسمانیی.

گەرچی ئێرە جێی باسکردنی مێژووی بارزانییەکان نییە، بەڵام پێویستە کورتەیەك لە مێژووی شێخ عەبدوسسەلامی بارزانیی باس بکەین، لە بارەی مێژووی

بارزانییەکانەوە، هێژا مەسعود بارزانی دەڵێ: "ناوی هۆزی بارزان دەگەڕێتەوە بۆ گوندی بارزانی مەڵبەندی شێخانی بارزان، ئەوانیش دەچنەوە سەر زنجیرەی خانەوادەی ئامێدی، لە سەردەمی باپیرەگەورەمان مەسعود ناوێك دابەزیونەتە گوندی (هەفنکا)ی نزیك بارزان و لەوێ نیشتەجێبوون، لە سەردەمی یەکێك لە کوڕەکانی بەناوی شێخ تاجەدین کە زانایەکی گەورە و پیاوێکی کارامە بووە خەڵکێکی زۆری لێ کۆبۆتەوەو بە موریدەکانییەوە هاتوونەتە بارزان و لەوێ تەکیەیان دامەزراندووە، لە دوای مردنی شێخ تاجەدین، شێخ عەبدوڵڵای کوڕی کە بە خواناسیی و دینداریی ناسرابوو جێگەی باوکی گرتۆتەوە.. لە سەردەمی خۆی دا شێخ عەبدوسسەلامی کوڕی ناردۆتە خوێندن و لەسەر دەستی شێخ تەهای نەهری فێری زانست بووە، حەزرەتی شێخ مەولانا خالیدی نەقشبەندیی لە سەردانێکی بۆ تەکیەی بارزان، شێخ عەبدوسسەلامی کردۆتە خەلیفەی خۆی، لە ساڵی (1872) شێخ عەبدوسسەلام مردووە، شێخ موحەممەد جێگەی گرتۆتەوە، بە شێخێکی خواناس و دیندار ناسراوە، هەتا خەڵك لە دونیانەویستیدا وەکو نموونە ناویان هێناوە، لە سەردەمی ئەو تەکیەی بارزان ببووە پەناگە بۆ زۆرلێکراوانی هۆزەکانی دەوروبەری بارزان، سەرۆك هۆزەکان لای دەسەڵاتدارانی عوسمانیی شکاتیان لە شێخ موحەممەد کردووە، شێخ پێنج کوڕی لە دوای خۆی بەجێهێشتووە، بە ناوەکانی: (شێخ عەبدوسسەلام، شێخ ئەحمەد، موحەممەد سدیق، بابۆ، مەلا مستەفا)[351].

ئەو عەبدوسسەلامەی ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا باسی دەکەین نەوەی شێخ عەبدوسسەلامی یەکەمە، پیاوێکی چاکسازو چاپوك بووە، بە تاوانی لادان لە ئیسلام لە لای سوڵتانی عوسمانی تاوانبارکراوە و گیراوە و بۆ موسڵ دوور خراوەتەوە هەتا (300) کەس هێرشیان بردە سەر موسڵ، بەڵام ئەوانیش گیرانو زۆربەیان خرانە بەندیخانە.. هەروەها خۆی و شێخ موحەممەدی کوڕی زۆر بەرگری لە جوتیاران کردووە کە لە ژێر دەستی ئاغاکان، بەتایبەت ئاغاکانی زێبار دەچەوسانەوە، بۆ ئەمەبەستە سوپایەکی بەناوی (دێوانە) لەو سۆفیانە پێکهێنابوو هەتا ببنە هێزێك بۆ دانانی سنوور لە بەردەم زوڵمی ئاغاکان و ئەوانی پێ چاوترسێن کردووە، لە ڕۆژانی شێخ موحەممەد

[351] - مسعود البارزانی: البارزانی و الحركة التحررية الكردية، الانتفاضة البارزان الاولى (1931-1932)، كردستان 1986

سدیقی کوڕی شێخ عوبێدوڵڵا، شێخ موحەممەد کەوتە شەڕەوە لەگەڵ شێخانی شەمدینانی نەهری، هەردوولا (نەهری و زێبار) ناچاربوون بەشی لای راستی زێی گەورە بەجێبهێڵن، وای لێهات سنووری شێخ نشینەکەی فراوان بوو بۆ ئەمارەتێك کە هەموو گوندەکانی زێبار و شێروان و مزووری بگرێتەوە، ئەمە بووە هۆی نیگەران بوونی ئاغاکان، لای دەسەڵاتداران لە موسڵ عەبدوسسەلامیان تاوانبار کرد بەوەی دڵسۆز نییە بۆ سوڵتان و ئەویش دووری خستەوە بۆ بەدلیس.

شێخ عەبدوسسەلام لەسەر ڕێبازی باوکی دەڕۆیشت، هەتا بووە چاکسازێکی ئایینیو سەرکردەیەکی نیشتیمانی، بە هەنگاوەکانی شێخنشینی ناوچەی بارزانی زیاتر فراوان و زیندوو کردەوە، لە گرنگترین دەستکەوتەکانی:

1- هەڵوەشاندنەوەی خاوەندارێتی زەوی.

2- دابەشکردنەوەی زەوی بەسەر جوتیاران.

3- هەڵوەشاندنەوەی مارەیی زۆر و بە شوودانی زۆرەملێ.

4- ڕێکخستنەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لەسەر بنەڕەتی دادگەریی و یەکسانیی.

5- درووستکردنی مزگەوت لە گوندەکان هەتا ببێتە شوێنی خواپەرستیی و مەڵبەندێکی تازە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتیو رووحیی و سیاسیی خەڵکی ناوچەکە.

6- نزیکخستنەوەی زانایانی زۆربەی ناوچەکانی بادینان لە خوێندنگای بارزانی ئیسلامییدا، هەتا کار گەیشتە شۆڕشێکی زانستیی لە ناوچەکەدا، شێخ ڕێزی لە زانایان دەنا و لە زۆربەی کاروباری سیاسیی و زانستیی شێخنشینەکەی راوێژی پێکردوون[352].

شێخ عەبدوسسەلام لە دوای مردنی شێخ موحەممەدی باوکی لەساڵی (1902)، لە ماوەی پێنج ساڵی یەکەم، لەسەر ڕێڕەوی باوکی سەرقاڵی پتەوکردنی ناوخۆی میرنشینەکەیو فراوانکردنی بووە، یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لە دیاربەکر راپۆرتێکی لەسەر شێخ عەبدوسسەلام نووسیوە و دەڵێ: لەم ساڵانەی دواییدا لە ناوچەکە چاکسازێکی کۆمەڵایەتی بە ناوی شێخی بارزان پەیدابووە، شوێنکەوتووی لە

[352] - بی رەش: بارزان و الحركه الوعى القومى الكردى، 1826-1914، كردستان، خەبات1987، ص84-85.. الدملوجى: ل89-91.

هۆزە کوردیەکانی وارۆماو شێروان هەیە، لە سەرکردایەتیکردنی هێرشەکانی بۆ سەر شێخە بچووکەکان سەرکەوتووە و هەندێکی بە ئەوانی تر لەناوبردووە، شێخ ئێستا (1500) چەکداری دڵسۆزی لە شوێنکەوتوانی خۆی هەیە، لە نەخشە چاکسازییەکانیدا جەختی کردۆتە سەر نەهێشتنی دەسەڵاتی ئاغاکان و یارمەتی و پشتیوانیی لە هەژارو چەوساوان کردووە، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی ئاشتییو ئارامیی، ماڵی ئاغاکانی تاڵان کردووەو بەسەر گوندنشینەکانی دابەش کردووە، قەڵاو قایمکاری ئاغاکانی نەهێشتووە، لە جیاتی حکومەت باجێکی گونجاو وەردەگرێت، بەڕاستی شێخ عەبدوسسەلام باشترین شێخی ناوچەکەیە، هەتا ماوەیەکیش هیچ گرفتێکی لەگەڵ حکومەتدا نەبووە، دادگەرانە مامەڵەی لەگەڵ شوێنکەوتووانیدا کردووە و مەسیحیەکانی پاراستووە[353].

شێخ عەبدوسسەلام لە ساڵی (1907) ئامادەی کۆنگرەی سەرۆك و شێخە کوردەکان بوو لە شاری دهۆك بە سەرۆکایەتی شێخ موحەممەد نوور قادری، بەمەش شێخ عەبدوسسەلام کەوتە چالاکیی سیاسییی و بەرگریی لە مافی کورد، هەروەها لە پشت ئەو بەڵگەنامە مێژووییەوە بووە کە لەو کۆنگرەیە دەرچووە، کە دەڵێ:

1ـ زمانی کوردی لە قەزاکانی دهۆك، زاخۆ، ئاکرێ، ئامێدی بکرێتە زمانی فەرمیی.

2ـ خوێندن لە ناوچەی بادینان بە زمانی کوردی بێت.

3ـ بەڕێوەبەر و فەرمانبەرەکانی ناوچەی بادینان کوردی زان بن.

4ـ باجی بەرانبەر بە خزمەتی سەربازیی وەکو خۆی بمێنێتەوەو دەبێت حکومەت پارە خەرج بکات بۆ چاککردنی ڕێگاو کردنەوەی قوتابخانە لە ناوچەی بادینان.

5ـ حوکمو دادگەریی لە ناوچەی بادینان بە پێی شەریعەتی ئیسـلام بێت.

6ـ وەرگرتنی باج بە پێی شەریعەتی ئیسلام بێت و ئەو باجانە لابرێت لەگەڵ شەریعەتی ئیسلام تێکدەگیرێ.

7ـ قازیو موفتیەکانی بادینان سەر بە مەزهەبی شافیعی بن[354].

هەردوو بەڕێزان مەسعود بارزانی و بی ڕەش لە دملۆجی دەگێڕنەوە ئەو کۆنووسە بە ئیمزای شێخ عەبدوسسەلام نێردراوە بۆ شوێنە باڵاکان و ئەنجومەنی نوێنەران و

---

353 - FO 193\2317, No 4 March 31,1909 Enclosure No 1,Vice Cosul Van.

354 - الدملوجي: ل98.

پیاوماقوڵان، دانەشی لێ نێردراوە ئەوانەی ئەوکات سەرۆکی کۆمەڵەو رێکخراوە کوردیەکان بوون، وەکو: شێخ عەبدولقادری نەهری و ئەمین عالی بەدرخان و شەریف پاشا. من گومانم لەو قسەیە هەیە، چونکە ئەگەر ئەو دوو بەڵگەنامەیە لەسەر قسەی هەردوو بەڕێزان لە ساڵی (1907) نووسرابێت، "دملۆجی ساڵی ئامادەکردنی بەڵگەنامەکەی دیاری نەکردووە"، ئەو کۆمەڵەو رێکخراوانەی ناوی بردوون (کۆمەڵەی هاوکاریو پێشکەوتنو کۆمەڵەی هێڤی) ئەو کاتە دانەمەزرابوون، بەڵکو ئەوانە لە دوای شۆڕشی دەستووریی ساڵی (1908) دامەزران، هەروەها بەڕێزان سەید عەبدولقادری نەهری و ئەمین عالی و ژەنەراڵ شەریف پاشا ئەوکات لە ئەستەنبوڵ نەبوون، دەگونجێت ئەو بەڵگەنامەیە لە ساڵی (1908ز) ئامادەکرابێت، یان نەنێردرابێت بۆ ئەو کەسانەی ناویان هاتووە، هەروەها ساڵی (1907ز)، هەردوو ئەنجومەنی نوێنەرانو پیاوماقوڵان نەمابوون و سوڵتان عەبدولحەمید هەڵیوەشاندبوونەوە، لە ساڵی (1908) دووبارە دایمەزراندەوە[355]. (مەکدواڵ)یش پێیوایە ناردنی ئەو مەزبەتانە دوای دەستبەسەراگرتنی دەسەڵات بووە لە لایەن ئیتیحادیەکانەوە[356]. ناوەڕۆکی ئەو مەزبەتانە بەڵگەیە لەسەر سەرهەڵدانی دەماری نەتەوایەتی لە بادینان لەناو زانایانی ئایینی و شێخانی تەریقەت، شێخ عەبدوسسەلامیش پەیوەندیی تایبەتی هەبووە بە سمکۆ و شێخ عەبدولقادری نەهری و عەبدوڕڕەزاقو ئەو کۆمەڵە کوردیانەی ناومان بردن، ئەو حەوت خاڵەی کوردان بە ڕوونی ئەوە دەردەخات پەیوەندیی پتەو هەبووە لە نێوان خواستە نەتەوایەتیەکان و سووربوون لەسەر پیادەکردنی شەریعەتی ئیسلامیی، زانایانی بادینان بۆچی داوای جێبەجێکردنی شەریعەت دەکەن؟ ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو نامەیە ئاڕاستەی ئیتیحادیەکان کراوە لەسەر دوورخستنەوەی رۆڵی شەریعەت و هێنانە ناوەوەی یاساو باجی ناڕەوا بۆ ئەو ناوچەیە، بەرگریکردنیش لە ماف کوردان هەر لە ڕوانگەی پابەندیی بووە بە ئیسلام، لەو کاتەی (دملۆجی) قایمقامی ئامێدی بووە، چاوی بە شێخ عەبدوسسەلام کەوتووە و پرسیاری لێکردووە لەسەر

---

[355] دامەزراندنەوە هەردوو ئەنجومەن لەساڵی 1908 دوای کۆدیتا، لەژێر فشاری کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی دامەزراو ئەو بایەخەی نەبوو. "وەرگێڕ".

[356] - he Modern History of Kurds, p98

هۆکاری ئەو چالاکییانەی بە قازانجی کورد ئەنجامی دەدا، شێخ وتوویەتی: (ئێمە لە بەجێهێنانی ئەرکی ئاینیی خۆمان بەولاوە هێچمان نەکردووە، ئەوەش دوورخستنەوەی زوڵمە لەسەر گەلێکی چەوساوە و رزگارکردنی لە کۆیلایەتی).[357]

مامۆستا (بی ڕەش)یش بە درێژیی باس لە چالاکییە سەربازییەکانی ناوچەی بارزانی ساڵانی (1908 ـ1914) کردووەو وێستگە گرنگەکانی بەرەنگاریی بۆ دیاریکردووین، شەڕی پێرسی یەکەم لە پاییزی ساڵی (1908) کاتێك رووی داوە موحەممەد پاشای داغستانی والی ئەو کاتەی موسڵ، شێخ عەبدوسسەلامی بانگ کردۆتە موسڵ، ئەویش نەچووە، حکومەتیش بە تاوانی یاخیبوون و پەیوەندیی بە دەوڵەتێکی بێگانە دەگونجێت رووس بێت تاوانباری کردووە و بە ناوی بزووتنەوەی جیاخوازی شەڕی لە دژی شێخ راگەیاندووە. فازیل پاشا دوو فەوجی هێزی نیزامیی و چەکی رەشاش و تۆپی ئامادە کردووە بۆ ئەو هێرشە، مامەش و مەنگوڕ و خۆشناو و نێرۆیی و هورماری و گەردی و بێرەسنی و هەرکی، کە هاوکاری حکومەت بوون بۆ سەر لایەنگرانی شێخ عەبدوسسەلام، لە دوای زیانگەیاندنێکی گەورە لە هێزی فازیل پاشا، شێخ عەبدوسسەلام ناچار بووە بکشێتەوە بۆ شاخە سەختەکان و لەوێ خۆی ون کردووە و داوای لە هێزەکەی کردووە بەرگری نەکەن و بگەڕێنەوە ناوماڵو منداڵی خۆیان، شەڕی (سەری باز) وێستگەیەکی تری بایەخداری ململانێیە، شێخ لە ناکاو بە دیارکەوت و لایەنگرانی کۆکردەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی حکومەت، ئەمجارە ناکۆکیی کەوتە نێوان سەرهەنگ سەفوەتی فەرماندەی سەربازیی لە موسڵو فازیل پاشای والی، یەکەمیان ئارەزووی کردووە بە هێمنیی و ئاشتیی چارەسەر بکرێت، دووەم سوور بووە لەسەر چارەسەری سەربازیی، هەردوو هێز لە دۆڵێکی گەورە بەیەکگەیشتوون و هێزەکانی حکومەت بە سەختی شکاون و ژمارەیەکی زۆر ئەفسەر و سەرباز کوژراون و سێ تۆپ و ئەندازەیەکی زۆر لە چەكو تەقەمەنیی کەوتۆتە دەست بارزانییەکان، لە ئاکامی ئەم شەڕە شێخ هاتەوە ناو ناوانو لە شوێنە فەرمیەکانو لە ناو خەڵك باسی کراوە، حکومەت لەگەڵی دا پێکهاتەوە، هەروەها دەڵێن حکومەت وازی لەو تاوانبارکردنەش هێنا کە ئاغاکان دابوویانە پاڵ شێخ، لە جاران بەهێزتر گەڕایەوە ئەمارەتی بارزان و

---

[357] - الدملوجي: ل93

کەوتە تۆڵەکردنەوە لەو زێباریانەی سەروەت‌و سامانی لایەنگرانی ئەویان تالآن کردبوو، نازم پاشا لە جێگای فازیل پاشای داغستانی بووە والی، والی تازە لە لایەنگرانی پارتی ئازادی‌و ئیئتلاف بەرهەڵستکاری ئیتیحادیەکان بووە، بۆ ڕێکەوتن سەفوەت بەگی ناردە بارزان، بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیە دان نراوە بە ئەمارەتی بارزان‌و بە ناوی بژاردنەوە یارمەتی گونجاویان پێداوە. لەسەر داوای شێخ، حکومەت بەڵێنی کردنەوەی قوتابخانەو نەخۆشخانەی داوە لە بەرانبەردا ئەوانیش بەڵێنیان داوە ئەو چەکانەی لە حکومەتیان وەرگرتبوو بیاندەنەوە، شێخ عەبدوسسەلام ویسامی پلە دووی دەوڵەتی عوسمانیی پێدراوە، لە دوای کۆدەتای سێیەمی ئیتیحادیەکان و گەڕانەوەیان بۆ دەسەلآت، لە ساڵی (1914) سلێمان نەزیف کە کورد بووە کرایەوە والی موسڵ، بەلآم پڕوپاگەندەی بۆ تۆرانییەت دەکرد و لە بەرانبەر کورد دڵڕەق بووە، ویستویەتی دەست بگرێ بەسەر شێخنشین‌و ئەمارەتی بارزان، داوای لە شێخ عەبدوسسەلام کرد خۆی بەدەستەوە بدات، ئەم قبوڵی نەکرد و حکومەتیش لە بەرانبەردا هێزێکی گەورەی ڕێکخستووە، ئەو هێزە بەکرێگیراوەی لەو هۆزە کوردانە بوو کە لەمەوپێش ناومان بردن. لە دوای بەرگریەکی گەورە لە شەڕی (بلە) شێخ بۆی دەرکەوت هێزەکەی لە لایەن هێزی حکومەت و هۆزە هاوپەیمانەکانییەوە گەمارۆ دراوە. حکومەت بەبەکارهێنانی تۆپ ڕێگای پاراستبوو هەتا توانیبووی بەرەو لای ڕۆژهەلآتی زێی گەورە بپەڕێتەوە، لێرەوە شێخ بڕیاری دا بۆ ناوچە سنوورییەکانی ئێران بکشێتەوە، ئەو پاشەکشەیەش زۆر ئەستەم بوو، چونکە بەفر ناوچەکەی داپۆشیبوو. شێخ لە ساڵی (1914) گەیشتە گوندی رازان کە بارەگای سەید تەهای لێبوو لە ناو خاکی ئێرانی[358].

شێخ عەبدوسسەلام لە دوای ئەوەی گەیشتە ئێران، لە مانگی ئاب سەفەری کرد بۆ تەفلیس لە ئازەبێجان، هەتا لەوێ چاوی بکەوێ بە"بیگراندۆك"ی جێگری قەیسەرو فەرماندەی لەشکری باشوور. مەسعود بارزانی پێی وایە سمکۆ لەو سەفەرە یاوەری کردووە، بەلآم (بی ڕەش) پێیوانییە و لەو باوەڕە دایە شێخ بە تەنیا و بەو پەڕی نهێنی و بۆ ماوەی (40) ڕۆژ ئەو سەفەرەی کردووە، سمکۆ بۆ مەبەستی ئاسانکاریی ئەو سەفەرە پەیوەندیی بە رووسەکانەوە کردووە . ف. نێکتین دەڵێ: شێخ لەو سەفەرەیدا

---

358 - الدملوجي: ل93

بۆ شەڕی دژ بە ئیتیحادیەکان داوای هاوکاریی لە ڕووسەکان کردووە. ڕووسەکان پێیانوتووە: وا باشترە ئەمە نهێنی بێت، چونکە لە بەرژەوەندیی ئەواندا نییە لەو بارودۆخە دوژمنکاریی تورکان بکەن، ئەمە پرۆسەیەکی سیاسییە، دوو تا سێ مانگی تر چاوەڕێ بکە، ئەگەر پەیوەندییمان لەگەڵ تورکان باش بوو، ئەوە داوای لێبووردنتان لێدەکەین، ئەگەر تێکچووین ئەوە هێز و چەکتان دەدەینێ و دەتانگێڕینەوە بۆ بارزان[359]. شێخ دوای ئەو چاوپێکەوتن و پەیوەندییە چڕوپڕانە بڕیاری دا سەرلەنوێ بەرەنگاریی ئیدارەی تورکیی ببێتەوە لە بادینان، بەڵام تورکیا لە ڕێگای پیاوێکی هۆزی شکاکەوە بە ناوی سۆفی عەبدوڵلا چاودێریی هەنگاوەکانی کردووە، لە کاتی گەڕانەوەی بۆسەیەکی بۆ ناوەتەوە و دەستگیری کردووە. مەکدواڵ باوەڕی وایە سمکۆ لە پشت دیلکردنی شێخ عەبدویسەلامەوە بووە[360]، بەڵام ئەمە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە، شێخیان بردە موسڵ و لەوێ لە لایەن دادگای عورفیی سەربازیی و بە ڕێنومایی سلێمان نەزیف بڕیاری لە سێدارەدانی درا، بەر لە دەرچوونی ڕەزامەندیی سوڵتان لەسەر بڕیارەکە لە سێدارە درا، سلێمان نەزیف لە ناو موسڵ ئاژاوەیەکی ڕێکخستو لایەنگرانی شێخ عەبدوسسەلامی تاوانبارکرد لە پشت ئەو ئاژاوەیەوەن، ئەمەش بۆ بەدەستهێنانی بیانوو هەتا بەبێ یاسا لە سێدارەی بدات[361]. ڕۆڵی سلێمان نەزیف لە شەهیدکردنی شێخ عەبدوسەلام هەمان ئەو ڕۆڵەیە کە پێشتر زیاکۆك ئەلپ گێڕای لە لای سوڵتان بۆ دەستبەسەراگرتنی بزووتنەوەی ئیبراهیم پاشا.

کومەڵە هۆکارێك هەبوون لە ناکۆکی نێوان شێخنشینی بارزان لە بادینان و حکومەتی ئیتیحادیەکان، یەکێك لەوانە ئارەزووی حکومەت بوو بەتایبەت ئیدارەی موسڵ بۆ سوود وەرگرتن لەو ململانێ تەقلیدیەی نێوان ئاغاکان شێخەکانی بارزان هەیە هەتا حکومەت دەست بگرێتەوە بەسەر ئەو شێخنشینەی ببووە ئەمارەتێکی سەربەخۆ، ئیتیحادیەکان سوور بوون لە سەر سەپاندنی دەسەڵاتی ناوەندیی بەسەر مەڵبەندی شێخان و بەستنەوەی بە ئیدارەی حکومەت لە ئاکرێ، ئەو هەنگاوە بە پێچەوانەی نەریتی باوی چەند سەدەی پێشوو بووە، باجی دیارییکراویان بەسەر شێخانی بارزاندا سەپاند، لە

---

[359] - بی ڕەش: ل136.

A, Modern History of Kurds, p100-101

[361] - الدملوجی: ل102، 104.

پاڵ ئەوەدا سەرژمێریی دانیشتوان لە بارزان بۆ سەرباز گرتنو کۆکردنەوەی باجی جیاجیا بە شێوەی راستەوخۆ، ئەو پەشێویەی درووست کرد[362].

یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانیی لە موسڵ دەڵێ: شێخ عەبدوسسەلام پێیوایە "ئەو حکومەتەی ئێستا کافرە و جولەکەی دوژنمە دەستی بەسەرا گرتووە، ئەگەر ئەم بۆچوونانەی کوردان بچێتە دەرەوەی ناوچەی بارزان زۆر مەترسیدار دەبێت و هەڕەشەیە بۆ سەر رژێمی تورکی لە ناوچە کوردیەکان"[363]. یاریدەدری قونسوڵی بەریتانیش لە (وان) لە ئازاری (1914) بۆچوونێکی هاوشێوەی هەیە و دەڵێ:

زۆربەی کورد لەژێرەوە خۆیان بە دوژمنی حکومەت دەزانن، بەم دواییە حکومەت گەیشتە باوەڕێکی لەو شێوە کە ناتوانێت مەترسیی ئەو شێخانە نەهێڵێ کە پێگەی سیاسیی و ئاینیی کردەییان لە ئایندەی ناوچەکەدا هەیە، ئەگەر بارودۆخی لەباریان بۆ هەڵبکەوێ بە ڕێکخستنی کۆنەپەرستانەی بەهێز بە رووی دەسەڵاتی ناوەندیی و دەوڵەت دەوەستن، بە بەردەوامیی ناوچەی بارزان هەڵوێستی دوژمنکارانەیان هەبووە لە دژی حکومەتی ئیتیحادو تەرەقیو ئەو ناوچەیە مەڵبەندی ئاژاوە بووە، دەڵێن عەبدوڕڕەزاق بەدرخان بەرنامەی دارشتووەو ساڵی پار شێخانی بارزان چوونە پاڵ هەڵوێستەکەی، دەگونجێت حکومەت بەو هۆیەوە بڕیاری سەرکوتکردنی دابن، پێشتر شێخی بارزان لەگەڵ شێخی شەمدینان (سەید تەها - نووسەر) ناحەز بوون بەیەکتر، بەڵام وادیارە لە نێو خۆیان ڕێکەوتوون و کێشەی نێوانیان چارەسەر کردووە، بەرەیەکی یەکگرتوویان دژی حکومەت پێکهێناوە[364].

بەو شێوەیە حکومەت بزاڤی بارزانی بە بەشێك لەو شۆڕشە گشتگیرە زانیوە کە لە ساڵی (1913)وە سمکۆ و عەبدوڕڕەزاق بە چاودێر و پشتیوانی رووس نەخشەیان بۆ دارشتووە، هەروەکو بزاڤەکەی مەلا سەلیم بەر لە بڵاوبوونەوەی بۆ ناوچەکانی تر بە هەموو توانا کەوتنە وێزەی، ئەگەر ئەو جوڵانەوەیە خاڵی هاوبەشی هەبوبێت لەگەڵ

---

362 - McDowell, pp100-101.

363 - FO 195\2310 No.24 October 30, 1909 M Young
British Vince Consul Mosul

364 - FO 195\2458 British Vice Consul Van, March 13,1941 . عەبدوڕڕەزاق بەدرخان: بیرەوەری، ل35.

ئامانجەکانی بزووتنەوەی کوردایەتیی، هیچ بەڵگەیەك نییە حکومەت لەسەر ئەوە نیگەرانیی دەرخستبێت، هەتا ئەندازەیەك ئاکامی دەرهاویشتەی ناوخۆیی بووە لەگەڵ حەزی حکومەت بۆ سەرکوتکردنو سەپاندنی ئیدارەی خۆجێیەتی، شێخ عەبدوسسەلام جەختی کردۆتە سەر رۆڵی سابونچی و پیاوماقوڵانی موسڵ و ئاغاکانی زێبار لە وروژاندنی حکومەت لە دژی ئەو، بە دملۆجی دەڵێ: (رێگەی بەرانبەرمان گیراوەو کەس نییە بەرگریی لە ئێمە بکات... هەموو پیاوی بەرژەوەندیی خۆیانن، وەکو ناحەزەکانمان گوندمان نییە بیدەین بە گەورەکانی موسڵ، بۆیە بۆ خۆمان بەرگریی لە خۆمان دەکەین، لێی دەپرسێت دوژمنەکانتان کێن؟ دەڵێ: بێجگە لە ئاغاکانی زێبار کەس دوژمنمان نییە[365].

کار گەیشتە ئەوەی یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانیی لە موسڵ بڵێ پیاوماقوڵانی موسڵ، بە تایبەتی جەمیل سابونچی پاشا چاوی بڕیوەتە گوندەکانی بارزانییەکان، لە هەوڵی ئەوەدا بووە ململانێی بارزانییەکان و ئاغاکانی زێبار بقۆزێتەوە هەتا زیاتر دەست بگرێ بەسەر گوندە کشتوکاڵیەکان، عوسمان ئاغای زێباری چەند گوندێکی دابوو بە سابونچی پاشا هەتا کار لە والی بکات هێز بنێرێ بۆ سەرکوتکردنی شێخنشینی بارزان[366].

بەڵگەنامەکانی بەریتانیی و عوسمانیی جەخت لەسەر کۆمەڵێك شت دەکەنەوە، لەوانە: ئیتیحادیەکان تەواو سوورن لەسەر کۆتاییهێنان بەو سەربەخۆیەی شێخەکانی بارزان، بەڵگەنامەی یەکەم جەختکردنە لەسەر ئەو باوەڕەی کە پێیوایە بزووتنەوەی بارزان مەترسیدارە، چونکە بەشێکە لە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردیی و هەم کۆسپە لە بەردەم هەوڵی ئەوان بۆ تواندنەوەی نەتەوە ناتورکەکان لە قاڵبی نەتەوەی تورکدا، زۆربەی بانگەوازکارانی مافی کورد لە شێخانی تەریقەتی سۆفیگەری و زانایانی ئایینیی دەبنە هێزێکی لە شکان نەهاتوو بۆ بەرگریی لە شەریعەتو پەیدابوونی بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی بەرهەڵستکاری ئیتیحادیەکان، هەروەها بە ڕوونیی دڵڕەقیی ئیتیحادیەکان

---

365 - الدملوجي: ص92.

366 - FO 195 \2310 No 24,October 30,1909 Milke Young British Vice Consul

دەردەخەن لە سەرکوتکردنی ئەو بزووتنەوەیە، بە ڕادەیەك وەزیری ناوخۆ و وەزیری جەنگ داوا لە فەرماندە جەنگیەکان دەکەن هیچ دەرفەت نەدرێ بە شێخ لەگەڵ حکومەت ڕێکبکەوێ، ئەمە لە کاتێکدا بەڵگەنامە بڵاوکراوەکان جەخت دەکەنەوە لەسەر دوورکەوتنەوەی شێخ لە خوێن ڕشتن و بەدەستەوەدانی ئەو ناوچانەی لە حکومەتی گرتووە، لەگەڵ ڕێزگرتن لە یاسا و ژیانی ئاشتیانە لە سایەی ڕژێمی تازە.

دەتوانین هۆکارەکانی ناکۆکیی ڕۆژانی شێخ عەبدوسسەلام بۆ سێ خاڵ کورت بکەینەوە:

1- ئارەزووی ئیتیحادیەکان لە سەپاندنی دەسەڵاتی ناوەند بەسەر بارزان و هەڵوەشاندنەوەی ئەو خودموختاریەی دەیان ساڵە هەیان بووە.

2- ململانێی نێوان ئاغاکانی زێبار و شێخ عەبدوسسەلام لەسەر دەسەڵات.

3- ململانێی نێوان تۆرانییەتی عەلمانی و کوردایەتی لە بەرگی ئیسلامەتیدا.

بۆ زیاتر شارەزایی بفەرموون بۆ ئەم بەڵگەنامانەی خوارەوە:

## بەڵگەنامەی ژمارە (1)

بەڕێوەبەرایەتی ئەرکانی جەنگی گشتیی میللیی سێیەم

برووسکەی هاتوو بە مێژووی (3)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (325)

لە فازیل پاشای والی موسڵو دەوروبەریەوە.

ج./ (30)ی تشرینی دووەمی ساڵی (325)، هەروەکو لە سەرەتا و کۆتاییدا باسم کرد، لە دوای تێکشکانی شێخی بارزان و لایەنگرانی، پرۆسەی ڕاوەدوونان و هەڵاتنی ئەوان لە شاخەکان ماوەی مانگێکە بە شەو و ڕۆژ بەردەوامە، لە چەند پێکدادانێکدا لەو سەرۆکە یاخیانەی وەکو فەقێ عەبدوڕڕەحمان حاجیك و سارم عەلۆ عارف و یونس، کوژراون و عەلی حەسەن بە بریندارى گیراوە، ژمارەیەکی زۆر لە لایەنگرانی کوژراون و سەد کەسیش بە زیندوویی گیراون، لە کۆتاییدا شێخ توانیبووی بە هاوکاری سەعید ئاغای باڵادەست لە ناحیەی (جال)ی ویلایەتی وان هەڵبیو بچێتە ئەو هەرێمەی گاورەکانی تەموز و تیاری لێ نیشتەجێن، لە لیوای هەکاری، ئێستا لە نزیك زاوێتە خۆی بزر کردووە، لایەنگرانی میجۆ، حیجۆ، خالید، مەلا حەسەن، فەقێ خالید و چەند

کەسانی تر لە دۆستان و بنەماڵەکەیان هاتوونوتە لای سەعید ئاغای ناوبراو، چەندین جار داوامان لە شێخی ناوبراو کردووە، پێویستە ئەوانە بگرن و بیاندەنەوە دەست حکومەت، کەچی دەڵێن لای ئێمە نین، بۆ سەلامەتیی و پاراستنی سەعید ئاغا نووسراومان بۆ ویلایەتی وان‌و موتەسەڕیفیەی هەکاری ناردووە هەتا هۆکاری خۆشاردنەوەی ئەوان روون بکەنەوە لەگەڵ زەرووړەتی گرتنیان، دەستەیەکی ئەسپسوارییشمان بە فەرماندەی بەگباشی ساڵح بەگ نارد بۆ ئامێدی لە کۆتایی سنووری ویلایەت، لە ئاکامی ئەم بەدواداچوونە سێ لەو یاخیانە گیراون و گواستماننەوە بۆ موسڵ، لەگەڵ ئەوەدا هیچ شوێنەواریی یاخیبووان لە ناو ویلایەتەکە نییە، بەڵام هەر بۆ وریاییدان نەوەکو لەگەڵ مەسیحیەکانی تیاری بێنە ناو شار، نووسراومان بۆ ویلایەتی وان نووسیوەو پێمانوتوون پێویستە دەسەڵاتدارانی ویلایەت ئەوانە بگرن، دوای ئەوە بڕیارماندا هەموو ئەوانەی بە دوای شێخەوە بوون گەڕاندمانەوە شوێنی خۆیان و ئێستا ئێمە ئیدارەیان دەگێڕین و داوایان لە حکومەتی سوونی ئەوە بووە بگەڕێنەوە سەر ماڵ‌و شوێنی خۆیان، هەتا لە بارزان و لیوایەکە بەرگریی سەرهەڵنەداتەوە، پێگەیەکی سەربازییمان بە ئەندازەی دوو تابوور لە هێزە یەدەگەکان لەوێ داناوە، پێگەیەکی سەربازیی نیزامییشمان لە شێروان داناو دوایی بۆ کاری پێویست گەڕاندمانەوە بۆ موسڵ، هەر کە بیستمان شێخی ناوبراو گەڕاوەتەوە بۆ هەکاری، ڕێنومایی توندمان داوە بە فەرماندەی بارزان لەسەر پێویستیەتی دەستگیرکردنی، بەڵام بە هۆی هەڵەیەکەوە کارەکە سەری نەگرت، هەروەکو باسم کرد هیچ کەمتەرخەمییەك، یان تەمبەڵیەك لە لای ئێمەوە رووی نەداوە، ئەو رووداوەی دوایش ئاکامی ترسنۆکی‌و گوێ نەگرتنی هەندێ لەپیاوانی هێزی یەدەك‌و هەندێ لەئەفسەران بووە، ئەوانەشم ناردووە بۆ دیوانی جەنگ هەتا سزایان بدەن، هێز و پێویستیەکانم ئامادەکردووە، بەڵام داوای لێبووردن هەتا ئێستا یاخیبوان نەگیراون، چونکە سەعید ئاغا داڵدەیان دەدا، ئەگەر هێزێکی سەربازیی لەوێ دانەنرێ، یان سەعید ئاغا دوورنەخرێتەوە و سزانەدرێ، ئەوە هەوڵەکانی ئاییندەمان بێئاکام دەبێت، بۆیە دەستپێشخەریی بکرێ لە ناردنی هێزی پێویست و ڕێگەچارەیەك بۆ دوورخستنەوەی سەعید ئاغا لە ناحیەی (جال). تکایە ئاگادار بن

## بەڵگەنامەی ژمارە (2)

..REF: FO 95\2458

یاریدەدەری قونسوڵیەتی بەریتانیی لە وان

(13)ی ئازاری (1914)

گەورەم (مالیت) باڵیۆزی حکومەتی خاوەن شکۆی پاشایەتی بەریتانیی / ئەستەنبوڵ.

گەورەییە بۆ من هێزێکی سەربازیی سنووردار ئامادە بکەم لە دژی شێخی بارزان و شوێنکەوتوانی.. کەتیبەی سوارەی ژمارە ـ20ـ و بەتالیۆنی یەکەم و دووەمی سەر بە کەتیبەی ـ19ـ دوو، ق. ف بەرگری شاخ و دوو چەکی رەشاش بەشدارییان لەو شاڵاوەدا کردووە، ئەمرۆ ئەو هێزە (وان)ی بەجێهێشت و لەگەڵ هێزەکانی تر بەشداریی دەکەن لە هێرشی سەر بارزان، ئەوان بە هۆی نەخۆشیەوە هێزەکەیان زۆر لاوازە و لە (500) پیاو تێپەڕ ناکات.

شێخ بە یەکێك لەو پێنج شەش شێخە بەهێزەی کوردستان دەژمێردرێت، لە ناوچە شاخاویەکانی درێژایی سنووری هەردوو ویلایەتی وانو موسڵ، پێگەی لە ناو شێخەکان و ئاغاکاندا هەیە، دەسەڵاتی حکومەت لەو بەشەی وڵاتی تورکیا لاوازە، قائیمقامەکانی ئەو ناوچەیە دەسەڵاتیان لەو گوندەی تیا دەژین تێپەڕ ناکات بۆ دەرەوەی گوند، زۆربەی بەڕێوەبەری ناحیەکانی ئەو ناوچانەش لە ئاغاکانن، بەڵام شوێنی فەرمیی ئەوان زۆر بە کەمیی لەسەر حیسابی دراوسێکانیان یاخیبوون و سەرپێچیی هەیە، زیاتر لاوازیی دەسەڵاتی ناوەندیی لەو ناوچەیە دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی شاخاوی ناوچەکە، کە بە زۆریی رێگای هاتوچۆ لەو وڵاتە بە هۆی دەربەندو رێڕەوی بەردینییەوەیە، لە هەندێك لەو ناوچانە هەتا رۆیشتنی هێستریش، ئەستەمە.

ئامادەکردنی چەندین بەرپرسی ناوچەکە بۆ زەمینەسازیی سیاسەتی وازهێنان لە سەرۆك هۆزە بچوکەکانو ئاغاکان، تا رادەیەك بۆ کاروباری ناوخۆ و خۆبواردن لە جەنگی ناوخۆ و قبوڵ نەکردنی دەمارگیریی جێگرەوەی باشە، زوو سەرقاڵ دەبنو ناتوانن ریزەکانی خۆیان یەکخەن و ببنە کۆسپێکی ترسناك دژی حکومەت، ناوچەکە بۆ حکومەت دەوڵەمەند نییە، زۆر پێویست نەبووە دەسەڵات بسەپێنێ و باج وەربگرێ و

دەست لە کاروباری ناوخۆ وەربدات، لێرە زۆربەی کورد لە ناخەوە دوژمنی حکومەتن، بەم دواییە حکومەت گەیشتە ئەو باوەڕەی بەبێ لابردنی پێگەی ئەو شێخانەی کە خاوەنی دەسەڵاتی ئاینیی و سیاسییی و کردەیین لە ناوچەکەدا، ناتوانێ مەترسیی ئەوانە لابەرێ، لە ئاییندە ئەوان لە بارودۆخێکی لەبار دەگەڕێن بۆ ئەوەی رووبەڕووی دەسەڵاتی ناوەندیی ببنەوەو رێکخستنێکی کۆنەپەرستانەی دژ بە حکومەت رێکبخەن، شێخ بە بەردەوامیی هەڵوێستی دوژمنکارانەی هەبووە لە حکومەتی ئیتیحادو تەرەقی و مەڵبەندو پێگەی ئاژاوە بووە، دەڵێن لەگەڵ عەبدوڕڕەزاق بەدرخان نەخشەی دژی تورکان داڕشتبوو، ساڵی پار چوو بووە پاڵ شێخی بارزان، دەگونجێ هەر بە هۆی ئەمە بووبێت حکومەت بڕیاری سەرکوتکردنی دابێت، پێشتر لەگەڵ شێخی شەمدینان دوژمنی یەکتربوون، بەڵام دیارە هەردوولا رێکەوتون لەسەر چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانیان بە رێگەی ئاشتیی و بەرەیەکی یەکگرتوویان لە دژی تورك رێکخستووە، ئەوەی جێی وەبیرهێناوەیە شێخ عوبێدوڵڵای باپیری شێخی شەمدینان کە بە (40) هەزار چەکداری کوردەوە شاڵاوی بردە سەر ورمێ، بەڵام نەوەکانی ئەو پێگەیەیان نییەو تورکەکان بەرەو ئێران دەریکردن، ئێستا پێگەی شێخ تەهاو شێخی بارزان بەرفراوانە، شێخ تەها ئێستا لە ناوچەی (رازان)ی ئێرانیی لە سنووری تورکیی - ئێرانیی نیشتەجێیە و چەند گوندێکی بەدەستەوەیە.

هەواڵێکم بەدەست گەیشتووە زۆر لێی دڵنیا نیم، دەڵێن ئیدارەی رووسی لە ئازەربایجان شێخ تەهای کردووە بە بەرپرسی کاروباری گومرگی ئێرانیی لە ناوچە سنوورییەکانو مانگانە موچەی بۆ بڕیوەتەوە، ئەگەر ئەو هەواڵە راست بێت ئەوا ئەرکی بنەڕەتیی سەرشانی حکومەت قەدەغەکردنی هێنانی توتنە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەوەوە بۆ ئێران، چونکە حکومەتی تورکیا بۆ ئەو مەبەستە زەوی داوە بە گوندنشینەکانی شێخ و داهاتی تووتنی قەدەغە کردووە، کە ساڵانە بە هەزاران پاوەند (جونەیهی ئیستەرلینی= وەرگێڕ)، دەخەملێنرێت، ئەگەر هەوڵی ئەم دوو شێخە یەکبخرێت (شێخی شەمدینانو بارزان= وەرگێڕ)، ئەوا دەتوانن ببنە هێزێکی گەورەو گیروگرفت بۆ حکومەتی تورکیا بخولقێنن، بەڵام شاڵاوی ئەم جارەیان پێچەوانەی بزووتنەوەکانی تری کورد دەرفەتی زۆری نابێت بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوت و

تالآنیی، وەکو ئەوەی لە شالآوی سەر ورمێ رووی دا، بۆیە هێزەکانی حکومەت لە لایەن کوردەوە تووشی بەرهەڵستیی گەورە نابن، وا چاوەڕوان دەکرێ ئەو هێرشە بە پەرپینەوەی شێخی بارزان دەست پێبکات بۆ ئێران، لەوێ بچێتە پاڵ ئەو کۆمەلآنەی بەرهەڵستکاری رژێمی تورکیان و لە دەرفەتێك دەگەڕێن بگرێنەوە ولآت و دەست بگرنەوە بەسەر ئەو زەوی و سامانەیان کە حکومەتی تورکیی دەستی بەسەردا گرتبوو.

بۆ من شەرەفێکی گەورەیە بەوپەڕی رێزەوە ببمە خزمەتکاری گوێڕایەڵ:

ج. ن. سمیت، ئەفسەری سوارەی سووك

## 5- شۆڕشی بەرفراوانی کوردان: عەبدوڕڕەزاق بەدرخان، سمکۆ، سەید تەها

چالاکی گەرمو گوڕ هەبووە بۆ نەخشەی شۆڕشێکی بەرفراوانی کوردان بە سەرۆکایەتی نەوەکانی بەدرخان، بەتایبەت عەبدوڕڕەزاق بەدرخان و حەسەن بەدرخان لە سالآنی (1910ـ 1914)، بەلآم بارودۆخی نێودەوڵەتیی و هەرێمیی و هۆکارە خودیەکان بە تایبەت کورد خۆی "لە نەبوونی سەرکردایەتیەکی کارزماتی و هوشیار و یەکگرتوو بۆ کورد، لەگەڵ گەلآلەنەبوونی هوشیاری نەتەوایەتییو زیاد پشت بەستن بە رووس" رێگر بووە لە بەردەم سەرهەڵدانی شۆڕشێکی بەرفراوان، ئەگەر ئەوە زامن بوایە پێ دەچوو قەوارەیەکی سەربەخۆی تایبەت بەکورد لە دایك ببوایە، چونکە هەر لەو ماوەیەدا ژمارەیەك لە گەلانی ژێر دەسەلآتی عوسمانیی لە ڕۆژهەلآتی ئەورووپا لە بەلقان سەربەخۆییان وەرگرت، ئەمە باشترین دەرفەت بوو ـ بە بۆچوونی ئێمە ـ لە ڕووی نێودەوڵەتیی و ئیقلیمی بۆ درووستکردنی ئەو دەوڵەتە و قبوڵکردنی وەکو دیفاکتۆ لە ئاستی ئیقلیمی و نێودەوڵەتیی.

وەکو پێشتر ئاماژەمان پێدا زۆر گرنگە بەر لەوەی باس لە بزووتنەوەی عەبدوڕڕەزاق و هاوڕێکانی بکەین، هەروا بە کورتیش بێت ئەو بارودۆخە ئیقلیمی و نێودەوڵەتییەی کاتی بزووتنەوەکە بە بیر خوێنەری بەڕێز بهێنینەوە. لە ساڵی (1910ز) بزووتنەوەی دژ بە ئیتیحادیەکان لە گەشەیەکی بەردەوام دابوو، پارتی ئازادیی و ئیئتلاف بەرهەڵستکار لەساڵی (1912ز) توانی سەرکردایەتی کۆدەتایەکی سەربازیی بکات و

هەتا لە ناوەڕاستیساڵی (1913ن) ئیتیحادیەکان لە دەسەڵات دوور بخاتەوە، لەو ساڵەدا لە ئاکامی کۆدەتایەکی دژ گەڕانەوە بۆ حوکمو سەردەمی سێ دیکتاتۆریەکە (تەلعەت، ئەنوەر، جەمال) دەستی پێکرد.

لەو ماوەیەدا چەندین شۆڕش لەسەر خاکی عوسمانیی لە ئەوروپای رۆژهەڵات سەری هەڵدا، هاندەر بوو بۆ ئەرمەن بە پشتیوانی وڵاتانی ئەورووپیی و بەتایبەتی رووس و ئینگلیز و فەڕەنسا لە ژێر پەردەی چاکسازیی لە ئەنادۆڵی خۆرهەڵات، لە هەندێ ویلایەتە ئەرمەنییەکانو بەشێکی گەورەی کوردستانی باکوور هەوڵی دامەزراندنی قەوارەی ئەرمەنیی بدەن[367]، گەرچی رووس تێڕوانینی ئاشکرای نەبووە لە مەسەلەی ئەرمەن، بەڵام پێیان وابووە ئەنادۆڵی رۆژهەڵات کە کەمینەی ئەرمەنیی عوسمانیی تیا دەژی، وەکو کراسی عوسمان بەکاری بهێنن، رووس لە ساڵی (1912ن) دۆسیەی ئەرمەنیی لە دەوڵەتی عوسمانی هێنایە گۆڕێ[368]، بە چەكو پارە کەوتنە هاوکاریی چەکدارە ئەرمەنییەکان کە بە (فیدائی) یان (تاشناق) ناسرابوون، لە خاکی ئەرمەنی ژێر دەسەڵاتی رووسەکانەوە دەپەڕینەوە بۆ ناو دەسەڵاتی عوسمانیی[369]، لە ساڵی (1914) دەوڵەتی عوسمانیی رەزامەندیی دەربڕی لەسەر ئەو پڕۆژەیەی رووسیا بە هاوکاریی فەڕەنساو بەریتانیا خستبوویە ڕوو، بە ناوی چاکسازییەکانی ئەرمەنی، بەو پێیە دەبوایە لەو هەرێمانە حاکمی ئەرمەنی، یان نەسرانی دابنرایە لە ژێر رێنومایی نوێنەری هێزەکانی ئەورووپی، زمانی ئەرمەنیی لە ئیدارە و فێرکردن بسەپێنرێت و دادگای ئەرمەنیی بۆ ئەو کێشانە پێکبهێنرێت کە یەکێك لە لایەنەکانی کێشەکە پەیوەندیی بەکریستانەکانەوە هەبێت، وەکو سنووردانان بۆ دەستدرێژیی کوردان لەسەر ئەرمەن، ئەو پڕۆژە چاکسازییانە هیچ قسەیەکیان لە بارەی کوردەکان نەکردبوو، کە زۆرینەی زۆری دانیشتوانی ناوچەکەیان پێکدەهێنا، پێشتر ئەمەیان بۆ مەسدۆنیا و

---

367 - Stanford J. Shaw History of Ottoman Empire and Modern Turkey,(Cambridge; university press,1917) von 2 pp203-207.

368 - مذكرات السلطان عبدالحميد: ترجمتو تعليق محمد حرب، القاهرة1987، ص51-53.
Jwaideh, pt, p 350-352

369 - FO, 195\2317 No.4 march 13, 1909 British Vice Consulate Van Bertram Dickson to G. Loather.

بۆسنه و هەرسك و ئەلبانيا و سربيا و قوبرس كردبوو، دەستێوەردان بە ناوی چاكسازييەوە دوايی لە دەوڵەتی عوسمانييان دابڕی[370]، ئەگەر دەرفەت بۆ چاكسازييەكانی ئەرمەن لە ئەنادۆڵی خۆرهەڵات هەبوايە كاريگەريی لەسەر كورد كەمتر نەبوو، لە كاريگەريی بەڵێنی بەلفوڕ لەسەر فەلەستينييەكان، سەرەڕای ئەرمەن، رووس بۆ هەيمەنە كردنە سەر كوردستانی رۆژهەڵات و باكوور لەسەر حيسابی بەرژەوەندييەكانی كورد وەكو ئامرازێك لە هەوڵی بەكارهێنانی ئاشوريیەكاندا بوون، مێژووی ديبلۆماسيەتی قونسوڵەكانی رووس لە ناو دەوڵەتی عوسمانيی و باڵيۆزيەكانيان لە ئەستەنبوڵ بير لە درۆو زيادەڕۆيی بكەنەوە لەسەر مەرگەساتی ئاشووريیەكان وەكو خۆيان دەڵێن بە دەستی "كوردە دەمارگيرەكان مسوڵمانەكان"[371]، ياريدەدەری قونسوڵی بەريتانيی لە موسڵ باسی لە ڕۆڵی رووس كردووە دژ بە كورد، لە بەشێكی نامەی سەرۆكی ئەساقيفەی قدشيانيس ـ جولەمێرگ ـ دا هاتووە كە بۆ قونسوڵيەی ناردووە و دەڵێ: (قەزم نعيس ئۆليڤەری قونسوڵی رووسی لەوان بەرپرسيارە لە وروژاندنی ئاشووريەكان لە دژی كورد)[372].

ئەو بارودۆخە گەڕەلاوژەو لاوازييەی لە ئاكامی شۆڕشی دەستووريی ساڵی (1907) پەيدا بوو، كە هەتا ساڵانی شەڕی يەكەمی جيهانيی بەردەوام بوو، بۆشايەكی سياسيی و كارگێڕيی لە ئازەربايجانی ئێرانيی و سنووری ئێرانيی ـ توركيی درووست كرد، دەوڵەتی عوسمانيی هەوڵی داوە ئەم حاڵەتە نائاراميیەی سنووری توركيا ـ ئێران بقۆزێتەوە بۆ دەستبەسەراگرتنی ئازەربايجان و كوردستانی رۆژهەڵات، رووسەكان لەو باوەڕەدا بوون ئينگليزەكان هاندەری دەوڵەتی عوسمانين لە سنووربەزاندن بۆ ناو خاكی ئێران، ئەمەش بۆ فراوانكردنی پێگەی خۆيان لەسەر حيسابی ئێران، رووسەكان چەندين جار داوايان لە ئيتيحاديەكان كردووە لە خاكی ئێران بكشێنەوە، بەڵام بێئاكام بوو، لە ڕاستيدا ئينگليزەكان پشتيوانيی عوسمانييەكان نەبوون لەو فراوانخوازييە بۆ ناو خاكی ئێران، بەڵكو سووربوون لەسەر مانەوەی باری ئارامی سنووری توركيی ـ ئێرانيی، رووس

370 -السلطان عبدالحميد: مذكرات، ص54

371 - FO 195\2449\ 45 Telegram.No.28.Aleppo British Vice Consul M. Fontana

372-- Fo 195\ 2449\45 Henry Honey. Vice Consul Mosul.

بەوە نەوەستا، لە ساڵی (1909ز) دە هەزار سەربازی نارد بۆ داگیرکردنی ئازەربایجان و لە ئاکامدا شارەکانی خووی و ورمێ و سەڵماس و ماکۆ، گیران، لە ئەمەدا زیاتر مەبەستی دامەزراندنی پەیوەندیی بووە لەگەڵ سەرۆکە کوردەکان و ڕێگریی بووە لە بەردەم سنوور بەزاندنی تورکی بۆ ئەو هەرێمە، هەروەها زیادبوونی پێگەی بەرچاوی ئەڵمانیا لەناو دەوڵەتی عوسمانیی ئینگلیز و ڕووسی ناچار کرد دەوڵەتی عوسمان و ئێران ڕازی بکەن بە دروستکردنی لێژنەی دیارییکردنی سنووری ساڵی (1911) هەتا ئەڵمان ئاریشەی سنوور بۆ بەرژەوەندیی خۆی نەقۆزێتەوە، بەڵام قەیرانی سنووری عوسمانیی ـ ئێرانی بەشێکی پەیوەست بووە بە مەسەلەی کوردەوە، کە هەتا ساڵی (1914) چارەسەر نەکرا، بە کورتی بارودۆخی قەیرانەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانیی و بارودۆخە نێودەوڵەتیی و ئیقلیمییەکان هەر بە نائارامیی مانەوە.[373]

عەبدوڕڕەزاق و سمکۆ و سەید تەها تاکە پشتیوانی سەرەکییان لە داڕشتنی نەخشەی بەرفراوانی شۆڕشی کوردان ڕووسەکان بوو، بۆیە بە پێویستی دەزانین ڕێڕەوی ئەو ماوەیەی سیاسەتی ڕووسیی تێبگەین بەرانبەر بە کورد. هەموو ئاماژەکان لەسەر ئەو بابەتە لەو ماوەیەدا جەخت لەسەر ناڕۆشنیی سیاسەتی ڕووسەکان دەکەنەوە لە بەرانبەر کورد، نەك هەر ئەوە، بەڵکو دەمارگیرییەکی ئاشکرای ڕووسەکان هەبووە لەمەڕ متمانە نەبوون و پشت نەبەستن بە کورد، بەڵکو ڕووس زیاتر پشتی بە ئەرمەن و ئاشووریی بەستووە لە بەدیهێنانی بەرژەوەندیەکانی لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی[374]، سەرەڕای ئەمانەش لە ئاکامی زوڵمی ئیتیحادیەکان لە ساڵانی (1910 ـ 1914) ژمارەیەکی زۆری سەرۆك هۆزی کورد چوونە باوەشی خواستەکانی ڕووس[375]، لازاریف دەڵێ: ناکۆکیی هەبووە لە نیوان ڕێنومایی قونسوڵەکانی ڕووس لە ناوچەکەو فەرماندەکانی قەوقاز و (تەفلیس)ی پایتەخت کە داوای دروستکردنی پەیوەندی پتەویان کردووە لەگەڵ کورد، دەیانوت دەبێت لە دژی عوسمانیی پشتیوانیی لە کورد بکرێ، ڕێنومایی باڵیۆزەکانی ڕووس لە تاران و ئەستەنبوڵ و بەرپرسانی دەرەوە لە پترسبۆرگ، تەواو پێچەوانە بووە و ئەمان پێیان وابوو نابێت هاوکاریی مافی نەتەوایەتی

---

[373] - لازاریف: ل306-307.

[374] - هاوار: ل52

[375] - Longing, p.67-68

کوردان بکرێ، یان وەکو کارتی فشار دژی دەوڵەتی عوسمانیی بەکاربهێنرێن، وەزارەتی دەرەوەش جەختی لەسەر پابەندیی بەم سیاسەتە دەکردەوە، چونکە دەیویست سوور بێت لەسەر بەڵێنەکانی لە بەرانبەر بەریتانیا کە لە ڕێکەوتننامەی لێکتێگەیشتنی ساڵی (1905) هاتبوو[376]، وادی جوەیدە لە (نێکتین) کە کاتی خۆی قونسوڵی رووس بووە لە ورمێ و پسپۆڕ بووە لە کاروباری کورد، دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە ڕاستیدا رووسیای قەیسەریی سیاسەتی رۆشنی نەبووە بەرانبەر بە کورد، بۆ نموونە لەناو هێزەکانی ئێمەدا لە قەوقازیا هەتا بە نەخشەی ورد رادەگات کوردی زانی باشیشیان نەبووە[377].

عەبدوڕڕەزاق بەدرخان کەسایەتیەکی گرنگو خاوەن خۆزگە بووە، ویستویەتی لە ژێر چاودێریی رووسیا ببێتە میری هەموو کوردستان، گرنگترین نەخشەی ئەو بۆ بەدیهێنانی ئەمارەتی کوردستانی سەربەخۆ بریتی بوو لە:

1ـ رووس و ئێرانییەکان رازی بکرێن کار بکەن بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی نەتەوایەتی.

2ـ دامەزراندنی بنکەیەك لە کوردستانی ئێران هەتا ببێتە پێگەیەك بۆ رزگارکردنی هەموو کوردستان.

3ـ بڕوای پتەوی هەبووە جوڵانەوەی کورد پەرت و بڵاوەو بەو شێوە ناتوانێ کورد بگەیەنێتە ئاوات.

4ـ کۆڵەکەی بنەڕەتی لە ڕزگارکردنی کوردستان بریتییە لە شۆڕشی رۆشنبیریی.

5ـ کورد هاوپەیمانی رووسیا بووە، نەك ئینگلیز.

بەر لەوەی لە لایەنی بەهێزو لاوازی نەخشەی عەبدوڕەزاق بەدرخان تێبگەین، باشتر وایە شتێك دەربارەی ژیانی ئەو سیاسەتمەدارە کوردە وریاو ناسراوە بزانین، باشترە لەو بەڵگەنامەی وەربگرین کە نامەیەکی خۆیەتیو لە ساڵی (1910) بۆ (گاریکۆف)ی باڵیۆزی رووسی لە ئەستەنبوڵی نووسیوەو داوای کردووە رێگەی پێبدرێت سەفەری رووسیا بکات و لە تەفلیس بژی:

من ناوم عەبدوڕڕەزاقی کوڕی نەجیبی کوڕی بەدرخانە، تەمەنم (46) ساڵە، دوای فێربوونی زمانی فەڕەنسیی لە ئەستەنبوڵ ویستم بچم بۆ پاریس، بەڵام سوڵتان

---

[376] - لازاریف: ل53.

[377] - Jwaideh,p.250-251.

عەبدولحەمید نەیهێشت، چونکە نەیدەویست کوڕانی بەدرخان بچنە ئەورووپاو ئەستێرەی بەختیان بدرەوشێتەوە، ناردمی بۆ دەرەوەی تورکیاو وەکو سکرتێری سێیەمی باڵوێزخانەی عوسمانیی لە پەترسبۆرگ دایمەزراندم، دوای ساڵێك كرام بە سکرتێری دووەمی باڵوێزخانەی عوسمانی لە تاران، سەرقاڵی سەفەر بووم بۆ تاران تاوانێکیان دایە پاڵ من و بە فەرمانی سوڵتان لە سامسۆنەوە گەڕامەوە بۆ ئەستەنبوڵ، دوای ئەوە هەوڵم دا بچم لە تەفلیس بژیم هەتا نزیك بم لە ئێریڤان و کوردستان، دوور بم لە بەڵای سوڵتان، چونکە لە لای زۆربەی دیبلۆماسەکانی رووس لە ئەستەنبوڵ کەسایەتیەکی ناسراو بووم، هەر کە گەیشتمە تەفلیس بەرپرسانو پیاوماقوڵانی شار بە گەرمیی پێشوازییان لێکردم، سوڵتان بەمە نیگەران بوو، بە فرۆفێڵی سوڵتان کە وەکو باقی بەرپرسانی تر پێی ناسراون فشاری خستە سەر بەرپرسانی حکومەتی رووس، بە رێگەی یەکێك لە بەرپرسانەوە ئاگادار کرام کە مافم نییە لە ئێران و لە تورکیا و لە رووسیا دابنیشم، پۆلیس منیان گرتو بردمیانە باتۆم، لەوێوە چوومە ئینگلتەرە، بەڵام سوڵتان بە بەڵێنی باق و بریق قەناعەتی بە باوکم کرد بگەڕێمەوە بۆ ئەستەنبوڵو ببم بە سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی تەشریفات، گەڕامەوەو (14) ساڵ خزمەتم کرد، بە چەندین مەدالیای رێزلێنان خەڵات کراوم، لە ناویاندا مەدالیای پلەیەکی عوسمانیی، گەیشتمە پلەی باڵاو لە ناوەندە فەرمییەکانی ئەورووپا کەسایەتیەکی باشم بەدەستهێنا، ویسامی (ستانسلاڤی)یم وەرگرت، لەو ماوەیە ریزوان بەگی بەڕێوەبەری پۆلیس تیرۆر کرا، خۆم و خانەوادەکەم لەسەر ئەو مەسەلەیە تاوانبار کراین، سوڵتان کاسەی تووڕەیی خۆی بەسەرماندا ڕژاند، نزیکەی هەزار کەس لە خانەوادەی بەدرخان بەرەو گرتووخانە بران، یان دوورخرانەوە بۆ تەرابلوسی رۆژئاوا، چونکە سوڵتان دەترسا بنەماڵەی بەدرخان دەست بگرن بەسەر کۆشکی دەسەڵات.. دوای (18) مانگ ناڕەحەتی بەندیخانە، ئیتیحادیەکان هاتنە سەر حوکم، ئەوانە جیاواز نەبوون لەگەڵ سوڵتان لە بەرانبەر ئێمەو زاڵم بوون، لێبوردنی گشتییان دەرکرد بۆ هەموو گیراوە ئەرمەنی و بولغار و تورکەکان، بەڵام وەکو تاوانبار مامەڵەیان لەگەڵ ئێمە دەکرد، دوو مانگ دوای شۆڕشی دەستوورییش من لە گرتووخان مامەوە، هەتا لێبووردنی تایبەتیان بۆ دەرکردم، لەو باوەڕەدام تورکیا نە بە من و نە بە میرەکانی کورد چاك نابێت... بۆیە داوا لە بەڕێزتان دەکەم وەکو هاووڵاتیەکی رووسیی قبوڵم بکەن، لە کاتێکدا باڵوێزخانەی رووسیی باشم

دەناسن، بە دڵسۆزیی خزمەتی رووسیای نیشتیمانی خۆم دەکەم... تکایە رێگەم پێبدەن لە تەفلیس نیشتەجێ بم)[378].

لەم ژیاننامە تایبەتیەی عەبدوڕڕەزاق بەدیاردەکەوێ کە (14) ساڵ لە دیوانی تەشریفاتو لە ئاستێکی بەرز خزمەتی کردووە، دیارە جێی متمانەی سوڵتان عەبدولحەمید و دڵسۆزی ئەو بووە، ئەگینا چۆن توانیویەتی ئەو ماوە زۆرە خزمەت بکات لەگەڵ سوڵتانێك کە زیاد لە پێویست بایەخی بە لایەنی ئاسایش داوە، دوایی بۆ لەو ماوەیە بەئاراستەی داواکاری مافی کورد نەجولاوەتەوە؟ یان بەر لەوەی لە بەرژەوەندیی خانەوادەکەی بدرێت بۆچی پشتیوانیی لە بەرهەڵستکاران نەکردووە..؟ بە مافی خۆمانی دەزانین بپرسین، ئایا عەبدوڕڕەزاقی ئیداریی و خاوەن خۆزگە دەبێ نەیتوانیبێت لە پایەی حکومیی شتێ بە شتێ بکاتو پەنای بۆ شێوازی شۆڕشگێڕیی بردبێت بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی لەدەستی چوو بوو؟.

(باسل نێگتین) لە ساڵی (1909) لە نامەیەکی دا بۆ رۆژنامەی (مانچەستەر گاردیان) نووسیویەتی: عەبدوڕڕەزاق هاتە پترسبۆرگ، پرۆژەی دەوڵەتی کوردیی پێبوو، بەڵام رووسەکان قبوڵیان نەکرد[379]، ئەو ساڵی (1909) لە گرتووخانەدا بووە، دەگونجێ ئەو ساڵە بە هەڵە نووسرابێت، بەڵام لازاریف دەڵێ: لە تشرینی دووەمی ساڵی

---

[378] - بیرەوەریی عەبدوڕڕەزاق بەدرخان: خرکردنەوە و ئامادەکردنی، جەلیل جەلیلی، ل15-20. لەوێدا عەبدوڕڕەزاق دەڵێ (ئیتیحادیەکان زۆر هەوڵیاندا بە پارەو پلەو پایەی حکومیی بە لای خۆیاندا رام بکێشن، بەڵام بێئاکام بووە، دڵنیام کردنەوە من لە بەدیهێنانی مافی کورد بەو لاوە هیچم ناوێ (بڕوانە، ل37-38). بەڵام لازاریف لە سەرچاوەیەکی باڵوێزخانەی رووسیی لە تارانەوە بیستوویەتی و دەگێڕێتەوە: کە لە ساڵی (1912ز) عەبدوڕڕەزاق گفتوگۆی هەبووە لەگەڵ ئیتیحادیەکان بە مەستی ئاسانکاریی بۆ گەڕانەوەی، عەبدوڕڕەزاق رازی بوو بە مەرجێ پارچە زەویەكو (2000) لیرەی بدەنێ، بەڵام تورکان قبوڵیان نەکردووە، (بڕوانە: کێشەی کورد ،ل323)، (فانتانا)، یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لە حەلەب لەو باوەڕەدایە ناکۆکیی نێوان ئیتیحادیەکان و عەبدوڕڕەزاق دەگەڕێتەوە بۆ کەمکردنەوەی موچەی مانگانەی حکومیی کە لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید (40) بووە و ئێستا تەنیا (10) لیرەی دەدەنێ. بڕوانە:

FO 195\2445,,kurds,,No 81Desember, 29, 1912 Aleppo. From R. Fontana to G. Loather.

[379] - The Manchester, Guardian, September 25, 1950.

(1910) داوای پیشکەش کردبوو ببێتە هاوولاتیەکی رووسی و لە ئێریڤان دابنیشێت، چونکە ئیتیحادیەکان تەنگیان پێ هەڵچنیبوو، لە سەرەتاوە داواکەیان قبوڵ نەکرد و دوایی رێگەیان پێدا، هات و لە ئێریڤان دانیشت.

عەبدوڕڕەزاق لەساڵی (1911) توانیبووی سەردانی شارو گوندە کوردیەکانی ئێران بکات بۆ هاندانی کورد بۆ دەرپەڕاندنی هێزەکانی تورکیی و هاوکاریی نەکردنی هێزەکانی ئەوان لە دژی ئێران، هەروەها مەسەلەی شۆڕشێکی بەرفراوانی لەگەڵ کوردەکانی ناو خاکی ئێران هێنابووە گۆڕێ، عەبدوڕڕەزاق وریایی دابووە کوردان ئەگەر هێزەکانیان یەك نەخەن ئەوە ئەرمەن بە پشتیوانی ولاتانی ئەورووپیی دەوڵەتی ئەرمەنی لەسەر خاکی کورد دادەمەزرێنێت، رەزامەندیی سەرۆکەکانی کوردیش بۆ پڕۆژەی عەبدوڕڕەزاق پەیوەست بووە بە پشتیوانیی رووسیەوە، عەبدوڕڕەزاق لە باسی سەفەرەکەیدا دەڵێ: (لە ماکۆوە هەتا ویلایەتی موسڵ پەیوەندییمان کردووە بە سەرۆکەکانی کورد و مەسەلەی کۆتاییهێنانمان بە زوڵمی تورکیی باس کردووە)[380]، عەبدوڕڕەزاق بەگ لە ناو ئەو سەرکردە کوردانەی پەیوەندییان بە ئەوەوە هەبووە ناوی سمکۆ دێنێ و بە یەکێك لە شوێنکەوتوانی خۆی باسی کردووە، لەگەڵ (سەید عەلی خێزانی)و سەرکردەکانی هەکاری، دەڵێ: زانایانو شێخانی دهۆکیش کۆبوونەتەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو پڕۆژەیە، دوایی دێتە باسی چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ سەید تەهاو سەردار ماکۆ، (مورتەزا قولی خان) بڕوای وایە ئەمەی دوایی بۆ بەرژەوەندیی نەتەوایەتی دڵسۆز نییە، ناوی کورد بەگ دێنێو دێتە سەر پەیوەندییەکانی بە شێخانی بارزان و ژەنەراڵ شەریف پاشا لە پاریس[381].

لە کۆتایی ساڵی (1912) یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانیی لە حەلەب لە ڕاپۆرتێکی دا باس لە بزووتنەوەیەکی دژ بە توورکان دەکات لە باکووری کوردستان[382]. گەیشتۆتە ئەو باوەڕەی ئەوە مەترسیی دروست دەکات لەسەر رژێمی تورکی، خانەوادەی بەدرخان حوسێن پاشاو حەسەن پاشاو عەبدولکەریم پاشا بە چڕیی خۆیان ئامادە

[380] - بیرەوەری، ل33-34.

[381] - هەمان سەرچاوە.

[382] - FO 195\2445 No.78 Aleppo Dec 14,1912.

کردووه، شارەکانی جەزیرە، سەعرەت، مهاباد، موسڵ مەڵبەندی بزووتنەوەی بەدرخانییەکانە، کوردەکانی ئەو بەشەی کوردستان لە هەموو ناوچەکانی تر بێزارتربوون لە دەسەڵاتی ئیتیحادیەکان و بە باشترین شێوە خۆیان ئامادەکردبوو بەرەنگاری دەوڵەت ببنەوە، چونکە گەندەڵیی لەناو ئیتیحادیەکان بڵاوببۆوە، لەگەڵ رەچاونەکردنی پێویستیەکانی ناوچەکەو هەستی نەتەوایەتیی کوردو هاوسۆزی بۆ سوڵتان عەبدولحەمید[383]، حکومەت بۆ مەبەستی بەگەڕخستنی هەوڵی کوردان بۆ شەڕەکانی بەڵقان لەساڵی (1912) لە دیاربەکر کۆنگرەیەکی بۆ شێخ و زانایانی کوردستان‌و فەرماندەکانی لەشکری حەمیدیە (سەر لەنوێ رێکخرابوونەوە بە ناوی: (کەتیبەکانی هۆزایەتی سوارەی سووك)، رێکخست، کۆنگرە کۆتایی هات بەبێ ئەوەی کورد هیچ هاوکارییەکی بەرجەستە پێشکەش بکات، سەرەڕای ئەمە بزووتنەوەی ئەرمەن بەهێز بوو[384]، ئەمە کوردانی هاندا داوای هەمان ماف بکەن کە ئەرمەن داوای دەکرد، بە هۆی شکستهێنانی سوپای عوسمانیی لە بەڵقان لە ساڵی (1912)، دەوڵەتی ناوەندیی هەیمەنەی خۆی لەدەست داو زۆربەی ویلایەتەکانی ئەورووپای عوسمانیی بوونە وڵاتی سەربەخۆ، یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانیی لە حەلەب لە راپۆرتێکی دا دەڵێ: زۆربەی کوردان بێ دوودڵیی لەو باوەڕەدان ئینگلیز چۆن پشتیوانی لە بزووتنەوەی سەربەخۆخوازیی بەلقان کرد، بەو شێوە پشتگیریی لە بزووتنەوەی سەربەخۆیی کوردیش دەکات و ویلایەتەکانی دیاربەکر و جەزیرە و سەعرەت دەخاتە سەر وڵاتی رافیدەین کە بەنیازە لە دوای کەوتنی ئیتیحادیەکان دایبمەزرێنن[385]، کوڕانی بەدرخانیش پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ ئینگلیز پاراستبوو، حوسێن پاشا هەموو سەرۆك هۆز و شێخەکانی ئاگادار کردبۆوە، کە لە دوای توانەوەی بەفر خۆیان ئامادە بکەن بۆ شۆڕشێکی بەرفراوان، کە لە نیسانی (1913) دەست پێدەکات، پڕوپاگەندەی وا هەبوو

[383] - FO 195\2182,, Current Events In Mosul Vilayet,, No.10 April 23,1913 H.C.Hony Vice Consul Mosul. No.78 Enclosure in R. Fantana, s Dispatch. To G. Luther December 14,1912

[384] - FO 195\2445 No. 18 December 14,1912,R. Fontana Vice Consul Aleppo.

[385] - FO 195\2445 No. 18 December 14,1812,R. Fontana

رووس بایی (200) هەزار چەكدار چەك و تەقەمەنیی پێویست دەدا بە كورد لە دژی ئیتیحادیەكان[386].

عەبدوڕڕەزاق هەوڵی دەدا شێخانی كوردستانی باشوور رابكێشێت، بە قسەی یاریدەدەری قونسوڵی لە ساڵی (1913) لە وان كۆنگرەیەك هەبووە بۆ شێخان و زانایانی ئیسلامیی كوردستان بۆ گفتوگۆ لەسەر هاوكاریی شۆڕشی بەدرخان، هەروەها توانیبووی پشتیوانی شێخانی ئێزیدیو مارشەمعۆنی سەرۆكی تایفەی ئاشووریی بە لای خۆیدا رابكێشێ، پەیوەندییشی كردبوو بە سەرۆكەكانی تاشناقو پیاوماقوڵانی ئەرمەن، بەڵام ئەوان مەترسییان هەبووە لە پشتگیری بەدرخان، عەبدوڕڕەزاقو سەركردەكانی تری هاوڕێی لە ساڵی (1913) دەیانگوت لە حاڵەتی راگەیاندنی شۆڕشی بەرفراوانی كوردیداین و زیاتر لە هەزار چەكدارمان هەیە[387].

لەو ساڵە عەبدوڕڕەزاق كۆتایی بە بەرنامەڕێژییەكەی هێنا، كە بریتی بووە لە دەسپێكردنی چالاكی سەربازیی لە سنووری توركیی - ئێرانیی.

بەپێی ئەو نەخشەیە، یەكێك لە سەرۆك هۆزە چالاكەكانی سەر سنوور بە ناوی سەعید بەگ هێرش دەباتە سەر ناوچەی ئوجاغ، عەبدوڕڕەزاقیش سەركردایەتی هێزێك دەكات بۆ رزگاركردنی بۆتان، سەید تەهاش سەركردایەتی هێزێكی تر دەكات بەرەو باشقەڵا، لە هەمانكاتدا سمكۆ هێرش دەباتە سەر ناوچەی سەرا لە سەرسنوور[388].

لازاریف بۆمان دەگێڕێتەوە عەبدوڕڕەزاق چی بە قونسوڵی رووسیی وتووە: (ئێمە هەموو شتێكمان ئامادە كردووە، چاوەڕوانی پیاوی نیشتمانی موسا بەگ دەكەم لە (وان)ەوە سەردانی ئێران بكات بۆ دانانی رێوشوێنی كۆتایی، دەتوانین وان بگرین و لەوێ زۆربەی سەربازەكانی كوردی ناو سوپای عوسمانیی هاوسۆزمانن بۆ ئەو پرۆژەیە، ئەمە سیاسەتی درووست نییە ئێمە ناتوانین بەرەنگاری هێزەكانی توركیا ببینەوە و هێرش بەرین، هێندە ساویلكەش نین لەم بارودۆخە پشت بە رووس ببەستین، بە خێرایی دەڕۆم بۆ ئێران و داوا دەكەم بمكاتە حاكمی كوردستان و پەیمانیان دەدەمێ توركان لە

---

[386] - FO\195\2445\45 British Vice Consul Mosul.

[387] - FO 195\2449\45 British Vice Consul Van.12 May 8,1913; Macdowall,p99

[388] - FO 195\2449\45 British Vice Consul Van.12 May 8,1913.

خاكی ئێرانیی لە كوردستان دەرپەڕێنم، نەسر ملوك "حاكمی ئازەربایجان= نووسەر" دەناسمو لە كۆنەوە دۆستایەتییم لەگەڵی دا هەیە، ئەگەر داوایەكەیان قبوڵ نەكردم ئەوكات بە هێز سەڵماس، یان ورمێ داگیر دەكەم، دوایی برووسكەیەك بۆ شا دەكەم، دڵسۆزیی خۆمی بۆ بە دیار دەخەم و ئامادەیی دەردەبڕم بۆ دەرپەڕاندنی تورك لە خاكی ئێران، كار دەكەم بە ڕاوێژ لەگەڵ قونسوڵی رووسیی، بۆ رزگاركردنی كوردستان پێویستمان بەوە هەیە لە كوێوە دەست پێبكەین، كوردستانی ئێرانیش گونجاوە ببێتە ئەو پێگەیە، لە كوردستانی توركیا هەموو ئامادەن، تەنیا پێویستیان بە ئاماژەیەك هەیە، بەڵام لەوەدا كورد هەموو یەك دەنگن كە پێویستیان بە ڕووس هەیە[389]. بەڵام نەخشەی عەبدوڕڕەزاق و حەسەن و حوسەین كوڕانی بەدرخان نەبووە راستیی و شۆڕشی چاوەڕوانكراوی كوردان هەڵنەگیرسا، دیارە ئەم سەرنەگرتنەش چەند هۆكارێكی هەیە، لازاریف هەڵسەنگاندنێكی باشمان دەداتێ لەسەر نەخشەكەی عەبدوڕڕەزاقو ئەو لێڵیەی بە چەند خاڵێك دیارییكردووە:

یەكەم: نەخشەی عەبدوڕڕەزاق یەكی نەدەگرتەوە لەگەڵ ئەو ناكۆكییەی هەبووە لە نێوان سەركردەكانی كورد، بەرپرسانی تورك ژمارەیەك لە سەركردەكانی كوردیان لە دژی بزووتنەوەی كوردان بـەكاردەهێنـا.

دووەم: خوێندنەوەی عەبدوڕڕەزاق بۆ لاوازیی ئێران خوێندنەوەیەكی درووست نەبووە، لە ساڵی (1912) دەسەڵاتی ناوەندیی لە ئێران لە بەهێزییدا بووە، بەرپرسانی ئێرانیش لەگەڵ توركان رێككەوتبوون بەرهەڵستیی نەخشەی عەبدوڕڕەزاق و سمكۆ بكەن، ئێرانییەكان پشتیوانی هێزەكانی توركیان كردووە لە ڕێگەی زانیاریی و لۆجستی بۆ راوەدوونانی سەركردەكانی بزووتنەوەی كورد، لە ساڵی (1912) رووسەكان سمكۆیان كردبووە حاكمی قوتور "شارێكی سەر سنوورە"، حاكمی تەفلیس كە فەرماندەی سوپای رووسیش بووە لە قەوقاز و مەدالیای رێزلێنانی داوەتێ، پارەی تایبەتی داوە بەو پاسەوانانەی لە ژێر فەرماندەی سمكۆدا بوون، بەڵام هەریەك لە توركیا و ئێران رازی نەبوون ئەو پلە و پایەی دراوە بە سمكۆ.

---

[389] - كێشەی كورد، 150-151

سێیەم: عەبدورڕەزاق هەڵسەنگاندنی درووستو زانستییانەی نەبووە بۆ هێزی خۆیو توانای تورك لە ناوچە سنوورییەکان، چونکە لەگەڵ ئەو بارودۆخە نالەبارەی کوردی ئێرانی تێکەوتبوو، پێیانوابووە دەوڵەتی عوسمانی سوونییە و خۆیان بە دۆستی تورك دەزانی و تورکیاش لە بەرانبەر مەترسیی هەوڵەکانی ئەرمەن کە بە ناوی چاکسازییەوە دەیەوێ دەست بەسەر ناوچە کوردیەکاندا بگرێ، بۆیە بانگەوازی بۆ جامیعەی ئیسلامی دەکرد و دەیویست کورد بە لای خۆیاندا رابکێشێ، عەبدورڕەزاقو هاوڕێکانی بکەنە ئامرازی دەستی رووس بۆ جێبەجێکردنی نەخشەی ئەرمەنیی، هەر بۆ نموونە عەبدورڕەزاق لە ساڵی (1911ز) گەیشتە ورمێ، قونسوڵی تورکی بەو هێزەی لەبەردەستی دابوو عەبدورڕەزاقی گرت، دوای هەوڵی زۆری قونسوڵی رووسیی ئازادی کردووە[390]، (عەبدورڕەزاق) لە بارەیەوە لە یاداشتەکانیدا نووسیویەتی:

کاتێك گەیشتمە ورمێ هەوڵم دا بچمە قونسوڵیە، بەڵام قونسوڵ لەوێ نەبوو، تێگەیشتم شار بە تەواوی لە بن دەستی قونسوڵی تورکیدایە، هەوڵم دا بە شێوەیەك متمانەی قونسوڵی تورکیی بەدەست بهێنم، دوای دوو رۆژ قونسوڵی رووسی گەڕایەوە ورمێ، منیش چووم داوای لێبکەم پەنام بدات، ماوەی هەفتەیەك لەوێ گیرم خوارد، ئەو ماوەیە بە هەموو شێوازێك قونسوڵی رووسیی هەوڵی دەدا دەرم بهێنێ، هەتا هەڕەشەی کرد هێرش بکاتە سەر قونسوڵیە.

دوایی قونسوڵی تورکی هاتە قونسوڵیەی رووسیی و فەرمانی لێبووردنی سوڵتانی خوێندەوە لەسەر من، بەڵام قونسوڵی رووسیی لەگەڵ ئەوەدا قونسوڵی تورکیی مەفرەزەی زۆری لە دەوری قونسوڵیە و دەوری شار دانابوو قونسوڵی توانیبووی رێوشوێنی فڕاندنم رێکبخات، لەوێ بۆم دەرکەوت بەرپرسانی ئێرانیی هەموو پشتگیرییەکی قونسوڵی تورکیان کردووە لە دژی من[391].

چوارەم: عەبدورڕەزاق لەوە هەڵە بووە، کە پشتی بە ڕووس بەستووە، ئەوانیش لەگەڵیدا راستگۆ نەبوون، بۆ نموونە عەبدورڕەزاق دەڵێ: گیرکۆف هاوڕێیەکی بە ئەمەك و هاوپەیمانیی کوردە، کەچی لازاریف لەسەر هەمان گیرکۆف دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: (عەبدورڕەزاق ویستویەتی هاوکاریی رووس بەدەستبێنێ لەو رووداوانە و هەندێ

---

[390] - هەمان سەرچاوە، ل253-254، 323-325

[391] - بیرەوەری، 28-29

گۆڕانکاریی بکات بۆ بەرژەوەندیی کورد، بەڵام نابێت ڕێگە بدەین بە دەوڵەتی کوردی، ڕێگەدان بە کورد بۆ دانانی پێگەیەکی شۆڕش ئەمەیان شتێکی ترە، چونکە دوایی دەکەوێتە ژێر کاریگەریی جامیعەی ئیسلامیی*)، هەن کە مینۆرسکی بە دۆستی کورد دەزانن، بە عەبدوڕڕەزاق دەڵێ: پیاوێکی بەرژەوەندییخواز و بە سەید تەها دەڵێ: پیاوێکە جێی متمانە نییە، هاوکاریی بزووتنەوەی کوردیی بۆ رووسیا بە هەڵە زانیوە، چونکە دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان دەبێتە هۆی نائارامیی لە سنوورەکانی رووس لەگەڵ هەریەك لە ئێران و دەوڵەتی عوسمانیی، ئەمەش زیان بە بەرژەوەندیی ستراتیژیەکانی رووسیی دەگەیەنێت لەو هاوپەیمانییەی لەگەڵ بەریتانیا لە ساڵی (1905) زوو هەیبووە، هەروەها بە بەردەوامیی وەزارەتی دەرەوە سوور بووە لەسەر بەکارنەهێنانی کورد وەك کارتی فشار، چونکە کورد فاکتەری نائارامیین[392]. لە دوایشدا ناکۆکیی جەوهەری هەبووە لە نێوان عەبدوڕڕزاق و سمکۆ لەسەر شێوازی کارکردن، سمکۆ لە عەبدوڕڕەزاق نیگەران بوو بەوەی پارەی کۆمەڵەی جیهانزانیی بەکارهێناوە بۆ کڕینی چەك بۆ هەندێ لە لایەگرانی، هەتا لەسەر سنوور بۆ ناو خاکی تورکیا لە وان و ئەرزڕۆم کاری سەربازیی سنووردار ئەنجام بدەن، سمکۆ بزووتنەوەی چەکداری بەرفراوانی بە چاکتر زانیوە[393].

کورد لە نێوان خۆیاندا یەکدەنگ نەبوون لەسەر هەڵگیرسانی شۆڕشێکی بەرفراوان، بەشێکی هۆکاری نووشستیمان لە ڕەخنەکانی لازاریف بۆ باسکردن، سەرەڕای ئەوانە جیاوازیی زۆر هەبووە لە بۆچوونی حەسەنو حوسێنو عەبدوڕڕەزاقی برازایان، عەبدوڕڕەزاق ویستویەتی بە تەنیا سەرکردایەتی خانەوادەی بەدرخانییەکان بکات و حیساب بۆ مامەکانی نەکات، بۆ نموونە لە یاداشتەکانیدا لەو کەسایەتیانەی پەیوەندیی پێوە کردوون ناویان ناهێنێ، ئەوە بە هۆی ساردیی نێوانیانەوە بایەخی پێنەداون، لە کاتێکدا کوردستانی باکوور، بەتایبەتی ناوچەی بۆتان، ملکەچی پێگەی حوسێن بەگ

* - مەبەست لە جامیعەی ئیسلامی: کۆبوونەوەی نەتەوە موسڵمانە جیاوازەکانە لە سایەی خەلافەتی سوڵتانی عوسمانیی، چونکە ئەو بابەتە لە لایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە پێش کۆدەتای ئیتیحادو تەرەقی وروورژێنرا، نەك ساڵی 1912. "وەرگێڕ"

[392] - کێشەی کورد، ل530-531. 546.

[393] - هاوار: ل168

بوون و بەو ئەندازەیە عەبدوڕڕەزاق لەوێ ناسراو نەبووە، جیاوازی ریشەیی هەبووە لە نێوان بۆچوونی عەبدوڕڕەزاق و مامەکانی لەسەر شۆڕشێکی بەرفراوان، عەبدوڕڕزاق هاوپەیمانییەتی رووسیی پێ چاك بووە و بڕوای بە پێشەنگیەتی رۆشنبیری رووسیی و دەوڵەتی رووسیی هەبووە وەکو هاوپەیمان بۆ کورد، چەندین جار دووپاتی کردۆتەوە کە شێخ عوبێدوڵڵای نەهری هەڵە بووە پشتی بە ئینگلیز بەستووە، دەبێت بە سەرپەرشتی رووس بۆ دەوڵەتی سەربەخۆی کورد تێبکۆشین، بەڵام حەسەن و حوسێن باوەڕیان وابوو پێشتر ئینگلیز یارمەتی بنەماڵەی سعود و خدێوی میسری داوە بۆ سەربەخۆیی لە دەوڵەتی عوسمانیی، ئێستاش ئینگلیز بەرژەوەندیی هەیە لە کوردستان و هاوسنووری وڵاتی رافیدەین و یارمەتیدەرە بۆ هەوڵی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، یان سوودوەرگرتن لە باشیی پەیوەندیی بەریتانیا بە دەوڵەتی عوسمانییەوە بۆ بەدەستهێنانی حوکمی زاتیی بۆ کورد لە چوارچێوەی تورکیا، حەسەن و حوسەێن لە کوردستانی باکوور و عەبدولکەریم مەکتوبچی برایان لە موسڵ پەیوەندیی باش و پتەویان هەبووە بە قونسوڵیەکانی بەریتانیی لە موسڵ و وان[394]. بە مەبەستی قوڵکردنەوەی ناکۆکیی نێوان سەرکردە چالاکەکانی کورد و ئیتیحادیەکان سەرلەنوێ لێبوردنی گشتییان بۆ شێخ عەبدولقادری نەهریی راگەیاند و هەموو دەرفەتێکی هاتووچۆیان لە ناوچە سنوورییەکانی نێوان تورکیا و ئێران پێدا، ئەمەش هەنگاوێك بوو بۆ بێهێزکردنی پێگەی سەید تەهای برازای و عەبدوڕڕەزاقی هاوپەیمانی رووسیی لەناو هۆزە کوردەکان[395]. لە تشرینی یەکەم و کانوونی یەکەمی (1912) جوڵانەوەیەکی تر هەبووە، بەدەر لە نەوەکانی بەدرخان ئەویش بە سەرۆکایەتی بوسراوی لە جەرابلس و کوڕەکەی ئیبراهیم پاشای میللیی و مستەفا پاشا ناوێك لە جەزیرە، ئەو بزووتنەوەیە دژایەتیی ئیتیحادیەکانی دەکرد چونکە هۆکاری مردنی ئیبراهیم پاشاو کوڕە گەورەکەی بوون و هەروەها شەریعەتیان خستۆتە پەراوێزەوە، سوڵتان عەبدولحەمیدیان لەسەر کار

---

394 - FO 195\2449\45 In disclosure in Consul Fantana,s Despatch NO 17 23\3\1913; FO 195\2182 NO. 12 Current Events in Mosul Vilaet,, British Vice Consul mosul,H,C. Hony April 23,1913.

395 - Mcdowall,p100

لابردووه كه تاكه پەیوەستی نێوان كورد و تورك بووه، نوشستی عوسمانییەكان له شەڕی بەڵقان (بوسرایی)و كوڕانی ئیبراهیم پاشای قەناعەت پێكرد "كه ڕۆژی توورکان له ئاوابوونه"، به پێی راپۆرتی (فانتانا) یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانیی له حەلەب "شێخ بوسرای و نەوەكانی ئیبرهیم پاشای میللیی و موستەفا پاشا (200) هەزار چەكداریان ئامادەكردووه و بەم زوانه له بیری هێرشكردنه سەر حەلەب دان، سەركردەكانی بزووتنەوەی كورد باوەڕیان وابووه كه چارەنووسیان بەستراوەتەوه به عەرەبەوه و ئێستا ئەوان ئەگەر خەلافەت رابگەیەنرێ ئامادەن بەیعەت بدەن به یەكێك له شەریفەكانی مەككه"[396]، ئەمەش له ڕووی ئامانج و لێدوانەوەوه بەڵگەیەكی تره لەسەر پەرت و بڵاویی جوڵانەوەی كوردی، بۆیه ئیتیحادیەكان بۆ له باریەك بردنی رقی كورد و پووچەڵكردنەوەی شۆڕشێكی بەرفراوان سیاسەتی نەرمیان بەرانبەر كورد پیاده كرد، له سنووری دەسەڵاتی هەردوو برا حەسەن و حوسێن له ئازاری ساڵی (1913) راپەڕینێكی جەماوەریی له شاری جەزیرەو میدیاد پەیدا بوو، حكومەتی ئیتیحادیەكان له ڕێگەی حەسەن پاشای والی دیاربەكرەوه له هەوڵی گەڕاندنەوەی ئاسایش دابووه بۆ ناوچەكه، له ڕاستیدا ئەو راپەڕینه له شەڕی نێوان دەروێش ئاغا و قائیمقامی میدیاد كەوتەوه، حوسێن پاشا داوای له حكومەت كرد یەكەم جار خۆی و دوایی لەو كوردانەی ئەو دوو شاره ببوورێ كه بەشدارییان لەو راپەڕینه كردووه و كه ژمارەیان دەگەیشته (60) كەس، لەو راپەڕینه قائیمقامی جەزیره و میدیاد و دوو له بەڕێوەبەری ناحیەكانی ناوچەكەیان دەركرد و داوایان له كورد كرد ئەو باجه حكومیانه نەدات كه لەسەریان دانراوه[397]، هەر خێرا رەزامەندییان لەسەر ئەو داواكاریانه دەربڕی، بەمەش پێگەی حوسێن پاشا زیادی كرد[398]، ئیتیحادیەكان هەموو هەوڵی خۆیان خستەگەڕ هەتا نەهێڵن گڕی راپەڕین بپەڕێتەوه بۆ دەرەوەی بۆتان، هەر لەو ماوەیه چەندین بەرپرسی حكومیی

---

[396] - FO,195\2445 Enclosure No.5 in Number 1,November 25,1912, FO 195\2445 Enclosure No. 78 In Vice Consul Fontana’s Dispatch December 14,`912.

[397] - FO 195\2449\45 Vice Consul Aleppo, R Fontana April 22,1913.

[398] - FO 195\2182 No.10 Current Events in Mosul Vila yet,, British Vice Consul Mosul H.C Ho. ny April 23,1913

سەردانی ناوچەکەیان کردو نییەتپاکیی خۆیان بۆ کورد دەرخست کە هەموو کێشەکانیان بە ئاشتیی بۆ چارەسەر دەکەن، یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانیی لە حەلەب دەڵێ: (لەم رۆژانەدا حکومەت زۆر رێوشوێنی گرتۆتەبەر بۆ رازیکردنی کورد). حکومەت ئەوەی مەبەستی بوو دەستی کەوت لە لەباریەکبردنی راپەڕینەکە، بەر لەوەی بەشەکانی تری کوردستان بگرێتەوە، بە قەدەری خوا دوای دوو مانگ حوسێن پاشای بەدرخان مرد، بەمەش زیانێکی گەورە لە جوڵانەوەکە کەوت کە ئامادەکاریی هەبوو بۆ سەرهەڵدانی شۆڕشێکی بەرفراوان، حەسەن پاشای برای بچووك وەکو کاکی خەسڵەتی سەرکردەیی تیا نەبوو، قونسوڵی بەریتانی لە دیاربەکر زۆر بە ورە دابەزیوی بینیویەتی، حەسەن پاشا وتوویەتی: کورد بە تەنیا داوای مافی رۆشنبیریی دەکەن لەگەڵ دامەزراندنی بەرپرسانی کورد لە ناوچەکە و کەمکردنەوەی باج و گواستنەوەی کاربەدەستە گەندەڵەکانی کوردستان[399].

لەسەر کارئاسانیی ئیتیحادیەکان لە دەستبەسەراگرتنی شۆڕشی کورد و خاوکردنەوەی رقی کوردان، لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە رووکەشیەی لە سیاسەتی دوژمنکارانەی ئەوان هاتەدی بەرانبەر کورد بە پێچەوانەی مامەڵەی پێشوو مەکدواڵ دەڵێ:

ئیتیحادیەکان لە دوای چەند ساڵ لە دەسەڵاتیان تێگەیشتن لە سروشتی بەرەنگاری و گەیشتنە ئەو باوەڕەی سیاسەتی عەبدولحەمید بەرانبەر کوردان راست بووە، بۆیە ناچاری لاساییکردنەوەی ئەو بوونەوە، بە مەبەستی رازییکردنی سەرکردەکانی کورد لە فەرماندەکانی حەمیدیەی لێکهەڵوەشاوەی پێشوو، ئیتیحادیەکان موحەممەد سادق نەهریان نارد بۆ ئێران، هەتا فەرماندە کوردەکانی پێشووی سەرکردەکانی حەمیدیە بگەڕێنەوە بۆ تورکیاو لەشکری حەمیدیەی لێکهەڵوەشاوە دووبارە دابمەزرێننەوە بە ناوی (کەتیبەی هۆزەکان بۆ سوارەی سووك)، ئیمتیازاتەکانی پێشووی بۆ سەرۆك هۆزەکان گەڕاندەوە، هەروەها ئیتیحادیەکان بەبێ دوودڵیی و بۆ سەرنەگرتنی یەکێتیی

---

[399] - FO 195\2182 No.10 Current Events in Mosul Vilayet,,British Vice Consul M H.C Ho. ny April 23,1913

نێوان کورد و ئەرمەن و نزیکنەبوونەوەی کورد لە ڕووس، بۆ ئەوەی کورد بە لای خۆیاندا رابکێشن دروشمی جامیعەی ئیسلامیان بەرز کردەوە[400].

پارتی ئازادیی و ئیئتلاف لە ئەستەنبوڵ لە حوزەیرانی (1912) بە هەڵگەڕانەوەیەکی سەربازیی هاتنە سەر حوکم، نەتەوەکانی تری ناتورك پێگەیان لەو پارتەدا هەبووە، ماوەی ساڵێك کوردستان لە سایەی پارتی ناوبراو جۆرێك لە کرانەوەی بەخۆوە بینی، ئیئتیلافیەکان کەوتنە بانگەواز بۆ جامیعەی ئیسلامیی لە ناو کوردان، لەو ماوەیەدا هەریەك لە شێخ عەبدولقادری نەهری و مەلا سەعیدی نەوڕەسی سەردانی کوردستانیان کرد و داوایان لە کوردان ئەوە بووە بە ڕووی ئەو پیلانە بوەستنەوە کە دەوڵەتی عوسمانیی بەو دەردە بردووە، هەروەها جەختیان لەسەر برایەتی ئیسلامیی دەکردەوە لە ناو گەلانی ئیسلامیی، حکومەت بۆ رازیکردنی کورد ئەو زەوییانەی دەستی بەسەراگیرابوو دەکڕینەوە و بۆ چارەسەکردنی گیروگرفتەکانی کوردستان بە خۆڕایی دەیدا بە ئەرمەن، گەرچی ئەم سیاسەتە جێبەجێ نەکرا، بەڵام ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی حکومەت بە گەرمیەوە بۆ ماوەیەکی کاتییش بێت کورد لە خۆی رازی بکات[401].

لە کوردستانی ئێرانیش بارودۆخ لەبار نەبوو بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشی کوردایەتیی، مەکدواڵ دەڵێ: بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانیی شوێنەواری گەشەسەندنی نەتەوایەتیی لە دایك نەبوو، لە ڕاستیدا لەو زەمانە هەستی کوردایەتیی لە کوردستانی ئێران رێك نەخرابوو، بەڵکو لێرەو لەوێ هەوڵی تاك تاك هەبوو بۆ بەدەستهێنانی ئەندازەیەك لە حوکمی زاتیی، لە دیارترین ئەو هەوڵانە لە ساڵی (1900) قازی فەتاح پڕۆژەیەکی لە جیاتی کوردەکانی موکریان دابوو بە حکومەتی ئێرانی، داوای کردبوو هەتا دەرفەتێکی تر ئەندازەیەك لە باج لەسەر خەڵکی لابرێ و هەروەها حاکمی کوردستان لە مهاباد بێت، حکومەتی ئێرانی قازی فەتاحی گرت هەتا دوای شۆڕشی دەستووریی بەرنەبوو، دوایی قازی فەتاح گەڕایەوە مهاباد و سەرکردایەتی کۆمەڵەیەکی کرد لە پێناو دەستوور "ئەنجومەن". لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجومەن لقی لەزۆربەی شارەکانی کوردستانی ئێراندا

---

400 - A. Modern history of Kurds,p.102-3

401 - لازاریف: ل321

کردەوە، بەڵام جوڵانەوەی دەستووریی لە توێژێکی سنووردا مایەوە، جەماوەری کورد، یان بایەخی پێنەدا، یان پشتگیرییان نەکرد، ئاغاکانی کوردستانیش لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیی کەوتنە دژایەتیی دەستوور، ئاغاکان هەڵوێستی ڕۆشنیان هەبوو لە پشتگیریی حکومەتی ناوەندیی، لە سەرەتاوە و بە ئاماژەی ئیتیحادیەکان لە (خوویی)و (سەڵماس) سمکۆ پشتیوانیی لە بزووتنەوەی دەستووریی کرد، بەڵام کە پەیوەندیی بە ڕووسەوە بەهێز کرد، هاوکاری سەردار (ماکۆ) مورتەزای قولی خانی کردووە دژی لایەنگرانی بزووتنەوەی دەستووری[402].

بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانیی بارودۆخی کوردستانی ئێران لە بار بوو بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشی کوردیی، بەڵام نەبوونی هوشیاریی نەتەوایەتیی و سەرکردایەتیەکی یەکگرتوو کە بتوانێ جەماوەری کورد جۆش بدات و ڕێنومایی بکات هەروا بە بێئاکام مایەوە، بارودۆخی کوردستانی بن دەستی عوسمانیی باشتر نەبوو لە هی بن دەستی ئێرانیی، هەموو ڕاپۆرتەکانی ڕووسی و بەریتانیی لەسەر ئەوە یەکدەنگن ئەو بەشەی کوردستان لە بارێکی زۆر خراپدا بووە، گەندەڵیی ئیداریی و شڵەژانی ئاسایش باری بەسەر ئەوێدا کێشابوو، لە ساڵی (1909) ڕووسەکان بەشێکی ئازەربایجانیان بە بیانووی دەرپەڕاندنی تورکان داگیر کرد (میر شوجاع ئەلدەولە)یان وەکو حاکم لەسەر دانا، ئەویش ئیرادەی لاوازی قونسوڵ و فەرماندە سەربازییەکانی ڕووس فەرامۆشیان کردبوو. حکومەتیش دەیویست دەسەڵاتی خۆی بگەڕێنێتەوە ناوچەکە، خەڵکیو بەتایبەتی جوتیاران دەبوایە چەندین باج بدەن، حکومەتیش دڵڕەقانە دەستی دابووە کاری سزادان و گرتن و دەرپەڕاندن، ئاغا کوردەکانیش لەلای خۆیانەوە بەلایەك بوون بەسەر شانی گوندەکانەوە[403].

بارودۆخی ناوچە سنوورییەکانی ئێرانیی - عوسمانیی زۆر خراپتر بوو لە شوێنەکانی تر، چونکە ببووە شوێنی تەراتێنی هێزەکانی تورکیا بۆ دەسەڵات سەپاندنو داگیرکردن، چەند شەڕێکی ناوخۆیی نێوان هۆزەکان بارودۆخەکەی زیاتر بەرەو خراپتر

[402] - A.Modern history of Kurds,p.102.

[403] - British Document on Foreign Affairs, pt.1.Ser.B, Tar Near and Middle East, Von. 19 Enclosure in Document No.88 Tabriz, November 18,1913.

برد، هۆزە کوردەکانی ناو خاکی عوسمانییش ئەو بارە نالەبارەیان قۆستەوەو بە ناوی تۆڵەسەندنەوەو خوێنو تاڵانیىو دەستبەسەراگرتن ناو بەناو شاڵاویان دەبردە سەر کوردستانی دیوی ئێران، بەتایبەتی بۆ سەر ورمێو خوی، لازاریف لە باسی ئەو بارودۆخەدا دەڵێ: لە دوو ساڵی دوایی بەر لە شەڕی جیهانیی بارودۆخی ناوچە کوردیەکان لە بایەزید هەتا کرماشان بە ئەندازەیەك خراپ بوو داوای پاراستنی رووسیایان دەکرد هەتا لە ڕووی هاوڵاتیبوون و باج و پاراستنەوە لە بەرانبەر گەندەڵیی ئیداریی ببنە بەشێك لە رووسیا. هەندێ لە شێخەکانی کورد وەکو سەلیم پاشای زیلانو مامە سدیقو حوسێن پاشای حەیدەرانلی داوایان کردبوو بچنە ژێر چاودێریی قونسوڵی رووسیی[404]. یاریدەدەری قونسوڵی بەریتانی لە حەلەب لە ڕاپۆرتەکەیدا جەختی کردۆتە سەر ئەو مەسەلەیە و دەڵێ:

شێخە کوردەکانی کوردستانی ئێران سکاڵایان هەبووە لە باری ناهەمواری گوندەکانیانو ئەو باجە حکومییە زۆرانە، شێخەکانی دیبوکریو بەگزادە بە ڕاشکاوی لە هەرەسهێنانی ئیدارەی حکومەت دەدوان، سەربازە تورکەکان ژمارەیەکی زۆری کوردان دەپارێزن لە ئێران هەتا دەستی دەستدرێژیی کاربەدەستە فارسەکانیان نەگاتێ کە لێرەو لەوێ ژمارەیان زیادی دەکرد، دوایی راپەڕین دەستی پێکرد، شێخەکانی بەگزادە و دیبوکری دەڵێن هۆزی ئێمە دەتوانێ (20) هەزار چەکدار ئامادە بکەن و ئێستا (15) هەزار چەکی ماوزەڕمان هەیە، کورد ئامادەیی شۆڕشە، بەڵام سەرکردایەتیەکیان دەوێ لە دەست ئیدارەی مشەخۆری فارسەکان دەریان بهێنێو ئێستا کورد ئامادەن بێنە ژێر ئیدارەی بەریتانیی[405].

## کوردستان لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانییدا

هێژا د. کەمال مەزهەر لە کتێبە بە نرخەکەی (کوردستان لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانییدا) زۆر بە درێژیی باسی بارودۆخی کوردانی کردووە لە ماوەی شەڕ، پێویستە ئێمەش لێرەدا بە کورتیی لەسەر هەندێ لە ڕووداوەکان بووەستین.

[404] - کێشەی کورد ل 192-193

[405] - FO 195/2499/45 No.12 February 10, 1913 Aleppo. From R Fontana.

بەر لەوەی شەڕ دەست پێبکات ناکۆکیی نێوان ئیمپراتۆریەتی بەریتانیی و ئەڵمانی لە بەرژەوندیی ئەڵمانیا کۆتایی هات و هاوپەیمانییەتی نێوان ئەڵمانیا و عوسمانیی لە (2)ی ئابی (1914) بەسترا، سێکوچکەی دیکتاتۆریەت تەلعەت، ئەنوەر، جەمال بە تەواوی کەوتنە سەربازگەی ئەڵمانیی، لە هەفتەی یەکەمی شەڕ گوێبیستی بێلایەنیی هەڵوێستی عوسمانییەکان بوون، بەڵام لە تشرینی دووەمی ساڵی (1914) ئەڵمانیا قەناعەتی بە دەوڵەتی عوسمانیی هێنا بۆ شەڕی دژ بە هاوپەیمانەکان (رووسیا، بەریتانیا، فەڕەنسا) رابگەیەنێ، ئەڵمانیا بە هیوا بوو دەوڵەتی عوسمانیی هاوپەیمانەکان بەتایبەتی رووسیا ناچار بکات بەشی زۆری هێزەکانی لە شەڕگەی باشووری قەوقاز سەغڵەت بکات و بەریتانییەکان ناچار بکات بەشێکی زۆری هێزەکانیان لە بەرەی میسر بهێڵێتەوە، ئەمەش هەڵوێستی مەیدانیی ئەڵمانیا بەهێز دەکات[406].

مسۆگەرکردنی دۆستایەتیی کورد لە ماوەی شەڕ جێی بایەخی بنەڕەتی ئەڵمانیاو هاوپەیمانەکان بوو، بۆیە ئەڵمان لە ڕێگەی پشتیوانیکردنی پرۆژەی جیهاد و بێرۆکەی جامیعەی ئیسلامیی بەشێکی توانای هەواڵگریی سەربازیی خۆی تەرخان کرد بوو بۆ راکێشانی کورد، لەگەڵ ئەوەشدا کورد تاکە ئامانجی ئەو بانگەوازە نەبووە، بەڵام لە گەلانی تری ناو دەوڵەتی عوسمانیی زیاتر کاری لە کورد کرد، هۆی بەدەستهێنانی ئەم سەرکەوتنەش دەگەڕێتەوە بۆ نزیکیی کوردستان لە ئەستەنبوڵو هەستی ئەوکاتەی دۆستایەتیی ئەوان بۆ ئیسلام، ئەمەش داینەمۆی هاوکاریی کوردان بووە بۆ تورك، بۆیە رووسیاش کەوتە پشتگیریی میلیشایە ئەرمەنییەکان بۆ ئەنجامدانی شەڕی قڕکردن لە کوردستان. لە دوای تێکشکانی دەوڵەتی عوسمانی لە شەڕی (ساری قامیش) لە نیسانی (1915)ەوە شەڕی قڕکردن دەستی پێکردووە[407].

---

[406] - د.كمال مظهر: كردستان فی سنوات، ص140-141.

[407] - David Loiyd George, War Memoirs, 6 Vols!V (Boston; Little 6 Brown and CO,1934), p144-146; FO 371\3397 Fortnightly Report, MAY 15, 1918. كردستان فی سنوات الحرب العالمیه الاولی، ص171-173. (شیومان) ئەفسەری هەواڵگری سەربازی ئەڵمانیا سوپایەکی لەبەکرێگیراوە کوردەکان ئامادە کردبوو بۆداگیرکردنی هەمەدان، هەموو چەکدارێکی پیادە (15) تومانو سوارەش (30) تومانی پێ دەدا، مەجید سەڵتەنەی حاکمی ئەو هەرێمەی ئێرانیش

لەگەڵ گەیشتنی هێزەکانی بەریتانیی بۆ بەغدا، مێجەرسۆن ئەرکی راکێشانی هۆزە کوردیەکانی پێ سپێردرا، لە دوای داگیرکردنی خانەقین سۆن کرایە ئەفسەری سیاسیی لە خانەقین و بە پارە لیوایەکی لەوێ لە کورد پێکهێنا کە ژمارەیان دەگەیشتە (200) چەکدار، هەروەها هەمان سەرکەوتنیشی لەگەڵ هۆزەکانی کەلهوڕ بەدەستهێنا، بەمەش ئەمنییەتی هێڵی بەیەکگەیاندنی نێوان بەغدا و کرماشانی مسۆگەر کرد، بە کەلهوڕ لە سەنجابیەکانی دۆستی ئەڵمانیای دا، بەڵام هەر لەسەر سیاسەتی بێمتمانەیی بە کورد بەردەوام بوون، هەتا شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆسیالستی لە ساڵی (1917) بە ماوەیەکی کەم بەر لە کۆتایی هاتنی شەڕ مینۆڕسکی پێشنیازی بۆ حکومەتەکەی کردبوو حوکمی زاتیی بدات بە کوردان، یان بۆ دوای شەڕ بەڵێن بدات ئەو مافە دەدات، کە ئەمە درەنگ بوو، هەروەها نەیتوانی بۆچوونی کوردان لە بەرانبەر رووس بگۆڕێ[408].

لە رێکەوتننامەی نهێنی سایکس پیکۆی ساڵی (1916)ی لەسەر دابەشکردنی مومتەلەکاتی عوسمانیی لەسەر ئەو بەرنامە تەقلیدیەی سیاسەتی بەریتانیی دەڕۆیشت کە راستەوخۆ خۆی دەبوارد لە ڕووس، عێراق لەسەر پێگەی بەریتانیی و کوردستانی باشوور درابوو بە فەرەنسا و کوردستانی باکوور بۆ رووسیا، ئێرانیش دەوڵەتێکی دۆستی بەریتانیا بوو دەبوایە یەکێتی خاکی پارێزراو بێت، لە دوای شۆڕشی کۆمۆنیستی رووسیا پاشەکشەی کرد و رێکەوتننامە نهێنییەکان لە ناویاندا رێکەوتننامەی سایکس پیکۆی ریسوا کرد، بەریتانیاش لە پێناو کوردستانی باشوور فەڕەنسای رازیکرد ئەوێ بۆ بەریتانیا بێت و لە بەرانبەردا دەست نەخاتە کاروباری فەڕەنسا لە سوریا.

سەرەڕای بە نهێنی دابەشکردنی کوردستان گرنگترین ئاکامی شەڕ لەسەر کورد، ئەو لەناوبردن و برسیەتیە بوو کە لە ناو کورد بڵاوبۆوە، تۆرانییەکان بە لاسایی دەوڵەتە ناسیۆنالیستەکانی ئەوروپا دەستیان کرد بە قڕکردن و دەستبەسەراگرتنی رۆشنبیریی و لەناوبردنی کورد، بە بیانووی روودانی شەڕی رووسیی و داگیرکردنی ناوچەکە لە لایەن رووسەکانەوە، (600) هەزار کوردیان گواستەوە بۆ بەشەکانی تری تورکیا، لە ڕاستیدا

---

هاوکاری دەکرد، بەڵام عوسمانیەکان لە تشرینی دووەمی ساڵی (1914)ز دەستیان بەسەرداگرت و پرۆژەکەی "شیومان: نوشستی هێنا. لازاریف: 60-61.

[408] - Iraq, 1900-1950 p.96.

بۆ مەبەستی بە تورککردنی کورد و گواستنەوە و نیشتەجێکردنی کورد لە ناوچەیەك کە رێژەیان (10٪) تێنەپەڕی، بەمەش ملوێنێك کورد بە هۆی شەڕی یەکەمی جیهانییەوە کوژران و ئاوارەبوون[409]. فەرماندە سەربازییەکانی رووس کە لەژێر کاریگەریی سەرکردە سەربازییە رەگەزپەرست و کوشتارچیەکان و کەنیسەی رووسی ئەرتۆدەکسی دابوون لە کوردستان وێرانکاریی و تالان و ئابڕووبردنی "کوردانی کافر و بکوژانی ئەرمەن"ی دەست پێکرد، شەڕی لەناوبردن لە شاری قامیشەوە دەستی پێکرد بۆ وان و بایەزید و بە خوی و رەواندز و خانەقین دا تێپەڕی، هێزەکانی رووسیی خەڵکی ناوچەکەیان ناچاری دەربەدەریی کرد، بە تەنیا لە بایەزید و دەوروبەری دەیەکی دانیشتوانەکەی مابوونەوەو سەدان گوند وێران کران، هێزە کرێگرتە ئەرمەنی و رووسییەکان لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری کۆمۆنیستی و لە کاتی پەڕینەوەیان لە بەرەی ئەرزرۆم - زەنجان هەزاران ئافرەتو منداڵی کوردیان کوشت، رۆژانی (14، 15)ی مایسی (1915ز) شاری وان گەورەترین قەسابخانەی موسڵمانە کوردەکانی بەخۆوە بینی بەدەستی ئەو هێزە ئەرمەنیانەی پێش هێزەکانی رووسیی کەوتبوون، رووس بەڵێنی دابوو شاری وان بگۆڕێ بۆ پایتەختی ئەو دەوڵەتەی بەڵێن بوو بۆ ئەرمەنەکانی درووست بکات، نزیکەی (250) هەزار لەو ئەرمەنانە کۆبوونەوە کە بچنە پاڵ دەوڵەتو لەشکری ئەرمەنیی، بە پشتیوانی لەشکری رووسی دەوڵەتی ئەرمەنیان راگەیاند و نەخشەی هێرش و پاککردنەوەی ویلایەتی بەدلیس و دیاربەکر و راگەیەنرا، بەڵام هێزەکانی رووسیی لە بەرانبەر دژە هێرشی عوسمانییەکان شکان[410]. راپۆرتەکانی بەریتانیی جەختیان کردۆتە سەر کوشتارو لەناوبردنی کوردان بە دەستی هێزەکانی ئەرمەنی و رووسی لە خانەقین، راپۆرتی ئەفسەرێکی ئینگلیزی باسی کوشتنی (500) کوردی شاری خانەقینی کردووە، ئەمە سەرەڕای قوربانییە زۆرەکانی گوندەکانی دەورووبەری، سەدان کورد لە ترسی کوشتاری بە کۆمەڵ هەڵهاتن بۆ ناوچەکانی ژێری دەسەڵاتی ئینگلیز[411]، رەواندزیش هەمان دەردی سبرینکای ساڵی (1997) لێ

---

[409] - بلە.ج. شێرکۆ: القچیە الکردیە ماچی الکرد وحاچرهم، بیروت 1986، ص72-75.

[410] - Jwaideh, pp.363-369.

[411] - Colonial Office, Report of the Administration for 1918 khanaqin District, London, HMS 1919 p.32-33; FO Fortnight Report, No. 4,December,1917.

بەسەرهات کە هێزەکانی سرپی ئەنجامیان دا، (ئەندرانیك)ی بێویژدانی ئەرمەنی تینوو بە خوێنی کورد نزیکەی (6000) منداڵ و ئافرەتی ئەو شارەی هەموو کوشت، لە کۆی (3) هەزار منداڵ تەنیا (60) منداڵ مابۆوە[412]. رووس و ئەرمەنەکان (30) گوندیان لە برادۆست وێرانکرد، هەزاران کەس لە خەڵکی بادینان لە ترسی ئابرۆی خۆیان بەرەو موسڵ هەڵاتن و بەشێکیان لە شەقامەکانی موسڵ لە برساندا مردن، ناوچە مێژووییەکانی کورد لە لایەن شاڵاوی ئەرمەنیی، رووسیی بە ئامانج گیرابوو، لە سەدا هەشتای خەڵکی سلێمانی لە ئاکامی مەرگەسات و بەتایبەتی برسیەتی، لەناوچوون[413]، ئەو شەڕە پڕ لە مەرگەساتەی لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیی تووشی کورد هات بە دەستی ئیتیحادیەکان، یان رووس و ئەرمەن، لە تاوانە گەورەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیی بوون[*].

---

[412]-- Jwaideh pt.I. pp365-366; K. Mayson, Central Kurdistan,, Geographical Journal, No.54(1919) pp.331-332.

[413] - K. Mayson,C Edmonds, The Kurds, p28

عزيز الحاج: القضية الكردية في العشرينات، بيروت، 1984، ص91

[*]- شاڵاوی رووسیی بۆ هەرێمەکانی کوردستان لەساڵی (1916) بەشێکی گەورەی نەهامەتییەکانی کوردستان بووە، لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیی، هۆزە کوردییەکانی کوردستانی باشوور بە هۆکاری جیهاد لە بەرەی شارباژێڕ و پێنجوین و لە بەرەی رەواندز بەشداریی کاریگەریان هەبووە دژی شاڵاوی رووسیی، سەرەڕای کەم بارانی ساڵانی (1916 ـ 1917ز) قاتو قڕی و بێ بەرهەمیی کشتوکاڵ، رووسەکان و تورکە ئیتیحادیەکان وەکو دوو زلهێزی دەرەکیی ئەوکات کوردستانیان کردە وڵاتی وێرانەو مەرگەسات، هەتا کۆتایی سەدەی رابردووش بیرەوەرییەکانی ساڵانی گرانی و سەفەربەلك بەشێکی گرنگی مێژووی میللیی ئێمەیان پێکدەهێنا. "وەرگێڕ".

# رژێمی خێڵەکیی، ئیدارەی شێخ مەحمود

حکومەتی بەریتانی لە ساڵانی (1918–1920) بایەخی بە کورد داوە، بەڵام بە شێوەی سەرەکیی مەبەستی بووە لەو ڕێگەیەوە ئاساش بۆ عێراق دابین بکات، کوردیش ئەمەی قبوڵ بووە، وەکو بەدیار دەکەوێ ئەو ماوەیە بە بەردەوامیی خەریکی راگۆڕینەوە و نەخشەدانان بوون لەسەر کورد، سیاسەتی بەریتانیی تەمومژاوی و لێڵ بووە لە بەرانبەر کورد، لە نێوان دەستبەسەراگرتنی راستەخۆ و ناڕاستەوخۆ و هەندێ جار سیاسەتی کاتیی پەیڕەو کراوە بۆ کاردانەوەی پەرەسەندنە هەرێمیو ناوخۆییەکان.

ئەرنۆڵد ویڵسنو زۆربەی کاربەدەستانی بەریتانیی ئەوکات، کە لە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیی لە هیندەوە هاتبوون، پابەندبوون بە ئەو بیرۆکەیەی پێی دەوترا بیردۆزەی "قوتابخانەی هیندی ئیستیعماری"و پێیان وابووە دانیشتوانی داگیرگەکان ئامادەو شایستە نین بۆ خۆبەڕێوەبردن، پێویستە بە ڕێگەی نمایندەی راستەوخۆی داگیرگەکانەوە پرۆڤەیان پێبکرێ، لێرە رۆڵی هاووڵاتی لە ڕێگەی ئەنجومەنی شارەوانیو خۆجێیەتیەوە کورت دەبێتەوە لە خستنەڕووی ئامۆژگاری بۆ حاکمی گشتیی، پووختەی بۆچوونی ئەوانە: "کارامەیی کارگێڕیی لە حیساباتی سیاسیی"[414]. بەرپرسانی بەریتانی

[414] – ئەو قوتابخانەیە لە ڕوانگەی زەمانەتی دەستبەسەراگرتنی هیندەوە دەیڕوانیە عەرەب، دەیویست کەنداوی عەرەبیی و دۆڵی رافدیەن (عێراق) گرێ بدات لە رێگەی ئەو پشتگیرییە بەهێزەی لە کێشەی وەهابیی دەکرد لە نیوە دوورگەی عەرەبیی، ئەمەش لە بەرانبەر قوتابخانەیەکی تر بووە، کە قوتابخانەی (ئەنگلۆ ـ میسری)، یان (قوتابخانەی هاشمی)ی پێدەوترا، کە بانگەوازی بۆ نەتەوایەتی عەرەب دەکرد و ئامانجی دانانی سنور بووە بۆ سەرکردە عەرەبیەکانی دۆست، وەکو سەرکردەی سەربەخۆ، بەتایبەت ئەوانەی سەر بە خانەوادەی شەریفی حوسەینی پاشایەتیو دەچنە ژێر بەڕێوەبردنی ناڕاستەوخۆی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیی، کە سوودمەندن لە پاراستنی نۆکەندی سوێس و ڕێگای وشکانیی لە لایەن بەریتانیەکانەوە. بۆ زیاتر زانیاری لەسەر ئەو قوتابخانە ڕووناکبیریە ئیمپریالیستیانە و پەیوەندییان بە جیهانی عەرەبیی بە گشتیی و عێراق بەتایبەتی، بڕوانە:

– Khadim Hashim Niama خاوەنی کتێبی Anglo- Iraqi Relations لە ماوەی ئینتداب – توێژینەوەی دکتۆرایەو بلاونەکراوەتەوە.

Unpul Doctoral Dissertation " University of Colleqe of Wales Aberystwyth 1974, pp 25 -9 " Ireland pp 101-2

عبدالرزاق الحسيني: تأريخ العراق الجديد، مطبعة عرفان، صيدا 1957، ص56-57.

ویستوویانە لەسەر ملپێکەچکردنی هۆزە هارەکانی بلوجستان لاسایی ئەزموونەکانی بەریتانی لە هیند بکەنەوە، بەو پێیە گروپە خێڵەکییەکانی باشووری کوردستانیش هاوشێوەی ئەوانەی باکووری رۆژهەڵاتی هیندن، ئەمەش لە رێگەی دامەزراوەی بەرێوەبەرایەتی خێڵەکییەوە دەبێت، کە بریتی بووە لە قەوارەیەکی خێڵەکیی بە سەرۆکایەتی سەرۆك خێڵ، ئەم رژێمەش بە ناوی: (ساندی مان) بە لاساییکردنەوەی رۆبرت ساندیمان (Robert Sandman).

مەبەستی سیاسەتی بەریتانیی لە دەستبەسەراگرتنی بلوجستان پاراستنی دانیشتوانی خاکە سنووریەکانی (سیند) بووە لە بەرانبەر هێرشی چیاییەکان، کە شاخەکانیان کردبووە پەناگەی خۆیان.

گەورە، سەرەك خێڵ، تاکە دەسەڵاتی رەهای هەبووە بەسەر نەتەوەکەی و بە تەنیا ملکەچی چاودێریی حکومەتی بەریتانیی بووە لە هیند[415]، لەگەڵ ئەوەدا هۆزە هەڵگەڕاوەکانی سنووری رۆژهەڵاتی هیند وەکو کۆسپێك بوون بۆ حکومەتی بەریتانیی لە هیند، لە برووسکەی نووسینگەی هیند، لە بەرواری (24)ی ئوغستۆسی ساڵی (1919) ئاماژەی پێکراوە، کە بەرپرسانی بەریتانیی لە عێراق درکیان پێکردووە و هەموو بەڵگەکان ئاماژەن بەوەی کوردیش توانای بەهێزی هەیە لە درووستکردنی کۆسپ و گیروگرفت بۆ عێراق[416].

---

Peter Sluglett Britain in Iraq (London; Ithaca Pares 1976) pp.25-27. Jwaideh Kurdish Nationalist Movement) pt.2, pp.274-276 .

415 - بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە:

R.I Bruce, Tribes on our North-West Frontier of India 2 vols (London Green and Company 1990). I.H Thornton Colonel sir Report Sandman; His Life and Work on our India Frontier (London; J.Murray,1895.(

416 -Loyalties II pp 142

(ئەسکۆیت)ی سەرۆك وەزیرانی ئەو کات بەراوردێکی کردبوو لە نێوان کورد و هۆزەکانی پەتان (Pathan)، لە کاتی داگیرکردنی باشووری کوردستان، هێزەکانی بەریتانی لە عێراق ئاگادار کردبۆوە، هەروەها ڕایگەیاندبوو لە ئاینده کورد گیروگرفت بۆ هێزەکانی بەریتانی لە عێراق دروست دەکەن، هەروەکو هۆزەکانی (پەتان) لە بەنجاب Panjap بۆ هیندیان دروست کردبوو. بڕوانە:

H.H Asquith, Letters to Venetia, Stanley, ed.M. Michael an F Brooch (London: Oxford Press 1982) P.510.

(ئای. ئاس. مونتاخ)ی وەزیری بەریتانی لە لێدوانێکیدا لەو کۆبوونەوەیەی لە نووسینگەی وەزارەتی دەرەوە لە نیسانی ساڵی (1920) لە هیند بەسترا دەڵێ: "هەر کارێك بکرێت بۆ دامەزراوەکانی باکووری عێراق هاوشێوەی ئەوەی سنووری باکووری رۆژهەڵاتی هیند دەبێت". لۆرد کیرزۆنیش بەو بۆچوونە رازی بوو، مامەڵە لە کوردستان وەکو مامەڵەی ئەو وڵاتە وایە، کە پێی دەڵێن نیشتمانی موحەممەد (بلاد محمد)، ئەو ناوچە سەربەخۆیە و کەوتۆتە رۆژهەڵات، لەسەر رێگەی سیتاڵ (chital) لە هیند، کە بە تەواوی ناوچەیەکی سەربەخۆیە، حکومەتی هیندی لەبەر خۆبەدووگرتن و لە گیروگرفت، گارگێڕیی تایبەت بە خۆی داوەتێ.

لۆرد کیرزۆن لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا بووە، ئەگەر کارگێرییەکی سەربەخۆ نەدرێت بە کورد، لە ناوچە شاخاویەکانەوە هێرش دەهێننە سەر عێراق[417]، بەڵام ئەو سیاسەتەی ویڵسن و سۆن و لێجمان لە ساڵانی (1918) بۆ (1920) پەیڕەویان کردووە زیاتر نزیك بوو لە بەڕێوەبەرایەتی سەربەخۆ، بەمەش خۆیان لە وریایکرنەوەکەی مونتاخ و کیرزۆن بەدوور گرتبوو، بە درێژایی ساڵی (1920) حکومەتی بەریتانیی بە دەست کوردەکانی باکووری رۆژهەڵاتەوە تووشی هەمان گرفتی هیند ببۆوە، ئەو گرفتانەش بە درێژایی ماوەی ئینتیداب بەردەوام بووە، کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا بە درێژی باسی دەکەین.

پرۆفیسۆر (وادی جوەیدە) وای دەبینێت، رژێمی (ساندامان) لە مل پێکەچکردنی هۆزەکانی مەوسود لە هیند لە لایەن بەریتانیاوە بۆ دەستگرتن بەسەر هیند، نووشستی هێنا، لەگەڵ ئەوەدا دەشێ لە عێراق هەمان سیاسەت پەیڕەو بکات، لەگەڵ ئەوەدا لە نێوان (ئەلمەسود)و (کورد) خاڵی هاوبەش هەیە. دەڵێ: کوردیش وەکو (مەوسوود) بە گەرمیی پەیوەستن بە ئازادیی، ئەوانە بە بەردەوامیی لە شەڕ و پێکدادانن لەگەڵ ئەوانەی دەیانەوەی دەسەڵات پسەپێنن بە سەریاندا، لە رۆژگاری شێخ عوبێدوڵڵاوە کورد تەنیا ملکەچی سەرۆکە ئایینییەکان، یان سەرکردە کلاسیکیەکانیان بوون[418] (مەوسوود)یش هەروا بوون.

---

417- F.O.371:5067 Inter-Departmental Conference on Middle Eastern Affairs, Draft Minutes of a meeting Held at the Foreign Office on Tuesday April 13,1920 U.D.C.E, 37th (Minutes) p.5.

418 - Jwaideh, (Kurdish Nationalist Movement) pt, 2p.478

لە کۆتایی تشرینی یەکەمی ساڵی (1918) حکومەتی بەریتانیی سوپای عوسمانیی لە باشووری کوردستان تێکشکاند، لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا حاکمی عوسمانیی لە سلێمانی لە لایەن عەلی ئیحسان پاشاوە ئاگادار کرایەوە دەستبەرداری دەسەڵاتی خۆی ببێت و کاروباری ناوچەکە بخاتە بەر دەستی شێخ مەحمود، کە لە کاتی جەنگدا وەکو بەهێزترین سەرکردەی ناوچەکە خۆی بەدیارخستبوو، شێخ مەحمودیش بۆ ئەڕنۆڵدی نووسی بوو، کە لە ژێر کاریگەریی سەرکەوتنەکانی بەریتانیادایە بەسەر عوسمانییەکانەوە، ئەوەی دەربڕی بوو، کە چاوی لە فەرمانڕەوایەتی کوردستانە بە ناوی حکومەتی بەریتانیی لە عێراق، بۆیە شێخ وەکو بەهێزترین کەسایەتی سیاسیی بەدیار کەوت، جگە لە ڕازی بوون هیچ ڕێگەیەکی تر لە بەردەم بەریتانیادا نەبوو، ئەگینا دەبوایە هێزی زیاتری دابین بکرایە بۆ پاراستنی سلێمانی و ئەو ناوچە شاخاویانەی ئەو کات لەبەر دەستی حکومەتی بەغدادا نەبوون، بۆیە حکومەت بۆ ڕزگاربوون لەو قەیرانە داوای شێخی قبوڵ کرد، مێجەر نۆیل کاربەدەستی هەواڵگری بەریتانیی، کە خاوەن ئەزموون و کارامەیی بووە لە مامەڵەکردن لەگەڵ هۆزەکانی فارس، ناردیان بۆ سلێمانی یارمەتی سەرکردەکانی کورد بدات بۆ گێڕانەوەی ئاسایشو ئۆقرەیی لە ناوچەکە[419].

ئەو بەرنامەیەی درابوو بە نۆیل لەسەر کارە نوێیەکەی بایەخێکی تایبەتی هەبووە و هێڵە گشتییەکانی سروشتی ئەو سیاسەتەی بەریتانیای ڕوون کردۆتەوە، کە پێویستە لە کوردستان پیادە بکرێ: (لە ڕۆژی (1)ی تشرینی یەکەمەوە بە لێپرسراوی لیوای کەرکووك دامەزراوی و دەستبەکار دەبی، لیوای کەرکووك لە زێوە درێژ دەبێتەوە هەتا دیالە و باکووری ڕۆژهەڵاتی سنووری تورکی ـ فارسی، هەمووی بەشێکە لە ولایەتی موسڵ، کە ئێستا ڕێکخستنی کاروباری بە دەست حکومەتی خاوەن شکۆیە، دەبێت وای دابنێین لە بازنەی داگیرکردنی سەربازییە، پێویستە ڕاستەوخۆ بەردەوام بیت لە کارەکانت، لەگەڵ ئەگەری مامەڵەی سەرۆکە خۆجێییەکان، ئەوەشت لا ڕوون بێت لە نەخشەماندا نییە هێزی سەربازیی لە سلێمانی، یان شوێنەکانی تری ڕۆژهەڵات بکشێنینەوە، دەبێت سەرکردە خۆجێیەکان ئەوە تێبگەن گرتنەبەری هەر ڕێوشوێنێکی

---

[419] Air 20|512. Teleg. From Political Baghdad (pol) to India Office (I.O) no 9351, 1. nov. 1918. Jwaideh, (Kurd Nationalist Movement). Pt.2, pp. 47LF- .

نویَ لە داهاتوودا دەچێتە خانەی پێویستیی، یان ئاماباشییەوە، دەبێت ئەوەشیان بۆ ڕوون بکرێتەوە، کە مەبەستمان نییە کارگێڕییەکی ڕۆژئاوایی، یان کارگێڕییەك خۆیان پێی رازی نەبن، بەسەریاندا بسەپێنین)[420].

زۆر بە گەرمیی لە سلێمانی بەخێرهاتنی مێجەر (نۆیل)یان کرد و بە خێرایی رێکخستنی بنەمای بەڕێوەبردنی تازە دەستی پێکرد، شێخ مەحمود بە حوکمدار دامەزرا، سەرۆکەکانی تر کە لە ژێر سەرپەرشتی بەریتانییەکان کاریان دەکرد، بوونە بەرپرسی بەڕێوەبەرایەتیەکانی تر[421].

بۆ لە نزیکەوە ئاگاداربوون لە بارودۆخی باشووری کوردستان، (ویڵسن) گەشتێکی کرد بۆ شاری سلێمانی، لە کۆنگرەیەکی گەورەی سەرۆك خێڵەکانی کورد لە کانوونی یەکەمی ساڵی (1918)، کە شێخ مەحمود ئامادەی کردبوو، سەرۆك هۆزە بەدەسەڵاتەکانی کوردی ئێرانیش ئامادەی بوون، چەندین کێشە و مەسەلەی سیاسیی باس کرا، شێخ مەحمود یاداشتنامەیەکی دایە نوێنەری کۆمیساری باڵاو تێیدا ئاماژەی بەوە کردبوو، کە کورد دەیانەویَ مەبەستی خۆیان بۆ بەرپرسانی بەریتانی "حکومەتی خاوەن شکۆ" رابگەیەنن، ئەویش رزگارکردنی خەڵکی کوردستانە لە چەوسانەوەی تورك‌و زەمانەت وەرگرتن بۆ سەربەخۆیی، نوێنەرەکانی کورد بە ناوی خەڵکی کوردستانەوە داوایان کرد حکومەتی بەریتانیا رازی بێت لە ژێر سەرپەرشتیی بەریتانیادا بن، ئەگەر بیانخاتە سەر حکومەتی عێراق، ئەوە بێبەش دەبن لەو سوودەی کە حکومەتی بەریتانیی پێشکەشی دەکات، داوایان لە حاکمی سیاسیی عێراق کرد نوێنەری خۆی لەگەڵ هاوکاریی پێویست بنێرێت "هەتا کورد بتوانیَ لە ژێر چاودێریی بەریتانیی پێشکەوتن و پەرەسەندن و ئاشتیی بە شێوەیەکی شارستانیی بچەسپێنن، ئەگەر حکومەت مافی پاراستن و یارمەتیی پێشکەش بە کورد بکات، ئەوە ئامادە دەبێت ئامۆژگاریی لێوەربگرێت"[422].

---

[420] - Bell Review of Civil Administration. Pp.59-60: Wilson. Loyalties, ll, p 128: Jwaideh, Kurd Nationalist Movement, pt,2. pp.473f.

[421] Bell, Review of Civil Administration. Pp.60-61

[422]-Wilson Loyalties ll p.129. Administration Teleg. From Civil Commissioner. (C.L.) to I.O. un. Numbered 3, July,1920. Bell, Review if

له بەرانبەردا ویڵسن نامەیەکی نووسراوی دایە شێخ مەحمود و دڵنیای کردەوە، کە ئەو بە حوکمداری باشووری کوردستان دانراوە، لەگەڵ کۆتایی مانگی کانوونی یەکەم شێخ بە هاوکاری مێجەر نۆیل توانی دەسەڵاتی خۆی فراوان بکات بۆ رانییە و رەواندز و کۆیە، بەڵام بەشێك لە هۆزی جاف لە هەڵەبجە و بەشێك لە هۆزی پشدەر لە ڕانییە و هەروەها بەشێك لە سەرکردەکانی کەرکووك و کفری رازی نەبوون بچنە پاڵ ئەو گردبوونەوە خێڵەکییە تازەیەوە[423].

تێکگیرانی رێنوماییەکانی ویڵسن و نۆیل لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەو یاداشتەی سەرۆکەکانی کورد لە کۆنگرەی سلێمانی دایانە نۆیل بە ڕوونیی ئەوە بەدیار دەخا، کە بەرژەوەندیی و ئامانجەکانی بەریتانیا زۆر جیایە لەگەڵ خواستو خەونەکانی کورد، هەردوو یاداشتنامە، یان بەڵگەنامە بە ڕێکەوتنی فەرمیی و دووقۆڵیی نێوان دوو حکومەتی هاوتا دانانرێت، بەریتانییەکان لە لایەن خۆیانەوە قەوارەکەی شێخ مەحمودیان بە کاتیی داناوە، کە سەرۆکێکی بەهێزی خۆجێیی سەرۆکایەتی دەکات بۆ پاراستنی ئاسایش و ئۆقرەیی لە کوردستان[424]، بەڵام لە ناوەڕۆکی یاداشتنامەی کوردەکان ئاماژەی ئاشکرا هەیە کە خۆیان بە نوێنەری خەڵکی کوردستان زانیوە و هەموو خواستەکانیان بۆ سەربەخۆیی بە ئاشکرا روونکردۆتەوە، لە ئەوەدا ویڵسن دڵنیایی داوە مەبەستی نییە هیچ رژێمێك بەسەریاندا بسەپێنێت، بەڵام ئەو پابەندبوونەوەی بەرانبەر سروشتو سەرچاوەی هێزی شێخ مەحمودە لێڵیی پێوە دیار بووە، شێخ بە بەردەوامیی جەختی کردەوە، کە لە سایەی سەرپەرشتیاریەتی بەریتانی بە گەورەی هەموو کوردەکانی ولایەتی موسڵ دەمێنێتەوە، بەڵام حکومەتی بەریتانی ئەمەی رەتکردۆتەوە، وێڵسن بە بەردەوامیی و بە روونیی دەیوت: "ئەو هێزەی شێخ مەحمود بە تەنیا لە لایەن حکومەتی بەریتانیاوە دەرفەتی پێدراوە"، بەو ئاماژەیە بێ دەتوانێت سوودمەند بێت لەو پشتیوانییە و وەکو بەکرێگرتە بمێنێتەوە، لێرەوە

Civil Administration pp.60f, Jwaideh, (Kurdish nationalist Movement) pt,2. pp480f.

[423]- Longing Iraq from 1900 to 1950 , p.103-104. Bell Review of Civil Administration, pp.60 Wilson Loyalties ll p.130.

[424] - Jwaideh, (Kurdish National Movement) pt.2 p. 468

دەتوانین لەو بەڵێنانە تێبگەین کە لە ڕێگەی حاکمی سیاسییەوە دراوە بە کورد، لە شێوەی ئەو بەڵێنانە بووە لە کاتی شەڕ بە پەلەیی و لێڵی و دژەڕاو نەخشەی کاتی بە ئەرمەن و عەرەب و جولەکە درا بوون.

شێخ مەحمود لەگەڵ حکومەتو وەزیرەکانی و (نۆیل)یش وەکو راوێژکاری سیاسیی دەست بەکار بوون، بە قسەی (حیلمی) نزیکترین متمانە پێکراوی شێخ مەحمود نۆیل بووە و لە لای ئەو شوێنێکی بەرزی هەبووە[425]، بەرپرسیارێتی ئاسایش‌و دەسەڵاتی ناوچەکانی دەرەوەی سلێمانی خرابووە ئەستۆی سەرۆك هۆزەکان، دەبوایە هەر سەرۆکێك یارمەتی دارایی بە ئەندازەی (2000) روپیەی پێبدرێت[426]، (5000) رووپیەش بۆ دابینکردنی (50) سوارە، شێخ مەحمود بۆ خۆشی "یارمەتیەکی کەمی" پێدەدرا، داوایان لێکردبوو (600) سوارە ئامادە بکات[427]، مێجەرسۆن بەم شێوەیە باسی رژێمی خێڵەکی شێخ مەحمودی کردووە:

(هەموو کەسێك ئەندامی یەك لەو هۆزانەیە و لە ژێر فەرمانی سەرۆکی هۆزدایە، بیرۆکەی پشت ئەمە دابەشکردنی کوردستانە بۆ ناوچەی هۆزایەتی بە ڕابەرایەتی سەرۆکەکانیان، زۆر سەرۆك هۆزی بچووکی دابڕاو و پەرتو بڵاو و کۆن لە کفری دۆزرانەوە و سەرلەنوێ فەرمانیان پێدرا یەکبگرنەوە، بیریان خرایەوە، کە سەر بە یەك هۆزن و سەرۆکیان بۆ دانرا، ئەو داهاتەشیان بۆ دیارییکرا، کە کۆی بکەنەوە، بەو پێییەی سەرۆك هۆز بۆیان دیاریی دەکات، هەروەها سەرۆك هۆز دەسەڵاتی جێبەجێکردن و یاسایی هەبووە، تاکە کەس بووە لەلای شێخ مەحمود دان بەدەسەڵاتیدا بنرێت، شێخیش تاکە ئەمیندار و پایەداری کوردستان بووە، لە بەرانبەر ئەمەشدا هەموو سەرۆك هۆزێك یارمەتیی دەدرا)[428].

---

[425] - یاداشت: رەفیق حیلمی، ل67.

[426] - روپیە: بەو دراوە دەوترا لە سەرەتای دەسەڵاتی بەریتانی لە عێراق بەکار دەهات..

-the diplomatic History of Iraq, 1920-1932. un pub. Doctoral Dissertation. University of Utah June 1979 p.73.

[427] Air 20/512 Letter. Pol. Baghdad Nov. 19.1919-

[428] - E.B. Sane Administrative Report on Sulaimania Davison 1919(London H.M.G. Stationery Office 1920) pp.2-3. Bell Review of Civil Administration p.60.

ئامانجی یەکەم لە ڕژێمی خێڵەکیی پاڵپشت و یارمەتی باجگر و کۆکردنەوەی داهات و پاراستنی ئاسایش و یاسا بووە، سەرۆك هۆزەکان بە فەرمیی ملکەچی شێخ مەحمود بوون و هەموو سەرۆك هۆزێکیش لە بارەگای قەزا ملکەچی یاریدەدەری ئەفسەری سیاسییی بوون لە نووسینگەی حکومەتی بەریتانیی، ئەو کۆششەی لەلایەن سەرۆك هۆزەکانەوە بۆ کۆکردنەوەی باج دەدرا هەمیشە تووشی مامەڵەی خراپ، یان کارەساتی جەرگبڕ دەبوون لەگەڵ جوتیاران، لەگەڵ ئەوەشدا ئاسایشو رژێم پارێزراو بوو، بەڵام خەڵکی گوندەکان کە تووشی نەهامەتیی شەڕ و برسیەتی ببوون، نەیاندەتوانی بە ئۆقرەیی سەرقاڵی چالاکیی کشتوکاڵیی بن[429].

شێخ مەحمود وەکو حاکم بەردەوام بوو لە چەسپاندنی دەسەڵات بەسەر ناوچەکانی دا، بۆ ئەو مەبەستەتەش لە ڕێگەی یارمەتیدان لە هەوڵی راکێشان و پشتگیریی و گوێڕایەڵیی سەرۆك هۆزەکان بوو، بە هاریکاریی حکومەتی بەریتانیی دەیویست شوێنی وەکو حاکم بەرز رابگیرێ، شێخ بۆ ئەوەی دەسەڵاتی راستەوخۆی بەسەر کارگێڕییەکەیدا هەبێت پلەوپایەی بەسەر خزمو دۆستەکانی دەبەخشیەوە، لە لایەکی ترەوە داوای لە هێزی لاوان "تاکە هێزی جەنگاوەری کاریگەر لە کوردستان" دەکرد، گوێڕایەڵیی و ملکەچیی بۆ رابگەیەنن، هەروەها قازیو سەرۆکی پۆلیسی لە سلێمانی دانابوو[430].

بەریتانییەکان ئاگاداری خۆزگەکانی شێخ مەحمود بوون، بەڵام لەو ماوەیەدا ویستوویانە سوودی لێوەربگرن، بۆیە دانیان بە ڕژێمەکەیدا ناوە.

میجەرسۆن لە لای خۆیەوە رەخنەی لە حکومەتەکەی شێخ مەحمود دەگرت و بە توندو تیژی باس کردووە، ئێستا دیارە بەریتانییەکان خۆیان ئەو رژێمەیان درووستکرد و پشتگیرییان لێکردوەو شێخیان بە ڕزگارکەر هەڵبژاردووە، بەڵام ئێستا راستەوخۆ بەرژەوەندییان لەگەڵیدا تێکدەگیرێ[431]. لە ماوەی مایسی (1919) بەریتانییەکان

[429] FO. 371:5069 Office of Commissioner Report on Kirkuk Division (London H.M.G. Stationery Office 1920) pp. 3-4.

[430]Bell Civill Administration. P.64: Wilson, Loyalties. ll. p.135.

[431] - Soane Administrative Report p.p.4. Jwaideh, (Kurdish National Movement). Pt.2, pp4871.

هەستیان کرد پێویستە چاو بەو سیاسەتەیاندا بخشێننەوە کە بەرانبەر بە شێخ مەحمود پەیڕەویان کردووە، ئەرنۆڵد ویڵسن کۆنگرەیەکی رێکخست و هەریەك لە ئار لیجمانی ئەفسەری سیاسیی لە موسڵ و دیبلۆ های ئەفسەری یاریدەدەر لە نووسینگەی هەولێر و میجەر نۆیل و لۆنگریکی ئەفسەری سیاسیی لە کەرکووك ئامادەبوون، لەو کۆنگرەیە بڕیاریاندا لە سەرخۆ و بە ڕێگەیەك دوور لە بەرەنگاریی، دەسەڵاتی شێخ مەحمود کەم بکەنەوە، مێجەر سۆن لە جێی نۆیل بووە حاکمی سیاسیی شێخ مەحمود لە شاری سلێمانی هەتا نەخشەکەیان جێبەجێ بکات[432].

مێجەرسۆن نەخشەی وابوو، هێزی شێخ مەحمود بە تەنیا لە سلێمانیدا بمێنێتەوە، بە هۆزەکانی جاف کفری و هەڵەبجەی راگەیاند بوو کە لە ئێستاوە ملکەچی شێخ مەحمود نین، سۆن لە ڕانییە بە پیلانی خۆی و بە هاوکاریی گەورە بەرپرسانی رانییە نوێنەری شێخ مەحمودی لابرد[433]. لیوای هەولێریان دامەزراند و راستەوخۆ لە ڕێگەی بەرپرسە سیاسییەکانەوە بەڕێوە دەبرا، هەتا لە ناو سلێمانیش سۆن توانیبووی هەندێ لەو کاربەدەستانە ناچار بکات واز لەو پایە بهێنن کە شێخ مەحمود پێی دابوون، سۆن پشتی بەو کاربەدەستە تازانە دەبەست کە خۆی دانابوون، بە زۆریی ئەو کاربەدەستە نوێیانەش ئەفغانیی، یان هیندیی بوون[434]. هەروەها سۆن لە پەیوەندیی باش دابوو لەگەڵ ئەو توێژە نەتەوەخوازەی کورد، کە لە ژێر کاریگەریی رۆژئاوادا بوون و بە شێخ مەحمود نیگەران بوون، بە (مەلا)یان دەزانی، سروشتی رژێمەکەشیان بە ئەرەستۆکراتی (چینایەتی) دانابوو[435].

بە سەرنجدانی هەموو ئەو رێوشوێن و گۆڕانکارییانەی پێشتر باسمان کرد، شێخ مەحمود گەیشتە ئەو پوختەیە: ئەگەر بە تەواوی دەست و برد نەکات لە ئاییندەیەکی نزیك شوێنەکەی لە دەست دەچێت، بۆیە لە مایسی (1919) دەستی بەسەر سلێمانیدا

[432] - M. G. Less (Two years in Kurdistan) J.RSAS. Xv(1928) pt111.p.225. Wilson ,Loalies.11.p.134-135

[433]- -Bell, Review of Civil Administration.p.64

[434] - ئەحمەد تەقی: خەباتی گەلی کورد، بەغدا، چاپخانەی (العربیە) 1970، ل92.

[435]--Edmonds, Kurds, Turks, And Arabs. P.30, Hawrami (sheikh Mohamed) The Kurdish Journal, v1 (1969)N.2,p62.

گرت، گرین هاوس کە لە دوای مێجەرسۆن دانرابوو، لەگەڵ بەرپرسانی تر گرتنی و ڕەوانەی زیندانی کردن، شێخ دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانی ڕاگەیاند و ئاڵای کوردی بەرز کردەوە، جوڵانەوەی شێخ هێندە لە ناکاو بوو هێزەی گەنجانە (لێڤی)* کەم بوون لە ناوچەکە نەیانتوانی بەرگریی بکەن و دایانە پاڵ حکومەتەکەی شێخ مەحمود[436]. ئەم ڕووداوە لە چەند سەرچاوەیەکەوە توێژینەوەی باشی لەسەر کراوە[437].

ویڵسن لە کەرکووکەوە، کە حەفتا میل لە ڕووداوەکەوە دوور بووە (2400) پیاوی لە هێزی پیادە نارد، کە زۆربەیان هیندیی و کوردە لایەنگرەکانی خۆی بوون، فەرمانی پێکردن بەرەو سلێمانییەوە بڕۆن بۆ شەڕی یاخیبووان، ئەو هێزە لە دووڕێیانی تاسڵوجە، کە (10) میل لە سلێمانییەوە دوورە، لەگەڵ هێزی شێخ مەحمود بەیەکگەیشتن و لەوێ هێزەکەی ویڵسن شکا، کۆلۆنێل لونگریك چەند هەوڵێکی سەرنەکەوتووی بۆ هاوکاری ویڵسن دا، هاوکات شۆڕش لە ناو خاکی ئێرانیی ژێردەستی بەریتانییەکان سەریهەڵداو هەندێ لە هۆزەکانی کورد دایانە پاڵ شێخ مەحمود، ویڵسن گەیشتە ئەو بڕوایەی ئەم ڕووداوە ئەو باوەڕە لە لای عێراقیەکان، بەتایبەتی کورد پتەو دەکات، کە بەریتانییەکان ناتوانن بەسەر بارودۆخەکەدا زاڵ بن[438].

---

* - لێڤی، یان سوپای گەنجانە: بەو میلیشیاتە نیمچە نیزامیە دەوترا، کە بەریتانیەکان لە عێراق پشتیان پێدەبەست، پێکهاتبوو لە دانیشتوانی داگیرگەکانی بەریتانیی لە ڕۆژهەڵات، تەنانەت ژمارەیەك عـەرەب و کورد و ئاشووریش وەکو کرێگرتە بەشداربوون. "وەرگێڕ".

436 - Jwaideh, (Kurdish nationalist Movement) pt,1.p.217-218

437 - عەلی سەیدۆ گورانی: من عمان الی العمادیە... ، 100-107.

.Edmonds, Kurds, Turks, And Arabs.p.31. 1919-1920. (Baghdad N/P 1966),p.91-98. Longing, 1990 to 1950. p.104-105. Air.20/719 Memo (Operations in South of Kurdistan) G.H.G 18th Division, July 26 1919, Bell, Review of Civil Administration,p.64.

438 - Wilson, Loyalties, 11,p.1437

## کەوتنی یەکەم حکومەتی شێخ مەحمود

راپەرینی باشووری کوردستان بۆ بەریتانییەکان زۆر مەترسیدار بووە، چونکە راستەوخۆ هەڕەشە بووە بۆ سەر تەواوی نەخشەی بەریتانیا لە پاراستنی عێراق، هەروەها هەڕەشە بووە بۆ سەر ئارامیی لە عێراق و ئێران، ئەگەر بە خێرایی سەرکوت نەکرایە ئەو بڕوایە لای هۆزەکانی عەرەب درووست دەبوو، کە دەتوانن لە عێراق بەرەنگاریی بەرپرسانی بەریتانی ببنەوە[439]، تیۆدۆر فرێزەر لە هەڤدەی حوزەیران لە گەرووی دەربەندی بازیان ـ دوانزدە کیلۆمەتر لە باکووری رۆژهەلاتی چەمچەماڵ دووره ـ سوپایەکی ئامادەکرد، هێزەکانی بەریتانیی بە یارمەتی پیاوە کرێگرتەکانی موشیراغای هەمەوەند* پێشڕەویان کرد، لەو کاتەی هێزەکانی کورد لەسەر "شێوەی عوسمانی" لە پێشەوە چاوەڕوانی هێرش بوون، لە پشتەوە پەلاماریان دان و بینیان لە هەموو لاوە دەورەیان گیراوە، لەم شەڕە نابەرانبەرە لە ڕووی ژمارە و تەقەمەنیی، هێزەکانی کورد شکان و شێخ مەحمود گیراو بە حوکمی لە سێدارەدان دادگایی کرا، دواتر حوکمەکەیان لەسەر سووك کرد بۆ زیندانی هەتا هەتایی و دوورخرایەوە بۆ دوورگەی (ئەندامان) لە هیند، دوای گیرانی شێخ، ئینگلیز سیاسەتی زەوی سووتاوی پەیڕەو کردووە لەگەڵ ئەو ناوچانەی پشتیوانیان لە شێخ مەحمود کردبوو، دوای چل و پێنج رۆژ بارودۆخی باشووری کوردستان هێمن بۆوەو مێجەرسۆن توانی بە تەواوی بە سەر سلێمانی دا زاڵ بێت[440].

بە هۆی چەند هۆکارێکەوە جوڵانەوەی شێخ مەحمود کۆتایی هات، هەیە پێیوایە زۆربەی خەڵك پشتگیریی شێخیان نەکردووە و جوڵانەوەکەی لە بەرژەوەندیی ئەو گرووپە

---

[439]Bell, Review of Civil Administration, pp.68-69, Two Years, pp.160-161

* - د. کەمال مەزهەر لەو چەند ساڵەی دوایی لە وتارێکیدا بەرگریی تەواوی لە مشیری حەمەی سلێمان کردووە و بە وردی روونی کردۆتەوە، کە ئەو مەسەلەیە بەو شێوە نەبووە، هەروەها لەو بارەیەوە سەرچاوەی تریش پشتگیریی ئەو بەرگریی لێکردنە بوون. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: د.کەمال مەزهەر: ویژدان و مێژوو.. یان دادگایی حەمەی سلێمان، گۆڤاری رەنگین، ژمارە (102)ی ساڵی 1997،، د.جەبار قادر: چەند بابەتێکی مێژوویی، چ1، سلێمانی، 1999، ل89-92.

[440] -Air 20/716 Memorandum General Head Quarters Mesopotamia Force (GHQMF) No G696, 26-27 1919. Bell, Review of Civil Administration.pp.65-66. Edmonds, Kurds, Turks, And Arabs.pp.85.

کەمە (ئاغا) بووە، کە لە سەدا چواری دانیشتوان بوون، ئەو توێژەش بایەخی گەورەیان بە سەربەخۆیی کوردستان نەداوە، توێژەکانی تر بە چاوی رقەوە سەیریان کردووە، بێجگە لە سەرۆك خێڵەکانی، بە بەرپرسیاریەتی کەسی تر رازی نەبوون، سەرەڕای ئەمە شێخ مەحمود لە هەڵگیرسانی جوڵانەوەکەی راوێژی بە سەرۆك خێڵەکانی تر نەکردبوو[441]، ئێمە پێمانوایە هۆکاری کەوتنی یەکەم حکومەتی شێخ ئەم خاڵانەی خوارەوەیە:

– تێکگیرانی بەرژەوەندییەکان لە نێوان پرۆژەی شێخ مەحمود بۆ سەربەخۆیی کوردستان و نەخشەی حکومەتی بەریتانیی لە عێراق.

– هەستی بێمتمانەیی لە نێوان شێخ مەحمود و بەریتانییەکان.

– ناکۆکییە ناوخۆییەکانی کوردستان.

– نەبوونی تێڕوانێکی روون و هاوسەنگ لە سیاسەتی حکومەتی بەریتانیی بەرانبەر کورد.

– نەبوونی هاریکاریی گونجاوی هەرێمیی.

لە ڕاستیدا تێکگیرانی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا لە عێراق لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی کورد هۆکاری بنەڕەتیی و گرنگ بووە لە هەرەسهێنانی کارگێڕییە خۆجێیە خێڵەکییەکەی کوردستان، کۆمیساری باڵای بەریتانیا لە بەغدا لە تەموزی (1919) نووسیویەتی: (ئەوەی ئێمەی بەرەو ئاکامێکی ژیربێژی برد کێشەی کوردیی بوو، ئەو ناوچەیەی کوردەکان دەیانەوێ بیکەنە بناغەی سەربەخۆیی ناوچەیەکی زیندووە بۆ عێراق، وەزارەتی هیندیی بەریتانیش بایەخێکی زۆری داوە بەو سامانە زۆرەی کە لە ولایەتی موسڵدا هەیە و دەوڵەمەندە بە نەوت، ئەمەش پێویستە بۆ پەرەپێدانی عێراقی ئایندە،[442] هەروەها ئیدارەی بەریتانیی لە عێراق چەندان جار جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە ئەگەر عێراق بە تەنیا دەشتایی بێت، ناتوانێت سنوورەکانی بە پارێزراوی بمێنێتەوە.

---

[441] Air 20/513 (Note on the Political Situation in Southern Kurdistan Major Sloane, 27-28.1920, Jwaideh, (Kurdish nationalist Movement) pt,2, pp.527-528.

[442] - British Documents on Foreign Affair 1919-1939, ed E-Woodward, R. Butter vol IV, The Middle East, lst ser. 1952, Teleg. From Admiral S, Catherop to Earl Curzon. No 1436, 7-10- 1919, p.679

چیاکانی کوردستان لەو بارودۆخە نائارامەی ئەو کاتەی ئێران و تورکیا ناوچەیەکی ئاوەدان و ستراتیژیی بووە، "وەکو بنکەیەکی سەربازیی" بۆ بەرگریی لە عێراق[443]، بۆیە حکومەتی بەریتانیی هەندێ ترسی لەو گروپە کوردیانە هەبووە، کە ئەستەم بووە بەسەریاندا زاڵ بێت، لەو بڕوایەدا بوون ئەگەر کورد بۆ خۆی کاروباری خۆی بەڕێوە ببات لە ئاییندە دەبێتە مەترسیی بۆ سەر ئارامیی و ئۆقرەیی عێراق و ئێران[444].

## بێمتمانەیی نێوان شێخ مەحمود و بەریتانییەکان:

پەیوەندییەکانی شێخ مەحمود و بەریتانییەکان بەوە ناسراونەوە، کە هەڵەی یەکتریان بە هێند وەرنەگرت، ئەمەش کاریگەریی بەرچاوی هەبووە لە نووشستی هێنانی سیاسەتی بەریتانیی بەرانبەر کورد، دەبێت ئەو بێمتانەییەی هەردوولاش بۆ ئەو ڕووداوە کورتانەی کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانیی بگەڕێنینەوە، خێرایی پێشڕەوی هێزەکانی بەریتانیی لە باشووری کوردستان، لە مایسی (1918) کاریگەریی هەبووە لەسەر کورد، لە سلێمانی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود کۆبوونەوەیەك کرا، ئەوانەی لەو کۆبوونەوەیە ئامادە بوون بڕیاریاندا پشتگیریی لە بەریتانیا بکەن.

شێخ مەحمود نامەیەکی بۆ "ئەرنۆڵد ویڵسن" ناردوەو داوای لێکرد بەریتانییەکان باشووری کوردستان داگیر بکەن[445]. ئەوانیش بە خێرایی هێرشیان کردە سەر کەرکووك و داگیریان کرد، لە ئاکام شێخ لەگەڵ ژمارەیەك لە پیاوماقوڵانی کورد ڕایگەیاند، کە لایەنگریی بەریتانییەکان دەکات، لە دوای دوو هەفتە بەریتانییەکان ناچار کران کەرکووك بەجێبهێڵن و جارێکی تر حکومەتی تورکیی دەستی بەسەر ناوچەکەدا گرتەوە، شێخ مەحمود و ژمارەیەك لە گەورە پیاوانی کوردیان بۆ ماوەیەکی کەم گرت و وای لێهات شێخ و گەورەپیاوانی هاوکار لەگەڵ ئینگلیز ببوونە گاڵتەجاڕی خەڵك[446].

---

443-- B.D.F.A. IV Teleg. From M.Mohler to J.Tilliey unup Constantinople 7,21,1919 Cab 23/20 (Minutes of Cabinet Meeting) March 23,1920. FO.371/5067, Teleg CC, Baghdad ,to, l.O. 4.2.1920.

-31Loyalties ll p.44.

444 Review of Civil Administration.p.68

445 -Review of Civil Administration.p.68.

446 Wilson, Loyalties, p.87. G.R. Driver,(The Kurdish-Question) Persian Magazine (1921) Septmber,No,3,p.255.

ویلسون کاتێك ئەمەمان بۆ دەگێڕێتەوە پێیوایە ئەوە یەکەم ئەزموونی پەیوەندیی حکومەتی بەریتانیی و گەلی کورد بووە، دەڵێ: بە ڕوونیی ئەو بەڵێن و پشتگیرییەی لە لایەن بەرپرسانی نابەرپرسەوە دراوە و بە شێوەیەکی راستەوخۆ، (بولارد) لە کەرکووك و (لۆنگریك) لە کفری لێی بەرپرسیارن، ناتوانین پشت بەم شێوازە ببەستین، ئێمە یاریی رووسەکان دووبارە دەکەینەوە لە بەکارهێنانی پیاوانی خێڵەکان وەکو پشیلەی راو، هەندێ لەو سەرکردانە لە ناویاندا سەرۆکی هەمەوەند لە ڕێگەی کەرکووك لە کاتی کشانەوە داوای لێکردین دەست بەرز بکەینەوە بۆ تورکە ناحەزەکانمان، بە خراپی شکاندمانن، بەتایبەتی سەرۆکی هەمەوەند لەگەڵ ئەوانی تر، چاوپۆشیان لێنەکردین و بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ دوژمنکارییان کردین[447]. بە جۆرێ هیچ لە بەردەم ئینگلیز نەمایەوە کشانەوەی کاتیی نەبێت لە کەرکووك، لە ئاکامی ئەم هەڵوێستە سەربازییەی دەرەوەی میسوپۆتامیا (بلاد ما بين النهرين) کشانەوە بووە، ئەمەش بێمتمانەیی بۆ کورد درووست کرد لە بەرانبەر بەریتانییەکان. (درایڤەر) باسی کردووە، کە کشانەوەکە بۆ ئیدارەی بەریتانیی خەسارەتێکی ریسوایی بوو، باوەڕیان وایە ئەگەر ئێمە لە کوردستان بمانیایەوە و لە سیاسەتمان راستگۆ بووینایە شێخ مەحمود نەیدەتوانی شۆڕش بکات[448]. لۆنگریکیش گەیشتبووە هەمان باوەڕ، کە دەڵێ: پاشەکشەکە تراژیدیا بوو بۆ سەر پەیوەندیی ئێمە و کورد[449].

لەو کاتەی دۆستانی رژێمی بەریتانیی لە کەرکووك و کفری نەچوونە پاڵ ئیدارەکەی شێخ و شێخ ئەویش ئەمەی بە پیلانی ئینگلیز دەزانی، بێمتمانەیی مامەڵەی شێخ مەحمود لەگەڵ سوپای بەریتانی زیاتر بوو، دانانی سۆن بە دەسەڵاتێکی بێ سنوور ئەم بڕوایەی لای شێخ مەحمود پتەو کرد، کە رژێمی بەریتانیی سوورە لەسەر کۆتایی هێنان بە هێز و دەسەڵاتەکەی ئەو[450]، لە لایەکی ترەوە کاربەدەستانی بەریتانیی بە هۆی رابردووی شێخەوە متمانەیان پێنەدەکرد، چونکە چەندین شۆڕشی لە دژی تورك ئەنجام دابوو. ویڵسۆن بەم شێوە لەسەر شێخ مەحمودی نووسیووە: (پیاوێکی خاوەن خۆزگە

---

[447] Wilson, Loyalties, p.88,quoted in Jwaideh, Kurdish nationalist pt,2, pp.469-470.

[448] The Kurdish Question, pp.255-256

[449] Iraq From 1900-1950,p.91

[450] Hilmi,1,p.92.Wilson, Loyalters,ll,p.134. Jwaideh, (Kurdish nationalist Movement) pt,2, pp.490. Bell, Review,p.64.

و فێڵ زانە، توورەیە و بە توندیی هەڵدەچێت، سۆن باوەڕی وابوو بیر تیژەو هەندێ هەڵسوکەوتی لە سەرووی ویستی خۆیەتی)[451]. بەڵام لی (G.M.L Lees) "ئەو ئەفسەرەی ماوەی رۆژێك گەمارۆ درابوو" بەو پەڕی توندیی رای خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ: (شۆرەتی خراپی شێخ مەحمود و فرۆفێڵ و ساختەکانی لە کەس شاراوە نییە، لە بێبەختی متمانەیێکی تەواوی پێدراوە و رێگەی دراوەتـێ بێسنـوور هـاوکـاریی دارایـی دەکـرێت، لەو کاتەی دەبـیـنـی تـا ڕادەی نـامـاقولْ خاوەنی دەسەڵات و پارەیە خۆزگەکانیشی زیادبوو[452]، هەروەها ئەدمۆنسیش هەڵوێستی باش نەبووە لەگەڵ شێخ و دەیووت: (لە ماوەی دەسەڵاتی عوسمانیی بە چەتە دڵڕەقەکانی شاری تۆقاند بوو، بەڵام کە بووە حاکمی فەرمیی توانای سنووردارییەتی خۆی ناسی)[453]. سەرەڕای ئەوە، زۆربەی کاربەدەستانی بەریتانیی لەو بڕوایەدا بوون لە باشووری کوردستان شێخ مەحمود جەماوەری هەیە، پێیان دەوت: زۆردار و فێڵاوی، لە لای نزیکەکانی لە سلێمانی خۆشەویست نەبووە، جوتیاران پشتیان تێدەکرد، هەتا تۆڵەی خۆیان بکەنەوە و لە زوڵمی ئەو رزگاریان بێت، کاربەدەستانی ئیدارەی بەریتانیی پێیانوابووە، ئەو یارمەتییەی کورد بۆ ئەو لە بێمتمانەییە بە حکومەتی بەریتانیی، کە لە کۆتایی دەسەڵاتی شێخ مەحمودیان بەسەردا دەسەپێنێت، بەڵام ئەوەی بینیان پێچەوانە بوو، بۆیە کاریگەریی شێخ مەحمود بەرەو نەمان چوو[454].

سۆن بە دەربڕینێکی تر لەسەر هەمان هەڵوێست هۆکارێکی ترمان دەداتێ، دەڵێ: لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیی، کورد زۆر تامەزرۆی ئاشتیی بوون، بە جۆرێ ئامادەبوون هەموو بەڵگەنامەیەك لە پێناوی ئارامیی واژۆ بکەن، بۆیەش ئەو هۆزە کوردانەی شێخ مەحمودیشیان باش نەدەناسی ئەو بەڵگەنامەیان واژۆ کرد، کە داوا بکەن بچنە پاڵ دەوڵەتە تازەکەی شێخ[455].

---

451 Loyalties ll p.134-1908

452) – Two years in Kurdistan) pp.253-254.

453 Kurds, Turks, And Arabs, p.30

454-Bell, Review of Civil Administration, pp.59-64. FO, 371/5068,Sulaimania, 11-7-1920. Soane Sulaimania Division,p.1.

455 -Soane Sulaimania Division,pp.1-2. quoted in Jwaideh, (Kurdish nationalist Movement) pt,2, p489.

هەموو ئەو قسانە هی ناحەزانی شێخ مەحمودن بۆ کەمکردنەوەی شکۆی ئەو لە لای کورد[456]، سەرچاوە کوردیەکان وێنەی تەواو جیامان لەسەر شێخ مەحمود دەدەنێ، ئەو سەرچاوانە دەڵێن هەر لە ساڵی (1908)وە سەرۆکی رۆحیی خانەوادەی بەناوبانگی بەرزنجە بووە[457]. بەهێزترین و بەناوبانگترین خانەوادەی باشووری کوردستانی پێش چەند سەدەیەك بووە، شۆرەتی ئەو خانەوادەیەش بە هۆی شێخ مارفی نۆدەیی (1753–1833) و شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمود جێگەی رێز و تەقدیری کورد بووە، لە هەموو دەوڵەتی عوسمانیی و لە لای سوڵتان رێزیان لێگیراوە[458]، باوکی لە کارەساتێکی مەترسیداردا، کە ئیتیحادو تەرەقی نەخشەیان بۆ دانابوو لە موسڵ تیرۆر کرا، چونکە لە سلێمانی بەشداریی حکومەت و لیژنەی ئەوانی نەکردبوو، بە هۆی ئەم کارەساتەوە کوردستانی باشوور راپەڕی و کوردان بە رێپێوان بەرەو موسڵ بەرێکەوتن، هەتا حکومەت ناچار بوو زەکی پاشا چەلەبی، کە دەستی لەو کارەدا هەبوو لەسەر کار لابەرێت، لە ئاکامی ئەمە شێخ مەحمود بووە سەرۆکی بەرزنجییەکان و گەورەترین کەسایەتیی کوردستان[459]. بە هۆی پێگەی زانستیی و سامان و ئازایەتی و گەرموگوڕیی و دەست و بردیی، کوردەکانی باشووری کوردستان وەکو سەرکردەیەکی مێژوویی سەیریان کردووە. بەو پێیەی شێخ مەحمود سەرۆکی هۆزی بەرزنجە بووە کاریگەریی زۆری هەبووە لەسەر جەنگەکانی ئەو لەگەڵ هۆزی جاف کۆنە دوژمنی بەرزنجیەکان[460].

---

456- See Waheed,pp.163-164-.

457 -Edmonds, Kurd, Turk, And Arabs, p.68

458- محمد امين زكی: تأريخ السليمانيه، بغداد، 1950، ص218-219. جمیل رۆژبەیانی (شێخ مەحمود حەفیدزادە، کاروان، ژمارە، 113، 1987، کمال محمد: مقابله فريده مع شێخ محمود، کاروان، ژمارە 96، (1984)، (1984)،ل120. حیلمی: ب1،ل48-49

Royal Instate of Intonation Affairs Survey international Affairs The Islamic Word since the peace Treaty (London Oxford University Press, 1927) p.39.

ئەحمەد تەقی: ل16-17. حیلمی: ب1، ل48-49.

459 - Soane, To Mesopotamia in Disguise, p.192 Hilmi. 1.p.39.

لەتیف بەرزنجی (شێخ مەحمودی نەمر) گۆڤاری کاروان 1984، ژمارە (26).

،Loyalties ll p G.R. Driver,(The Kurdish- Question) Persian Magazine (1921) Septmber,No,2,pp.469-470. Wilson, Loyalters,ll,p.135. FO, 371/5068,Sulaimania 11-7-1920

460 - Wilson, Loyalters,ll,p.135. FO, 371/5068,Sulaimania 11-7-1920 .

لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانیدا کورد بە سەرۆکی خۆی دانا بوو، لە مایسی (1915) شانبەشانی عوسمانییەکان لە عێراق لە (شوعەیبە)ی خوارووی فورات سەرکردایەتی (2000) سوارەی کوردی کردووە لە دژی هێزەکانی بەریتانیی، هەروەها لە بەرپەچدانەوەی هەوڵەکانی رووسیا بۆ باشووری کوردستان سەرۆکی سوارەکانی کورد بووە[461]، بەریتانییەکان ئاگادار بوون بە هەڵوێستی بەرزنجییەکان لە کوردستان، لە تشرینی یەکەمی (1918) وەزیری دەوڵەتی بەریتانی لە هیند بەر لە شاڵاوی بەریتانی هەواڵی دایە کە ئامادەی تەواوی هەیە بۆ راکێشانی دۆستایەتی بەرزنجییەکان لە پێناو دیارییکردنی چارەنووسی سیاسیی لەگەڵ کورد[462].

لەسەر کارگێڕیەتی شێخ مەحمود و جەماوەرەکەی بە شێوەیەکی رەخنە، بەڵام ئەرێنیانە رەفیق حیلمی بۆ ساڵی (1918) دەڵێ: بە ماوەی کەمتر لە دوو هەفتە بۆ قسە کردن لەسەر بەرژەوەندیی کوردستان، شەستو دوو سەرۆکی باشووری کوردستان بە پیر بانگەوازەکەیەوە هاتن، هەتا لە سلێمانی کۆنگرەیەکی نیشتیمانی ببەستن، ئەم ئامانجەش بە بێ یارمەتیی حکومەتی بەریتانیی بوو، بەڵام بێئاگام بوو بەوەی کە نابێت کوردەکانی ئێران بەشدار بن[463]. زۆربەی نووسەرە کوردەکان لەگەڵ رەفیق حیلمی هاوڕان بەوەی جەماوەری شێخ مەحمود جێی مشتومڕ نییە، هەرچەندە ئەو بەرهەڵستیەی باسی دەکەن لە هۆزی پشدەر*و جاف زیاتر نییە[464]. هەروەها وادی جوەیدە و زۆربەی رۆشنبیرانی کورد لەسەر ئەوە هاودەنگن، کە زۆربەی هۆزەکانی

---

.Edmonds, Kurds, Turks, And Arabs, p.77-78.

[461]Hawrami, pt.1,p.58

[462] - Air 20/512, Teleg, From pol. Baghdad to Secretary of State (S.O for idea No. 9267, 30,10, 1918.

[463] -حیلمی: ب1، ل101

* - هۆزێك نییە بە ناوی (پشدەر) زیاتر دەبێت مەبەستی هۆزی میراودەلیی بێت، گەرچی میراودەلییەکانیش وەکو جاف هەموویان لەگەڵ شێخ مەحمود ناکۆك نەبوون، بەشێکیان بە سەرۆکایەتی بابەکر ئاغا دژی شێخ مەحمود و دۆستی ئینگلیزەکان بوون، بەشەکەی تری میروادەلیی بە سەرۆکایەتی عەباسی مەحمود ئاغا لە بەرەی شێخ مەحمود و دژی ئینگلیز بوون. "وەرگێڕ".

[464]- لەتیف بەرزنجی: ل5، رۆژبەیانی: ل62-63، شەمزینی: ل110، هەورامی: ل135، ئەحمەد تەقی: 16، گەورانی: 99-100.

باشووری کوردستان پشتیوانیان له شێخ مەحمود کردووە، بەڵام نوشوستی شێخ مەحمود لەوەدا بووە نەیتوانیوە ئەو هێزانە بە شێوەیەکی باش لە ڕووی بەریتانییەکاندا بەکار بهێنێت[465].

نە ئەو وێنەیەی کە کاربەدەستانی بەریتانیی بۆ شێخی دەکێشن ورد و درووستە و نە ئەو هەڵسەنگاندنەی ڕۆشنبیرانی کورد لە جێی خۆیدایە، شتێکی بەرچاوە شێخ مەحمود بەرهەڵستکاریی هەبووە و نوشوستی هێناوە لە خستنەڕووی هەڵسەنگاندنێکی درووستی هێزەکەی لە بەرانبەر هێزی بەریتانیی و زیادەڕۆیی کردووە، پێیوابووە زۆر لەوە بەهێزترە بەریتانییەکان لە سلێمانی دەریپەڕێنن، ئەوان لەوە کەمترن لە دەسەڵات لای ببەن، بڕوای وابووە ئیدارەکەی ئەو زۆر پێوستە بۆ دابینکردنی ئارامیی و ئاشتیی لە ناوچەکەدا[466].

هەتا لە فێڵەکانیشی لەگەڵ ئینگلیز بە هۆی کەم ئەزموونیی، باش ئاگاداری هۆکارەکانی ناوخۆیی و نێودەوڵەتیی نەبووە، سەرەڕای لێڵیی سیاسەتی بەریتانیی لە کوردستان و عێراق، شێخ ئیدارەیەکی کارامە و راوێژکاری بە توانای نەبووە، هەتا یارمەتیی بدەن لە مامەڵەی درووست لەگەڵ ئەو تازە بابەتە ناوخۆیی و جیهانییەی مەترسییان هەیە بۆ سەر چارەنووسی کوردستان، بە کۆمەڵێك مێشك وشك دەوورە درابوو، کە هانیان داوە هەڵوێستی نەگونجاو وەربگرێ بەرانبەر بەریتانیا[467]. ئاغاکانیش کاریگەرییان هەبووە لەسەر شێخ مەحمود، کە لەگەڵ بەریتانیا تێکبگیرێ، کاربەدەستانی بەریتانیی دەڵێن: ئاغاکان گومانیان وابووە داگیرکردنی بەریتانیی سەرنج لەسەر خاوەندارێتی ئەو زەویانە دادەنێت کە لەبەردەستیاندایە و بە زەبری هێز دەستیان کەوتووە، بەریتانییەکان باسی ئەوەیان کردووە دەسەڵاتی ئەو ئاغا و سەیدانە کەم بکەنەوە کە بە ڕێگەی ناڕەوا زەوی و زاریان دەستکەوتووە، بەڵام بێجگە لە پشتیوانیی ئەو گروپە تەقلیدیە، هیچ ڕێگەیەکی تریان نەبووە، چونکە زاڵبوون بەسەر پیاوانی هۆزەکان وائاسان نەبووە، بۆیە ئیدارەی بەریتانیی بڕیاریدا پشتیوانیی

---

465 Kurdish nationalist Movement. Pt,11,p.528 -

466 Waheed, The Kurds, p.161.

467 - حیلمی: ل38-85.

هێزەکەی شێخ مەحمود بکەن و تۆمارەکانی تاپۆ "تۆمارەکانی زەوی میری" نەنێرن بۆ بەغدا[468].

لە ساڵی (1919) ئەحمەد تەقی ـ کەسایەتی ناودار لە جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کورد ـ نامەی لە شێخ عەبدولقادری نەهریەوە بۆ شێخ مەحمود هێنا بوو، شێخ عەبدولقادر سەرۆکی کۆمەڵەی پێشکەوتن و بەرزی کوردستان و ئەندامی ئەنجومەنی دەوڵەتی عوسمانیی، پشتیوانی گەورە بۆ کێشەی کورد و شارەزا بووە بە نەخشەکانی داگیرکەر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە نامەکەیدا هەندێ ئامۆژگاریی شێخ مەحمودی کردبوو کە حەکیمانە مامەڵە لەگەڵ ئینگلیز بکات و خۆببوێرێت لە بەرەنگاربوونەوەی بێسوود[469]، ئەوە تاکە ئامۆژگاریی راستەقینە بووە بۆ شێخ مەحمود، بەڵام بێسوود بوو، لە ئاکامی سیاسەتی هەراسانکارییانەی سۆن ئاژاوە و گەڕەلاوژەیەکی گەورە هەموو کوردستانی گرتەوە و راپەڕینی نیشتیمانیی لێکەوتەوە، نیشتیمانپەروەرانی کورد و تورك پێکەوە بێمنەتیی خۆیان لە ئەنادۆڵ بە بەریتانییەکان راگەیاند، کوردەکانی هۆزی گۆیانی نیشتەجێی زاخۆ لە نیسانی (1919) راپەڕین و کاربەدەستو سەربازانی بەریتانییان کوشت، راپەڕیوان دەریانخست دەتوانن رووبەڕووی حکومەتی بەریتانیی ببنەوە. کوردەکانی ئێرانیش دژی حکومەتی ناوەند راپەڕین، تورکەکانیش بە ناردنی چەندین نامە بۆ شێخ مەحمود هەواڵیان پێدا کە شاڵاوی تورکان نزیك بۆتەوە، شێخ مەحمودیش فەرمانیدا بە کوردە موسڵمانەکان بۆ شەڕی کافرە بەریتانییەکان راپەڕن[470]، لە دوایدا شێخ هەڵە بوو، بەوەی پێیوابووە بەریتانییەکان لە عێراق دەمێننەوە. ویڵسۆن لەو بارەوە دەڵێ: لە هەموو مانگێکدا بە قەبارەی زۆرەوە سوپامان دەکێشایەوە، بەڵام لە بەرانبەردا ئەرکە سەربازییەکان سووك نەدەکرا، بازرگان و خەڵکانی تر کە لە بەغداوە دەگەڕانەوە سلێمانی دەیان بیست هەموو ڕۆژێك

---

[468] -- Bell, Review of Civil Administration,p.63,Also quoted in Jwaideh.

[469] - ئەحمەد تەقی: ل15.

[470]Bell, Review of Civil Administration,p.64, Longing; Iraq 1900 to 1950,p.101, Mayson, p.432, Drive, p.113, Jwaydeh. (Kurdish nationalist Movement) pt,2, p.50665ئەحمەد تەقی: ل.

به کەشتی و شەمەندەفەر وڵات بەجێدێڵین، ئەمەش وای کرد تێبگەن کوردستان و خەڵکەکەی بەجێدەهێڵین، یان ئەم کارە بۆ دەسەڵاتداران جێدەهێڵین[471].

لەسەر ئەو رۆڵەی شێخ مەحمود دەبوایە لە چوارچێوەی سیاسەتی بەریتانی بیگێرێت خراپ حاڵی بوون لە هەردوولاوە هەبووە، شرۆڤەکردنی شێخ بۆ رۆڵی خۆی وەکو (حکومدار) جیا بووە لەگەڵ تێگەیشتنی بەریتانییەکان، لەلای حکومەتی بەریتانی شێخ لە هەوڵەکانیدا بۆ چەسپاندنی رژێم و یاسا لە ناوچەکە بە تەنیا رۆڵی (راج)ی هیندی دەگێرێ، لە کاتێکدا شێخ وای دانابوو سەرۆکی گەلێکی شکۆدارە و لە ژێر چاودێریی بنەماکانی ویلسونی سەرۆکی ئەمریکادایە لە بابەت دیارییکردنی ماڤی چارەنووسی گەلان، کە لە وتاری (8)ی کانوونی دووەمی بەیەکگەیشتنی هاوبەشی نێوان کۆنگریس و ئەنجومەنی پیراندا هاتووە: (لەسەرمان پێوستە بەرگریی لە بەشەکانی تورکیای دەوڵەتی عوسمانیی بکەینیو باوەڕمان بە سەروەریی ئەوێ هەبێت، بەڵام بۆ نەتەوە ناتورکەکان دەبێت بڕوامان وابێت دەرفەتیان پێبدەین بۆ خۆبەڕێوەبردن)[472].

بۆیە شێخ پێیوابووە بەریتانییەکان هاوکاریی دەکەن بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ، ئەوەتە ئەدمۆنس چەند سەرنجێکمان لە بارەی خۆی و هاوڕێکانی دەداتێ[473]:

(گومانم نییە شێخ مەحمود وەکو ئەوڕەحمان "مەبەست ئاوڕەحمان پاشای بابانە" هاوکاریی بەریتانیای دەوێ لەگەڵ دەست وەرنەدان لە کاروباری حکومەتە تاك لایەنییەکەی، بەریتانییەکان لەسەریانە دەست لە کاروباری دەسەڵاتەکەی وەرنەدەن، بەڵام بۆ بەرهەڵستی ئێرانییەکان و حکومەتی عەرەبیی لە بەغدا پێویستە ئەمە بکەن، هەتا بە رۆڵی حکومەتەکەی کرماشان و پاشایەکانی بەغدای سەدەی نۆزدەهەم هەستن،

---

[471]- Loyalties, pt.2, p.135

[472]- See Royal International affairs Memorandum on the Termination of the Mandate (London 1932) p.3 of the (see Lbid pp.3-4), (Air 20/513 intelligence Office Report No. 499, IC. Intelligence Office Constantion,July,13,1919.(

[473] Kurds, Turks, And Arabs, p.59

بۆ بەرهەڵستی سەربەخۆیی کوردستان، هەروەها ئەو بڕوایە لای هەموو توێژەکانی کۆمەڵگای سلێمانی هەبووە، کە دەوڵەتی کوردیی پێکدێت و سلێمانیش دەبێتە پایتەختی ئەو دەوڵەتە، کەواتە وا بەدیاردەکەوێ ئەقڵی شێخ مەحمود پڕ بووە لەو باوەڕەی کە کورد شایستەی دەوڵەتی سەربەخۆن و ئەویش دەتوانێت سەرۆکی ئەو دەوڵەتە بگێڕیت، هەروەها بەرزنجیەکان بەهۆی کەمکردنەوەی دەسەڵاتیان، لە شێخ رازی نەبوون، ئەمەش مایەی نائارامیی بەریتانییەکان بووە لە شێخ[474].

## ناکۆکیی کورد و کۆمەڵە کوردییەکان

سروشتی خێڵایەتی کۆمەڵگای کوردیی، نەبوونی هەستی روون و ئاشکرای نەتەوایەتیی، ناکۆکیی سەرۆکەکان، رەنگدانەوەی ئاشکرای هەبووە لەسەر داڕشتنی سیاسەتی بەریتانیی سالآنی (1918ـ 1920)، کورد لەو ماوەیەدا هەستی هاوکاریی نەتەوایەتییان تا رادەیەك نەبووە و لە ناو خێڵایەتیی توابوونەوە، هەندێ لە کاربەدەستانی بەریتانیی باسی کوردیان کردووە بەوەی توند و وشك و رقیان لە خۆیەکلاکردنەوەیە بۆ هەرچی حکومەت هەیە[475]، بە ماوەیەکی دوور و درێژ دوای شەڕ، رژێمی باوکایەتی و ئاغایەتی زاڵ بووە، ئەمەش شوێنەواری گەورەی بەسەر ئیدارەی شێخ مەحمودەوە هەبووە، سەرۆك هۆزەکانی دۆستی شێخ سامان و تالآن و ئیمتیازاتیان دەویست، لە هەمانکاتدا رقیان لە گوێڕایەڵیی بووە بۆ کاربەدەستەکانی شێخ مەحمود، ئاستی وشیاریی سیاسییی و ئەزموونی کۆمەڵایەتیی و سروشتی رابردووی نەریت و ئاستی گەشەکردن، هەموو ئەم دیاردانە دەوڵەتی شێخ مەحمود و ئاکامەکەیان بەم رۆژە گەیاند[476]. هەروەها جوگرافیای کوردستانیش کاریگەریی هەبووە لەسەر پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی خێڵەکیی و بەرهەڵستی کردنی دەوڵەتی کوردیی و هاوژیانییەتی گەلەکەی، ناوچە کوردیەکان لە چەند زنجیرە چیایەکی رێکوپێك پێکدێت، وای کردووە ئەستەم بێت یەکێتی دانیشتوانەکەی بێتەدی، ئەمە بۆتە هۆی پێکهێنانی

---

[474] Jwaideh, pt,2, p.502-505.

[475]Willson, Loyalties, 11, p.127

[476] Iraq From 1900-1950, p.104.

چەند هۆزێکی پەرت و بڵاو، دانیشتوانی هەر بەشێکی ناوچە شاخاویەکان بازرگانیی و مامەڵەیان لە ناوچە دەشتاییەکانی باشوور و ڕۆژئاوا لەگەڵ دراوسێ ناحەزەکانە، کە زۆربەیان کورد نین[477].

کۆسپی سەرەکیی لەبەردەم گەشەی حکومەتەکەی ساڵی (1918)، دەسەڵاتی ئاغا بووە، عەقید (نولدێر) یاریدەری ئەفسەری سیاسیی بەریتانیی (Colonel Nolder) لە ئامێدی گوتبووی: مەسەلەی ئاغا لەگەڵ ئێمە و هەموو حکومەتێکی دی جیاوازە، ئەمە بە دەرەبەگایەتی چاخەکانی ناوەڕاست دەچێت، هەندێ چەکداری هەیە و جوتیارەکانی پێدەترسێنێت[478]. بە هەر شێوەیەک حکومەت دابمەزرێت کاریگەریی خراپی دەبێت بۆ سەر ئاغا، لە بنەڕەتدا حکومەت لای ئەوان یانی یاسا و دەسەڵاتدارێتی، ئەمەش یانی زوڵم و ستەم، واتە کۆیلایەتیی و ملکەچیی، هەر شتێك لە کۆمەڵگا هەڕەشە لە سەرەڕۆیی ئەوان بکات دژی دەوەستن، سەرۆك هۆزەکان بە مەبەستی دژایەتیی رژێم و یاسا پشتگیریی کوردستانێکی سەربەخۆ دەکەن لە ناوچەکە، سەربەخۆیی لای ئاغاکانی کورد رزگاربوونە لە کۆت و زنجیری یاسا و دەرەفەت رەخساندنە بۆ کاری تاڵانیی و زەوتکردن[479].

لەبەر ئەم هۆیانە لای کاربەدەستانی بەریتانیی ئاغا و شێخەکان بەرپرسیارن لە بزواندنی بەرهەڵستی خێڵەکیی دژ بە بەریتانیا لە ناوچەکە، بەریتانییەکان گومانیان بووە لە ئاکامی چاوچنۆکیی خۆیان و دەیانەوێ نەفامیی و سروشتی کوردی بۆ مەبەستی خۆیان بەکاربهێنن[480]، لەو بڕوایەدا بوون کوردێك نابینی پەنجەی بجوڵێنێت بۆ بەرگریی لە ئاکاری ئایینیی و کێشەی نەتەوایەتیی، تاکی کوردیی پابەند نین بە ئایینەوە، بەڵام سروشتی سادەیی و ئەفسانەدۆستیی وای کردووە بە چاك، یان بە خراپ لە ژێر کاریگەریی شێخەکان دابن[481]، دەربازبوون لە دەسەڵات و ملکەچ نەبوون بۆ

---

477 N. Spence, pp. 123-124.

478 - Wilson, Loyalties, 11,p.153

479 - Bell, Review of Civil Administration,p.63; Noel Diary 11, 148-149.

480-Lees,p.254 .

481- FO. 371/5068, (A note on Rawanduz) by Hay 26.1919.

هێزی دەرەکیی لە خاسیەتی زۆربەی کوردانە، ئەمە وایکردووە بەرهەڵستی هەوڵەکانی بەریتانیا بن لە دامەزراندنی یاساو رژێم لە ناوچەکە، نەبوونی کاریگەریی هەستی نەتەوایەتیی پتەو لە ناو کورد لە بەرانبەر بەریتانییەکان وای لە کاربەدەستانی بەریتانیی کرد لە نووسینگەی کۆمیساری باڵا لە ئەستەنبوڵ و بەغدا بڕوا بهێنن هەستی نەتەوایەتیی کورد لاوازە، لۆید جۆرجی سەرۆك وەزیرانی بەریتانی لەساڵی (1920) دەڵێ: هەوڵەکانمان بۆ توێژینەوە لە هەستی نەتەوایەتیی کوردی لە ئەسەتەنبوڵ و بەغدا بەدیار دەکەوێ مەحاڵە کوردێك ببینی، کە زۆربەی کورد پشتگیریی لێبکەن[482]. چەندین بەیاننامە لە نووسینگەی کۆمیساری باڵا لە قوستەنتینییە (ئەستەنبوڵ) هەیە، کە تێیدا هاتووە، یەکدەنگیی هەمەلایەنەی پتەو لای کورد نابینرێت[483].

بەرپرسانی بەریتانیی لە عێراق سووربوون لەسەر ئەوەی کورد پێویستی بە هەستی نەتەوایەتییە، هەر ئەوەش بووە هۆی نوشوستی هێنانی شێخ مەحمود لە بەگەڕخستنی کورد لە دەوری خۆیدا، ئەو بانگەشەی هەستی نەتەوایەتیی دەکرد، کە ئەو هەستە نە لای سەرکردە تەقلیدییەکان و نە لای زۆربەی خەڵکیی، کە نەخوێندەوار بوون دەست نەدەکەوت[484].

لۆرد کێرزۆن لە نیسانی (1920) ئامادەیی حکومەتەکەی نیشاندا بۆ چاوپێکەوتنی نوێنەری کورد، هەتا گوێ لە بۆچوونەکانیان بگرێ لەسەر پێکهێنانی حوکمی زاتیی، لەو بارەیەوە فەرمانی ئاراستەی ئەستەنبوڵ و بەغدا کرد، بەڵام وەڵامێکی گەرموگوڕی دەست نەکەوت، نوێنەری باڵا لە ئەستەنبوڵ وەڵامی دابۆوە، کە کوردێکی دەست ناکەوێ لەو ڕێگەیەوە بەریتانییەکان حکومەت بۆ کوردستان رێکبخەن، هەروەها

482 FO, 371/5069,.Memorandum From I.O. to, No, 1124, 22,2,1921. Harold Nicolson, Curzon: The Las phase 1922-1925 (New Yoyrk: Hascount Comp. 1939, p.3299: Halmerich, pp.301, 2. in 1915 Sir Mark Sykes, (Cab 27/206 (British Desiderata in Turkey in Asia June 30th 1915 , Note by Leut, of Colonel Sir M. Sykes, pp.100-101⁄

483 - FO. 371/5068 ,(Turkey) Teleg, From Admiral De Rob bock to. FO. No, 302, 3-29-1920.

484- Less, p.254, - Wilson, Loyalties 11,p.133.

نوێنەری باڵا، وەزارەتی دەرەوەی ئاگادارکردبۆوە، کە کوردێکی بەتوانای دەست ناکەوێ بەراستی نوێنەری هەموو کوردستان بێت[485].

هۆکاری کەوتنی ئیدارەی شێخ مەحمودیش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی یەکیەتی راستەقینە لە نێوان سەرکردە تەقلیدییەکانی کورد، لە ڕاستیدا کورد بەسەر ئەو سەرکردە کوردانەدا دابەش بوو بوو، کە شاخەکان لێکی جیاکردبوونەوە، بەمەش هیوای شێخ مەحمود لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی ببووە نیمچە مەحاڵ، مەولانا موحەممەد ئەفەندیی هەولێری دەڵێ: بە هۆی ناکۆکیی و دووبەرەکیی نێوان سەرۆکەکانی کوردستان ناتوانرێ کورد و کوردستان بکرێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ، هەریەك لەوان نایەوێ ملکەچی ئەوی تر بێت[486].

(ویگرام) وێنەیەکی روونی کێشیاوە لەسەر رێڕەوەی رووداوەکان و کورد، بەراوردی کردووە لەگەڵ دانیشتوانی ناوچە باڵاکانی سکۆتلەندە، کە لە هەردووکیاندا هیچ کەس لە سەرۆکەکان ناتوانێت ئەوانی تر ملکەچ پێبکات، بەڵکو هەموویان دەیانەوێت ملکەچی دەسەڵاتی دەرەکیی بن[487].

لەو ماوە کورتەی ئیدارەی شێخ مەحمود، لە مایسی (1919) ناکۆکیی کەوتە ناو کوردەکانی باشووری کوردستان، گەورەترین هۆزی ناوچەی سلێمانی دەسەڵاتی شێخیان نەدەویست، سەرۆك هۆزە تەقلیدیەکانی بەرزنجەی لەگەڵ بەریتانییەکان رێککەوتن، بۆ ئەوەی پەشێوی بخەنە دەسەڵاتی شێخ مەحمود، لە ناوچەکانی کەرکووك و کفریش هەندێك هەبوون لە ژێر کاریگەریی شێخەکانی تاڵەبانیدا بوون، کە سەرسەختترین دوژمنی بەرزنجیەکان بوون و ئەوانیش فەرمانڕەوایەتی شێخیان نەدەویست[488].

---

[485]FO. 371/5067 Inter- Departmental Conference on Middle Eastern Affairs, Minutes, 13-14, 1920, p.3.

[486]Air 20/512 (Note) Prepared by Nasir Effendi, Dragoman to Major Noet, 5-8-1919.

[487] Wilson, Loyalties 11, p.133, Hay, Two Years, p.174.

[488]FO,37/5069 (Administrative Report of Kirkuk Division) for Period January lst 1919 to December 13th 1919,p.4-5.

له ڕانییه و قەڵادزێ هۆزی پشدەر بە سەرۆکایەتی بابەکرئاغا لە ماوەی شۆڕشی مایس نەچوونە ژێر ئیدارەی شێخ مەحمود و بابەکرئاغاش لە دژی شێخ پشتگیریی بەریتانییەکانی کردووە، لە ناوچەی هەولێریش هۆزی دزەیی بێجگە لە دەسەڵاتی سەرۆکەکانی خۆیان، دانیان نەناوە بە هیچ دەسەڵاتێکی تر و مامەڵەی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ کاربەدەستە بەریتانییەکان پێ باشتر بوو لە هی شێخ مەحمود[489].

لە کۆیە هۆزەکەی حەماغای غەفوری پشتگیریی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆ بووە و بە توندی دژی هەوڵەکانی لکاندنی کۆیە بوون بە فەرمانڕەوایەتیەکەی شێخ مەحمود[490]، هەتا لە شاری سلێمانی کێبەڕکێ هەبووە لەسەر دەسەڵات و پێگە لە بەرانبەر شێخ، ڕووناکبیرانی کورد (نوخبەی نەتەوەخواز) لە سلێمانی لەگەڵ خەڵکی بازاڕ هاوپەیمانییەتیان پێکهێنابوو، ئەوەی جێی سەرنجە هەردوو گروپ بۆ لاوازکردنی دەسەڵاتی شێخ مەحمود پشتیان بە هەوڵەکانی بەریتانیا بەستبوو[491]، هەروەها شێخ ئەحمەدی بارزانییش هاوکاری شێخ مەحمودی نەدەکرد، بە ڕای شێخ مەحمود، شێخ ئەحمەد بەکرێگیراوی بەریتانیا بووە[492].

## نەبوونی سیاسەتێکی ڕوونی بەریتانیی

نەبوونی سیاسەتێکی ڕوونی بەریتانیی لە ساڵانی (1918- 1920) ببووە هۆی پیادەکردنی سیاسەتێکی تێکگیراو و ئاڵۆز و دژ بەیەك، دەستەوستان لە بەرانبەر سیاسەتێکی ڕوون، کە هەڵقوڵاوی سروشتی کێشەی ئاڵۆزکاوی کورد بێت، دەتوانین

[489] - Hay, Two Years, p.141

[490] 5069⁄37،- A.G, Renate A.P.O (Administrative Report on Koi Sanjaq for the years 1919) 15-1-1920 pp.19-30, Hay, Two Years, p.160-161 .

[491]-کەمال نوری مەعروف: (شێخ مەحمودی نەمر خەباتی دژی ئینگلیز) پێشکەوتن. کانوونی دووەمی 1980 ژمارە (41)، حیلمی: ب1، ل72-73.

[492]FO,37/5069 Teleg, From , From Admiral De Rob bock (HC in Const) to FO, No, 401-403, 3-5-1920, Air 20/517 Memo ; GHQ (Baghdad) ,16-6-1919, Air 20/513 (Northern Kurdistan) Repot 18-2-1920, pp.1-2, FO.. 371/5069 ,(Turkey) annual report 1920, p.4243,. FO, 371/5068 left From CC Baghdad to FO, 32-3-1920 FO, 608/97 Sharif Pasha A Note by Toynbee 1-1-1920, FO, 371/5061 Inter- Departmental Conference 13-5-1920 Minutes p.3.

بلّێین، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ نائارامیی بارودۆخی عێراق و ئێران و تورکیا، دوایی رای جیاواز هەبووە لەسەر مەسەلەی عێراق و دیارییکردنی دەسەڵات لە نێوان وەزارەتی دەرەوە و وەزارەتی داگیرگەکان و وەزارەتی جەنگ و وەزارەتی هیند، هەروەها رای جیاواز هەبووە لە ناو نوسینگە و ئیدارەی بەریتانیی لە عێراق، سەرەڕای ئەوە لە نێوان کاربەدەستە بەریتانییەکانی ناو نووسینگەی کۆمیساری باڵا لە عێراق.

لە لێدوانێکی هـ. أ. سێکیش (سەرۆك وەزیرانی بەریتانی کاتی شەڕ)دا هاتووە: (کورد یەکێکە لەو ئاریشە گەورانەی "رووبەڕووی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیی - هیندیی بۆتەوە)"[493]، بۆنارلۆ (سەرۆك وەزیران)یش لە ئازاری (1920) هەمان تێبینی کردووە و دەڵێ: (مەسەلەی کورد یەکێکە لەو مەسەلانەی لە کاتی وتووێژەکانی پاریس بۆ ئاشتیی، سەرنجی هاوپەیمانەکانی راکێشاوە)، ئەم کێشەیە چەند لایەنەیە و کاریگەریی بەسەر هەموو سیاسەتی بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەبووە، بەتایبەتی پەیوەندییەکانی حکومەتی بەریتانیی لەگەڵ تورکیا و ئەرمینیا و عێراقی عەرەبیی[494]. ئەوەی ئەم کێشەی زیاتر هەستیار و ئاڵۆز کردووە نەبوونی شارەزایی پێویست بووە، سکاڵای سەرەکیی کاربەدەستانی بەریتانی لە ساڵی (1919) لە ئەستەنبوڵ و سوریا و عێراق ئەوە بووە، ئەو زانیاریانەی لەبەردەستدان بەشی ئەوە ناکەن سیاسەتێکی روونی لەسەر بنیات بنرێت لە کوردستان، ئەوەی کارەکەی قورس کردووە بۆ وەزارەتی دەرەوە لەسەر قسەکانی کاربەدەستانی بەریتانی لە ناوچەکە، نەبوونی شارەزایی تەواوە، کە کوردەکان چییان دەوێ؟، "مرۆڤ گوێ لەهەر گروپێك بگرێ بە ئاشکرا، یان بە نیوە ئاشکرا دەزانێت، کە بانگەشەی هیواو ئاواتی خۆیان دەکەن"[495]. نەبوونی سیاسەتی روونی بەریتانیی دەگەڕێتەوە بۆ ناڕۆشنی سیاسەتی ئەوان لەسەر کۆی بارودۆخی عێراق، ئەرنۆڵد ویڵسن لە هەوڵی ئەوەدا بووە سیاسەتێکی بەریتانی دابڕێژێ لە دواییدا ببێتە هۆی بەهێزکردنی دەسەڵاتی بەریتانیی لە عێراق و پێیوابووە لە کۆتاییدا عێراق دەچێتە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیی - هیندیی.

---

[493] - کەمال مەزهەر: ل173.

[494]--FO, 371/5062 Parliamentary Debate Turkey

[495] -- FO. 371/512 Teleg From GHQ, to CC No C2735, 3-7-1919

شوێنی عێراقیەکان راوێژکاریە لە ڕێگەی دامەزراندنی شارەوانیی و ئەنجومەنی پارێزگاکان، کاربەدەستانی بەریتانیی لە وەزارەتی دەرەوە و خاتوو (بێڵ) سکرتێری رۆژهەڵات لە نووسینگەی کۆمیساری باڵا لە عێراق ئەم بۆچوونەی رەتکردەوە، لە کاتێکدا ئەوانە کەمکردنەوەی دەسەڵاتی راستەوخۆیان لە عێراق پێ باش بووە و دەیانویست دەوڵەتی عێراق بە سەرۆکایەتی یەکێك لە کوڕەکانی شەریف حوسەینی نەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) خزمەتکاری خاکی حیجازی پیرۆز بێت، کەواتە ئەوانە لەسەر سیاسەتێکی روون لە عێراق رێکنەدەکەوتن، بەڵام هەتا هەڵگەڕانەوەی ئابی (1920) دژی دەسەڵاتی بەریتانی دەستی پێکرد، ویڵسن بۆ خۆی بەردەوام بوو لەسەر جێبەجێکردنی سیاسەتی هیندیی لە عێراق،[496]، کیرزۆن لە لێدوانێکیدا باس لەو لێڵییەی سیاسەتی بەریتانیی کردووە و دەڵێ: لەو کاتەی بۆ یەکەم جار هێزەکانمان نارد بۆ بەسرا، مەبەستمان نەبووە هەتا هەتایە دەست بەسەر دۆڵی رافیدیندا بگرین، بەڵام وردە وردە چووینە بەغدا و ئەو ناوچە شاخاویانەی دەکەونە نێوان بەغدا و موسڵ و سنووری ئێرانیی[497].

دواکەوتنی پەیماننامەی ئاشتیی نێوان تورکیا و هاوپەیمانەکان، هەڵوێستی لەمەڕ موسڵ لە بیر خۆی بردەوە، ئەمە کاریگەریی راستەوخۆی هەبووە لەسەر کێشەی کورد،

---

[496] 5069/371- Teleg From CC to I.O No 4416, 17-7-1920 for a detailed discussion on British Policy in Mesopotamia during the year 1918-1920 See Ireland pp.109-112, Niama pp.25-27 Sluglett pp.35-38.

[497] -FO, 371/5067 Departmental Conference on Middle Eastern Affairs, Minutes, 13-14, 1920, p.3.

--85Wilson, Loyalties, 11,p.124.

هۆی دواکەوتنی واژۆکردنی رێکەوتننامەی ئاشتیی لە پاریس دەگەڕێتەوە بۆ ساردیی و هەستکردن بە دڵگرانیی، کە باڵی کێشابوو بەسەر وتووێژەکانی ئەنگلۆ ـ فەرەنسیی، بانگەشەی فەرەنسیی و عەرەبی لە سوریا لە توندترین بابەتەکانی ئەو کاتەی وتووێژەکان بووە، هەر زوو گەیشتنە چارەسەر و سەرەنجی وتووێژەکان بۆ لای تر کێش کرا، کە پەیوەست بوو بە رێکەوتننامەی ئاشتیی لەگەڵ سوریا بە شێوەیەکی ئاسان، هەروەها هۆکارێکی تری دواکەوتنی وتووێژەکانی پاریس دوودڵیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بووە، لە ئارەزووی بە ئەستۆوەگرتنی بەرپرسیاریەتی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ. بڕوانە:

Halmviech pp “ 328 “ 328-29 Temporally p “ 28

له لایەك دوودڵیی لای كورد درووستكرد و له لایەكی ترەوە كۆسب بووە بۆ هەوڵەكانی بەریتانیی له دانانی سیاسەتێكی روون بۆ كوردان، كاربەدەستانی بەریتانیی له وتووێژ لەگەڵ كورد بەم لێڵیە هێشتەوە و دووری خستەوە له هەر بەڵێنێك شوێنەوار لەسەر بڕیاری كۆتایی لەمەڕ ولایەتی موسڵ، هەروەها كاریگەریی هەبووە له سیاسەتێك، كه بەریتانیا بخاتە ئیلتیزامەوە لەگەڵ ئەو سەرۆكە كوردانەی داوای كوردستانێكی سەربەخۆ دەكەن، هەر بۆیە داوایان له كاربەدەستانی بەریتانیی كردبوو وریابن لەگەڵ كورد[498]، لەو هەڵوێستە نادرووستەدا كاربەدەستانی بەریتانیی پەنایان دەبردە بەر سیاسەتی كاتیی له دابینكردنی فەرمانڕەوایەتی ناوچەكەدا، بۆیە كۆنفیدراڵیەتەكەی شێخ مەحمود له تشرینی دووەمی (1918) چارەسەركردنی كاتیی بووە، بەریتانییەكان خۆیان لەم راستیە نەدەشاردەوە، لونگریك حاكمی سیاسیی له كفری دەڵێ: كێشەی كوردستانی باشوور هەر ئەوەیە رژێمێك هەبێت له گەڕەلاوژەیی باشترە[499]. له تشرینی دووەمی (1918) ویڵسن ئەمەی بۆ نۆیل روونكردەوە: "ئەگەری ئەوە له ئارادا نییە هێزی هەتا هەتایی بۆ سلێمانی بنێرین، دەبێت له لای سەرۆكەكان ئەوە روون بێت ئەو رێوشوێنانەی بە باشی دەزانن پێوستە كاتیی بن)[500].

ئەوەی سەرەوە بەڵگەیە لەسەر مامەڵەی نێوان بەریتانیاو شێخ مەحمود، كه لەسەر بنەمای سەربازیی بنیاتنراوە، ئەدمۆنسی حاكمی سیاسیی لەو رۆژانەدا ئەو هەڵوێستەی باس كردووە و دەڵێ: (حوكمی خۆیەتی له ژێر فەرماندەی شێخ مەحمود لایەنی سەربازییە بەسەر حكومەتی شانشینی بەریتانیدا سەپاوە، نەك لایەنی سیاسیی)[501]، بەڵام درایڤەر ژەنەراڵی بەریتانی له باشووری كوردستان دەڵێ: (بوونی شێخ مەحمود تا ئەو ئەندازەیە گرنگە، كه ناتوانین پشتگوێی بخەین)[502].

---

[498]-BDFP, Ist. Ser Vol, 1V Letter From Mohler to J. Telly Constantinople, July 2ist 1919, p.695, Teleg From Admirals Calthrope (Constantinople) to earl of kurzon 10-7-1919, No 1437, p.679.

[499]-Iraq From 1900-1950, p.103 .

[500] - Bell, Review of Civil Administration,p.59-60

[501] -Kurds, Turks, And Arabs, p.59

[502] - Driver (Kurdish Question),p.109.

له سالانی (1918ـ 1919) حکومەتی بەریتانی لە ژێر فشاری ناوخۆییدا بووە بۆ کەمکردنەوەی بەرپرسیاریەتی داگیرگەکانی، کەواتە حکومەتی بەریتانیی لەسەری بوو پێگەی شێخ مەحمود بەکار بهێنێت بۆ رزگاربوونی بەریتانیا لەو ئەرکە سەربازییە قورسەی لەو باردۆخە ناوخۆیی و هەرێمیی و نێودەوڵەتییە ناسکەدا تووشی هاتبوو، خاتوو (بێل) جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە و دەڵێ: (یارمەتیی سەربازیی شێخ مەحمود نەبێت ناچار دەبین هێزی سەربازیی بهێنین، ئەمەش ئاسان نییە، شێخ لە لایەنی سیاسییەوە بەبێ ئەوەی هێز بەکاربهێنین زۆر گرنگە بۆ پاریزگاریی ئاسایشی ناوچەکە)[503].

ڕووداوەکانی مایسی (1918) بۆ (1920) ئەوەی بەدیارخستووە، کە سیاسەتی بەریتانیی لە کوردستان لەسەر بنەڕەتی ئەزموونییە و پشتی بە چەمکی هەڵە و ڕاست بەستووە، بەڵام بە زوویی ئەو ئەزموونەی شێخ مەحمود لە مایسی (1919) کۆتاییهات و بەریتانییەکان پەیوەندییان کرد بە سەید تەهای نەهری نەوەی شێخ عوبیدوڵڵای نەهری، داوایان لێکردبوو شاری ڕەواندوز، کە پێگەی خۆیەتی ببێتە مەڵبەندی ئەو کۆنفیدراڵیەتە، ئەرکی سەید تەها هەمان ئەو ئەرکەی شێخ مەحمود بووە لە دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتیەکی خۆیی، کە ملکەچی کۆمیسیاری باڵای بەریتانیی بێت لە بەغدا، بەڵام سەید تەها هەستی کرد حکومەتی بەریتانیی دەیەوێت سوود لە پێگەکەی وەربگرێ بۆ هێمنکردنەوەی کوردەکانی باشوور و چارەنووسی لە شێخ مەحمود باشتر نابێت، بۆیە وازی لە پلە و پایە هێنا[504]، لە دواییدا بەریتانییەکان سەرکەوتوو نەبوون لە دابینکردنی سەرۆکێکی کوردیی، کە بتوانێ لە جێبەجێکردنی دەسەڵاتی ناڕاستەوخۆ ڕۆڵی شێخ مەحمود بگێڕێ. لە ساڵی (1919) و (1920)یش هەوڵی ڕێکخستنی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆیاندا بۆ باشووری کوردستان، ئەمەش کارەساتی لێکەوتەوە، لە ئاکامدا چەندین شۆڕش و ڕاپەڕین سەری هەڵدا، هەر بۆیە کۆمیسیاری باڵای بەریتانیی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی بۆ کوردستانی باشوور بە بێئاکام زانی و فەرمانی دا بە حەمدی بەگی بابان "یەکێك بووە لە بنەماڵەی میرانی بابانی نیشتەجێی بەغدا" حوکمی زاتی لە

---

503 - Review of Civil Administration, p.63.

504 - Hawrami, pt.11,p.46, Hay, Two Years, pp.353-35446حیلمی: ب1، ل.

کوردستانی باشوور دابمەزرێنێ، حەمدی بەگی بابان لەسەر ئەرك و خەرجیی حکومەتی بەریتانیی گەشتی بۆ ناوچەکە کرد، هات پشتگیریی سەرۆکەکان بەدەستبهێنێ.

تۆفیق وەهبی "دۆستی حکومەتی بەریتانیی یەکێك بوو لە ڕووناکبیرانی نەتەوایەتیی ئەو کات" ڕای سپارد (کۆمەڵەی سەربەخۆی کورد) دابمەزرێنێ، مەبەستیش لە دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە مسۆگەر کردنی پشتگیریی کورد بووە بۆ حەمدی بەگی بابان، بۆ بەڕێوەبردن لەسەر بنەڕەتی پاشایەتیی، بەڵام هەر زوو حەمدی بەگ دوودڵیی خۆی لەو کارە دەربڕی، ئەمەش بە هۆی ئەو کۆسپ و ئاڵۆزییانەی کە هەڕەشەی لە سەرخستنی کارەکەی دەکرد، لە دوایی ڕای وابوو ئەم کارە دەبێت چاودێریی بەریتانیی زۆر کەم بەسەرەوە بێت هەتا کورد پێی قبوڵ بکرێ، ئەو کاربەدەستانەی بەریتانیی کە ئەو ئەرکەیان لە ناوچەکەدا لە ئەستۆ گرتبوو ڕایانگەیاند، کە ئەو میرە بابانییە بە کەڵکی ئەو کارە نایەت، لە مێژە لە ناوچەکە دوورکەوتۆتەوە و ناتوانێ لە بارودۆخی سیاسیی ناوچەکە بە ڕوونی تێبگات، لە ئاکامدا بەردەوام بوون لە حوکمی ڕاستەوخۆ و حەمدی بەگیان وەلانا[505].

پێکهێنانی (کۆمەڵەی سەربەخۆی کورد) یەکەم کاری ڕێکخراوەیی بوو، کە ئینگلیز وەکو بیرۆکە پاڵپشتی کێشەی نەتەوایەتیی کوردی پێبکات لە باشووری کوردستاندا، ناڕۆشنیی لە دابەشکردنی بەرپرسیارێتی لە سیاسەتی وەزارەتی جەنگ ببووە هۆی ناڕۆشنیی لە سیاسەتی بەریتانیی، ڕای زۆر جیا هەبووە لە نێوان کاربەدەستانی بەریتانی لە لەندەن و عێراق. (سێر ویڵسن)ی کۆمیسیاری باڵا پێی وابووە سیاسەتی کورد ناگونجێ لەگەڵ بۆچوونەکانی حکومەتی بەریتانیی وەکو دەوڵەت، لە ساڵانی (1918) بۆ (1920)، وەزارەتی دەرەوە ڕای وابوو لە سلێمانی بکشێنەوە، ویڵسن لە (1919) گەیشتە ئەوەی ویلایەتێکی عەرەبیی لە موسڵ هاوسنووری دەوڵەتە حوکمی زاتیەکەی کورد درووست بکرێ لە ژێر سەرۆکایەتی ئەو کوردانەی لە ژێر فەرمانی کاربەدەستانی سیاسیی بەریتانیدان،[506] بەڵام وەزارەتی هیند پشتگیریی ڕای ویڵسنی

[505] - FO, 371/5069 Letter From APO Koi to CC, Air 20/573, (Memo) by Hamdi Beg to Lieutenant Colonel Sir Arnold T Wilson Baghdad 6-8-1920, Hawramani, P.11, p.100

[506]-Air 20/5013 Teleg from poll Baghdad to SS for India No 9267 30-10-1918 Edmonds p.303 Wilson Loyalties 11, p.123 .

کرد بەوەی هێزەکانی بەریتانی لەویٚ پێویستە بۆ پارێزگاریی لە ئاشتیی و ئارامیی ناوچەکە، هەر بۆیە هەتا ئابی (1919) وەزارەتی هیند پاڵپشتی کۆمیسیاری باڵای عێراق بوو لە خۆبواردن لە پیادەکردنی سیاسەتی وەزارەتی دەرەوە بەرامبەر کورد[507].

ڕاپەڕینی شێخ مەحمود لە ساڵی (1919)و جیهادی ناوچەی بادینان دژی هێزەکانی بەریتانی، هەڵوێستی وەزارەتی هیندی - بەریتانی گۆڕی بەرامبەر کورد، لە ئابی (1919) ویلسۆن وەڵامی نامەیەکی خۆی لە وەزارەتی بەریتانیی بۆ کاروباری هیندی پێگەیشت، لە بابەت راکێشانی هێڵی ئاسنی بەریتانیی لە بەغدا بۆ کەرکووك، تێیدا هاتبوو: (لە رابردوو حکومەت رازی بوو لەسەر فراوانکردنی دەسەڵاتی بەریتانی لە کوردستان، چونکە لەو باوەڕەدا بووە خەڵکەکەی ڕازین بەر لەو پێشنیازە بۆ دەوڵەتی خودموختار بە سەرۆکایەتی کوردان کۆمەڵەیەك درووست بکەن، کە لە (9)ی ئازاردا هاتووە، بەڵام ئێستا وەکو بەدیار دەکەویٚ خەڵکەکەی بە دەسەڵاتی بەریتانیی ڕازی نین، هێڵی ئاسنیش بۆتە هۆیەکی پێویست بۆ سەپاندنی ئیدارەی ئینگلیز، لەم بارودۆخە باش نەبوو کاربەدەستە سیاسییی و هاوپەیمانەکانمان بکێشنەوە و کورد بۆ خۆیان بەجێبهێڵێن)[508]. وا دیارە وەزارەتی دەرەوە و وەزارەتی هیندیی ڕازی بووبن لەسەر بیرۆکەی پاشەکشە لە کوردستانی باشوور، بەڵام (ویڵسون) دەیووت: بەجێهێشتنی کوردستان ئاکامی خراپی دەبێت بۆ سەر سیاسەتی گشتیی بەریتانیی لە عێراق و ئێران. پێیوابووە لیوای سلێمانی لە ڕووی جوگرافیی و ستراتیژییەوە بەشێکە لە خاکی عێراق، نەك بەشێك بێت لە کوردستان، هەروەها وتبووی: ئاشتیی لە ناوچە سنوورییەکان کەمە و ئەگەر حکومەتی بەریتانیی نەگاتە ئیدارەی ناوچە سنوورییەکانی کورد، ئەوا حکومەتی ئێرانی بە تەنیا دەتوانیٚ ئاسایشی سنوورەکەی خۆی بپارێزیٚ، هەروەها وتبووی: ئەگەر کورد بۆ خۆیان واز لێبهێنن لە ئاییندەدا بەردەوام دەبنە مەترسیی بۆ سەر عێراقی عەرەبی، ئەوەش مانای پەیدابوونی کۆمەڵێك شەڕی خێڵایەتیی و ڕاکێشانی بەریتانیایە بۆ ناردنی هێزێکی زۆرە بۆ دەستبەسەراگرتنی ناوچەکە[509].

---

507 -FO 371/5069 , Teleg SS for India to CC 23-3-1920 (Kurdistan) India Office Recommendations Memo No p.7701 20-12-1919.

508 – Wilson Loyalties, 11, p.142

509 Ibid, p.143

له ماوەی ئابی (1919) بۆ نیسانی (1920) هەردوو وەزارەتی هیندیی و دەرەوەی بەریتانیی چەندین پرسیاریان بۆ کۆمیسیاری بالاّ له بەغدا ناردو داوایان لێکردبوو بۆ پاشەکشە له کوردستان و پێشکەشکردنی یارمەتی ماددیی و مەعنەوی بۆ کورد له پێناو پێکهێنانی حکومەتی تایبەت به خۆیان، (وێڵسن)یش به کارامەیی خۆی توانیبووی له جێبەجێکردنی ئەو فەرمانه خۆی بدزێتەوه[510]. له ئازاری (1920) سکرتێری دەوڵەتی هیند تەلەگرافیکی بۆ بەغدا ناردووه و دەڵێ: (حکومەتی بەریتانیی پشتگیریی سیاسەتی کشانەوەی تەواو دەکات له کوردستان و لەو بارەیەوه رای (وێڵسن)ی دەوێ، ئەویش زۆر به وریایی ولاّمی دانەوه، که لەسەر ئاکامی ئەو سیاسەته وەلاّمی ئەو نامەیه دەداتەوه، ئەگەر حکومەتی بەریتانیی جێبەجێی بکات، داوای کردبوو پەله نەکرێ له دەرکردنی بڕیار هەتا بتوانرێ ئەنجامه خراپەکانی ئەو سیاسەته له باریەك ببرێ، هەروەها داوای کردبوو چاو بەو سیاسەتەدا بخشێنێتەوه هەتا گیروگرفتی ریسوایی درووست نەکات و ببێته هۆی زنجیرەیەك کارەساتی وا ئیگلیز ناچار بکات، نەك تەنیا له ویلایەتی موسڵ، بەڵکو له عێراقیش دەربکرێ، بەلاّم (ئارپر هیرتزل)ی وەزیری دەوڵەت بۆ کاروباری هیند له وەلاّمی (ویلسن)دا دەڵێ: (له سەرت پێویسته ئەوه تێبگەی حکومەت هەڕەشه قبوڵ ناکات و له هەڵوێستت تێدەگەم، به هەڵەدا دەچی ئەگەر رای حکومەت وەرنەگری لەسەر کوردستان و حکومەت کوردستان ناهێنیته ناو ئینتیدابی خۆی)[511]. ئەم جیاوازیی بۆچوونه له نێوان سیاسەتمەدارانی ئینگلیز بەرامبەر کوردستان لەو کۆبوونەوەی له لەندەن گیرا، له ڕۆژی (20)ی نیسانی (1920) زیاتر بەدیار دەکەوێ، ژەنەراڵ (برادکلین) له وەزارەتی جەنگ پێیوابووه دەبێت سیاسەتێکی ڕۆشن له کوردستان بگیرێته بەر، که لەگەڵ رای (ویڵسۆن) ڕێکبکەوێت، ئەو سیستمێکی ئاسمانیی پێشنیاز کرد، که ڕێگه بدات به هێزی ئاسمانیی بەشداریی پاراستنی ئارامیی ناوچەکه بکات، لایەنگرانی سیستمی ئاسمانی له توندترین پشتیوانانی دەسەلاّتی راستەوخۆ بوون، پشتگیریی دامەزراندنی (عێراقی مەزن = دۆڵی ڕافیدەین و کوردستان)یان دەکرد، سیستمی ئاسمانیی (هەوایی)یان به پێویست زانی

[510] FO 371/5067, Teleg from CC, to I..O. No 1558 Baghdad 4-2-1920
[511] - Quoted in Marlow, p.175.

بوو، كه به ئاسانیی دەست بەسەر كوردستاندا دەگرێ و ئەرك و خەرجیی كەمە، ئەمە لە جیاتی هێشتنەوەی هێزە لە ناوچەكە، دەتوانرێ بەهێزی ئاسمانی چارەسەری هەڵگەڕانەوەی گوندو شارەكان زۆر بەئاسان تر بكرێت لەوەی بە هێزی وشكانیی، وا چاوەڕوان دەكرا بە چەسپاندنی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆ و بە زەبری هێز سیستمی ئاسمانیی كێشەی كورد بەرەو چارەسەر بەرێت[512]، كه لە ڕاستیدا سەركەوتنی سیستمی هێزی ئاسمانیی لەكوردستان ئاكامی دووری دەبێت.

وا چاوەڕان دەكرا سیستمی ئاسمانیی لە عێراق و لە كوردستان ببێتە نموونەی سیاسەتی پادشایەتی بەریتانیای گەورە لە هەموو شوێنە داگیركراوەكان، لە دەوڵەتە عەرەبیەكان و دونیای سێیەم، ئەمەش سەرەڕای لاوازبوونی لە هەندێ شوێنی دونیا، بەریتانیای وا لێكرد سیاسەتی بەهێز بێت لە هەندێ لە ناوچەكان، كوردستانیش یەكەم ئەزموونی سیاسەتی دوای شەڕ بووە[513] لۆرد كیرزون بەرهەڵستی سیستمی ئاسمانیی بووە لەسەر ئەو بنەڕەتەی كە كاربەدەستانی ئینگلیز بێ ئەزموون دەبن و ناتوانن لە چۆنییەتی مامەڵە لەگەڵ هۆزەكان تێبگەن، مەبەستی ئەوە بووە سیستمی ئاسمانیی بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ داگیركردنی هەمیشەیی باشووری كوردستانە، كە (لورد لیزۆن) بەرهەڵستیی كردووە لەسەر ئەو بنەمایەی بەڵێنی بە وەزیری دەرەوەی فەڕەنسی (فلیب ببر شولیت)دا بوو، بەریتانیا بەم نزیكانە و لە كاتی كۆبونەوەكان لە كوردستان دەكشێتەوە.

هەردوو وەزارەتی هیند و دەرەوە رەزامەندی خۆیان دەربڕی لەسەر پێكهێنانی كوردستانی سەربەخۆ، بەڵام (ویڵسون) هەڵوێستەكەی رابردووی چەند بارە دەكردەوە، كە نموونەی ئەو سیاسەتە لە ئاییندە ئاكامی خراپی دەبێت بۆ سەر سیاسەتی بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. لە كۆتایی رای (ویڵسون) كاری پێكراو كۆبوونەوە گەیشتە ئەم بڕیارانەی خوارەوە: (بەریتانیا لە باشووری كوردستان وەكو بەشێك لە عێراق دەهێڵێتەوە و توركیا دەبێتە باكووری كوردستان)[514]، ویڵسون لە بابەتی ئەو

---

512 - Olson. Pp. 55-56, F,O. 371/5067, Inter-Departmental Conference on Middle Eastern Affairs, Minutes, 13-14, 1920, p.1-2.

513 - Olson. P.57

514 -Inter-Departmental Conference 13-3-11920, Minutes, 3-4, 8-10, Longing, Iraq from 1900-1950, p.107

بڕیارانەوە لە (20) مایسی (1920) نامەیەکی نووسیووە: (سەبارەت بە کوردستان لۆرد لیرزۆن بڕوای بە خۆ بەدەستەوەدان هەیە، ئەوەمان بە دەستهێنا کە چاوەڕوانمان دەکرد، من دڵخۆشم و پێم خوش نییە گوێم لێ بێت، کە حکومەت سیاسەتێك پیادە بکات من بەرهەڵستیی بکەم، بەڵام لە لایەن نووسینگەی وەزارەتی دەرەوە ناچارکرام، پێموایە دەستبەسەراگرتنی یەك نووسینگەی بەریتانیی بەسەر سیاسەتی عێراق، کارەساتە)[515].

لە نیسانی (1920) (وێڵسن) داوای لە مێجەرسۆن کرد بە سیستمێکی ئیداریی وەکو ئەوەی لە ناوچەکانی تری عێراق پەیڕەو دەکرێت، حوکمی کوردستانی باشوور بکات[516].

جیاوازیی هەبووە لە نێوان بەریتانییەکان لە عێراق لەسەر ئەو سیاسەتەی کە پێویستە بگیرێتەبەر بەرامبەر کورد، (وێڵسن) بەرپرسیار بوو لە سیاسەتی عێراق، بەڵام پشتگیریی دەوڵەتی کوردی نەدەکرد، کەچی (نوێڵ) کە بەرپرسیار بوو لە سیاسەتی بەریتانیی لە کوردستان لە (1918 - 1919) پشتگیریی پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی دەکرد لە باشووری کوردستان و ئەو ناوچانەی کوردی لێ نیشتەجێن لەژێر دەسەڵاتی تورکیا و ئێراندا[517]، کاکڵەی گرنگیپێدانی (وێڵسن) پاراستنی ناوچە سنوورییەکانی عێراق بووە، بەڵام ئەمەش بە ڕای ئەو لە ئاییندە دابین نابێ بەبێ گرێدانی هەموو باشووری کوردستان بە دەوڵەتی عێراق، کە لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیادایە، (وێڵسن) ڕای وابووە ئەو کاتە بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کوردیی دەبێتە بازنەیەکی بۆش، کە ئامانجەکانی بێ پشتگیریی بەریتانیای بێت، هەروەها (وێڵسن) لەو بڕوایەدا بووە لە ئاییندەدا کوردەکانی باشوور دەچینە پاڵ تورکەکان بۆ دەرپەڕاندنی بەریتانیا لە عێراق، لە دواییدا ئەرمینیای هاوپەیمانی بەریتانیا داوای هەمان ناوچە دەکەن، هەردووکیان داواکاری کوردستان دەبن[518].

---

515 -Quoted in Marlow, p.179.

516 - Inter-Departmental Conference (Minutes) April. 13.1920, FO, 371/4161 From CC to SS1 26th April 1920.

517 -Edward William C. Noet had Diary Major Noel on Special Duty from June 14th to September 21st, 1919, (see Olson, pp.194-195.

518 - Hawrami, (Sheikh Mohamed and the Kurdish question) pt,1, p.61.

(نوێڵ) لەو بڕوایەدا بوو، کە کورد چوار سەدەیە لە لایەن تورکانەوە دەچەوسێنرێنەوە، ئەوانە لە تورکیا شایستەی سەربەخۆیین، وای دەبینیٚ دەوڵەتی کوردی تورکیا بیٚ هێز دەکات و بەمەش تورکیا وای لێدێت نەتوانیٚ ریٚ لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئەرمەنیی بگرێت، سەرەڕای ئەمە کورد لەسەر بنەماکانی (ولسن)ی سەرۆکی ئەمەریکا داوای مافی خۆیان دەکەن، کە هەموو گەلان بۆیان هەیە داوای مافی چارەنووس بکەن، ئەوانەی دەرفەتیان نەبووە سەربەخۆیی وەربگرن، لەو پێناوەدا (نوێڵ) پێی وابووە مادام بەریتانیا هێزێکی شارستانییە و دۆستە و نمایندەی ئەو ژیارەیە، لەسەریەتی یارمەتیی کورد بدات لە بەدەستهێنانی ئەو خۆزگەیە[519].

حکومەتی بەریتانی لە ساڵی (1919) لە نێوان بۆچوونەکانی نوێڵ و وێڵسن تووشی دەستەوستانی ببوون لە بەرامبەر دابینکردنی سیاسەتێکی ڕوون و ئاشکرا، بەڵام ڕاپەڕینەکانی (1920) حکومەتی بەریتانی هێنایە سەر ئەو باوەڕەی کە کوردستانەکەی نوێڵ خەیاڵییە و عێراقەکەی (وێڵسن) واقیعی و جێی بایەخپێدانە، عەقڵ نایگریٚ حکومەتی بەریتانی لە ئایندە ئارامیی و ئاسایشی عێراق بخاتە بەردەم هەڕەشەوە لەسەر قسەی نوێڵ، کوردستانە سەربەخۆکەی ئەو چەندین ئەگەر و پرسیاری بەدوادا دەهات، بڕوای شەخسی کاربەدەستانی ئینگلیز لە عێراق ڕۆڵی گرنگی هەبووە لە پیادەکردنی نەخشەی سیاسییی بەرامبەر کوردستان[520].

وێڵسن بۆ بەدیهێنانی ئارەزووی پێکهێنانی عێراقی گەورە کاری دەکرد، (نوێڵ)یش بۆ کوردستانی گەورە، کۆمیسیاری باڵا سکاڵا لە لای نوسینگەی هیند لە (نوێڵ) کردبوو، کە بە کێشەی کوردەوە پابەندە و مەیلدارە بە لای سیاسەتێکی دیارییکراو، کە لەگەڵ سیاسەتی بەریتانی لە عێراق تێکدەگیریٚ[521]. (وێڵسن) تاکە کەس بوو رەخنەی لە پابەندیی (نوێڵ) گرتبیٚ لەسەر کێشەی کورد. (ئەدمۆنس)یش لەو بارەیەوە رەخنەی

---

519 – Noel Diary, p.1,Bell, Review of Civil Administration, p.71,Air, 20/513, noel Malaria to political Baghdad, und (Northern Kurdistan), by, G.L. 18-2-192024، تەقی: ل

520 -L.P, S/10/781 from A.T. Wilson Teleg to Hertezel 27th November 1919, Cab.23/20, (Cabinet-Meeting) March 23rd 1920.

521 -FO, 371/5068, letter from CC to FO, 19-5-1920

توند لە (نوێل) دەگرێ، ئەو لە لێدوانێکیدا دەڵێ: دەرفەتی سەرهەڵدانی جیاوازیی جەوهەریی نییە لە ئەو بۆچوونانە و بۆچوونی نوێل لەسەر سیاسەتی ئەوان بەرامبەر کوردستان، چونکە نوێڵ بە پێی مشتومڕ و لە ڕوانگەی کوڕانی سلێمانییەوە سەیری مەسەلەکەی کردووە[522]، عەقید لیجمان حاکمی سیاسیی لە موسڵ ڕایگەیاند کە نوێڵ هاوسۆزە لەگەڵ کورد لەسەر حیسابی جالیاتی مەسیحی لە ویلایەتی موسڵ. (م. موهلێر)ی کاربەدەستی سیاسیی بەریتانیی لە ئەستەمبوڵ و کاربەدەستانی تریش لەو بڕوایەدا بوون، نوێڵ وەکو (لۆرانس)ی کاتی شەڕی یەکەمی جیهانیی کردووە، کە هەوڵی دەستکەوتێکی دەدا بۆ عەرەب، ئەویش لە هەوڵی بەدەستهێنانی دەسکەوتێکدا بووە بۆ کورد[523].

لە ساڵی (1919) لۆرانس بۆ وەزارەتی دەرەوەی نووسی بوو کە بەرهەڵستی هاوسۆزیەکەی نوێڵ دەکات لەگەڵ ئەو کوردانەی هەستی نەتەوایەتییان نییە، لۆرانس پێیوابوو پشتگیریی نوێل بۆ کورد باش نییە و دەبێتە هۆی بزواندنی عەرەب بۆ هاوپەیمانییەتی لەگەڵ هێزە کەمالیەکانی تورکیا لە دژی بەریتانیا[524].

ئەم بۆچوونە جیایانە لە سیاسەتی بەریتانیی بەرامبەر کورد لە نێوان نوێڵ و وێڵسن هاوکاریی کوردیان نەکردووە لە سیاسەتی ئینگلیز تێبگات و هەنگاوی دژ بە یەك لە ناوچەکە بهاوێ، لە لایەکەوە (نوێڵ) شێخ مەحمودی وەکو سەرۆکی کوردستانی سەربەخۆ سەیر کردووە، لە لایەکی ترەوە (وێڵسن) هەروەکو نوێنەری خۆی لە سلێمانی مامەڵەی لەگەڵ کردووە، بە هیچ جۆرێ هاندەری نەتەوایەتی کوردی، یان جیاخوازیی نەبوو، کێشەکە لەو کاتە دەستی پێکردووە، شێخ مەحمود کراوە بە"حوکمدار"، نوێڵ کوردەکانی هانداوە ئاهەنگێکی جوان، کە شایستەی لە دایکبوونی دەوڵەتێکی نەتەوەیی بێت بگێڕن، ئەمە لە کاتێکدا پایەی "حوکمدار" بە مانای حاکم دەهات و شێخ مەحمود وەکو موتەسەریفی حکومەت دانرابوو[525]، شێخ بە هاوکاریی نوێڵ هەوڵی فراوانکردنی

---

[522] - Kurds, Turks, And Arabs, p.303

[523] Br.Doc, vol, IV, 1919-1939. letter from political Mosul to Noel Bawanuz Teleg, No 178 11$^{th}$ June.1919.

[524] FO 371/4159 from H.C De Robeck Cons teleg, to FO, 7$^{th}$ Sept 1919, FO, 371/6469 (Turkey) Annual Report No 428, 27-4-1921.

[525] Hawrami, pt.1. p.61

بازنەی دەسەڵاتی خۆی دەدا بۆ قەزایەکانی خوارووی کوردستان، بەڵام کاربەدەستانی تری بەریتانیی بە فەرمانی (وێڵسن) لە موسڵ و کەرکووك و ڕانییە و ڕەواندوز کۆسپیان دەخستە بەردەم هەوڵەکانی[526]. دانانی مێجەرسۆن لە ئازاری (1919) بەو دەسەڵاتە فراوانەی و کەمکردنەوەی پێگەی شێخ مەحمود لێڵییەکی زۆری لە ناوچەکە درووستکرد. حکومەتی بەریتانیش ئامادە نەبوو ئەم سیاسەتە بۆ کورد روون بکاتەوە[527]. گفتوگۆی دواتری نێوان گرین هاوسی جێگری میجەرسۆن لە سلێمانی و عەباسی مەحمود ئاغای سەرۆکی هۆزی پشدەری لایەنگری شێخ مەحمود کورتەیەکمان لەو لێڵیە دەداتێ، کە ئەوکات تووشی سەرۆکە کوردەکان ببوو، گرین هاوس لە عەباس ئاغا دەپرسێ، کە بۆچی هاتۆتە سلێمانی، وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: (سەیرە ئێوە لەو چەند مانگەی پێشوو داواتان لە ئێمە کرد بێین بۆ ئێرە و لەگەڵ شێخ مەحمود کار بکەین، ئێستاش پرسیارم لێدەکەی بۆچی لە سلێمانیم، گومان دەبەم ئێمە گەمەی بەردەستی ئێوە بین)[528].

کاربەدەستانی بەریتانیی ئاگاداربوون، کە ڕێڕوونییەك نییە لە سیاسەتی ئەوان بەرامبەر کورد، هەورامی دەڵێ: (ئەو گێروگرفتەی ئێستا ڕووبەڕووی کوردان بۆتەوە، لەبەر ئەوەیە بەریتانیا ناتوانێ سیاسەتێکی جێگیر لە ویلایەتی موسڵ بگرێتەبەر، لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی پیادەکردنی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆ، لە لایەکی ترەوە نایەوێ لەگەڵ کورد رێکبکەوێ، لە نەخشەیەکدا کوردستانی سەربەخۆی لێ بکەوێتەوە)[529].

خاتوو بیل رای وابووە: (کێشەی ڕاستەقینەی ئێمە ئەوەیە ناتوانین بزانین چیمان دەوێ و بە تەواوی چی دەکەین لە عێراق، ئایا دەتوانین لەگەڵ خەڵك بین؟ ئەگەر لەگەڵیان نەبووین ئامادەین لە بەرامبەریان بوەسن؟ چاوەڕوانکراوە کورد لەو هەڵوێستە دوودڵ بن، ئێمە زۆر پێویستمانە بڕوایان پێبکەین بەرژەوەندیی هەردوولامان پێکەوەیە[530]، وێڵسن لە یاداشتەکانیدا دەڵێ: (بە نەرمیی مامەڵە لەگەڵ شێخ مەحمود

---

[526]-ئەحمەد تەقی: ل24-25.

[527] After, p.11, Hawrami, pt,1,p.61.110-109ل: شەمزینی.

[528] - ئەحمەد تەقی: ل37-38.

[529]- Hawrami. pt,2, p.61.

[530]- Bur gone, Jady Bell 1914-1920, 11,p.43.

کرا چونکە لە کاتی شۆرشی ئازاری (1919) بە خراپی مامەڵەی لەگەڵ دیلەکانی ئینگلیز نەکردبوو، سیاسەتی بەریتانیش لە ویلایەتی موسڵ، کە ناکۆکیی لە سەرە و کێشەیەکی ئاڵۆزە نەبۆتە بیانوو بۆ لە سێدارەدانی سەرۆکێکی کورد)[531].

حکومەتی شێخ مەحمود، کە وەزارەتی هیند پێکی هێنابوو بۆ ئیدارەی باشووری کوردستان خێڵەکیی بووە، هەمووی دەچووە خانەی سیاسەتیی کاتیی لە دابینکردنی ئاشتیی و یاسا بۆ خێڵە کوردەکان، ئەمەش لەژێر کاریگەریی ئەزموونی سیاسەتی بەریتانیدا بووە لە هیند، ئەم سیاسەتەش نوسشتی هێنا لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا بە هۆی لێکتێنەگەیشتنی نێوان شێخ مەحمود، کە بۆ سەرخستنی ئەو سیاسەتە پشتی پێدەبەسترا، لەگەڵ بەریتانییەکان، هەروەها کۆمەڵێك هۆکاری تر بوونە هۆی کەوتنی حکومەتەکەی شێخ مەحمود لەوانە: لێڵیی سیاسەتی بەریتانیی بەرامبەر کورد، نەبوونی هەستی نەتەوایەتی ئەو کاتە لە لای کورد، ڕکابەری گەورەی نێوان سەرۆکە کوردەکان، رووخانی ڕژێمی خێڵەکیی و ئەو شەڕەی بە دوای خۆیدا هێنای لە کوردستان، کە پشتگیریی بوو بۆ هەڵوێستی ئەو بەریتانیانەی کە دەسەڵاتی راستەوخۆیان پێ پەسەند بوو لە عێراق و کوردستان.

---

[531] Wilson Loyalties, 11, p.145،

لە دوای هەرەسهێنانی کارگێڕییە خێڵەکییەکەی شێخ مەحمود و نوشووستی حکومەتی بەریتانی لە دابینکردنی سەرکردەیەکی بڕواپێکراو، کە هاوکاری بێت لە دابینکردنی دەسەڵاتی ناڕاستەخۆ لە کوردستان، حکومەتی بەریتانیی لە عێراق پەنای بردە بەر دەسەڵاتی راستەخۆ، هەر لە دوای ڕۆیشتنی مێجەر نوێل، لە مایسی (1919) مێجەر سۆن لەسلێمانیو ئەدمۆنس لەکەرکووکو نەقیب های لەهەولێرو کۆلۆنێل لیجمان لەموسڵو ئەفسەرە سیاسییەکان هەموویان لە هەوڵی راگەیاندنی بانگەوازی دەسەڵاتی راستەوخۆدا بوون، زیندووکردنەوەی دەسەڵاتی راستەوخۆی ناوەند لە دوای چەند دەستکارییەك هەمان نموونەی سەردەمی ئیتحادیەکانی تورکیا بووە.

مێجەرسۆن رەخنەگرێکی زمان درێژ بووە لە بەرانبەر حکومەتی شێخ مەحمود، سیاسەتی ئەوی بە دواکەوتوو داناوە، کە رژێمی خێڵەکیی و گەڕەلاوژە و ئازادی لە سنوور دەرچوو بەرهەم دێنێ، دەرفەتی خۆسەپاندنی دەداتە کوردەکان، بە گشتیی ئاکامی پێچەوانەی پرۆسەی دیموکراتیی دێنێتە دی[532]. هەروەها (های) سەرنجی دابوو کە راگرتنی کوردستان بەبێ هێز مەحاڵە، بۆیە بانگەوازی دەسەڵاتی راستەوخۆی بە رێگەچارە دانابوو بۆ فەرمانڕەوایەتی کوردستان، تێبینییەکی تر کە لە (سۆن)ەوە دەستی پێکرد و بیرۆکەیەمان دەداتێ لەسەر ئەخلاقیەتی زۆربەی کاربەدەستانی بەریتانی لە ناوچەکە دەڵێ: (لەسەرمان پێویستە ئەگەر ویستمان حوکمی هەولێر بکەین بە تەنیا بە ئەوەندە لێنەگەڕێن، بەڵکو دەبێت حوکمی رەواندزیش بکەین، سەیری کورد دەکەم ئەو بڕوایەم لادرووست دەبێت کە نەویستوویانە و نەشایستەن بە حوکمی زاتیی، لە ڕەواندز پێیانوتم، ئەگەر حکومەت نەبێت دەبنە بەرخی بێ شوان، ئەوە بە تەنیا لەسەر شارەکان جێبەجێ نابێت، بەڵکو بۆ گوندەکانیش وایە، بازرگان و جوتیارەکان لە ئاغاکان دەترسن و ئەوانە هەریەك لە ئەوەی تر دەترسێت، پێویستە لەم کاتەدا هێزی دەرەکیی هەبێت بۆ پاراستن، کورد وەکو قوتابی دەبێ هەندێ جار رەق بێتو هەندێ جاری تر شەکری نیشان بدەیت، لەبەر ئەوە رەقیی زیاد لە پێویست، یان نەرمیی زیاد لە پێویست، قوتابی لە مامەڵەدا ناهاوسەنگ دەکات، لەو کاتەی دار بە دەستی سەرپەرشتیارەکەیەوە دەبینێت بە ئەدەب دەبێت)[533].

[532]- Soane Administrative Report on Sulaymania Division p.32.

[533]- FO. 371/5081,W.R.Hay,(Note on Rawanduz),27-12-1919, p.4.

بەریتانییەکان بە دەستکارییەکی کەمەوە ئەو دابەشکردنە کارگێڕییەی عوسمانییەکانیان لە دەسەڵاتی راستەوخۆدا پاراستبوو، ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لە هەرێمەکان رۆڵی موتەسەریفی عوسمانیی دەبینی، ئەفسەری سیاسیی کاری دادوەریی دەکرد، بۆیە پایەی موتەسەڕیف و دادوەر لانەبرابوون، لە دوای ئەو رێوشوێنانە کوردستان وەکو ویلایەتێك نەمایەوە، ناوچەکە بۆ چەند بەشێك دابەشکرا، کە حاکمی سیاسیی بەڕێوەی دەبرد، ناوچەکە بۆ چەند یەکەی بچووکتر، کە بە قایمقام سپێردرابوو لەگەڵ بیست و چوار سوارە و بەڕێوەبەرێکی دارایی، هەموو قەزایەك دابەشکرابوو لە ژێر فەرمانی راسپێردراوی دارایی، وا دانرابوو بەڕێوەبەری ناحیە بەرپرس بووە لە دارایی ناحیە بەرانبەر قەزا، لە هەموو ناحیەیەك بەڕێوەبەر و نووسەر (کاتب)و ژمارەیەك سوارە هەبوو، هەموو ناحیەیەك لەژێر فەرمانی موختار دابەش کرابوو بۆ چەند بەڕێوەبەرایەتییەکی گوند، موختار چارەسەری ناکۆکییەکانی دەکرد و یاریدەدەری بەرپرسی دارایی بوو لە دیارییکردنی داهاتی کشتوکاڵ، موختار داهاتی کشتوکاڵی کۆدەکردەوە لەگەڵ رێژەیەکی سەدیی لە کەلوپەلی بازرگانی و سێ لە سەدای داهاتی کشتوکاڵی زستانە[534].

جیاوازییەك نەبووە لە ڕژێمی باجی بەریتانی لەگەڵ رژێمی باجی ئیتحادیەکان، لە دوا ڕۆژانی تورك رژێمی ئیلتیزام کاری پێدەکرا لە کۆکردنەوەی باج، ئەو کات باج دەخرایە زیادکردنی ئاشکراوە، هەتا زۆرترین ئەندازە (قازانج) مسۆگەر بکات، هەندێ تایبەتمەندیی کەم هەبوو بۆ ئەو پابەندیانەی لە خستنەڕووی ساڵانی ئاییندە کاریان دەکرد لەکۆکردنەوەی باجی گوندە بچوکەکان. لە سەرەتاوە بەریتانییەکان سیاسەتی رژێمی باجی راستەوخۆیان جێبەجێ دەکرد، بەڵام بە هۆی کەمیی فەرمانبەر گەڕانەوە بۆ ئیلتیزام، کە ئەمیشیان بۆ جێبەجێ نەکرا بەرهەمی دیارییکراویان بۆ هەر گوندێك دادەنا و راستەوخۆ کۆیان دەکردەوە، ئەو باجەی لە سەردەمی ئیتحادیەکان سەپێنرابوو بەسەر مەڕوماڵات پێی دەوترا (کۆدا)، ئەمەیان وەکو خۆی هێشتەوە، کە بۆ هەر سەر مەڕێك (2/91) قورش بووە، بەڵام ئەندازەیەکی دیارییکراو دەدرا بە راسپێردراوی دارایی، کە باجی کۆدای کۆ دەکردەوە[535].

---

534 - Office of Civil Commissioner, Administrative Report on Iraq 1920,p.48.

535 -Soane Administrative Report on Sulaymania Division,p.5.

ئەو ماوەیە یاساکانی تایبەت بە باج قورس بووە، دوایی کوردستان کەمێك ئاسایی بۆوە، رژێمێکی فراوانیان بۆ باج بەکار دەهێنا، لە هەموو بەرهەمهێنراوەکان (10٪) لەسەر داهاتە زستانییەکانی ئەو زەویانە دانرا بوو کە بەدەستی خەڵکەوە بوون، ئەگەر ئەو زەوییانە حکومەت ئاوی بۆ دابینبکردایە زیادەی باجی 10٪ی تری دەخرایە سەر.

لە زەوییە حکومیەکان بە دوو جۆر باج کۆ دەکرایەوە، یان وا دانرابوو حکومەت خاوەنی ئەو زەوییانەیە، یان حکومەت بەشدارە لە داهات، ئەو کات باج لەگەڵ داهاتە کشتوکاڵییەکان دەگۆڕا، بە جۆرێ لە دێمیی دەیەك وەدەگیرا، ئەگەر حکومەت خاوەنی ئامرازەکانی ئاودێریی ببووایە سێیەك، یان نیوە وەردەگیرا[536]. حکومەت لە کۆکردنەوەی باج زۆر توندبوو، لە دوای کەوتنی شێخ مەحمود باجی تازەشیان هێنایە گۆڕێ، بۆ نموونە جووتیارەکان (15) ئەوەندەی سەردەمی ئیتیحادیە تورکەکانیان باجیان دەدا، گومانی تیا نییە کورد ئەوەی پێ ناخۆش بووە، ئینگلیز حیسابی بۆ ئەوە نەکردووە، کە دە ساڵ دەبوو ناوچەکە بە برسێتی تاڵ و کاولکاریی و وێرانەییدا تێپەڕیوە.

سیاسەتی پشتیوانیی لە سەرکردە کوردەکان کە لە سەردەمی شێخ مەحمود باو بووە، هەڵوەشێندرایەوە، حکومەتی بەریتانیی فەرمانی بە هۆزەکانی جاف و پشدەریشی کرد کە گوێڕایەڵیی سەرۆکەکەمان نەبن، ئەم سیاسەتە لە لایەن ئەفسەرە سیاسییە بەریتانییەکانەوە بووە بۆ ئەوەی راستەوخۆ پەیوەندیی بە گوندنشینەکانەوە بکەن، بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتی سەرۆکەکانی کورد راستەوخۆ کۆکردنەوەی باجی لێ قەدەغەکردن و لە رێگەی فەرمانبەرە کرێگرتەکانەوە ئەو باجەی کۆ دەکردەوە، بەمەش لاسایی رژێمی تورکی دەکردەوە[537].

حکومەتی بەریتانی هەوڵەکانی خۆی لە دەسەڵاتی راستەوخۆدا بە سەرکەوتوویی دەبینی، بەتایبەتی ماوەی دەسەڵاتی مێجەر سۆن لە سلێمانی لە مایسی (1919) هەتا تشرینی یەکەمی (1920)، حاکمی سیاسیی لە نیسانی (1920) بۆ وەزارەتی دەرەوەی نووسیوە و دەڵێ: (هیچ ناوچەیەك لە عێراق نابینی کە نیزام سەرۆکاری بێت

[536] - Soane Ibid, p.14، پێشکەوتن، ژمارە (192) حوزەیرانی 1920

[537] - Soane Sulaymania Division. P.5

و به تەواوی ملکەچی دەسەڵاتی بەریتانی بووبێت، وەکو سلێمانی)، هەروەها ئەوەی حاکمی سیاسیی تێبینی کردووە چاندنی گەنم و جۆ لەگەڵ پێوانەی داچێنراوی توتن سێ ئەوەندە زیاد بووە[538]، (وێڵسن)یش سەرنجی داوە سلێمانی لە ماوەی کورتی دەسەڵاتی شێخ مەحمود ئاژاوەی تێدابوو، ئێستاش وای لێهاتوە نیزام جێگیر بووە، بۆ دڵنیایی، سۆن توانی (20000) جونەیهی ئیستەرلینی بۆ میزانییەی ساڵانەی سلێمانی کۆ بکاتەوە[539]، دواتر حاکمی سیاسیی راپۆرتێکی بۆ وەزیری داگیرگەکان لە هیند ناردووە بەوەی هەڵگەڕانەوەی گشتیی لە عێراق کاری لە ڕێڕەوی کاروباری سلێمانی نەکردووە و سلێمانی بە هێمنترین ناوچەی عێراق دادەنرێت، وڵسن ئەو رایەی سۆنی دووبارە دەکردەوە کە دەڵێ: 99٪ کورد لە کوردستانی عێراق نایانەوێ دەسەڵاتی راستەوخۆی بەریتانی بگۆڕێ[540].

سەرەڕای بەرهەڵستیی سۆن لە دەمارگیریی سەربەخۆخوازی شێخ مەحمود، دەیویست پشتگیریی ئەندازەیەك هەستی نەتەوایەتیی کوردیی بکات لە چوارچێوەی عێراق بە ئاشتیی بژی، لەو هەوڵانەش تۆفیق وەهبی و رەفیق حیلمی و جەمال عیرفان و شێخ نوری ئەوانی تر هاوکاری بوون، سۆن خۆی بەشداریی کردووە لە نووسین و دەرکردنی (پێشکەوتن)، کە بە یەکەم بڵاوکراوەی دەوری کوردی دەژمێردرێت لە سلێمانی، بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی بیری نەتەوەیی سۆن دەیویست کۆمەڵێك لە دانیشتوانی گوندە خێڵەکییەکان بگۆڕێ بۆ کۆمەڵی نەتەوەیی، کە خاوەنی رژێمی سیاسیی بن و لاسایی ورد و درشتی رۆژئاوا بکەنەوە[541].

ویڵسن لەو بوارەدا پشتگیریی سۆنی نەکردووە و بەرهەڵستیی چاودێریی و پەرەپێدانی بیرۆکەی نەتەوایەتیی کوردی بووە، هەروەها حاکمی سیاسیی بیرۆکەی سۆنی رەتکردەوە لە پاراستنی بارودۆخی تایبەت بە ناوچە کوردییەکان و هەوڵی دەدا

---

538 -. FO,371/4151 Teleg from Civil Commissioner Baghdad, April 1920

539 - Wilson, Loyalties, 11,p.143.

540 -Cab 24/111 Teleg from CC, to Sec of for India, No C-P,1857, 7-9-1920

د.کمال مظهر: کردستان فی...ل115. کەمال نووری مەعروف: شێخ مەحمودی نەمر، خەباتی دژی ئینگلیز، ل2. پێشکەوتن، ژ(14) ، Hamilton, Road, p.202.

541 - Less, Two Years in Kurdistan).p.269

کوردستان بە عێراق ببەستێتەوە، ئەمەش بە دانانی کاربەدەستی عەرەب لە ناوچەکەدا، بۆیە سۆن دەستی لە کار کێشایەوەو بڕیاریدا واز لە بەرپرسیاریەتی لە سلێمانی بهێنێت. لیس– LESS لەسەر ئەوە دەڵێ: دەست لە کار کێشانەوەی سۆن بۆ بەرهەڵستیی ئەو سیاسەتەیە کە بیرسی کۆکسی کۆمیساری یەکەمی باڵا لەسەری دەڕۆیشت، سۆن پێیوابووە هەوڵەکانی کۆکس بە گرێدانی کوردستان بە عێراقەوە دژی خەباتی ئەو بووە، وای دانابوو ئەمە زیان بە بەرژەوەندییەکانی کورد دەگەیەنێت[542].

سەرەڕای ناکۆکیی نێوان سۆن و کاربەدەستانی تر، حکومەتی بەریتانیی بە هۆی کارەکانی رابردوویەوە رێزی لێدەگرت، ئەوان کارەکانی (سۆن) وەکو کارەکانی لۆرانسی ناو عەرەبان سەیر کردووە[543]. لەگەڵ ئەوەدا یەکێك لە شوێنەوارەکانی دەسەڵاتی راستەوخۆی بەریتانی چاندنی تۆوی نەتەوایەتی کوردی بووە لە ناوچەکەدا، کە ئەم بیرۆکەیە بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانیی بە تەنیا لە ناو توێژێکی تایبەتی دەرەوەی کوردستان هەبووە.

هەندێك لە رووناکبیرانی کورد بە تێڕوانینی جیاوە دەیانڕوانییە کارەکانی سۆن لە باشووری کوردستان، زۆربەی کورد لەو باوەڕەدا بوون بە توندیی بەرهەڵستیی دەسەڵاتی راستەوخۆ بکەن، سۆن زیادەڕۆیی کردووە لە بەکارهێنانی هێز بۆ زاڵبوون بەسەر ناوچە کوردیەکان، ژمارەیەك لە شێخ و پیاوە ناودارەکانی دوورخستەوە و دەستی بەسەر سەروەت و سامانیان داگرت و هەموو بەرهەڵستیەکی لە سلێمانی رەتکردەوە[544].

---

[542] - - Main, p.51

[543] - ئەحمەد تەقی: ل42-44. حیلمی: ب1، ل36-37، لەگەڵ ئەوەدا (سۆن) گۆچانی هەڵنەدەگرت، بەڵام شێوازی بێڕێزیی لەگەڵ کورد و بە تایبەتی سەرکردەکانیان دەکرد، مامەڵەی ڕەقی لەگەڵ دانیشتوان هەمان شێوازی بەرپرسە ئینگلیزەکان بووە لەگەڵ عێراقیەکان. (سۆن) خۆی وا ناساندووە کە فەرماندەی ڕۆژهەڵاتە و خاوەن هێزی ڕاستەوخۆیە، پێویستە لە شوێنێکی بەرز بێت، داوای لە کوردان دەکرد لەبەری هەستن، چاودێرە تایبەتییەکانی لەو کەسانەیان دەدا، کە ئەو فەرمانەیان جێبەجێ نەدەکرد. بڕوانە:-حیلمی: ل136-137، هاوار: کوێرەوەریی: ل56.

[544] .-Less, Two Loyalties Years in Kurdistan).p.269

(لیس)ی هاورێی پێیوابوو سۆن بە دەستێکی دیکتاتۆریانە حوکمی کوردستانی کردووە، سۆنیش پێی وابووە دیکتاتۆریەت شەرێکە و دەبێ هەبێت[545].

سەرەڕای سروشتی خێڵەکیی کۆمەڵگای کوردستان وا بە ئاسانی بەپیر هێزە دەرەکیەکانەوە نەچوون، کە دەیانویست بەسەر کۆمەڵگای کوردستانییدا زاڵ بن، دەسەڵاتی ئاغا بە هۆی هێزی دەرەکییەوە جێی مەترسیی بووە، ئەو شێوازەی سۆن پەیڕەوی کردووە فاکتەری گرنگی نیگەرانیی کورد بووە لە دەسەڵاتی راستەوخۆی بەریتانیی.

شێوازی دەسەڵاتی سۆن و سیاسەتی کۆمەڵایەتی و ئابووریی ئەو ماوەی بەریتانیی سەرچاوەی سەرەکیی تووڕەیی کورد بووە لە بەرانبەر دەسەڵاتی راستەوخۆ، سۆن حەزی کردووە تەنگ بە خەڵکیی هەڵچنێت، بۆ نموونە لەو رۆژگارە دەیویست خەڵکیی ناچار بکات باج زیاد بکەن زیاتر لەوەی لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیتحادیەکان هەبوو، هەروەها هەندێك لە گوندەکان ناچارکران باجی دوو ساڵ بدەن، کە هێشتا بەرهەمەکەی پێنەگەیشتبوو، ئەو باجە زیادانە ئاستی بژێوی وڵاتی خراپ کرد، حکومەتی بەریتانی لە سلێمانی لە ساڵی (1919) نزیکەی (302000) رووپیە، کە دەیکردە (250000) هەزار جونەیهی ئیستەرلینی کۆ کردەوە، (630000) رووپیە نەبێت هیچی لەوێ بۆ فێرکردن خەرج نەکردووە، ژمارەی قوتابخانەکان بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانیی چۆن بووە، دوای شەڕ هیچی تری زیاد نەکردووە[546]. ئەوەی جێی سەرسوڕمانە سۆن داهاتە زیادەکەی ناردووە بۆ بەغدا، کە دەگەیشتە (200000) جونەیهی ئیستەرلینی، لەو کاتەی ناوچەکە بە هۆی ئاژاوەی خێڵایەتیەوە بەدەست برسیەتیەوە دەینالاند.

دەتوانین بڵێین گەل و ئاغایەکان پێکەوە دەیانڕوانییە ئاکاری کاربەدەستانی بەریتانیی، ئەو کاربەدەستە بچووکانەش کە لە وەزارەتی داگیرگەکانەوە هاتبوون لە ئاستی پێویستدا نەبوون، لە ئاست هۆزەکان بە خۆیانەوە دەنازی، جولەکە و مەسیحییەکان پیشتر رەعیەتی کوردان بوون، دوایی بوونە راوێژکاری ئەوان و چاویان لە پلەی بەرز بوو، ئەمەش ئاغاکانی تورە کرد.

---

[545] - هاوار: کوێرەوەری، ل، 181 .Madhar Chand, p.180.

[546] - د.کمال مظهر: ل180-181، هاوار: ل65

لە سەرەتاوە حکومەتی بەریتانی هەوڵی داوە مەیلی کوردان ببزوێنێ، پڕوپاگەندەی دەکرد کە هاتووە بۆ پارێزگاری لە ئیسلام، لە بەرانبەر لادانی تورکیی بەرگریی لە ئیسلام دەکات، بەڵام لەو ماوە کورتەدا دەرکەوت ئاگادار نەبوون بە هەستی ئایینیی کورد، لە ساڵی (1919) بە ئاشکرا دەستیان کرد بە فرۆشتنی ئارەق، لە ساڵی (1920) لە هەولێر ماڵێکان بۆ لەشفرۆشیی کردەوە، ئەمەش بەڵگەی تێنەگەیشتوویی کاربەدەستانی بەریتانیا بووە لە ئاست کورد[547]. دیارە بڕیاری یەکلاییکەرەوە بۆ پیادەکردنی دەسەڵاتی راستەوخۆ و باجی زیادە بەو دڵڕەقیە، بەبێ رەچاوکردنی بارودۆخی ناوچەکە، بێئاگایی بەرپرسە بەریتانییەکانە بەرانبەر کورد و نوشوستی سیاسەتی بەریتانییە لە ناوچەکە، ئەم سیاسەتە بووە زەمینەسازیی شۆڕشی لە کوردستان ساز کرد[548].

دەسەڵاتی راستەوخۆ کوردی لە حکومەتی بەریتانی دوورکەوتەوە و شۆڕشی شێخ مەحمود هەڵگیرسا، لە ساڵی (1919) چەندین ئاماژەی سەرەتایی هەبوون بۆ ناڕەزایی، کاربەدەستانی بەریتانیی گومانیان وابووە شێخ مەحمود هۆکاری راپەڕینەکە بووە لە سلێمانی، ئەمەش نیشانەی سەرنەکەوتنی سیاسەتی بەریتانییە لە ناوچەکەدا.

## جیهادی دژ بە ئینگلیز لە بادینان

کوردەکانی موسڵ بە پیر کۆنفیدراڵیەتە خێڵەکییەکەی شێخ مەحمودەوە نەچوون، ئەو دەڤەرە بە زاراوەیەکی جیاواز قسە دەکەن*، دەڤەری بادینان، کە لەژێر دەسەڵاتی ئەفسەرێکی سیاسیی لە موسڵ مایەوە بە ناوی کۆڵۆنێل لیجمان، ئەم لایەنگری دەسەڵاتی راستەوخۆ بووە و نەیویستووە دەسەڵات لە رێگەی سەرۆکە کوردەکانەوە بێت، لیجمان بەرهەڵستیی چالاکییەکانی نۆیلی دەکرد، داوای لێکردووە پەیوەندیی بە سەرۆکە کوردەکانی لیوای سلێمانییەوە نەکات.

---

547 -Ireland, p.118-121

548 Wilson, Loyalties, 11,p.143.

* - پێموایە نووسەر تەنیا بۆ ناسینی دەڤەری موسڵ قسەی لەسەر جیاوازی لەهجە کردووە، ئەگینا جیاوازیی لەهجە هیچ پەیوەندیی بە هۆکاری پشتگیریی نەکردنی شێخ مەحمودەوە نییە. "وەرگێڕ".

کوردەکان لە دەسەڵاتی لێجمان ڕازی نەبوون، لە (6)ی نیسانی (1919) فەرماندە (بێرسن) ئەفسەری سیاسییی لە زاخۆ لە کاتی هاتووچۆی بە ناوچەی گۆیانی سنووری تورکیا دەکوژێ، کاربەدەستانی بەریتانیی لەسەر ئەو کوشتنە ئاغای هۆزی (گۆیان)یان گرت، چونکە دەسەڵاتی بەریتانی نەدەویست و ئامادەبووە بکاتە سەر گوندە مەسیحییەکان[549]. غولامیی پێیوایە، (پیرسن) گوێی نەدابووە بە هەستی ئاغاکان و ویستوویەتی لە ڕێگەی کاربەدەستە کریستان و جولەکەکانەوە دەستبەسەر کورد دابگرێت، کریستانەکان ئەو دەرفەتەیان قۆستۆتەوە و پلەو پایەی بەرزیان وەرگرتبوو[550].

(لە دوای کوشتنی فەرماندە پێرسن، هەراو هۆریا لە زاخۆ پەیدا بوو، هێرش کرایە سەر گوندی کریستانەکان، ئیدارەی بەریتانیی وای دانابوو ئەم شۆڕشە مەترسیی دەبێت بۆ سەر حکومەتی بەریتانیو دەبێت لە ناو ببرێت، لە بێشکەوە پێش ئەوەی گەشە بکات بۆ ناوچەکانی تر)[551].

ئەو کات هێڵی پەیوەندیی پێوەکردن بە ناوچەی (گۆیان) وا ئاسان نەبووە، ئینگلیز نەیتوانی چالاکیە سەربازییەکانی لە ئاستێکی بەرفراوان ئەنجام بدات، لە تۆڵەی ئەو شۆڕشە چەند جار بۆردومانی ناوچەکەی کرد و وازی هێنا)[552]، سەرەڕای ئەوەی شۆڕش سنوردار بوو، کە بە خێرایی سەرکوت کرا، بەڵام دەریخست کورد توانای بەرەنگاری هێزی بەریتانیای هەیە، لە کاتێکدا ئەم شۆڕشە بە هاندانی تورکەکان بووە لە ئەودیو سنوور، کە ئینگلیزەکان کافرن و جیهاد لە دژیان بکرێ.

شۆڕشی (15)ی تەمووزی (1919) لە ناوچەی ئامێدی کە (55) میل لە باکووری ڕۆژهەڵاتی موسڵەوە دوورە، بەرەنگاربوونەوەیەکی تر بووە بەرانبەر دەسەڵاتی بەریتانی لە باشووری کوردستان. ئەمە لە شۆڕشی مایسی سلێمانی گەورەتر بووە، زۆربەی هۆزە

---

549 - Bell, Review of Civil Administration,p.62

Wilson, , 11,p.147, Bell, Review of Civil Administration,p.62

550-Wilson, Loyalties, 11, p.147 -

551-- Air 20/513 (Northern Kurdistan) p.5, Wilson, Loyalties, 11,pp.71-72

552- Air 20/512 (memo) P.O. Mosul to CC Baghdad, No, 575, 2nd Feb, 1919, Ghulami, pp.42-44, Bell Review of civil administration pp.770-710

کوردیەکانی موسڵ بەشدارییان تێدا کردووە و سێ مانگی خایاندووە، هەردوولا زیانی گەورەیان لێکەوتووە، لە نێوان هۆکارەکانی ئەم شۆڕشە و شۆڕشەکانی سلێمانی و زاخۆ خاڵی هاوبەش هەبووە، هەموویان بە هۆی بێزاریی کوردانەوە بووە لە دەسەڵاتی راستەوخۆ، حکومەتی بەریتانی لە حوزەیرانی ئەو ساڵە بڕیاریدا هێزەکانی لە سوارەتووکە بکشێنێتەوە،کە هەژدە میل لە رۆژئاوای ئامێدیەوە دوورە، چونکە بە ئاسانیی پشتیوانییان بۆ نەدەچوو، نەشدەکرا پەیوەندییان پێوە بکرێ، بۆیە هێزێکی کەم بۆ کۆکردنەوەی باج مانەوە لەگەڵ سەرتیپ (ویلی) یاریدەدەری ئەفسەری سیاسییی و عەقید (ماندونێڵ)و چاودێر (تروپ)، سەرتیپ ویلی تازەدامەزراو بوو، وەکو عقید لیچمان شارەزا نەبوو، پشتگیریی دەسەڵاتی راستەوخۆی دەکرد، لەو کاتەی دوو کەس لە پیاوە دیارەکانی ئامێدی بە شەڕ هاتبوون، ویلی بۆ بەدیارخستنی هێز چەکەکانیانی دەستبەسەراگرت و لە بەرانبەر سەلامەتیان پارەی سەندبوو تا لە ئاکارباشیان دڵنیا بێت، بەمەش ئاغاکانی تووڕە کرد[553]، ئەوەی زیاتریش ئاغاکانی تووڕەتر کرد هەوڵەکانی ویلی بوو بۆ هێنانی هێزی پۆلیس (جەندرمە) بۆ گوندەکە، لەگەڵ ئەو شێوازەی حکومەت گرتبوویە بەر لە دابەشکردنی گەنم و پارە بەسەر جوتیارەکاندا، ئەوەیان بە هەڵوێستی حکومەتی بەریتانیی دەزانی، دواتر پەیوەندییکردنی راستەوخۆ بە جوتییارانەوە، کە داشکاندنی شکۆی ئاغاکان بووە.

تووڕەبوونی خەڵکی زیاتر بوو لەو کاتە بڵاوبوو بووەوە کە ویلی ویستوویەتی زەوی لە خەڵك وەربگرێ‌و بیدات بە ئەو پەنابەرە کریستانانەی لە هەکاریەوە هاتوون، بڕوایان وا بووە کاربەدەستانی بەریتانیی کریستانەکانیان خۆشتر دەوێت و گەنم و قەرزیان بەسەردا دابەش دەکەن[554].

کاربەدەستان رایانگەیاند ئەم مەیلدارییە پڕوپاگەندەیە و بنەمایەکی درووستی نییە، تەنیا پڕوپاگەندەی ئاغاو شێخەکانە، بەڵام لە کاتی دەستبەکاربوونی باجگرەکان لە ناوچە شاخاویەکان بەرهەڵستکاریی بەهیزتر بوو، کاربەدەستان رایانگەیاند کە شێخ و ئاغاکان لە ئاکامی دەسەڵاتی راستەوخۆ و لە بەرژەوەندیی خۆیان دەترسن، بۆیە

---

[553] -- Air 20/513 (Northern Kurdistan),p.5, Wilson, Loyalties,11,pp.71-72

[554] - غولامیی: ل43-46

دەستیان کردووە بە ناوزڕاندنی بەریتانیا[555]. ئەوە بوو لە ئامێدی ئاغاکان بڕیاریاندا شەڕ دژی دەسەڵاتداریەتی بەریتانیی رابگەیەنن، وەفدیان ناردە بامەڕنی کە چەند میلێك لە ئامێدیەوە دوورە بۆ فەتوای شێخ بەهائەدینی گەورەترین کەسایەتی ئایینی ناوچەکە بۆ راگەیاندنی جیهاد لە دژی حکومەتی بەریتانی، شێخیش پشتگیریی کرد لە ڕاپەڕین دژی ئینگلیز.

عەقید لیجمان درکی بەوە کردبوو، بۆیە پیاوماقوڵانی ناوچەی ئامێدی بانگ کردە موسڵ و لای خۆی هێشتنییەوە، لە ئاکامی مەترسیداری راپەڕین ئاگاداری کردنەوە، بەڵام ئاغا و پیاوماقوڵان لە بڕیاری خۆیان پەشیمان نەبوونەوە، لە ئێوارەی (14)ی تەمووز کۆبوونەوە و رێککەوتن لەسەر راگەیاندنی جیهاد، راپەڕیوەکان لە ئامێدی گەمارۆی بارەگای سەرتیپ (ویلی)یاندا، لە دوای شەڕێکی سووك (ویلیو ماکدوالو تروپ)یان کوشت، هێزی باجگرەکانیش دایانە پاڵ راپەڕیوەکان، گوندە مەسیحیەکان و هێزەکانی بەریتانی بوونە ئامانجی شۆڕشگێڕان، ئامێدی بە درێژایی نیوەی دووەمی تەمووزو هەموو مانگی ئاب لە باری بەرەنگارییدا مایەوە.

لە (3)ی ئاب لیجمان بە سەرۆکایەتی هێزێکی سەربازیی چووە بامەڕنی و دەوری شاری گرت، تەکیەکەی مەڵبەندی ئایینی شێخ بەهائەدینی سووتاند، سوکایەتیان بە شێخ کرد و لە موسڵ زیندانیی کرد، بۆیە هەموو کورد ورووژاو داوایان لە هەموو سەرۆك هۆزەکان کرد پشتگیریی لەو جیهادە بکەن[556].

لە دوای شۆڕش زنجیرەیەك پێکدادان لە نێوان کورد و سوپای هیندیی ـ بەریتانیی لە ئامێدی روویدا، ئینگلیز زیانی بەرچاوی پێکەوت، لە هەزاران کوژراو و بریندار، زیانی کوردەکانیش لەوە کەمتر نەبوو، لە ئەنجامی ئەو زیانانە ئینگلیز ناچار بوو هێزی زیاتر بنێرێتە ناوچەکە، هێزەکانی بەریتانی دەستیان کرد بە تۆپبارانی گوندەکانو ئاغاکانو خەڵکی ئامێدی ناچار بوون گوندە سوتاوەکانیان بەجێبهێڵن و روو بکەنە چیاکانی دەورووبەری شار[557].

---

[555] - غوڵامیی: ل5052، 55-56

[556] - F.O, 371/6359 (personates Mosul April and the Frontiers), - Wilson, Loyalties, 11,p.11, pp.150-151.

[557]- Air 20/513 (Northern Kurdistan) p.5-6, Bell, Review of Civil Administration,p.73.

ئینگلیز لەمەدا سەرکەوت و زۆربەی سەرکردەکانی راپەڕین پەنایان بردە بەر تورکیا، دوایی بە خێرایی و لە ماوەی سێ مانگ بارودۆخەکەی هێمن کردەوە، ژمارەیەکی زۆری لە ئاغاکان کوشت و دەیان گوندی وێران کرد، مەبەستی لەمە ترساندنی کورد بووە، لەگەڵ بڕوایی هێنان بەوەی هەڵەبوون لە ورووژاندنی ئاژاوە، ئەوەی روویدا بە هۆی کارەکانی خۆیانەوە بووە[558].

وەکو بەدیار دەکەوێ ئینگلیز گرنگیی نەدابوو بە ڕاپەڕینی ئامێدی، سەرچاوە خۆجییەکان بە درێژی باسیان کردووە، بەڵام جۆرێك زیادەڕۆیی هەیە[559]. لێدوانەکەی جۆرج سەرۆکی هێزەکانی بەریتانی لە عێراق هیچ بوارێکی بۆ گومانی مەترسیی بەرەنگاریی نەهێشتۆتەوە، ئەگەر ئەو شەڕانە بەر لە ڕاپەڕین بوایە ئەوە بە تەنیا لە ڕاگەیاندنی هاوچەرخدا وابەستە نەدەبوو، بێگومان شوێنەوارێکی گەورەی دەبوو لە مێژووی فەرمیی هێرشە سەربازییەکانی ناوخۆی عێراق[560]. خۆڕاگریی بەریتانییەکان لە ئامێدی نەبووە بەربەست لە بەردەم کوردەکانی ئاکرێ لە بەرەنگاربوونەوەی ئینگلیز، هۆزەکانی زێبار و سورچی و بارزان بە دوو مانگ لە دوای راپەڕینی ئامێدی هاوپەیمانییەتییان بۆ شەڕی هێزەکانی بەریتانی پێکهێنا، عەقید بێڵ بە پلەی ئەفسەری سیاسیی لە موسڵ لە جیاتی لێجمان هات، بێڵ وەکو ئەوانی تر پشتگیریی سیاسەتی هێرش بووە، لە کاتی هاتوچۆی بێڵ و سکۆتی یاریدەدەری بە قەزای ئاکرێ، غرامەی فارس ئاغای گەورەی زێباریو ئەبوبەکراغای "بیرەکیرە" دەکەن، چونکە رەعیەتەکانیان هێرشیان بردبووە سەر هێزەکانی بەریتانی، عەقید بێل لە"بیرکیرە" کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆك هۆزەکان گرێداو قسەی بۆ کردن، ئاغاکان ئەم وتارەیان بە خراپ لێکدابۆوە بۆ سەر خۆیان، زێباری و سورچییەکان ناچار بوون دوژمنکاریی کۆن لە بیر خۆیان ببەنەوە و هاوپەیمانییەتی دژی بەریتانییەکان پێکبهێنن، نەقیب سکۆت لە ڕووی کارگێڕییەوە بڕیاری لکاندنی ناوچەی بارزانیدا بە ئاکرێ، بەمە شێخ ئەحمەدی

[558]- لەگەڵ ئەوەدا لە لای غولامیی زیانەکانی بەریتانی و دیلەکان بە سەدان هەژمار دەکرێ، (بیلْ) ژمارەیەکی کەمی زیانەکانی لایەنی بەریتانی دیارییکردووە، (ویلْسن) یش بەنزیکەی (137) کوژرا و (330) برینداری داناوە. بڕوانە: غولامیی: ل57-58

[559] -:Bell, Review of Civil Administration,p.73. Wilson, Loyalties, 11,p.151.

[560] - Wilson, Loyalties, 11,p.150-151.

بارزانی له خۆی تووڕه کرد، چونکه ئاکرێ دەچووه ژێر دەسەڵاتی فارس ئاغای ناحەزی، که ئەوان دوژمندارییه تەقلیدییەکانی خۆیان له بیر کرد، هێزی شۆڕشگێڕان له دەرەوەی بیرەکیره له دژی عەقید بێڵو سکۆت کۆبوونەوەو هەردووکیان کوشتن، دوایی هێرشیان برده سەر ئاکرێ و دەستیان بەسەردا گرت[561]. هێزەکانی بەریتانی جارێکی تر له تشرینی دووەم ئاکرێیان گرتەوه، بۆ هێمنکردنەوەی سوپایان نارده ناوچەکه، له (6)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (1919) نەقیب (کێرك) یاریدەدەری ئەفسەری سیاسیی نوێ له ئاکرێ، سەرکردایەتی هێرشی دژی هۆزی سورچی هەڵگەڕاوه ڕێکخست، که له ژێر فەرماندەی شێخ ڕەجەبدا بوون، هۆزی سورچی بەسەر بەریتانییەکان سەرکەوتن و نزیکەی (300) کەسیان لێ کوشت و بریندار کردن ، له ئاکامدا حکومەت به ناچاری هێزی زیاتر نارد، له دوای چەند ڕۆژ له بۆردومانی ئاسمانیی سوورچییەکان به ناچاریی هەڵهاتن و پەیوەندییان کرد به هەڵگەڕانەوەی بارزانی و زێبارییەکان له چیاکانی دەوروبەر[562].

هۆی ڕاپەڕینەکانی سلێمانیو ئاکرێو زاخۆ به هۆی تێکگیرانی بەرژەوەندیی ئاغاکانی کورد بووه، ئەوانه دەیانویست له کۆمەڵگای کوردی پارێزگاری له بەرژەوەندییه تایبەتیەکانی خۆیان بکەن، له بەرانبەردا حکومەتی بەریتانیی که ئارەزووی دامەزراندنی سیستم و یاسای ڕۆژئاوای کردووه له کوردستان و پەیڕەوی سیاسەتی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی ویستووه لەسەر شێوەی دەسەڵاتی ئیتحادیەکان، ئەمەش بووه هۆی هەمان ئەنجامی ڕابردوو له بەڕۆژئاواییکردنو ڕاپەڕینه سەربازییەکان له ناوچەکەدا، بەڵام ئاغاکان سوودیان له کەسێتیی شێخو زاناکان وەرگرت له ناو کورد بۆ وروژاندنی هەستی ئایینی دژی دەسەڵاتی ئینگلیز.

ئەو سێ ڕاپەڕینەی کەمتر له هەشت مانگی خایاند، بەس بووه بۆ وەزارەتی داگیرگەکانی بەریتانی له هیند و وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا قەناعەت بکەن له ناوچەکه بکشێنەوه، سەرەڕای دڵنیایی پشتگیری ئیدارییەکانی بەریتانیا، له کۆتایی (1919) بەریتانیا له زێی گەوره کشایەوەو گەڕایەوه بۆ پیادەکردنی دەسەڵاتی

---

561 - Hay: Two Years.. Pp.180-181, Wilson, Loyalties, 11,p.154. Bell, Review of Civil Administration,p.73.

562 - غولامی: ل75-76، 83-85

ناڕاستەوخۆ، سەرداره خۆجێیەکانی ئامێدی و زاخۆ و ئاکرێ و ڕەواندوز وازیان هێنا، باجیان بۆ ئاسانکاریی کاری کارگێڕیی ناوچەکە کۆ دەکردەوە[563]. بەمەش هێمنیی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا، بەڵام ناوچەکانی کەرکووك و سلێمانی و هەولێر و کفری لە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆدا مانەوە، کە لە شۆڕشدا بوون.

## - نائارامیی لە هەردوو ناوچەی کەرکووك و هەولێر (1920)

تا ڕادەیەك ناوچەی هەولێر ئارام بووە، کە لە ساڵی (1920) ببووە مەڵبەندی بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتی بەریتانیی، نوری باویل ئاغای سەرۆکی خێل لە ڕەواندز[564] خۆی بۆ پایەی هاوشێوەی شێخ مەحمود ئامادە کردبوو، بۆ هێرشی دژ بە بەریتانیا توانی بووی سورچی و خۆشناو و ئەوانی تر لەدەرەوەی خۆی کۆ بکاتەوە، بە ناوی جامیعەی ئیسلامیەوە ئەو ڕاپەڕینانە لە دژی بەریتانیا بوروژێنێ، دووبارە لە ئەیلولی (1920) پیاوەکانی نوری باویل ئاغا بە پشتگیریی سورچیەکان شاری ڕەواندزیان گەمارۆدا، لەو کاتەدا نەقیب های خەریك بوو هێزێکی خێڵەکی دۆستی بەریتانیا پێکبهێنێ، کارەکە بە هۆی فەتوای شێخەکانەوە پەکی کەوتبوو، بەریتانییەکان ڕەواندوزیان بەجێهێشت و شوێنکەوتوانی نوری ئەنجومەنێکی خێڵەکییان* بۆ بەڕێوەبردنی شارەکە هەڵبژارد[565].

---

[563] - Bell, Review of Civil Administration,p.75-76, Noel Diary, p.23, Halmreich,p.204

[564] - نوری باوەیل ئاغا ناوێکی درەوشاوەیە لە نەوەکانی ڕەواندوز، لە ساڵی (1919) موجەنەددی پۆلیسی بەریتانی بووە، بە هۆی مەیلداریی بۆ جولانەوەی ئیسلامیی و بڕوای بە زۆرلێکراویەتی کورد، لە ساڵی (1920) شۆڕشی بە ڕووی ئینگلیزدا ڕاگەیاند، بۆ کۆکردنەوەی پشتگیریی هۆزەکانی کورد هەموو ناوچە دوورەکانی دەوروبەری ڕەواندوز گەڕا، ڕایگەیاند حکومەتی بەریتانی هیچ شتێك بۆ کوردستان ناگەڕێنێتەوە، (های) بە هەڕەشەیەکی مەترسیداری دانابوو بۆ سەر دەسەڵاتی بەریتانی لە هەولێر، نوری باوەیل ئاغا شۆڕشگێڕ بوو، بە دڵسۆزیەوە خزمەتی شێخ مەحمودی کردووە، دوژمنی سەرسەختی (های) بوو، های هەولێکی زۆریدا دووری بخاتەوە، بەڵام ئەم شێوازی پارتی زانی (الکر و الفر)ی بەکاردەهێناو شۆڕشگێڕێکی ئازا بوو.

FO, 371/5068, W.Hay (Note Rawanduz) B 71/6346, Two Years,p.261-287،

* - لە بابەت ئەم ئەنجومەنەوە ئەحمەد تەقیّ لە بیرەوەرییەکانی دەڵێ: (کۆمەڵی شەعبیان تەشکیل کرد، بەم نەوعە شێخ ڕەقیبی بجێڵ سەرۆك و من نائب سەرۆك و شێخ عوبێدوڵلاو شێخ جەوادو شێخ کاك

کۆیه شارێکی بچووکی هاوتوخبی ڕۆژهەڵاتی هەولێره، خەباتیان له دژی ئیدارەی بەریتانیی ڕاگەیاند، وایان دانابوو ئەو گروپەی دژی سیاسەتی بەریتانیایه و داوای جامیعەی ئیسلامیی دەکەن خوازیاری مافی کوردانن[566]، ئەمەش بووه هۆی ئەوەی له (15)ی ئەیلول بەریتانیا له ژێر فشاری چڕی تێکۆشەران به تەواوی ئەو هەرێمه بەجێبهێڵێ، هێزه سەربازییەکانی بەریتانیا کشانەوه دەوروبەری شاری هەولێر، دەسەڵاتی بەریتانیا به تەنیا له ناوەندی شار مایەوه، هەڵوێستی نەقیب (های) کەوته مەترسییەوه، زۆربەی سەرکردەکانی هۆزی دزەیی، که قورساییان له ناوچەکەدا هەبووه له ئیدارەی بەریتانیا رازی نەبوون و داوایان له نوری کرد دەست بخاته کاروباری هەولێرەوه، له ئەنجامدا هێزێکی تایبەت له سورچی و خۆشناو له چەند لایەکەوه هێرشیان کرده سەر هەولێر و گرتیان، ویڵسن فەرمانی به (های)دا شار بەجێبهێڵێ.

های دۆسیه و تۆمارەکانی میری نارده کەرکووك و پێی باش بوو له هەولێر بمێنێتەوه بۆ گفتوگۆ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکانو پەرتەوازه پێکردنیان، هەروەها (ویڵسن)یش بۆ بەرزکردنەوەی ورەی دۆستەکانی سەردانێکی له ناکاوی هەولێری کرد، له کۆبوونەوەیەکیدا دۆستایەتی سەرۆکی دزەیی و پیاوماقوڵانی هەولێر له بەرژەوەندیی بەریتانیا مسۆگەر کرد، هەڵوێستی بەریتانیا له دوای ناردنی دوو کەتیبه بەرز بۆوه، ئەم گۆڕانکارییه خەباتکارانی ناچار کرد گەمارۆ لەسەر شار هەڵبگرن[567].

هۆکاری ڕاپەڕینەکانی هەرێمی هەولێر لەگەڵ هی سلێمانی و بادینان پێك دەچوون، سەرۆکەکانی دزەیی که له ڕۆژگاری دەسەڵاتی عوسمانیی ڕۆڵی سەرەکییان دەگێڕا،

---

ئەمینی سەلانو غەفورخانی ناودەشتو باوەیل ئاغاو خدر ئاغای سەرچیاو سەعید بەگی برادۆست ئەندام...... بۆ تەشکیلاتی ئیدارییش ئەحمەد بەگی بکۆك قائیمقامی ڕەواندوز و نوری ئەفەندی باوەیل ئاغا سەرۆکی ئەمن، شەوکەت ئەفەندی سەرۆکی شارەوانیی و مستەفا ئەفەندیی ڕەواندوزیی به مدیری مال، قبوڵ کرا...) بڕوانه:. بیرەوەرییەکانی ئەحمد تەقی دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمود و سمکۆ. سلێمانی (1998).

565 -Hay, Two Years , pp.303-305.

566 - Hay, Two Years , pp.87-89, Cab. 24/111,Teleg, from Civil Commissioner to S, of S for India, C.P, 1892Ghulami,pp.89-90 .

567 - Wilson, Loyalties, 11,p.286-287 :د.كمال مظهر: دور الكرد في الثورة العشرين. ص27-29

ئێستا له لایەن (های) له بیر کراون، غەیری کوردیان له کۆکردنەوەی باجی ناوچەکه دامەزراندووه و به نادادگەریی باج کۆ دەکەنەوه، ناڕەزایی سەرۆکەکانی دزەیی له ئاکامی بێبەشکردنی ئەو دەستکەوتانەوه بوو که هۆزەکانی پشدەر و جاف له لیوای سلێمانی هەیانبووه، سەرەڕای ئەمەش (های) داوای لێکردن سەردانی بکەن، له (8)ی ئەیلول سەرکردانیان کرد، بەڵام سۆن هێشتنییەوه و به توندیی لەگەڵیان جوڵایەوه، چونکه هاریکاری ئیدارەی بەریتانییان نەکردووه، های فەرمانی به هەموو ئاغاکانی دزەیی کرد بۆ ماوەی شەش مانگ سەد پارچه چەك و (1500) ڕوپیه بدەن، به مەرجێك له هەولێر دەرنەچن هەتا ئەو مەرجانه جێبەجێ دەکەن، ئەمانه هەمووی بۆ لێدانی سەرداره کوردەکان بووه[568].

نەبوونی سیاسەتێکی روونی بەریتانیی بەرامبەر کورد و دەستێوەردانی دەرەکیی ڕۆڵی گرنگیان گێڕا له ڕاپەڕینی سلێمانی، له ڕاپەڕینی هەولێریش دوو هۆکاری گرنگ هەبوون، کورد و فەرمانبەرەکانی عوسمانی لەوێ کۆمەڵەیەکی ئیسلامیی دوژمن به ئینگلیزیان پێکهێنا بوو، که له پەیوەندیی هەمیشەییدا بوون به هێزه ناسیۆنالیسته تورکەکانەوه، ئەندامانی کۆمەڵه نووسراوێکیان نووسی و دۆستایەتی و مەیلیان بۆ لای جامیعەی ئیسلامیی دیارخستبوو، پڕوپاگەندەیان دەکرد که دووباره تورکان دەگێڕێنەوه ناوچەکه، ئەمەش خەڵکی زۆری والێکرد هاوکاری لەگەڵ حکومەتی بەریتانییدا نەکەن[569].

کۆمیساری باڵا به وەکالەت له سەردانەکەی بۆ هەولێر سەرنجی دابوو، که بەریتانیا له توانایدا نییه سیاسەتێکی ڕوون دابڕێژێ لەسەر داهاتووی ویلایەتی موسڵ، که بۆته پەشێویی گەوره له ناو کورد، له دوای ئەوه پیاوماقوڵانی هۆزەکان فشاریان خستبووه سەر ویلسن که ڕاگەیاندنێك دەربکاو دڵنیایی بدات که حکومەتەکەی ڕێگەی گەڕانەوەی تورکان نادات، ئەمەش له توانای ویلسندا نەبوو، کوردەکانیش پێیانوت: (ئەگەر تورکان گەڕانەوه دەمانکوژن و ئافرەتانمان دەڕفێنن)[570].

---

[568] - Air 20/513 (Report on Arbil), S, Marry, APO, Erbil 15-7-1920, 20/512 Note on Unrest, Amongst the Diza Kurds: Hay, Two Years, PP.87-89.

[569] - Hay, Two Years, P.161

[570] - Wilson, Loyalties, 11,p.287-28 .

شۆڕشی (1920) کاریگەریی هەبووە لەسەر کوردستان، سەرەڕای هەوڵەکانی ویڵسن بۆ پوچەڵکردنەوەی پەیوەندیی نێوان شۆڕشی عێراقی و ڕاپەڕینی هەولێر، ئەندازەیەکی زۆر لە کاربەدەستانی بەریتانیی ئاماژەیان بە چالاکییەکانی هەولێر کردووە، کە پڕوپاگەندەیان بۆ بەرژەوەندیی ڕاپەڕینی عێراقی کردووە و نووسراویان دابەش کردووە، کە گوزارشتی هاوکاریی بووە لەگەڵ تێکۆشانی دژ بە حکومەتی بەریتانیی، لە ڕاستیدا لە مانگی ئابەوە لە هەولێر بەرەنگاربوونەوەی کارا هەبووە و توانیبویان پشتگیریی زوربەی خەڵك بەدەستبهێنن[571].

ڕاپەڕینی عێراقیی شوێنەواری لەسەر خانەقین و کفری و کەرکووك بەجێهێشت، لە مانگی ئابدا لێوەشاوەترین کوردانی دانیشتووی بەغدا و کەرکووك بەشداریان لەو ڕاپەڕینەدا کرد، لەوێ هۆزەکانی کورد هێرشیان کردە سەر کۆمپانیا پەترۆڵیەکانی ئینگلیز ـ ئێران و لە (22)ی ئاب شۆڕشگێڕان ئاڵای بەریتانییان سووتاند، لە کفری و خانەقین ئاڵای عوسمانییان بەرزکردەوە، هۆزەکانی دەلۆو جاف هێزیان کۆکردەوە بۆ دەرپەڕاندنی ئیدارەی بەریتانیی لە ناوچەی نێوان توزخورماتوو کەرکووك، کە هۆزەکانی داودە و بەیانو زەنفاناو ئالی ئەلعەزیزی عەرەبی لێ نیشتەجێن*، لە کۆتاییدا بەری ڕۆژهەڵاتی کەرکووك کەوتە بەردەستی شۆڕشگێڕانی کورد و حکومەتی بەریتانیی ناچارکرا لە زۆربەی ئەو ناوچانە دەربچێ، بە تەنیا دەستەڵاتی لە شاردا مایەوە[572].

هەڵگەڕانەوەی چەکداریی لە کەرکووك و خانەقینو عێراق بە گشتیی هۆکارەکانی فرە رەهەند و کارتێکەری جیاوازی هەبووە، هاندانی زانا شیعەکانی شوێنە پیرۆزەکانی عێراق کاریگەریی هەبووە لەسەر شیعەکانی کورد لە خانەقین و ناحیەکانی باشووری کەرکووك، ئەندامانی عەهد (گردبوونەوەی نەتەوەیی عێراقی= التجمع القومي العراقي) لە دیمەشق چالاکانە لە ناو کورد کاریان دەکرد، هەندێ لە چالاکییەکانیان بیری سەربەخۆیی نیشتمانیو دوژمنداریێتی بێگانەیان تێکەڵ کردبوو، بیری جامیعەی ئیسلامییان کە لەتورکیاوە هاتبوو بڵاودەکردەوە، هەروەها هەندێك لە شوێنکەوتوانی

---

[571] - Wilson, Ibid: p.285. -Hay, Two Years, P.296-297. دور الكرد في...ص258

* - سەرچاوەیەکمان لەبەردەستدا نییە لەسەر ئەو هۆزە عەرەبیانە، بەڵام هۆزی داودە کوردن. "وەرگێڕ".

[572] - Edmonds: Kurd, Turk, and Arabs, p.299, - Wilson, - Wilson, Loyalties, 11,p.284-285

شێخ مەحمود دەیانویست بارێکی نائارامیی لە ناوچەکە درووست بکەن، هەتا فشار لەسەر ئینگلیز درووست بکەن بۆ راگەیاندنی فەرمانڕەوایەتی شێخ مەحمود[573].

لە میانی ڕێوشوێنی بەرگریی ئینگلیزەکان توانیان دەست بەسەر ڕاپەڕینەکەدا بگرن و نەیەڵن بپەڕێتەوە ناوچە گرنگەکانی سلێمانی و بادینان، ئەفسەری سیاسیی لە کەرکووك هەوڵیدا شێخ حەبیب تاڵەبانی، کە خاوەنی دەسەڵاتێکی گەورە بووە لە کەرکووك بەکاربهێنێ بۆ هێمنکردنەوەی دانیشتوانی نێوان کەرکووك و خانەقین و نیشتەجێکردنی پیاوانی ئەو هۆزە چەکدارانە لایەنگری بەریتانیا بوون، حکومەتی بەریتانیا ڕەشبگیری بە (700) پیاوی سەنجابی کرد لەگەڵ هەندێ لە کەڵهوڕیەکانی کوردی ئێران، لونگرێك بە پاڵپشتی ڕەشبگیرییەکەی حکومەت هەوڵی دەرپەڕاندنی وەکو خۆی وتویەتی یاخیبوان لە کفریو خانەقینی دا[574]، لەگەڵ ڕێوشوێنی بەرگریی بە دابڕینی سلێمانی لە عێراق[575]، سۆن چەند ڕێوشوێنی تری لە سلێمانی گرتەبەر، لە هێنانی پێنجسەد کەس لە هۆزی پشدەر بۆ شارەکە، بە درێژایی گرژییەکە هێزە سەربازییەکان لە لیوایەکە مانەوە، هەرچۆنێك بێت لە سلێمانی کۆسپی خستە بەردەم کورد هەتا شۆڕش نەکەن[576].

هۆکاری ڕاپەڕینی (1920) لە هەولێر و کەرکووك هەمان هۆکاری ڕاپەڕینی ساڵی (1919)ی سلێمانی و بادینان بووە، نیگەرانی کورد لە هەوڵەکانی پیادەکردنی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی حکومەتی بەریتانیی لە ناوچەکە، وەکو نیگەرانی پێشوو بووە لە سیاسەتی مەرکەزیی، کە کۆمەڵی ئیتحادو تەرەقی لە تورکیا پیادەی کردبوو، دوای شەڕی یەکەمی جیهانیی لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا هەمان سیاسەت پەیڕەو دەکرا، ئەمەش ئەگەر هەر مەبەستێك بگەیەنێ، بەڵگەیە لەسەر پەند وەرنەگرتنی ئینگلیز لە ئەزموونی تورکە ئیتحادیەکان لەگەڵ کورد.

---

573 – Wilson, Loyalties, 11,p.290

574- Office of Civil Commissioner Report on Iraq 1920-1922 .ئەحەد خواجە: چیم دی، ب3، 20-21

575 -Longing: Iraq form 1990-1950, p.125. Cab, 24/111, Teleg, from Civil Commissioner Baghdad to Sec of State for India 10-9-1920

576 – د.کمال مظهر: دور الکرد فی الثورة العشرین، ص535

## هۆكاره كاریگەره دەرەكییەكان لەسەر جیهاد

هۆكارەكانی دەرەكی لە (1918- 1920) شوێنەواری گەورەی هەبووە لەسەر گەڵاڵەبوونی سیاسەتی بەریتانی لە بەرامبەر كوردی عێراقی و ڕێڕەوی ڕووداوەكانی باشووری كوردستان، گرنگترین ئەو هۆكارانە بریتی بوون لە جامیعەی ئیسلامی و بەلشەفی و نەتەوایەتیی كوردیی لە ئێران و توركیا، لەگەڵ گرنگیی ئاسایشی بەریتانیا لە ئێران و توركیا و پێشبڕكێی ئەنگلۆ - فەڕەنسیی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

لە كانوونی دووەمی (1919)دا ژەنەراڵ ئیحسان پاشای توركیی بۆ دەرپەڕاندنی ئینگلیز لە ویلایەتی موسڵ ڕەشبگێریی لە ناو كوردان لەسەر هێڵی ئاگربەستی سنووری توركیا ڕاگەیاند، نوری پاشا پسپۆڕ بوو لە كاروباری كوردانی سەرسنوور، چونكە لەوێ فەرماندەی هێزەكانی عوسمانیی بووە، دروشمەكانی جامیعەی ئیسلامیی بەكاردەهێنا لە ڕەشبگێریی كوردان دژی ئینگلیز، لەساڵی (1919) حكومەتی ئیتیحادی باوەڕی كرد حوكمی زاتیی بداتە كورد، هەتا ڕێگر بێت لە بەردەم بەریتانیا بۆ لێدانی تورك بە كورد، دوایی هەندێ لە سەركردە ئیتیحادیەكان لەو بڕوایەدا بوون كوردستانی گەورە قۆناغی یەكەمە بۆ پێكهێنانی كۆنفیدراڵیەتی دەوڵەتانی موسڵمان لە ژێر دەسەڵاتی خەلیفە[577].

ئەو ڕاپۆرتانەی لە پاریس لە كۆنگرەی ئاشتییەوە هاتبوون ئاماژەیان بە دەوڵەتی پێشنیازكراوی ئەرمەن كردبوو لە ڕۆژهەڵاتی توركیا، كە بەشە كوردییەكانی باكووری ڕۆژهەڵاتی توركیای دەگرتەوە، ئەمەش پاڵنەر بوو بۆ كۆمەڵە نەتەوەخوازەكانی كورد هاوكار بن لەگەڵ توركە ئیتیحادیەكان بۆ پوچەڵكردنەوەی نەخشەی ئینگلیز و هاوپەیمانەكان، لە كانوونی دووەمی ساڵی (1919) حكومەتی عوسمانیی كۆمەڵە نەتەوەخوازەكانی هاندەدا داوا لە هاوپەیمانان بكەن بۆ دروستكردنی دەوڵەتی سەربەخۆی كوردیی، ئامانجی عوسمانیی لەو پشتگیرییەی كێشەی كورد لە بارییەك بردنی نەخشەی سوێندخۆرەكان بووە لە دروستكردنی دەوڵەتی ئەرمەنیی[578]،

[577] - Air 20/512 Teleg From Special Service, Mosul to GHG Baghdad No 181, 17-2-1919-

[578]- Air 20/512 teleg from policy Cairo to GHQ, Baghdad 39805, 6-8-1919 from GHG, to I.O, (Report)15-8-1919,Air, 20/512,Teleg from GHG Mesopotamia force to India Office August. 5th 1919.

نەتەوەخوازانی کوردی ئەندام لە ئیتحادو تەرەقی پشتگیریی مەسەلەی کوردستانی سەربەخۆییان دەکرد، کە داواکاریی تورکە ئیتحادیەکان بووە، هەستیان کردووە ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیی بارودۆخێکی گونجاو دەخوڵقێنێ بۆ پێکهێنانی حوکمی زاتیی و هەندێ لە سەرکردەی ئەو کۆمەڵانە پشتگیریی بیرۆکەی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیان کردووە لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیی، بەو هیوایەی دەرفەتی زیاتر بکاتەوە لە بەردەم چەوسانەوەی زیاتری ژێردەستە و جوتیارەکان، کە ئەگەر لە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی بەریتانییدا بمێننەوە[579]، بەڵام مەسەلەی جامیعەی ئیسلامیی دواتر و لە نیوەی (1919) پەرەی سەند، بە بەدیارکەوتنی ئەنوەر پاشا لەگەڵ سوپای سەوز لە قەوقاز، کە ژمارەیان چل هەزار سەرباز دەبوو، ئەنوەر پاشا لەسەر سنوور پەیوەندیی بە پیاوماقوڵانی کوردی عێراقەوە کردبوو، پەیمانی دابوو بەرەو عێراق بێتو دەستەڵاتی سوڵتانی خەلیفەیان بۆ بگەڕێنێتەوە[580].

---

لە کۆتایی شەڕ ڕای گشتیی لە بەریتانیا و ئەمەریکا بە شێوەیەکی پتەو لە بەرژەوەندیی ئەرمەن دروست بوو، گرنگییدانی بەرچاو هەبوو بۆ چارەنووسی ئەوان، چوونە پاڵ لایەنی هاوپەیمانەکان لە کاتی شەڕو قوربانییەکانیان بڕوای بە هێزی بە دەوڵەتانی هاوپەیمان هێنابوو لە وتووێژەکانی ئاشتیی لە پاریس مەسەلەی پێکهێنانی دەوڵەتی ئەرمەن بە هێند وەربگرن، ئەم دەوڵەتەش لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ وەکو ئەرزڕوم و تەرابزون و وان و بەتلیس دادەبڕێت، لە وتووێژەکانی ئاشتیی وەفدی ئەرمەنیی نوار پاشا توانیبووی مەسەلەی مافی ئەرمەن و پێکهێنانی دەوڵەتی ئەرمەن بخاتە ناو باسەکانی ڕێکەوتننامەی سیڤەر، لە سەرژمێری دانیشتوان ئەرمەنەکان بە هۆی کوشتار و کۆچ و نەهامەتیی بە تەنیا لەساڵی (1919) لە سەد هەزارەوە کەم ببوونەوە بۆ بیست هەزار کەس، هەتا لە ڕابردووش ئەو بەشەی ئەرمەن بە ناوچەی خۆیان دانابوو زۆرینەی کورد بووە، مستەفا کەمالی بەسەردا هات و بارودۆخەکە هەروا مایەوە، ڕێکەوتننامەی لۆزانیش پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی و ئەرمەنی هەڵوەشاندەوە بڕوانە: Shaw, pp.300-301, Afra, 28-30،

[579] - Bell, Review of Civil Administration,p.66-68

[580] -Air 20/513 (Northern Kurdistan) Report, pp.5-6 , FO, 371/5068 (Sulaimania) by E B Soane, 11-5-1920

ئەنوەر پاشا یەکێك بوو لە سەرکردە کاریگەرەکانی ئیتحادو تەرەقی، لە دوا ساڵی شەڕ چووە قەوقاز، هەتا لەوێ دووبارە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی بنیاد بنێتەوەو دەسەڵاتی تورکیی بگەڕێنێتەوە بۆ قەوقاز و ئاسیای ناوەڕاست و عێراق، ساڵی (1919) هاوپەیمانێتیی لەگەڵ بەلشەفیەکان بەست و سوپای سەوزی لە دژی داگیرکەری بەریتانی پێکهێنا بۆ وڵاتانی ئیمبراتۆریەتی عوسمانیی ڕابردوو. بڕوانە:

هێرشەکانی جامیعەی ئیسلامیی لە تورکیا هۆکارێکی بنەڕەتیی ڕووداوی ڕاپەڕینەکانی دژ بە بەریتانیای ساڵی (1919) بووە[581]، سەرکردە کوردەکان لە (25)ی مایس لە جەزیرەی ئیبن عومەری ناوچەی سەرسنوور کۆبوونەوە بۆ وتووێژ لەسەر چۆنییەتی توانای هاندانی کوردەکانی ویلایەتی موسڵ بۆ شۆڕش لە دژی ئینگلیز، ڕێککەوتن لەسەر ناردنی وەفدێکی نهێنی بە نامەوە بۆ لای پیاوماقوڵانی کوردو شێخ مەحمود هەتا هانیان بدەن بۆ پەیوەندییکردن بە جوڵانەوەی خەلافەت و بانگەوازی جیهاد لە دژی ئینگلیز[582].

عەبدوڕڕەحمان تەتاریی لە شەرناخ، کە بانگەوازکاری جوڵانەوەی خەلافەت بووە لە ناوچە سنوورییەکان، لە نیسان و لە هەرێمی زاخۆ کاریگەریی گەورەی هەبووە لەسەر هۆزی گۆیان و گەورەترین هاندەر بووە لە ڕاپەڕینی دژ بە ئینگلیز[583]، سەرەڕای ئەمانە شاڵاوی یۆنانی بۆ ئەزمیر لە مایسی (1919)و کوشتاری دژی تورکان هەستی کوردانی دژ بە کریستانەکان ورووژاند، لۆمە کەوتە سەر ئینگلیز و وای لە کوردان کرد هەمان پێوانە لەسەر هەڵوێستی خۆیان بگرنەبەر، پڕوپاگەندە هەبوو سوپای ئەرمەنیی لایەنگریی بەریتانیایە و دوایی بۆ کوشتنی کورد و داگیرکردنی خاکەکەیان دێن، لە ناوچە سنوورییەکان بەیاننامەی بڵاوکراوەی سەر کاغەز هەبووە، کە کوردی ترساندووە بە روخاندنی مزگەوت، دانانی کەنیسە، هەتا دەوترا "لە دوای ئەوە گوێ بیستی دەنگی بانگدان نابین"[584]. کورد هەستی بە مەترسیی زیاتر کرد، کە بیستیان کاربەدەستانی فریاکەوتنی بەریتانی لە ناوچەکە ناوی ئەوانە کۆدەکەنەوە، کە لە ماوەی شەڕ بەشداریی تاوانی کوشتاری ئەرمەنیان کردووە. (نوێڵ) نووسیویەتی: ئەو سیاسەتە و

---

See: FO 371/5069 Memo SC. 33897 25th Spet 1919 From, pot. April to CC Baghdad, Shaw, History Ottoman Empire and Modern Turkey. 11,pp.326-327 .

[581] – مەبەست لێرەدا شاڵاوی پڕوپاگەندەی ئیسلامییە لەلایەن کەمالیەکانی تورکیاوە. "وەرگێڕ"

[582]-- FO, 371/5068 Teleg from CC to S.S, Col, 6-5-1920, No 4205, Driver, p.111.

[583] -Air 20/512 Teleg from HC to GHQ, No, 20-12-1919 Mayson, p.344, Driver, p.111.

[584] - Wilson, Loyalties, 11, p.131

لێدوانی پیاوانی دەوڵەتی بەریتانیی دۆست بەئەرمەن لەو ماوەیەدا کاریگەریی خراپی هەبوو بۆ سەر کورد[585]، ئامانجی ئەو پڕوپاگەندە چڕانەی پشت سنوور بۆ کوردەکانی ویلایەتی موسڵ دژ بە کریستانەکان بووە، هەر لە سەرەتای ساڵی (1919) سیتۆ ئاغای قایمقامی جەزیرە، کە خاوەن دەسەڵاتی ناوچە سنوورییەکان بوو، ناردبوویە لای شێخ ئەحمەدی بارزان هەتا ڕەشبگیریی کوردان لە دژی بەریتانییەکان لە ئاکرێ ڕابگەیەنێ، لە دوای هاوکاریی شێخ ئەحمەد و سیتۆ ئاغا لە ڕاگەیاندنی جیهاد لە ئاکرێ چاوەڕوان بوون لە دوای دەرکردنی ئینگلیز لە عێراق ئەنوەر پاشا بگات بۆ راگەیاندنی خەلافەتی ئیسلامیی[586].

نەتەوەخوازانی عێراقی لە دیمەشق ڕۆڵی کاریگەریان بینی لە هەڵگیرساندنی شۆڕشی بادینان، فارس ئاغای زێباری و ڕەجەب ئاغای سورچی لە مایسی (1919) لە پەیوەندیی بەردەوامدا بوون لەگەڵ کۆمەڵەی "عەهد" لە موسڵ، بەیاننامەکانی ئەو کۆمەڵەیە لە بادینان و هەولێر و کەرکووك داوایان لە کورد دەکرد ئینگلیز دەربکات، لە تشرینی دووەمی (1919) ئەندامانی کۆمەڵەی عەهد بەم شێوەیە بۆ بارەگاکانیان لە دیمەشق دەنووسن: (زوربەی گەلی عێراق بە دەسەڵاتی بەریتانیی ڕازییە بە تەنیا کوردەکانن ئاستەنگ بۆ ئینگلیز درووست دەکەن، لەسەر ئێمەیە هانیان بدەین)[587].

جوڵانەوەی جامیعەی ئیسلامیی لایەنگری تورکیاو جوڵانەوەی دژ بە ئینگلیز هێزێکی تری زیادەی ڕاکێشایە ناوەوە، ئەویش هێزی کوردیی بوو لە ژێر فەرمانی مستەفا کەمال، لە کۆتایی (1919) جامیعەی ئیسلامیی تورکی پەیوەندیی بەرگریی لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا لە ژێر فەرماندەی سولەیمان نەزیف پێکهێنا.

چالاکییەکانی ئەو جوڵانەوەیە جەختی کردبووە سەر ناوچە کوردیەکان، لە ئەیلولی (1919) متمانەنامەیەکی نەتەوەیی لە تورکیا لە سیواس (saves) واژۆ کرا، دەقەکەی ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو بەشانەی عەرەب نین لە ئیمبراتۆریەتی "عوسمانیی بە

---

585 - Noel Diary, p.2

586 - Air 20/513 Memo from SS, Mosul to CC, 29th Dec 1919, - Bell, Review of Civil Administration,p.73, - Wilson, Loyalties, 11,p. 152 .

587 - Bell, Review of Civil Administration,p.72. Ghulami, p. 72 ، غولامي: ل32، كمال مظهر: دور الكرد في الثورة العشرين، ل112

کوردستانی عێراقیشەوە" نابێت دابەش بنو بەشێکە لە تورکیای تازە، لە نیسانی (1920) حکومەتی ئەنقەرە ئەم بەڵگەنامەی بە ڕاست وەرگرت، بە هۆی بەکارهێنانی دروشمە ئیسلامییەکان، کەمالیەکان پشتگیریی بەرفراوانیان لە ناو کورد دەستکەوت، هەروەها کورد لە سەرخستنی کەمالیەکان ڕۆڵی سەرەکیی گێڕا، لە هەشت سەرکردەی کۆنگرەی ئەرزڕومی جوڵانەوەی کەمالیەکان، سیانیان کورد بوون، هەروەها لە سەرەتاوە و بەر لە دەستبەسەراگرتنی ئەنقەرە، قەوارەیەکی بنەڕەتییان لە سوپای کەمالی پێکهێنا بوو، لە ماوەی هێرشی پڕوپاگەندەی کەمالیەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ مستەفا کەمال جەختی کردبووە سەر برایەتی ئیسلامیی کورد و تورك، لە دوای تێکشکانی یۆنانیی و بەریتانییەکان لە ئەنادۆڵ بەڵێنی جێبەجێکردنی یەکسانیی کوردانی دەدا[588]، لە دوای ڕزگارکردنی ئۆزمیر، مستەفا کەمال توانی بەردەوام بێت لە پێشڕەویی بۆ سنووری تورکیی ـ عێراقیی، بە هیوای بەکارهێنانی کوردان لە داگیرکردنی باکووری عێراق، بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستەش چەندین وەفدی ناردە سەردانی سەرۆکە کوردە دەسەڵاتدارەکانی کوردستانی عێراق، ئەو وەفدانە وتووێژیان دەکرد لەسەر دۆزینەوەی ڕێگەچارە بۆ دەرپەڕاندنی ئینگلیز لە باشووری کوردستان، جەزیرەی ئیبن عومەری سەرسنوور بنکەی سەرەکیی هاندانی دژ بە ئینگلیز بووە[589].

لە دوای زنجیرەیەك سەرکەوتنی بەلشەفیەکان لە قەوقاز، ئالۆزیی و مەترسییەکانی سەر عێراق زیادی کرد، وای لێهات ئیدارەی بەریتانیی لە سنووری ئازەربایجانەوە مەترسیی هێرشی بەلشەفیەکانی هەبوو بۆ سەر عێراق، لەوێ دەنگو باسی هاوپەیمانییەتی کەمالیو بەلشەفیەکان هەبوو لەگەڵ بڵاوبوونەوەی پڕوپاگەندە لەسەر دەرکردنی ئینگلیز لە عێراق، لە ماوەی ساڵی (1920) لایەنگرانی بەلشەفی لە چالاکیی بەردەوام دابوون لە ناو کوردەکانی باکووری عێراقو باکووری ڕۆژئاوای هەرێمەکانی

---

588 - Air 20/513, Teleg, from Intelligence Office Const. General Staff, HQ, Baghdad No 572, 4-8-1919. مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك... ل72-75، سلۆپی: 58-61

589 - Air 20/513, Teleg, from De Report (Const for 28-7-1920، کوردستان فی سنوات...، ل174-175 Martin Gilbert , Sir Horace Rumbled , Portrait of a Diplomat, London, Heinemann 1973, pp.229-230, Roderick H. Davison, Turkish, Diplomacy.

ئێرانی هاوتوخب لەگەڵ کوردستانی عێراق[590]، بە هۆی نەبوونی دەسەڵاتی مەرکەزیی لە ئێران، بەریتانییەکان هەستیان کرد دەبێت بەرگەی هەراسانکردنی دژایەتی بەلشەفیەکان بگرن، نوێنەری باڵای بەریتانیا لە بەغدا لە (20)ی ئابی (1920) بۆ وەزیری بەریتانیی لە هیند نووسیووە: (ئێستا لە هەرێمەکانی باکووری ڕۆژئاوای ئێران بارودۆخ بە ئاڕاستەی دژایەتیی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا دەڕوات)، هەر لەو بارەیەوە دەنووسێ: (بانگەشەی سەرکەوتنی بەلشەفیەکان لە ناو کوردەکانی ئێران ڕێگە بۆ کوردستانی عێراقیش خۆش دەکات)[591].

لە ساڵانی (1919 ـ 1920) سمکۆ ئاغای کورد لە هۆزی شکاك سەرۆکایەتی جەنگی سەربەخۆیی کوردستانی ئێرانی دەکرد، پەیوەندیی هەبوو بە کەمالی و بەلشەفیەکان، بانگی کوردی کردووە بۆ جامیعەی ئیسلامیی، بە لای بەریتانیاوە جوڵانەوەکە شێوەیەك بووە لە شێوەکانی بەلشەفی لە بەرگی ئیسلامیدا[592].

لە ساڵانی (1918 هەتا 1920) پرۆژەی دەوڵەتی کوردیی لە لایەن بەریتانیاوە پشتیوانیی لێدەکرا، بۆ ئەوەی بیکاتە پەیژەیەك بۆ بەرپەرچدانەوەی کاریگەریی بەلشەفی لە ناو کورد، هەروەها بۆ پاراستنی سنووری عێراق، دەوڵەتی کوردیی هۆکاری ڕاگرتنی هاوسەنگیی نێوان تورکیا و عێراق دەبوو، کە بەریتانیا تێیدا دەستەڵاتدارە، مێجەر (نوێل) کە پشتگیریی بیرۆکەی دەوڵەتی کوردیی بووە، دەنووسێ: (جوڵانەوەی نەتەوایەتیی خاوەن هێزێکی لە بن نەهاتووە، لە داهاتوو هیچ کۆسپێك نابینم لە بەردەم درووستکردنی کوردستانی سەربەخۆ لە ژێر پاراستن و پشتیوانییەتی بەریتانیا، کە لە

---

590 -FO, 371/5061 Teleg from High Commission (HC) Baghdad to Sec of S for Colonies, 21-11-1920, FO, 371/5068, (Sulamaniya) E.B Soane, 11-1-1920 .

591 -Cab, 28/111, Teleg from CC, Bahg. to CC, for India 10-8-1920

قونسوڵی بەریتانی لە تەوریز چالاکانە بەشداریی هەوڵەکانی حکومەتی ئێرانی کردووە لە دژی بڵاوبوونەوەی بیری کۆمۆنیستی، یەکێك لە شێخەکان بەناوی شێخ ئیبراهیم لە سنە لە باکووری ڕۆژئاوای ئێران" دوورخستەوە، ئەمەش بە هاوکاری حکومەتی ئێرانیی. بڕوانە: See Air 20/512,Teleg from Senna to Tahran, u.a.g.

592 - FO, 371/4161, Teleg from Sec of S. for India to FO, 20-4-1919, Teleg from under S.S for India to FO, London, No, 5803 u/a.l

باشووری کوردستانەوە درێژ دەبێتەوە هەتا کەنارەکانی دەریاچەی وان لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، پرۆژەی لەو جۆرە لە ڕووی ئابوورییشەوە ئەنجامی بە سوودی دەبێت)[593] . لە کاتێکدا بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانیی پوختەی داهاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەو ناوچەیە ساڵانە بە (250/000) جونەیهی ئیستەرلینی خەملێنراوە، هەروەها بە پیتترین شوێنە هەتا ئێستا دەستی بازرگانیی بەریتانیای گەیشتۆتێ، لە ڕاستیدا من بە تەواوی دڵنیام کوردستانی سەربەخۆ کاریگەرەو نابێت خۆمانی لێ گێل بکەین، داوا لە حکومەتی بەریتانیا دەکەم یەك جارەو کۆتایی بە ڕاگەیاندنی کوردستانێکی سەربەخۆ بهێنێ کە دەبێتە کاریگەریی واقیعی)[594] .

لە ساڵی (1919) حکومەتی بەریتانی مێجەر نوێلی نارد بۆ بە ناوچە کوردیەکانی ئەودیو سنووری موسڵ، هەتا زانیاریی دەست بکەوێ لەسەر پەیوەندیی تورك و کورد و ئەندازەی کاریگەریی جوڵانەوەی ئیسلامیی لە ناو کورد، لەگەڵ بارودۆخی کریستانەکانی باکووری ئەنادۆڵ، هەروەها تێگەیشتن لەسەر رادەی ئامادەیی کورد بۆ ئیدارەی خۆیی، نویڵ گەشتەکەی بە یاوەری دوو کەس بووە لە میرەکانی بەدرخان و کەسێکی تر بە ناوی جەمال پاشا لە نەتەوەخوازانی کورد.

ئەو زانیارییانەی نویڵ بە دەستی هێنا بوو بریتی بوون لە: (جوڵانەوەی نەتەوایەتی دژی بەریتانیا نییە و پەیوەندیی بەریتانیاو کورد بەرەو باشی دەچێت، ئەگەر بەریتانیا کورد دڵنیا بکاتەوە بە هۆی ڕۆڵی کورد لە کوشتاری (1915)ی دژی ئەرمەن سیاسەتی تۆڵەسەندنەوەی نییە لە کوردان. بڵاوبوونەوەی دروشمی جوڵانەوەی ئیسلامیی دەگەڕێتەوە بۆ مەترسیی کورد لە سەپاندنی ئیدارەی ئەرمەنیی بە پشتیوانی بەریتانیا)، نوێڵ پێیوابووە: (کوردەکان دەیانەوێت رزگاریان بێت لە تورکانو دەوڵەتێکی تایبەت بە خۆیان لە ژێر چاودێریی بەریتانیادا درووست بکەن)[595] .

---

593 - Air 20/512 Teleg Noel (Sulaymania) to pol. Baghdad, 17-11-1918

594- FO 371/ 5067 Teleg from pol, Baghdad to India Office, 16-11-1918

595 - Noet Diary.pp.1-3. Air 20/512 Teleg. To Egyptian force. No 2849 11-3-1919. Noel

گەشتەکەی نوێڵ بۆ ڕۆژهەڵاتی تورکیا هاوکات بوو لەگەڵ هەوڵەکانی هێرشە سەرنەکەوتووەکەی دامان فەرید پاشا بۆ سەر هێزی کەمالیە هەڵگەڕاوەکان لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا، لەو کاتە نویل لە (ملاتیە)

حکومەتی هیندی ـ بەریتانی فەرمانی بە نوێل دا گرەنتی بداتە کوردان بە هۆی بەشداریی لە شەڕی ئەرمەن سیاسەتی تۆڵەسەندنەوە پەیڕەو ناکات، بەریتانیا (23)ی حوزەیرانی (1919) فەرمانی بە نۆیلْ دا بە کوردان بڵێ: لە وتووێژەکانی لۆزان بۆ ئاشتیی نابێتە لایەندار و مەسەلەی کوردان لەسەر بنەڕەتی مافی چارەنووس دیاریی دەکرێت[596].

---

خۆی لە هەڵویستی شەرمەزاریدا دێتەوە، ئەم سەردانە بڕوای لای کەمالیەکان دروست کرد بەریتانیاو فەرید پاشا پیلانی هاوبەش دەگێڕن بۆ لەناوبردنی جوڵانەوەکەیان. بڕوانە:

See: Noel Diary pp. 1-9, FO 371/6469 (Turkey) annual report 1920 No 428 by Horace Ram bold Const AP 27-1921 pp.42-43, Air 512 Teleg From pol, Baghdad to Egypt force No 289, 11-1919 Air 20/513 Northern Kurdistan report, p.1. Air 20/512 Teleg from GHQ. Mesopotamia Expeditionary Fore, 19-5-1919 No 1962/63 .

[596] - Air 20/513, (Northern Kurdistan) Report, pp.5-6. in 1915

کۆمەڵە ئەرمەنیەکان لە رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ پشتگیریی هێرشی ڕووسیی و هاوپەیمانەکان بوون بۆ سەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی، بۆیە حکومەتی ئیتحادیەکان بڕیاری دووبارە نیشتەجێکردنەوەی ئۆردوگا ئەرمەنیەکانی دا لەبەشێك لە سنووری تورکیا، باس دەکەن لە کاتی بە زۆر کۆچپێکردن، ملیۆنێك ئەرمەنی مردون، پڕوپاگەندەی بەهێز هەبوو لەسەر بەکارهێنانی کورد لە لایەن ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە لە پڕۆسەی تۆڵەکردنەوە لە ئەرمەن، (ویگرام) یەکێکە لە میسیۆنەرەکانی ئەمەریکی، دەنووسێ: (شێوازی پڕۆسەی کوشتار لە هەموو ناوچەکان بە یەکتر دەچێت، سەرکردە خۆجێییەکان یەکەم جار ئەرمەنیەکانیان دەگرتو دوایی دەیان کوشتن، ئەوانەش لە خزمەتی سەربازیی بوون چەکەکانیان لێ دادەماڵێنو فڕێیان دەدانە ناو تیپی بێگارەوە، ڕێگا خۆشکردن، یان هەر کارێکی تر هەبوایە لە ناوچە دوورەکان پێیان ئەنجام دەدان، لە شوێنە دوورەکان بە کارکردن و بێتاقەتییو برسیەتی هیلاکیان دەکردن، هەندێکیان بە گوللە دەکوشتن، بەڵام چینە دەوڵەمەندەکان گوزەرانیان باشتر بوو، لە شار وەکو پزیشك و مامۆستا و بازرگان دادەنیشتن، لە شوێنی خۆیان بۆ شوێنە دوورەکان بەبێ هۆ دوریان دەخستنەوە، کە پێشتر ئەوەیان بۆ ڕێك دەخستن، کە کوردە چەکدارەکان هێرشیان بکەنە سەر، یان پاسەوانەکانی یاوەریان دەکردن لە کاتی گواستنەوە دەیانکوشتن. بڕوانە کتێبی: of Mankind Life in Eastern (Kurdistan p.338.) Griddle

ڕۆڵی کورد لە کوشتاری ئەرمەن بۆتە نیشانەی پرسیارێکی زۆری نووسەر و رۆشنبیران، پێیانوایە کورد خۆی ببووە قوربانی کوشتاری وەحشیگەرانە، بە جۆرێك کەمتر نەبوو لەوەی تووشی ئەرمەن هاتووە، ژمارەی ئەو کوردانەی لەو شەڕە لەناوچوون بە هۆی ئەو قەسابخانەوە بوو بێت کە ئەرمەن سازی دابوو، یان بە هۆی برسیەتی و رەوپێکردن، کە بە نزیکەی (700/000) هەزار هەتا ملیۆن دادەنرێت. بڕوانە:

لەگەڵ کۆتایی ساڵی (1919)، بەرپرسانی بەریتانیی لە لەندەن و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆیان روون بۆوە پرۆژەی نوێڵ بۆ "کوردستانی ئازاد" کردەیی نییە، هەریەك لە مونتاخی وەزیری هیندیی و ویلسن ڕوونیان کردەوە کە دەرپەڕاندنی تەواوی تورکان لە باشووری کوردستان بەدی نایەت، بۆ ئەوەش پێشنیازیان کرد حکومەتی کوردیی دۆست درووست بکەن، کە میری بەدرخان سەرۆکایەتیی بکات و پایتەختەکەی شاری جەزیرەی ئیبن عومەر بێت، ئەو هەنگاوەش داگیرکردنی شاری جەزیرەی دەوێت، لەگەڵ سامانی پێویست، بەو هیوایەی حکومەتی بەریتانی لە جێبەجێکردنی ئەو پڕۆژەیە سنووری عێراقی بپارێزێ لە دوژمنایەتی تورکیا، ئەمە لە لای باکووری ڕۆژئاوا، بەڵام بۆ باکوور ئەوە سنوورەکەی پارێزراو دەبێت بە هۆی سوپا لە موسڵ، لە باکووری ڕۆژهەڵاتیش بە هۆی حکومەتی کوردستانی ئازاد، کە زنجیرەیەك چیا سنوورەکەی لە تورکیا و ئێران جیادەکاتەوەو بە ئەستەم سنوور دەبەزێنرێت[597]. حکومەتی هیند لەو بڕوایەدا بووە بەدیهێنانی ئەو پڕۆژەیە ئاسانە، بەرپرسانی بەریتانی لە ویلایەتی موسڵ ڕایانگەیاند جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کورد لەوێ و بە تایبەتی لە جەزیرە و دیاربەکر زۆر بەهێزە، خاوەنی پشتگیریی زیاتر لە (20) هەزار پیاوی چەکدارە و کورد لەو هەرێمەدا

---

Afra The Kurds p.28-29 Shaw, pp.300-305 See

نوێل پێکاویەتی بەوەی دەڵێ: ئەرمەن بە هۆی ئەو کاریگەرە بەهێزەی لە دەرەوە هەیبووە توانیبووی گرنگی ڕای گشتیی بۆ کێشەکەی خۆیان رابکێشن، بەڵام ڕای گشتیی ئەورووپیی قسەیان نەکرد لەسەر کوشتاری کوردان بەدەستی ئەرمەن لە ڕیزی پێشەنگی خزینی رووس بۆ ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ، ئەو تاوانانەی لە بەرامبەر دانیشتووانە مسوڵمانەکان ئەنجام درابوو کەمتر نەبوو لەو تاوانەی تووشی ئەرمەنەکان بوو بوو (Noel Diary. p.3) نووسەرو ڕۆشنبیرانی کورد لە جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کورد دان بەوەدا دەنێن کورد ڕۆڵی هەبووە لە کوشتاری ئەرمەن، بەڵام ئەوەش ڕادەگەیەنن ئەم کارە بە پێی ڕێنومایی عوسمانییەکان ئەنجام درابوو، بڕوانە: کمال مظهر: کردستان فی سنوات حرب العالمیە الاولی، ص 262ـ 264، بەڵام بەرپرسانی تورك ئەوانەی دان بە کوشتارەکەدا دەنێن بەرپرسیاریەتی ڕووداوەکە بە تەواوی دەخەنە ئەستۆی کوردان، بڕوانە: See: Silopi , 54. لە ڕاستیدا تورك و بەشێك لە ئاغاکانی کورد و ئەرمەنە پیلانگێڕەکان لەگەڵ هۆکاری دەرەکیی پێویستە بە یەکسانیی ئەو بەرپرسیاریەتیە لە ئەستۆ بگرن.

[597]- FO, 371/5068, (Kurdistan) India Office, p. No, 7701, 20-11-1919, FO, 371/3657,Teleg from HC (Const) to, FO, 5-1-1919.

کوردستانیان دەوێت بە سەرکردایەتی میر بەدرخان و شێخ سلێمان ئاغای تەتار لە شەرناخ، ئەوانیش خاوەنی پشتگیریی بەهێزی خێڵایەتیی و ئاراستەی نەتەوەییان هەیە[598].

پشتگیریی بەریتانیا بۆ دەوڵەتی کوردیی لەو قەناعەتەوە هاتووە کە تورکیا لە گەورەترین خاك و هێزی مرۆیی بێبەش بێت، چونکە ئەم دەوڵەتە لە داهاتوو تورکیا دادەبڕێ لە دووبارە سەرهەڵدانەوەی وەکو هێزێکی مەترسیدار لەسەر ئەو حکومەتەی لە لایەن بەریتانیاوە پشتیوانی لێدەکرێ لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ و دەوڵەتی عێراقی ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا لە باشوور[599].

هەتا ساڵی (1920) بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی گفتوگۆی لەسەر دەکرا، ئەو بیرۆکەیەش لە دوای قوربانیدانی کوردەکانی ئێران و نزیکبوونەوە لە سەربەخۆیی، لە بەشی سیاسیی ئیدارەی بەریتانیی لە عێراق، زیادی کرد، ڕۆس (Rose) لە بەشی کوردیی نووسینگەی نوێنەرایەتی بەریتانی لە بەغدا پێشنیازی کردبوو، کە دەبێت ناوەندی کوردستانی سەربەخۆ لە ئەرمینیا بێت[600].

لەگەڵ ئەوەدا پێشنیاری (ڕۆس) بە پێشێلکاریی ڕێککەوتننامەی دوو قۆڵیی ئەنگلۆ - ئێرانی ساڵی (1919) دادەنرێت، رۆس قەناعەتی لەسەر ئەوە بنیات نابوو، کە تاکە ڕێگەچارەی درووستە لەلایەن حکومەتی بەریتانیاوە بۆ چەسپاندنی بارودۆخی سنووری ڕۆژهەڵاتی عێراق، لە بابەت هێرشەکانی داهاتووی کوردی ئێران بۆ سەر باشووری کوردستان نووسیویەتی: "بەردەوامبوونمان لە پشتگیریی حکومەتی ئێرانیی قورسە، ئەگەر پشتیوانیی خۆمان کشاندەوە دەبێتە گەڕەلاوژە، حکومەتی ئێرانیی وەکو تێبینی دەکرێ زوو بێ، یان درەنگ ئەگەر دەستی تێوەرنەدەین دەڕووخێ، بەشێکی گەلی کورد ئەو دەسەڵاتە بە توندیی ڕەتدەکەنەوە، ئەگەر بتوانێ خۆی ڕزگار دەکات لە دەسەڵاتی

---

[598]- Air, 20/512 from Special Secret Service (SSO Mosul Captain A Launder to SHQ Mesopotamia Baghdad 12-2-1919.

[599]- Noel Diary (19-20) Die Welt des Islam 47 (1947)pp.93-94

[600]- Ramazani Foreign policy of Iran 1900-1914 Carloheville university Press, 1966, p.161.

ئێرانیی و دووباره داوای لکاندنی به دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانەوە دەکات، که به ئاسانیی دەخرێته سەر ئەو دەوڵەته، ئایا ئەو کاته ئێمه پێی دەڵێین نابێت؟ ئایا به زەبری هێز دووری دەخەینەوە؟ لەگەڵ ئەوەدا هەر هەوڵێکی ترساندنی کورد بۆ مانەوەی له ژێر دەسەلاتی حکومەتی ئێرانیی، که هەوڵ دەدات خۆی لێ ڕزگار بکات، ئەوە دەسەلاتی ئێمه لەو بەشانەی کوردستان دەکەوێته لەرزین، ئێمه بۆ هێشتنەوەی دەسەلاتمان ئامادەنین پشت به هێز و سوپا ببەستین، کوردیش لەو بڕوایەدان حکومەتی ئێرانیی شێداره و هەتا سەرئێسقان بۆگەن بووە"[601].

له ساڵی (1920) حکومەتی بەریتانیی درکی بەوە کردووە دروستکردنی دەوڵەتی کوردیی به سوودە بۆ دژایەتی هەڕەشەی بەلشەفیو کەمالیەکان له تورکیا، له ئەیلولی (1920) سەید تەهای فەرماندەی جولانەوەی کوردی له ناوچەی سنووری ئێرانی ـ تورکی کۆنگرەیەکی به ئامادەبوونی پیاوماقوڵ و سەرۆکه کوردەکان بەست بۆ وتووێژ لەسەر سەربەخۆیی کوردستان[602].

له ساڵی (1920) باڵیۆزی بەریتانیی له ئەستەمبوڵ پێشنیازێکی له شێخ عبدالقادری نەهری وەرگرت له بارەی پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیی بۆ شەش ویلایەتەکەی باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیا، فەرید پاشای سەرۆك وەزیرانیش پشتگیریی لەو پێشنیازه کرد[603]. له نیسان و تەمووزی هەمان ساڵدا حکومەتی بەریتانی حسابی گرنگی بۆ ئەو پێشنیازه کردو به ڕێوشوێنی کاریگەریی دانابوو له بەرانبەر پێشڕەویی بەردەوامی بەلشەفیەکان بەرەو سنووری تورکیاو ئێران، ڕێگەچارەیەکی تر بووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی کەمالیی له ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ، ئەو هێزانەی کۆسپو بەرهەڵستن له بەردەم ئارەزووی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیی له واژووکردنی ڕێککەوتنامەی

---

[601] -Air 20/512 (A note on the Kurdish claims to Uremia District of Persia) M.G. Rose Baghdad 1/Kurdish Bureau 8-7-1919.

[602] - FO,371/5069 Memo No Sc 33897/12 from Pol. Arbil to CC Baghdad 25-9-1920, Hay: Two Years.. pp.333-334, Bell, Review of Civil Administration,p.69.

[603] - Air 20/512 Teleg from CC, to GHQ ,Mesopotamia 18-4-1920

ئاشتیی لەگەڵ هاوپەیمانەکان[604]. ڕای فەرید پاشا درووستکردنی دەوڵەتی کوردی خودمختار بووە لە ناو تورکیا، بە ئەدمیراڵ ڕۆبیك (Admiral Roebuck)ی وتبوو: "تۆ مستەفا کەمالت خۆش ناوێ، ڕێککەوتن، یان پەیماننامەی لەگەڵ ئێوە ناوێ، سەرکردە کوردەکانیش خۆشیان ناوێ، چونکە بەلشەفیەکان دێنێ بۆ پشتیوانیی خۆی، کەواتە پێکەوە کورد لە دژی ئەو بەکاردەهێنن"، باڵیۆزی ناوبراو لایەنگری ئەو بیرۆکەیە بوو، بەڵام ڕوونی کردەوە کە هاوکاریی فەرەنسیی لەو بارەیەوە پێویستە[605].

ئەم بۆچوونە لە کۆتایی (1920) گۆڕانی بەسەردا هاتو کوردستانی سەربەخۆ بووە ناکردەیی، هۆی ئەم گۆڕانەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك، لەوانە: چەسپاندنی ئارامیی لە وڵاتانی دراوسێی عێرا ق بەتایبەتی تورکیاو ئێران، پێشبڕکێی ئینگلیزیی - فەرەنسیی لە ناوچەکە، هەروەها ناکۆکیی ناوخۆیی کوردەکان کاریگەریی خراپی هەبووە لەسەر هەوڵەکانی حکومەتی بەریتانیی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی.

ئەو بیرۆکەی حکومەتی بەریتانیا، کە ڕاستەوخۆ لە دوای شەڕ هاتە کایەوە، بریتی بووە لەچەسپاندنی باری ئارامی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە تاکە زامنی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیایە لە ناوچەکەدا.

لەبەر ئەمە بووە کە بەریتانیا دەترسا لە درووستکردنی دەوڵەتی کوردیی، چونکە لە داهاتوو ڕەنگدانەوەی دەبوو لەسەر کوردی ئێران، لە ساڵی (1917)، واتە بەر لە ساڵی (1918)، ڕێکەوتننامەیەك هەبوو لە نێوان بەریتانیا و ڕووسیا کە هەردوولا پابەند دەکات بە پاراستنی یەکێتی خاکی ئێرانیی، هەردوولا ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیان لەناو سنووری ئێران هەبوو، بەڵام لەناکاو شۆڕشی بەلشەفی ساڵی (1917) کۆتایی بەو ڕێکەوتننامەیە هێنا، هەر ڕاستەخۆ دوای شۆڕش هەردوولا گەڕانەوە بۆ پێشبڕکێی پێشوو، سیاسەتی ئیمپریالستی ڕووسیی لە ئێران سەرلەنوێ گەڕایەوە بۆ هەڕەشە لە

604 - FO,371/5068, teleg from SS, for Col, to CH, Baghdad 26-11-1920,Teleg, From APO, Rawanduz to pol Baghdad.17-4-1919

605 - -FO,371/5067, Memorandum, by Mr, Rayon const, to, FO 28-28-7-1920.

بەرژوەندییەکانی بەریتانیی لە ئێران، بەو حیسابەی دەوڵەتێکی گرنگ و نزیکە بۆ بەرگریی لە هیند[606].

بە ڕێکەوتننامەی بەریتانیی - ئێرانیی ساڵی (1919) گەڕانەوە بووە بۆ پابەندبوون بە بڕوای تەقلیدیی لەسەر یەکێتی خاکی ئێران، ئەمە شوێنێکی ستراتیژیی پێکهێنا بوو لە بیری سیاسییی بەریتانیی و هۆکارێکی گرنگ بووە لە کاتی چارەسەری کێشەی کورد، پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ بۆ کورد لە باشووری کوردستان لە ئاییندەدا ئاماژە بووە بۆ کورد لە ئێران، کە ئەو کات لە شۆڕشدا بوون بۆ جیابوونەوە، ئەمەش مانای لێکهەڵوەشانەوەی دەوڵەتی ئێران بووە، بۆیە بەرپرسانی بەریتانیی رازی نەبوو بە پشتگیریی کوردەکانی ئێران، کە لە ساڵی (1918) خستبویانە بەردەم شێخ مەحمود و فەرمانی پێکردبوون گوێڕایەڵیی حکومەتی ناوەندیی بن لە ئێران، لە ئازاری (1919) بە هۆی بەرپرسانی بەریتانەوە بە سەید تەها پێی ڕاگەیەنرابوو، کە حکومەتی پایەبڵندی پاشایەتی بە بەردەوامیی پابەندە بە یەکێتی خاکی ئێران، ئامۆژگاریی کرابوو هاوکاریی لەگەڵ سمکۆ بوەستێنێ[607]. (ولسۆن) لە ئابی (1919) نووسیویەتی: (ئێمە

[606] -Ramazani, p.139, 160-161 Br, Doc 4,Memo by Earl Curzon in Persia, No 118911/150/33, 9-8-1919, p.1121, lord Curzon.

لۆرد کیرزۆن لە کاتی پارێزگاریی لە پەیماننامەکە دەڵێ: "دەبێت وا سەیری یەکێتی خاکی عێراق بکەین کە لە پێشینەی کاری ئیمپراتۆریەتی ئێمەیە"، لە ناو دەوڵەتی هاوسنوورو درێژبووەی نێوان هیند و ئەورووپادا وا دادەنرێ ئێران لاوازترین دەوڵەت بێت، لەگەڵ ئەوەدا زنجیرەی بەیەکەوە گرێدانی لە هەمووان زیندووترە، کیرزۆن لە مانگی ئابی (1919) ڕوونکردنەوەی لەسەر گرنگیی ئێران نووسیوە و دەڵێ: (بۆچی نابێت ئێران بۆ خویان لێبگەڕێین، وەڵام ئەوەیە شوێنی ئێران لە ڕووی جوگرافیی و ئەندازەی بەرژەوەندییەکانمانو داهاتووی ئیمپراتۆریەتەکەمان لە ڕۆژهەڵات چەند مەسەلەیەکن، داوامان لێدەکەن گرنگیی بە ئێران بدەین، سەرەڕای ئەوە دەوڵەتێکی خاوەن ئینتیدابی خۆمان هەیە، کە عێراقە، ئەمەش دەماخاتە سەر سنووری ڕۆژهەڵاتو حاڵەتی بەرژەوەندیی هاوبەشیش هەیە، ناتوانین ڕێگە بدەین بە ناوچەیەکی پڕ لە ئاژاوەو مەترسیدار، یان گەڕەلاوژەی ئابووریی لە نێوان سنووری ئیمپراتۆریەتەکەمان لە هیند و پارێزراوە تازەکانمان)، سەرەڕای ئەمە ئەگەر ئێرانمان بۆ خۆی واز لێهێنا ئەوە بەلشەفیەکان بە هۆی پێگەیان لە باکوور بەسەریدا زاڵ دەبن، لە دوایی ئێمە سامانی گەورەمان هەیە لە کانیی پەترۆڵ لە باشووری ئێران.

[607] - Bell, Review of Civil Administration,pp.69-71, Hay, Two Years.. ,pp.353-354, FO, 371/5069 Memo No SC, 3387/12, 25-9-1919 from BI.

به هەرچی لە تواناماندا بێت هەوڵ دەدەین بۆ لاوازکردنی هەر ڕێگەیەك لە لایەن کوردی ئێرانەوە لە گۆڕێدا بێت بۆ جیابوونەوە لە ئیدارەی حکومەتی ئەویٚ)[608].

سەرەڕای رێوشوێنی ڕێکەوتننامەی ئەنگلۆ - ئێرانیی، حکومەتی بەریتانیی داوای پشتیوانیی دەکرد بۆ حکومەتی ئێرانیی چاککردنی بارودۆخی سنووری ئێرانیی - تورکیی لە بەرژەوەندیی ئێران، لە کاتی کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس لە ساڵی (1919) نەسرو دەولەی (وەزیری دەرەوەی ئێران) داوای لە بەریتانیا کردبوو هاوکاری بێت بۆ بەدەستهێنانی هەرێمەکانی کوردستانی باکوور "ویلایەتەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیای ئێستا"، لەگەڵ زۆربەی بەشەکانی کوردستانی باشوور بۆ دروستکردنی "کوردستانی یەکگرتوو" لە ناو ئێران[609]، بەڵام حکومەتی ئێرانی دوودڵ بوو لەو پشتیوانییە بە هۆی شۆڕشی بەردەوامی ئەو کاتە لە کوردستانی ئێران، ئەمەش بەڵگەی ئاشکرایە کورد نەیوستووە بخرێتە ژێر دەسەڵاتی ئێرانیی[610]. سەرەڕای ئەمە بەرپرسانی بەریتانیی لەو باوەڕەدا بوون ئەگەر حکومەتەکەیان هاوکاریی بە پەلەو کاریگەری ئێرانیی نەکات کوردەکان بەرەو جیابوونەوەو سەربەخۆیی دەچن، لە کانوونی دووەم قونسوڵی بەریتانیی لە تەورێز لە ڕاپۆرتێکیدا نووسیویەتی: (ناوچەکانی نێوان خۆی و سەلمان "لە باکووری ڕۆژئاوای ئێران" لە ژێر دەستەڵاتی هێزی سمکۆدایە، ئەمەش شۆڕشگێڕانی تر هاندەدات و ئەو وڵاتە لێکهەڵوەشێتەوە، بۆیە پێشنیاز دەکەم سمکۆ سەرکوت بکەن، یان بە شێوازێکی ڕەقتر مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، چونکە لە لای بەریتانییەکان ئەو خراپترین سەرکردەی کوردە)[611]. لە تشرینی دووەمی

---

Baghdad, to pol, April, High Commission Iraq, Administrative Report 1920-1922, pp.69-70.

608 - Wilson, Loyalties, 11, p.142

609-- Br, Doc Nesreted Dawla Foreign of Iran Teleg from Earl of Curzon to Earl of Derby (paris) No 127, 25-10-1919, Persian minister to Earl Curzon 17-11-1919, No 153056/ 150/34, p.1238 .

610 - Br Doc 4,Teteg. From Earl of Curzon to sir P.Cox (Tehran) un nob 28-11-1919, p.1284 letter Persian minister to FO, No 877, tr, P.2172 .

611 - Air 20/512 Ismail Agha Simko (in) personalities-Mosul Arbil and Frontier) 19-2-1919, SS, Mosul to GHQ 29-12-1919 Teleg From Tarbiz to Tehran No 89, 7-4-1919.

(1919) پێرسی کوکس (Perce Coks) وەزیری بەریتانیی لە ئێران ڕایەکی تری بە پێویست زانی بوو لەسەر وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیی، کە ڕاستەوخۆ هێزێك بنێریت بۆ هاوکاریی حکومەتی ئێرانی لەر شەڕی دژی شۆڕشگێڕە کوردەکان، سێر بیرسی کوکس و بەرپرسانی بەریتانیی لە عێراق گومانیان وابوو سەرکەوتنی کوردی ئێران لە بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، ئاکامی مەترسیداری دەبێت لە شێواندنی باری ئاسایشی عێراق، چونکە سمکۆ بە تەنیا بانگی کوردی ئێران ناکات، بە هۆی دروشمی ئیسلامیی و بانگەوازی نەتەوایەتیی، ڕەنگدانەوەی فراوانی دەبیٚو هەموو خاکی کوردان گوێی لێدەگرن[612].

سەرەڕای ئیدارە و سوپای بەریتانیی لە باشووری کوردستان ئێرانییەکان پێویستیان بە دابینکردنی ڕژێم و یاسایەك هەبوو بۆ کوردستان، چونکە کوردستانی سەربەخۆ، یان خودموختار، لە ناوچە سنوورییەکان لەگەڵ عێراق دەبووە هەڕەشە بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا[613].

سروشتی دابەشکردنی کوردستان لەگەڵ مانەوەی پەیوەندیی دۆستایەتیی نێوان سیٚ دەوڵەتە پەیوەندییدارەکە نابێتە هۆی تێکگیران، یان گریٚو گۆڵ ئەگەر هەر یەکێك لەو دەوڵەتانە بتوانیٚ بە شێوەیەکی کاریگەر زاڵ بێت بەسەر بەشەکەی خۆی، بەڵام کەوتنی هەریەك لە حکومەتە دیکتاتۆرەکانی ئێرانو تورکیا بارودۆخێکی تازەو ناڕێك لەسەر خاکی عێراق درووست دەکات[614].

بەدرێژایی وتووێژەکان حکومەتی بەریتانیی لە بابەت داهاتووی تورکیاوە هێمنیی و ئاسایشی ئەو وڵاتەی مەبەست بووە، چونکە بڕوای وابوو هەر بەرگرییەکی چەکداریی لە لایەن کوردەکانی تورکیا کاریگەریی دەبێت لەسەر نائارامیی کوردستانی عێراق، لەگەڵ ئەوەدا ئەو ڕاستیەمان لە بیر نەچێت، لە حوزەیرانی (1919) (نویل)یان نارد بۆ دووەم گەشتی بە ناوچەکانی سەرووی هێڵی ئاگربەست، لەویٚ هۆزەکانی ئاگادارکردەوە کە

---

[612] - Br Doc 4,Teteg. From sir p.Cox to Earl of Curzon, No, 747,21-11-1919, p.1242 Air 20/512 (Note by Major) to I.O, No, 20627, 2-7-1919.

[613]-- FO 371/4151, Teleg from CC, Baghdad, to FO,5-4-1920.

[614] - Less,(Two Years in South Kurdistan, p.253.

پێویستە بە یاساوە پابەندبن لە پێناو گرەنتی ئاشتی لە سنوورەکانی باکووری عێراق و دەوروبەری[615].

نویڵ بە مەبەستی ئاسانکاریی دوو کەسایەتی ناوداری خاوەن پێگەی لە میرەکانی بەدرخان لەگەڵ خۆی بردبوو، بەو هیوایەی بتوانێ کاریگەریی ئەوانە بەکاربهێنێ بۆ هاندانی ئاشتیی لەر ناوچە پڕ لە کێشەکان، ئەوەشمان لە بیر نەچێت ئەمە لە کاتی وتووێژەکانی ئاشتیی بووە، هەروەها لە ئازاری (1919) سەرکردە کوردەکان لە پێناو وتووێژ لەسەر شێوازەکانی خستنەگەڕی کورد لە دژی هێزە ناسیۆنالیستەکانی تورك لە مەلاتیەی ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ کۆبوونەوە، کۆلۆنێل (بێڵ ـ Bell)ی سەرۆکی هەواڵگریی بەریتانی لە حەلەب بە پەلە چووە ناوچەکە، بۆ ئەوەی رازییان بکات مادام کۆنگرەی ئاشتیی لە پاریس بەردەوامە بڵاوەی لێبکەن و هیچ بەرگرییەکی چەکداریی ئەنجام نەدەن، کۆلۆنێل بۆی ڕوونکردنەوە هاوپەیمانەکان بە ئارەزووی کورد کێشەکە چارەسەر دەکەن، بەو مەرجەی هیچ کێشەیەك لە ناوچەکە ئەنجام نەدەن، ئەوانیش کۆبوونەوەکەیان بەتاڵ کردەوە[616].

لە ماوەی سالانی (1919)و (1920) کۆلۆنێل بێڵ لەگەڵ جولانەوەی کوردو کۆمەڵە کوردییەکانی وەکو (کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردی) لە هەوڵی بەدەستهێنانی هاوکاریی فەرەنسییەکان بوو بۆ قەدەغەکردنی چالاکیی دژ بە کەمالییەکان[617]، زیاد لەوەش لە ناوەڕاستی (1919) هەتا (1920) هەموو بەرپرسانی بەریتانیی لە ئەستەمبوڵ و بەغدا بەپێی ڕێنومایییەکانی نووسینگەی دەرەوەی بەریتانیا دەڕۆیشتن، کە هاوکاریی هیچ کۆمەڵەیەکی کوردیی نەکرێت خەبات بکات بۆ بەرگری چەکداریی لە دژی تورکیا، هەر بۆ نموونە لە سالی (1919) لە شەرناخ شێخ عەبدوڕڕەحمان دوا

---

[615] - FO,371/5068 (Sulaimanyah) by CB, soane 19-1-1919, Air 20/313 (Northern Kurdistan) Report P.4-5, Wilson, Loyalties, 11,p.146, Br, Doc 4 Teleg from Admiral De Report Const Earl Curz0n No 2271 Enclosure in No 616 (Memorandum) by Ryan 4-12-1919, pp.921-922.

[616] - Noel Diary p.1 Br, Doc 4 Teleg from Admiral De Roebuck to Earl Curzon, No, 2271, 4-12-1919,enclosure No 616 Memo by Ryan p.22.

[617]- Suriya Badr Khan, pp.140-141 Shilrko, p.83.

کارتی خستە بەردەم بەرپرسانی بەریتانی لە موسڵ و داوای چەكو تەقەمەنیی لێکردن بۆ ئەوەی لە هێرشی چەکداریی دژی هێزی کەمالیەکان بەکاری بهێنێ، بەڵام بێئاکام بوو[618]، وا دیاربوو بەرپرسان لە موسڵ ڕێنومایی کرابوون هیچ هاوکارییەکی ماددیی و سیاسییی ئەوانە نەکەن، کە داواکاری پشتیوانیی دەکەن بۆ ئەنجامدانی چالاکیی دژ بە کەمالیەکان[619]. شێخ عبدولقادری نەهریی لە کانوونی یەکەمی ساڵی (1919) لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ بە هاوکاریی وەزیری عوسمانیی لەسەر ڕکێفی ڕەشبگێریی بوو لە دژی کەمالیەکان، سەرۆکی کورد لە لایەن باڵیۆزی بەریتانیی لە ئەستەمبوڵ ئاگادار کرایەوە، ئەمە پرۆژەیەکی پڕ مەترسیدارە و مەسەلەی کورد لە کۆنگرەی ئاشتیی تووشی گرفتی گەورە هاتووە، حکومەتی بەریتانیی جەختی کردەوە کە بەرژەوەندیی هەموو لایەك پاراستنی ئاشتیی و ئارامییە لە ناوچەکەدا[620]. هەروەکو (فرنسۆن) بە ئاشکرا ڕوونی کردەوەو وتی: بەریتانیای گەورە لە تورکیا ئارەزووی پشتگیریی جوڵانەوەی سەربەخۆیی ناکاتو ئەوە دەبێتە هۆی هەرەسهێنانی ئەو وڵاتە.

(سیاسەتی بەریتانیی هەتا نیوەی (1920) کوردانی هاندابوو لەسەر ئەو باوەڕە کە بەریتانیا بۆ سەربەخۆیی لایەنگرییان دەکات، لەو ماوەیەدا بەریتانیا هانی هەوڵەکانی تورکیا بووە لە پاڵ ئەو باوەڕەی کە لە کۆتاییدا کورد بەرەو دەوڵەتی سەربەخۆ نەچێت، بەڵام بەکارهێنانی کورد بەو شێوەیە سوودی دەبێت بۆ بەدەستهێنانی پاشەکشەی سیاسییی جوڵانەوەی ناسیۆنالیستی تورکیی بۆ بەریتانییەکان، بەتایبەتی بە درێژایی سنووری عێراقیی - تورکیی)[621].

ئەوە بەکارهێنانی ئاقڵانەی کورد بووە بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوتی سیاسییی لە لایەن بەریتانیاوە لە ناوچەکە و لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە بە هەمیشەیی

---

618 - Air 20/513 letter from Sulaymania Agha Tater, Reis of Ashirat Shenack to PO, Mosul 25-6-1920

619 - FO 371/5068, Teleg from HC, Baghdad, to SS, Col, No, 115, 23-12-1920

620- Br, Doc 4,Teleg from Admiral De Roebuck (Const) to Earl of Curzon 9-12-1919,p.927

621 - Olson Emergence of Kurdish Nationalism, p.25

له بەکارهێنانی کورددا بوون بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی سیاسییی لە ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی و بەتایبەتی لە عێراق.

چاوتێبڕینی فەڕەنسا لە کوردستان هۆکارێکی تری دوودڵیی بەریتانیا بووە لە پێکهێنانی دەوڵەتی کوردیی، بەپێی رێکەوتننامەی سایکس ـ بیکۆی ساڵی (1916) (Sykes Pico agreements) زوربەی ویلایەتی موسڵ دەکەوتە چوارچێوەی فەڕەنسا، بە مەرجی پاراستنی بەرژەوەندییە نەوتییەکانی رووسیا لە ناوچەکەدا[622]. لە تشرینی دووەمی (1918) بەدیار کەوت، کە ڕێکەوتننامەی (1916) پێویستی بە چاوپێخشاندنەوە هەیە، چونکە باری سیاسییی بە شێوەی ڕیشەیی گۆڕاوە، بەریتانیا داواکاری نوێی پەیوەست بە ویلایەتی موسڵی خستە بەردەم فەرەنسیەکان، بەرپرسانی فەرەنسیی ڕێگەیان پێنەدرابوو هاوکاری دارایی بەسەر بەرپرسە خۆجێیی و پیاوماقوڵەکاندا دابەش بکەن[623]. زۆربەی هاووڵاتیە کوردەکان ئەوەیان لە بەردەم میستەر نویڵ دەربڕی، کە هەڵوێستی کلاسیکیی فەرەنسا لە پاراستنی کریستانەکان وای کردووە، لەبەرچاوی کورد شایستە نەبن بۆ ئەرکی پێکهێنانو چاودێری یەکێتی فیدراڵی کوردیی[624]، سەرەڕای ئەمە بەرپرسانی بەریتانی لە عێراق سەرکەوتووبوون لە ڕاکێشانی سەرکردە کریستانەکانی دۆستی فەڕەنسا لە ناوچەکەدا، هەروەها جالیە یەهودیەکانیش ببوونە دۆستی بەرپرسانی بەریتانیی[625]، ئینگلیزەکان درکیان بە هەڵەی خۆیان کرد لە دانانی ویلایەتی موسڵ لە ژێر دەسەڵاتی فەڕەنسییەکان، لەبەر ئەوەی پێشتر کۆمپانیای نەوتی تورکیی ـ ئینگلیز مافی دەرهێنانی نەوتی بەدەستهێنابوو، ئەمەش مانای دانانی بەرژەوەندییە زیندووە ئابوورییەکانی بەریتانیای بووە لە ژێر دەسەڵاتی سیاسەتی فەڕەنسیی، کە بارێکی زۆر هەستیاری درووستکردبوو، بۆ ڕاستکردنەوەی بارودۆخەکە لە کانوونی یەکەمی ساڵی (1918) لوید جۆرج ( Lloyd George) لە کاتی سەردانەکەی بۆ لەندەن باوەڕی بەکلیمان سۆ (Clemenceau)

---

622 - Ca, 27/206 (British Desiderata in Turkey in Asia,30-6-1915.

623 - FO, 371/8593 Letter From Louis Mallet to French Ambassador in London, 14-11-1918

624 - Air 20/512 Teleg from Pol, Baghdad to, I.O, 9967,30-10-1918

625 - Ahiya, p.75.

کرد، که ڕازی بێت لەسەر لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی بەریتانی لە بەرامبەر پاشەکشەی بەریتانی لەسەر سنووری فەڕەنسیی ـ ئەڵمانیی لە سووریا[626].

لە ساڵی (1919)و ماوەی کۆنگرەی ئاشتیی هەڵوێستی فەرەنسا لەسەر مەسەلەی کورد ئەوە بوو کە دەبێت باشووری کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیادا بێت، عێراق و باکووری کوردستانیش دابەش بکرێت بەسەر ناوچەی بەریتانیی و فەڕەنسیی، لە ناوچەی ئینتیداب دوو دەوڵەتی کوردیی حوکمی زاتیی هەبن، بەڵام لە ڕووی تیۆریەوە مەسەلەی فەرمانڕەوایەتی لەو ناوچانە دەبووە هی تورکیا[627]. لە کۆنگرەی سێ لایەنیی کانوونی یەکەمی (1919) لە لەندەن، وەزیری دەرەوە (کیرزۆن) هەڵوێستی بەریتانیی لەسەر مەسەلەی کورد ڕوونکردەوە و سیاسەتی بەریتانیی ـ کوردیی لەسەر ئەم بنەمایانەی خوارەوە داڕشتبوو:

نابێت کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیی، یان فەڕەنسیی یەکبخرێت، چونکە سەرناگرێ و بۆ هەموولایەك بێ سوودە، بێجگە لە کوردستانی عێراق، کە دەبێت ملکەچی ئیدارەی بەریتانیی بێت.

ئەگەر بەناویش بێت بەڕێوەبەرایەتی تورکیی بەردەوام بێت لە کوردستان.

کورد دەتوانن ڕێنومایی کار و فەرمان لەگەڵ تورك و ئەرمەن دابنێن، لەو حاڵەتەدا مەسەلەکە دابڕاو بێت لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئەرمەنیی، کە فەڕەنسا و بەریتانیا لەسەری یەکدەنگ بوون.

دەبێت واز لە کورد بهێنین خۆیان بڕیار بدەن دەوڵەتێك، یان چەند دەوڵەتێکیان دەوێت لەو بەشانەی پەیوەندییان پێکەوە لاوازە.

---

626 -Br, Doc 4.Teleg from Gary to Cabman No 788, 15-5-1919 Liyod George, Teurth, p.1038 Shaw ran p.193-196 Halmreich from Paris to Severs (Columbus Ohio State Unviristy 1974) pp.206-207 Busch pp.69-70 Henry H.Coming Franco-British Rivalry in the Post-war Near East (west point Greenwood Press 1938) pp.67-69.

627 - Br Doc 4,French Nole on Kurdistan M, Bertha lot (No 1661, 33/3050/44) Ignores, Le 23rd December 1919, p.960.

زەمانەتی پارێزگاریی لە دەوڵەتی کوردی بدرێت بەرانبەر دوژمنکاری تورکیی، بەڵام دانانی راوێژکار لەوێ چاکترە فەرەنسیی بێ، یا بەریتانیی[628].

لەگەڵ ئەوەدا کۆنگرەی سێ لایەنە لە لەندەن، کە هەریەك لە ئیتاڵیا و فەرەنسا و بەریتانیای گەورە ئامادەی بوون چەند بابەتێکی گرنگیان چارەسەر کرد، بەڵام مەسەلەی کورد هەروا مایەوە، چونکە حکومەتی بەریتانیا خاوەنی تەواوی دەسەڵات بووە لە باشووری کوردستان، چەند مەسەلەیەکی بچووك کاریگەریی گەورەیان لەسەر کوردستانی سەربەخۆ هەبووە، بۆیە لە کاتی کۆنگرەدا، بەریتانییەکان فشاریان بەکاردەهێنا بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەی خێرا بۆ ئەو بابەتە، بە قسەکانیاندا دەردەکەوێ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردیی لەو بارودۆخە بەرەو لەبارچوون دەچێت، حکومەتی فەرەنسا توانی ڕەزامەندیی بەریتانیا بەدەست بهێنێ لەسەر چارەسەرنەکردنی مەسەلەی کورد[629].

ئەوکاتە لە ماوەی سالآنی (1919 – 1920) هەردوو حکومەت هەوڵیاندا پشتگیریی کەسایەتیە ناودارەکانی کورد بەدەستبهێنن، لە شوباتی (1920) شێخ عبدولقادری نەهریی بە قسەی فەرەنسا رازی بوو بە دامەزراندنی "کوردستانی سەربەخۆ" لە ژێر چاودێریی ئینتیدابی فەرەنسیی، بۆ هەمان مەبەست لە سووریا بەرپرسە فەرەنسییەکان پەیوەندییان کرد بە چەند کەسایەتیی بەدرخانییەکان، بەڵام ئەم هەوڵانە سەرنەکەوتن لە ڕاکێشانی کورد بە لای خۆیاندا[630]، لەبەر ئەوە رازیبوونی لەو جۆرە یانی رازیبوون بە دابەشبوونی وڵاتەکەیان بۆ ناوچەی بەریتانیی و فەرەنسیی، ئەو سەرکردە کوردانەی ئامانجیان کوردستانی یەکگرتووی سەربەخۆ بووە لە ژێر چاودێری بەریتانیی دوودڵ بوون لە هاوکاریی لەگەڵ حکومەتی فەرەنسیی[631]،

[628] .- Br Doc (third Meeting- Turkish Settlement) No 166415/1516711/44, PP.966-967

[629] - FO,371/5068 Teleg from SS, For India 23-3-1920, doc 4, Memo No, 7/1069, 2-7-1920. p.159

[630] - FO 371/5067, Teleg from De Roebuck to Curzon 24-2-1920, Cited in Halmreich p.301.

[631]- FO 608/95 19828, 24-10-1919.

ساردوسڕی لە چارەسەری مەسەلەی کورد و بڵاوبوونەوەی پڕوپاگەندەی دابەشکردنی کوردستان لە نێوان بەریتانییەکان و فەڕەنسییەکان بووە هۆی دوودڵیی و بێمتمانەیی لە ناو جوڵانەوەی نەتەوایەتیی لایەنگری بەریتانیا، حکومەتی بەریتانی ترسا ئەو تارماییەی دەوری چارەنووسی کوردی داوە لە دوای کۆنگرەی سێ لایەنە، سەرکردە کوردەکان رابکێشێتە ناو هاوپەیمانییەتی تورکیی، لەبەر ئەوە بە پەلە سیاسەتی خۆیان ڕاگەیاند کە حکومەتی پایە بڵندی پاشایەتی لە مەسەلەی کورد نایەوێ کوردستان دابەش بکات لە نێوان چاودێرییەتی بەریتانیی و فەڕەنسیی، ئێستا ئامانجی سەرەکیی و فەرمیی بەریتانیا ئەوە نییە کوردستان لە نێوان چەند دەوڵەتێك دابەش بکات، کوردستان خاوەن حوکمی زاتییە و دابڕاوە لە دەسەڵاتی تورکیی و ئێستا ئامانجی سەرەکیی و فەرمیی بەریتانییەکانە[632].

لە نیسانی (1920)و لە کاتی وتووێژەکانی پەرلەمانی بەریتانیی لەسەر مەسەلەی کورد، لە لای بەریتانیا مەسەلەی فەڕەنسا لە زەقترین بابەتەکان بووە، لۆرد کیرزۆن بە دیاری خست کە یەکێك لە بەرچاوترین هۆکارەکانی بەرهەڵستیەتی بەریتانیا لە دامەزراندنی حوکمی خۆجیەتی بۆ کوردستانی باشوور فەڕەنسیەکانن، کە دەیانەوێ رژێمێکی هاوشێوەی ئەوە لە کوردستانی باکوور لە ژێر چاودێریی ئیدارەی خۆیان دابمەزرێنن، وەزیری دەرەوەی بەریتانیا ڕوونی کردەوە کە ئەو ناکۆکییەی تێیکەوتبوو لەگەڵ وەزیری دەرەوەی فەڕەنسیی لەسەر بنەڕەتی ئامادەیی دەرچوونی حکومەتی بەریتانیا بووە لە کوردستانی باشوور[633]. ئەو گرفتە هەروا مایەوە لە کۆنگرەی سان ڕیمۆ (San Remo)ی نیسانی (1920) گەیشتنە چارەسەری کۆتایی، ئەمەش بە سەرکەوتنی دیبلۆماسیەتی فەڕەنسیی دادەنرێ، بەریتانییەکان ناچارکران وازبهێنن لە پشتیوانییەتی پێشوویان لە بیرۆکەی کوردستانی سەربەخۆی دوور لە حکومەتی تورکی، ڕەزامەندییان نیشاندا بۆ نەخشەی فەڕەنسا، کە داواکاری ئاسایشی شەرعیی بوو لە هەموو خاکی کوردان بۆ تورکیا، بەو گرەنتیە تا ڕادەیەك حوکمی خۆجێی خۆیان هەبێت، ئەو نەخشەیەی فەڕەنسا، کە لە بنەڕەتدا بە هۆی لیژنەی هاوبەشی فەرەنسیی

---

[632] - FO 371/5067, Teleg from FO, to HC (Const)23-3-1920

[633]- FO,371/5068 Interdepartmental Conference on Middle Eastern Affairs (Minutes) 13-4-1920, p.5

و ئیتالیی و بەریتانیی چەسپا بوو، بوو بە بەشی سێیەمی پەیماننامەی سیڤەر (severs)، کە لە ئابی (1920) لە نێوان هاوپەیمانەکان و حکومەتی عوسمانیی واژۆ کرا.

بەندەکانی (62، 64) پەیوەندیی بە کوردستانەوە هەیە و لە بڕگەی (62)دا دەڵێ:

(لەمەودوا لە سەرەتای دەستپێکردنی دەستبەکاربوونی ئەو ڕێکەوتننامەیەی لیژنەیەکی هەمیشەیی لە ئەستەمبوڵ بۆ ماوەی شەش مانگ دادەنرێت، حوکمی زاتیی خۆجێی بۆ ئەو ناوچانەی زۆرینەی کوردن لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات و باشووری سنووری ئەرمینیا و باشووری تورکیا لەگەڵ سووریا و عێراق)[634]، بەڵام لە بڕگەی (63) داوا لە حکومەتی تورکیی کراوە بە قبوڵکردن و جێبەجێکردنی بڕگەی (62)، لە بڕگەی (64)دا هاتووە کەی و چۆن کوردەکان دەتوانن داوا لە لیژنەی نەتەوەکان بکەن، لە کاتی ئارەزوومەندیی ئەوان سەربەخۆیی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی بەدەست بهێنن، هەروەها ئەو بڕگەیە ئاماژەی بە مافی کورد کردووە لە ویلایەتی موسڵ، کە دەتوانن بچنە ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیەی لە کوردستانی باکوور پێکدەهێنرێ[635]، بە ڕوونی بەدیار دەکەوێ بەریتانیای گەورە واز لە هەموو داواکارییەکانی ڕابردووی دەهێنێ، بەتایبەتی بەشە کوردییەکانی دەرەوەی ویلایەتی موسڵ، گۆڕانکاری بنەڕەتیی لە هەڵوێستی بەریتانیا لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە خێرایانە بووە، کە لە ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی بە گشتیی و لە کوردستان بە شێوەیەکی تایبەت ڕوویدا، لەگەڵ تێپەڕبوونی نیوەی ساڵی (1920) حکومەتی بەریتانیا لە لەندەن و بەرپرسە بەریتانییەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەوتنە داڕشتنی بیرۆکەی زیاتر واقیعی لە بەرامبەر مەسەلەی کورد، بە هۆی کەوتنی ئیدارەی شێخ مەحمود و سروشتی شۆڕشی هۆزەکانی باشووری کوردستان لە هەولێر و زاخۆ و ئامێدی و ئاکرێ بەرامبەر دەسەڵاتی بەریتانی، هەریەك لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا و بەرپرسانی لە هیند باوەڕیان کرد کە ئەو پێشنیازەی بەرپرسانی بەریتانیی پێشتر وتبوویان کورد پێشوازی لە ئینتیدابی

---

[634]- -Br, Doc, V111, (Noel of a meeting of the British, French and Italian Delegations) San Remo, on April 18-1920, I.C.P,p. 95, 11-13, 41-43, Jwaideh, (Kurdish National Movement) pt.11, 380-384 .

[635] -Jwaideh, (Kurdish National Movement) pt.1, pp.380-382

بەریتانی کردووە، ئەوە بۆ ئەو بارودۆخە لێکدانەوەیەکی ورد نەبووە[636]، سەرەڕای ئەوە دەسەڵاتی هێزەکانی کەمالیی لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ حکومەتی بەریتانیان رازی کرد، بەوەی کۆمەڵە کوردیەکان لە ئەستەمبوڵ ڕاستگۆ نین لەو پڕوپاگەندەیەی کورد لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ کەوتوونە ژێر دەسەڵاتی ئەوانەوە، ئەوانە زۆربەیان چوونەتە پاڵ جوڵانەوەکەی مستەفا کەمال لە جەنگەکانی دژ بە سوێندخۆرەکان، کە پەردەی ئیسلامەتی بە بەرخۆیدا کردبوو[637]. ڕاپەڕینی (1920)ی دژ بە بەریتانیا لە عێراق و ئاکامە خراپەکانی شەڕەکانی هەریەك لە قەوقاز و ئەفغانستان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی بەدوادا هات، ئەوەی سەلماند حکومەتی بەریتانیی لەسەریەتی "باری بەرپرسیاریەتی هەڵبگرێ لە بەرامبەر ئەوەی ناتوانێ بەرگریی لێ بکات"[638].

لەبەر ئەم هۆیە بوو گرنگیی بەریتانیا بە پاراستنی سنووری عێراق لە مەترسی دەرەکیی کلیلی سیاسەتی بەریتانیایە لە باشووری کوردستان، ئارەزووی حکومەتی بەریتانیی بە پتەوکردنی ئارامیی لە ناوچەکە لە داوی شەڕ وەکویەکی لێهات لە گرنگیی بنیاتنانی سیاسەتی ئەوان لە بەرامبەر کورد بە گشتیی و باشووری کوردستان بەتایبەتی، پێشبڕکێی فەرەنسیی و بەریتانیی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست شوێنەواری دیار و ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەر سیاسەتی بەریتانی لە کوردستان.

ماوەی ساڵانی (1918- 1920) حوکمی بەریتانیی لە کوردستان بە ئارەزووی بەهێزەوە بەرەو دەستەڵاتی ڕاستەخۆ بەدیار کەوت، بەڵام ئەم سیاسەتە دەستەوستان بووە لە دەرکردنی بڕیار و لاواز بووە لە بەرانبەر پێکەوەژیان، دانانی شێخ مەحمود وەکو فەرمانڕەوا بۆ هەموو کوردستان و دوای پێنج مانگ بەو خێراییە گۆڕانکاریی بنەڕەتیی لە سیاسەتیان بە شێوەیەکی لەناکاو، ئاماژە بووە بە سروشتی سەرسوڕهێنەرانە لە سیاسەتی بەریتانیدا، لە دوای ماوەیەکی کورت دوور لە شێخ مەحمود ئەزموونی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆ لە ژێر ئیدارەی سۆن لە سلێمانی هەستی کرد

---

[636]- Halmreich, p.204

[637] - FO, 371/6469, H. Remold (Turkey) Annual Report No. 428, 27-4-192: FO, 371/5068 In departmental Conference on Middle Eastern affairs (Minutes) 13-4-1920, p.5: FO,371/1193 Teleg from T.A Wilson to I.O, Unumb 27-11-1920 Busch, p.187 Wilson, Loyalties, p.194.

[638] -Busch, pp.238-239.

دەسەڵاتی ناڕاستەوخۆ بە ڕێگەی سەرکردە کوردەکانەوە تاکە ڕێگەچارەی لەبارە، ئەم درك پێکردنە بە ڕوونیی بۆمان بەدیاردەخات هەوڵەکانیان بۆ دانانی سەید تەهاو حەمدی بەگی بابان وەکو حوکمدار لە کوردستان بۆ جێبەجێکردنی هەمان سیاسەتی شکستخواردووی پێشتر بووە لەگەڵ شێخ مەحمود، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر لاوازیی سیاسەتی بەریتانیا لە بەرانبەر کورد، بە هۆی ناکۆکیی ناوخۆیی کورد لە دوای نەمانی ڕۆڵی شێخ مەحمود، کارەکە زیاتر ئاڵۆز بوو، تەقینەوەی ڕاپەڕینەکانی دژ بە بەریتانیا، کە چوارچێوەکەی لە دەسەڵاتی شێخ مەحمود فراوانتر بوو، هەروەها لە دوای هاواری پڕوپاگەندەی بەرپرسانی بەریتانی لە عێراق بەوەی شێخ مەحمود هۆکاری نووشستی سیاسەتەکەیان بووە، لە ڕاستیدا سەرنەگرتنی سیاسەتی بەریتانی لە کوردستان بەشێك بووە لە کۆی گشتیی نوشستی نەخشەی بەریتانیدا لە عێراق لە ماوەی ڕاستەوخۆی دوای شەڕ.

هەڵوێستی بەریتانیی پەیوەست بە کورد لەو ساڵانە هەمان هەڵوێستی بەر لە شەڕ بووە، نەخشەی جیاواز هەبووە بۆ بەکارهێنانی کورد وەکو هۆکارێکی هێمن کردنەوەی بارودۆخی عێراق، کە بەریتانیا بەسەریدا زاڵ بووە، هەمان بۆچوون و شێواز لە تورکیا لە لای بەرپرسانی دەوڵەت لە سەدەی نۆزدە هەبووە، هەوڵەکانی حکومەتی بەریتانیی لە بەکارهێنانی نەتەوایەتی کورد لە هێرشەکانیان دژی کاریگەرییەکانی جوڵانەوەی ئیسلامیی و بەلشەفیی لە ناوچەکە دەمانگەڕێنێتەوە بۆ بەکارهێنانی میری بابان لە پێناو بەدەستهێنانی ئامانجەکانیان لە عێراق، بڵاوبوونەوەی کورد و دابەشبوونی بەسەر ئێران و عێراق و تورکیا وای کردووە لە لایەن هێزە دەرەکییەکانەوە ئاسان بەکاربهێنرێن، ئەمە لە ساڵانی (1920) بۆ (1921) بە ئاشکرا رووی دا، مستەفا کەمال بە شێوەی کاریگەر کوردی بەکاردەهێنا بۆ دەرپەڕاندنی بەریتانییەکان لە ویلایەتی موسڵ.

بۆ سەرنەگرتنی ئەو نەخشەیە حکومەتی بەریتانیی گەڕایەوە بۆ نەخشە کۆنەکەی لە هاندانی نەتەوایەتیی، لە ساڵی (1922) جارێکی تر شێخ مەحمودی گەڕاندەوە بۆ کۆکردنەوەی کورد و دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی بە پشتیوانی بەریتانیا، ئیدارەی دووەمی شێخ مەحمود دەستی پێکرد، جێی سەرنجە زۆربەی ڕاپەڕینەکانی کورد لە ماوەی (1919 ـ 1920) بە ئاڕاستەی دژ بە ئینگلیز و بیرۆکەی جامیعەی ئیسلامیی

(Pan Islamism) بزواندونی و سەرۆکی هۆزەکان و شێخانی تەریقەتی سۆفیگەریی سەرکردایەتی کردوون، ئەمە نیشانەی بێهێزیی بیرۆکەی نەتەوایەتیی کورد بووە، پێشەنگی بیری نەتەوایەتیی لە سلێمانی و ئەستەمبوڵ لاواز و گۆشەگیر بووە لە خەڵك و ئیسلام بەهێزترین بزوێنەر بووە.

وەکو لەم لێکۆڵینەوەیەدا بۆمان دەرکەوت تورکە ئیتحادیەکان و ئینگلیز بۆ مەبەستی بەدیهێنانی بەرژەوەندییە سیاسییەکانیان لە کوردستان تۆوی بیرۆکەی نەتەوایەتیان لە ناو کوردا چاندووە*، بەریتانیا و فەڕەنسا و تورکیا ویستیان کورد وەکو پشیلەی راو بەکاربهێنن لە ناوچەکە بۆ جێبەجێکردنی نەخشە و پیلانە سیاسییەکانیان.

ئەم لێکۆڵینەوەیە سەلماندی کە ڕێکەوتننامەی سایکس - بیکۆ و سان ڕیمۆ، ڕێکەوتننامەی لەندەن لە نێوان دەوڵەتە سوێندخۆرەکان واژۆ کرا، نەخشە بووە بۆ دابەشکردنی کوردستان، ئەوەش دەرهاویشتەی ململانێی بەرژەوەندیی دەوڵەتە زلهێزەکانی ئەوروپاو دەوڵەتی عوسمانیی بووە. لەو ڕێڕەوەدا بارودۆخی بابەتی گەلی کورد کاریگەر نەبووە کە شایانی باس بێت، لاوازیی‌و پەرتەوازەیی سەرکردایەتی

* - دکتۆر لێرەدا بە سادەیی باسی سەرهەڵدانی نەتەوایەتیی کوردیی کردووە، سەرهەڵدانی بیری نەتەوایەتیی فرە رەهەندەو قۆناغ‌و خوێندنەوەی هەیە، شێخ مەحمودو هاوبیرانیشی لە شێخانی تەریقەت خوێندنەوەیەکی تایبەت‌و هی قۆناغێکی تایبەتی بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کوردایەتیین. وادەبینم زیاتر دکتۆر مەبەستی نوخبەی نەتەوایەتیی عەلمانی کوردیی بێت، پێموانیە حەمدی بەگی بابان، کە نەیتوانیوە بۆشایی شێخ مەحمود پڕ بکاتەوە سەر بە قوتابخانەی نەتەوایەتی عەلمانیی کورد بووبێت، ناشتوانین بیرو ڕێڕەوی سەرکردایەتی شێخ مەحمود و بنەماڵەی بەرزنجییش لێواو لێو لەسەر قوتابخانەی ئیسلامیی بۆ خوێندنەوەی کوردایەتیی دابنێین، ئێمە سەرکردایەتی شێخانی تەریقەت وەکو بەڕێز دکتۆر لە هەندێ شوێن بە (تەقلیدیی) ناوی دەبات، لەوە زیاتر نییە، کە پاشخانی فیکریی تێکەڵی هەیە لە (کەلتوری ئیسلامیی بە خوێندنەوەی تەریقەتی‌و تەقلیدی و خێڵایەتی‌و دەرەبەگایەتی لەگەڵ بیری کوردایەتیی بە رووخسارە پەرچەکردارەکەی دووریش نەبوو هیچ گرەنتیەك نەبووە ئەگەر مەلیکیەتی شێخ مەحمود بە تەواوی سەری بگرتایە ئەو دادگەرییە ئیسلامییەی دکتۆر باسی کردووە پەیڕەو دەکرد، چارەنووشی ئەو بنەماڵە پادشایانەی ئەو سەردەمە لە وڵاتانی دەوروبەر دیارە بە چ ئاکامێك گەیشتن. "وەرگێڕ".

تەقلیدیی کورد "ئاغا و شێخەکان" کارئاسان بوون بۆ یاریی هێزەکانی ئەوروپی بە کورد، ئەگەر دادگەرانە ئاماژە بە حاڵی سەرکردایەتی عەرەب، یان تورك، یان فارس بکەین ئەوانیش زۆر لە کورد باشتر نەبوون، بەڵام جوگرافیای سیاسییی کوردستانو بەرژەوەندیی داگیرکاران لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەتایبەتی ئارەزووی بەریتانیا لە بەرگری بەلشەفی (شیوعی)یەکان ڕێگەخۆشکەر بوون بۆ دابەشکردنی کوردستان و سەرهەڵدانی دەوڵەتانی ناسیۆنالیستیی لە تورکیا و ئێران و عێراق، هەروەها ڕێکەوتننامەی سیڤەر، کە هەندێ بە باڵایدا هەڵدەدرێ، هەنگاوی داگیرکاریی بوو بۆ دابەشکردنی کوردستانو درووستکردنی قەوارەی ئەرمەنیی لەسەر بەشێك لە خاکی کورد *.

* - بە خوێندنەوەیەکی تر پەیمانی سیڤەر یەکەم بەڵگەنامەی نێودەوڵەتیی بوو بۆ دابەشکردنی کوردستان، کە باسی کوردستانی ژێردەسەلاتی ئێران و کوردستانی سۆڤیەتو ئەو بەشەی بندەستی سوریای نەکردووە، چونکە لە بەرژەوەندیی هاوپەیمانەکان نەبووەو قسەی لەسەر نەکراوەو ناچنە سنووری ئەو دەوڵەتەی لە سیڤەری ئابی (1920) ناوی هاتووە، ئەمانە راستن، بەڵام ناوهێنانی ئەرمەن لێرەدا بە زیادە دەزانم، چونکە پرۆژەی کارتی ئەرمەن و قەوارەی ئەرمەن شوێنی خۆی هەبووە و دکتۆر بە وردیی شی کردۆتەوە. "وەرگێڕ"

هەتا ئێستاش لەسەر سروشتی جوڵانەوەی سمکۆ و ئامانجەکانی، لە ناو توێژەرەواندا مشتومڕێکی چڕ هەیە، سمکۆ لە ماوەی (1921– 1926) توانیویەتی سەرکردایەتیی جوڵانەوەی چەکداریی بکاتو حکومەتێکی کوردییدا بگەیەنێت، ئەم وتارە بە چەند بەڵگەنامەیەکی بەریتانیی و بۆچوونی نووسەرە هاوچەرخەکان هەندێك لایەنی نادیاری ئەو جوڵانەوەیە بەدیار دەخا، لە سەرەتاوە بۆچوونی توێژەرەوە کوردەکانو غەیری ئەوان لەو بارەیەوە دەخەینە ڕوو، دوایی ڕێڕەوی مێژوویی دەگرینە بەر بۆ لێکدانەوەی ڕووداوەکانو دواتر پوختەی ئەنجامگیرییەکانی ئەو ئەزموونە مێژووییە وەردەگرین.

بە شێوەیەکی گشتیی نووسەرەکانی خۆمان سمکۆیان خراپ بۆ وێنا کردووین، جەلال تاڵەبانیی لەو بارەیەوە دەڵێ: (جوڵانەوەیەکی خێڵەکی توندڕەو بووە... سمکۆ تاکڕەو بووە، لە کردەوە زیانبەخشەکانی وەکو سەرکردەیەکی دەرەبەگی زاڵم بەدیار کەوت..). لەسەر کوشتنی (مارشەمعۆن)ی سەرۆکی رۆحیی و سیاسیی تایەفەی ئاشووری لە ساڵی (1918) تاڵەبانیی دەڵێ: (ئەو تاوانو زاڵمیەتەی سمکۆ لە دژی برا ئاشوورییەکان ئەنجامی دا، لاپەڕەیەکی رەشە)[639].

دکتۆر عەبدوڕەحمان قاسملو باوەڕی وایە کوشتنی مارشەمعۆن بە دەستی سمکۆ کارێکی هەڵە و بە هاندانی ئینگلیز بووە[640]. دکتۆر کەمال مەزهەر لە باسی جوڵانەوەی سمکۆدا دەڵێ: دەبێت دان بەوەدا بنێین ڕووداوەکانی کوردستانی زەمانی شەڕ هەندێ واقیعی پێچەوانەی درووست کردووە، بۆ نموونە سمکۆ بە ڕەقترین شێواز مامەڵەی کردووە لەگەڵ ئازەریی و ئاشوورییەکان، کوشتنی مارشەمعۆن لە کارە هەرە خراپەکانی بووە[641].

هەر لەو بارەیەوە جەمال نەبەز دەڵێ: لە سیاسەتدا سمکۆ فەرماندەیەکی خێڵەکیی بووە، نەزان بووە و چەندان هەڵەی کردووە، بۆ نموونە هەڵوێستی سمکۆ نادادگەرانە بووە لە بەرانبەر برا ئاشوورییەکان، بووە هۆی چەندان شەڕ و نەگبەتیی نێوان ئەو دوو

---

[639] – كوردستان و الحركة الكردية. بيروت، دار الطليعة. 1971، ص115

[640] – كردستان والاكراد، ترجمة العربية، بيروت، ص 98

[641] – كردستان في سنوات حرب العامية الاولى، بغداد، مطبعة مجمع العلمي، 1977، ص221.

گەلە دۆستە کە بەهێزبوون بەرانبەر دوژمنی هاوبەش، هەروەها زیاد لە پێویست متمانەی هەبووە بە مستەفا کەمالی دیکتاتۆر[642].

هەڵوێستی خراپی نووسەرەکانی کورد لە بەرانبەر جوڵانەوەی سمکۆ چەندین هۆکاری هەیە، لەوانە:

یەکەم: ئەوانە لە نووسینەوەی مێژووی هاوچەرخی کورد کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی رۆژهەڵاتناسانی رووسیی "لە پێش و لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر"، ئەوانەی سەردەمی قەیسەر لایەنگری بەرژەوەندیی ناسیۆنالیستیی رووسیی بوون، دەستێوەردانی رووسیا لە کاروباری ناوخۆی ئێرانو تورکیا بە خاڵی ئەرێی تێدەگەن[643].

لازاریف ناوی سمکۆ دێنێت بە سادە و ساکار کە پشووی جێگیری نەبووە لەسەر سیاسەت[644].

ئەگەر لە سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بە دوای مێژووی جوڵانەوەی کورددا بگەڕێین، دەبینین سەرچاوە ئینگلیزییەکانیش لە مامەڵە لەگەڵ سەرکردەکانی کورد هەمان پرۆگرامیان پەیڕەو کردووە، بۆ نموونە ناوی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری بە دەمارگیر و دواکەوتوو دەهێنن، لای ئەوان شێخ مەحمود خراپەکارەو شێخ ئەحمەدی بارزان دەمارگیر و ئەقڵ تێکچووە، لە بەرانبەردا لە کوردستان ئەوانە "روناکبیر" بوون کە لە ژێر کاریگەریی خۆیاندا بوون[645].

دووەم: لێکدانەوەی هەڵوێستی خراپی نووسەرە کوردەکان لە بەرانبەر جوڵانەوەی سمکۆ کورت هەڵهاتووە لە گوزارشتی "هەڵە"و هەستکردن بە تاوانباریی بەرانبەر ئاشوورییەکان، بۆ لێکنزیکردنەوەی کورد و ئاشووریی ئینگلیز و ئاشوورییە هاوپەیمانەکانی سمکۆیان بە کۆسپی سەرەکیی زانیوە لە بەردەم هەوڵەکانیان بۆ بنیاتنانی قەوارەی ئاشووریی لە کوردستانی ئێران. لەو ماوەیە ئەفسەرە سیاسییەکانی ئینگلیز لە عێراق و ئێران تووڕەیی خۆیان بە سمکۆ ڕشت، بە"دەمارگیری

642 - کوردستانو شۆڕشەکەی، ستوکهۆڵم، 1985، ل125

643 - لازاريف: المسألة الكردية، ترجمة: عبدي حاجي، بيروت، 1991، ص228-230.

644 - لازاریف: هەمان سەرچاوە، ل229.

645 - W.jwaideh (Kurdish Nationalist Movement) Syracuse Univ. 1961.

موحەممەدیی" و "خۆفرۆش" و "زۆردار" و "خوێنرێژ" و "شێت و خۆویست" ناویان بردووە. خستنەڕووی بابەتییانە لەسەر کارەکانی سمکۆو جوڵانەوەکەی، پێویستی بە باسی واقیعیانە هەیە لەسەر باری رووداوەکانی ئەوکات..

سمکۆ لە ژینگەیەکی کوردیی پێگەیشتبوو، دوو جار دڵڕەقی پاشایەکانی ئێرانی چێشتبوو، لە ئەنجامی غەدر و خیانەت ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەکانی کورد و نەوەی هۆزەکەی کوژرا بوون، یان تووشی کارەسات ببوون، مستەفا پاشا یامولکی یەکێك بووە لە سەرکردەکانی جوڵانەوەی کوردیی لە سلێمانی لە چاوپێکەوتنی مێژوویی دانسقەدا لەگەڵ سمکۆ دەڵێ: (راستە بە شێوەیەکی بنەڕەتیی هەستی نیشتیمانی ئێمە دەبزوێنێ، بەڵام نکۆڵی لەوە ناکەم کە دەمەوێ تۆڵەی کوشتنی باوکمو باپیرانمو خزمەکانمو دوو لە برایەکانم لە ئێرانییەکان بکەمەوە، هەروەها دەمەوێ تۆڵەی ئەو سەرکردە کوردانە بکەمەوە کە بە زوڵم کوژراون، وەکو سلێمان خان و عەلی خان و ئەوانی تر)[646].

ئەوەی شایانی باسە لە ساڵی (1907ز) نیزام سەڵتەنەی دەسەڵاتداری ئازەربایجان بانگی جەعفەر ئاغای براگەورەی سمکۆی کرد بۆ تەورێز، بەو بیانووەی هاوکاریی بکات بۆ لە ناوبردنی جوڵانەوەی یاخیبوان، لەوکاتەی جەعفەر ئاغا گەیشتە تەورێز بە فەرمانی نیزام سەڵتەنە لە پشتەوە لێیانداو کوشتیان. لە ساڵی (1918ز) موکەڕەم مەلیکی دەسەڵاتداری تەورێز لە کیسەیەکدا مادەی تەقینەوەی نارد بۆ سمکۆ، کە بە کاغەزی دیاریی رازابۆوە، سمکۆ نەیزانی و وەریگرت، یەکسەر هەستی پێکرد کە تەقەمەنییە، ترساو فڕێی دا، تەقیەوەو برایەکی سمکۆو چەند کەسێك لە خزمەکانی کوژران[647].

کارەساتی زوڵمو خیانەت بەسەر خۆیو ئەندامانی خێزانەکەی سمکۆ کاریگەریی داناوە، هەتا متمانەی بە خزمە نزیکەکانیشی نەبووە، هەرچەندە خوشکی سەید تەهای نەهریی، نەوەی شێخ عوبێدوڵلا خێزانی بووە بەڵام خۆی لێ دەبوارد، چونکە سەید تەها دۆستی ئینگلیزان بووە.

---

[646] F.O.371\1778.Mustafa to Abdul Aziz, Sulaimani, December, 1921.

[647] - Hasan Arafat, The Kurds London. Oxford Univ… Press, 1966. P.50.

گەڕەلاوژەی سیاسییی سەر سنووری ئێران ـ تورکیی لە ئەنجامی ناکۆکیی چڕی دەوڵەتی عوسمانیی و رووسیای قەیسەری لەسەر پێگەی خۆیان لە ئەزەربایجان بارودۆخێکی ناڕێکی درووست کردبوو، لەسەر بڵاوبوونەوەی شەڕو سیخوڕیی لە ناو خێڵە کوردەکان، زۆربەی شەڕەکانی عوسمانیی و رووسیی و لە لایەکی تر عوسمانیی و ئێرانیی لە ناو کوردستان روویدا بوو، ئەمانە هەمووی لە ئەزموونی بەهرەمەندیی سمکۆ و سیاسەتمەداریەتیو قوڵکردنەوەی شێوازی براگماتیانەی زیاد کرد بوو. ئەو لە سەرەتاوە لە ساڵانی (1909–1918ز) هاوکاریی لایەنگرانی ئیتیحادو تەرەقی بووە، کە ویستوویانە دەسەڵاتیان لە ئازەربایجان لە ژێر چەتری بەهێزکردنی برایەتیی ئیسلامیی لە ناو گەلانی موسڵمانانەدا بەهێز بکەنو هەوڵیان داوە رووبەڕووی چاوتێبڕینی رووسی ببنەوە، سمکۆ هەر زوو زانی ئەندامانی ئیتیحادو تەرەقی بۆ تۆرانییەتی تورکیی کار دەکەن، دەیانەوێت هەستی ئیسلامەتی کورد بقۆزنەوە، لەبەر ئەوە بەبێ دوودڵیی یەکێك لە ئەندامە بەرزەکانی ئیتیحاو تەرەقی دایە دەست دەسەڵاتدارانی رووسیی، بەمەش متمانەی لای رووسەکان بەهێز بوو[648].

لە ماوەی (1912–1914ز) عەبدوڕڕەزاق بەدرخان هاتە ورمێ، داوای لە سمکۆ کرد پێکەوە دژی دەوڵەتی عوسمانیی و بە هاوپەیمانییەتی لەگەڵ رووس کار بکەن، عەبدوڕزاق بە تاوانی سیخوڕیی بۆ رووسەکان لای تورکە ئیتیحادیەکان مەحکوم بوو بە لەسێدارەدان، لە ساڵی (1913ز) عەبدوڕڕەزاقو سمکۆ کۆمەڵەیەکی فەرهەنگیو رووناکبیریی کوردییان بە ناوی (گەیخاندی) دامەزراند*، عەبدوڕڕەزاق رایگەیاند کە ئامانجی کۆمەڵە تەنیا بڵاوکردنەوەی هوشیاری نەتەوایەتیی کوردییە، پێدەچوو میر عەبدوڕڕەزاق کاریگەریی شارستانییەتی ئەرتودەکسی رووسیی لەسەر بووبێت، کار گەیشتە بانگەشە بۆ بەکارهێنانی ئەبجەدیەتی رووسیی بۆ زمانی کوردی[649]. ناکۆکیی نێوان سمکۆ و عەبدوڕڕەزاق زوو دەستی پێکرد، کۆمەڵەکە گۆڕا بۆ حزبێکی سیاسییی دۆستی رووسیا، شەڕیان لەدژی تورك راگەیاندو سمکۆش بەو هەنگاوە رازی نەبوو.

---

648 - Martin Van Bruin Essen Kurdish Tribes And The State of Iran. The Case of Shimko in Conflit of Tribe and State London Croon Helm, P.383.،

* - پێدەچێت هەر کۆمەڵەی (جیهانزانی) بێت. "وەرگێڕ".

649 - جليلي: المصدر السابق، ص172

سمكۆ وشیار بوو بە چاوتێبڕینی رووسیی لە ئازەربایجانی رۆژئاوا، پێیوابووە بۆ ئەو مەبەستە کورد بەکاردەهێنن، ئەوەی شایانی باسە لە ساڵی (1908–1914ن) لە چوارچێوەی نەخشەی رووسیی بۆ قوتدانی ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتو باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا، نزیکەی دە هەزار پسپۆڕی رووسیی لە ناوچەی ئازەربایجانی رۆژئاوا هەبووە، رووس هەوڵی زۆریان لە ناو هۆزە کوردەکانی رۆژئاوای ورمێ دا، کەنیسەی ئارتۆدەکسی ئەوکات بزوێنەری سیاسەتی رووسیی بووە بەرانبەر دەوڵەتی عوسمانیی[650].

زۆربەی هۆزەکانی کورد لە کوردستانی ئێران چوونە پاڵ عوسمانیی، سەرەڕای دەستبەسەرکردنی لەلایەن دەسەڵاتدارانی رووسیا، سمکۆ هەڵوێستی بێلایەنیی و خۆخافڵاندنی گرتەبەر، بۆ سوود وەرگرتن لە کورد لە ساڵی (1916) سمکۆیان کردە حاکمی ناوچەی (خۆی)و پێنج هەزار رۆبڵی زێڕیان پێدا[651]، لە ئۆکتۆبەری ساڵی (1917) کۆدەتای کۆمۆنیستەکان ڕوویدا، رووسیا لە شەڕ کشایەوە، سمکۆ و هاوکارانی هێرشیان کردە سەر ئەو هێزانەی رووس کە پاشەکشەیان کردبوو، چەکو تەقەمەنیی زۆریان دەستکەوت، لە کاتێکدا هێزەکانی تورکیا دووبارە گەڕانەوە بۆ ئازەربایجانی رۆژئاوا، نزیکەی سێ هەزار ئەفسەرو سەربازی کوردستانی تورکیا، کە لە ناو هێزەکانی تورکیی لە ئازەربایجان کاریان دەکرد دایانە پاڵ سمکۆ، بەمەش سمکۆ بووە گەورەترین هێزی سەربازیی ناوچەکە، مەبەستی سمکۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی بووە لە ویلایەتی هەکاری تورکیاو ئازەربایجانی هاوسنووری، ئەمەش لەگەڵ ئاواتی ئاشوورییەکان تێکدەگیرا، کە ئەوانیش خاوستی پێکهێنانی دەوڵەتیان هەبووە[652].

لە ساڵی (1918ن) کێشەی ئاشووریی و ئەرمەنیی لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا هاتە سەر خوانی رووداوەکان، سەدان ساڵ بوو لە ناو دەوڵەتی عوسمانیی ئاشووریی و ئەرمەنەکان لەگەڵ برا موسڵمانە کوردەکانیان بە ئاشتیی و تەبایی ژیاون، ئەم

---

[650] 0 S. Shaw, History of Ottoman Empire. P211-212.

[651] - Bruin Essen. P.384

[652] - Bruin Essen, pp.384. Marfa. P.56.

راستییەش لە کاتی کێشەی موسڵی (1924)، لە ڕاپۆرتی کۆمەڵەی گەلاندا باس کراوە[653].

ئاشووریی و ئەرمەنەکان لەگەڵ ئەوەدا لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانیی هاووڵاتی دەوڵەتی عوسمانیی بوون، بەڵام لە ڕووی سیاسییی و سەربازییەوە دۆستی سوێندخۆرەکان بوون، هێزەکانی ئاشووریی بە فەرماندەی بەترۆس ئاغا سەدان گوندیان لە ناوچەی هەکاریی سوتاند و وێران کرد، هێزە ئەرمەنییەکانیش بەرفراوانتر ئەو کارەیان دووبارە کردەوە، بە چەك و پارەی ئینگلیز و رووس کەوتنە کوشتن‌و ئاوارەکردنی نزیکەی ملیۆنێك کورد. هێزەکانی رووسیی لە کاتی کشانەوە لە کوردستان چەکەکانیان دا بە هێزەکانی ئاشووریی، هەروەها قونسوڵی فەڕەنسی لە ئەستەنبوڵ یارمەتی هێزەکانی ئاشووریی دا. هێزی ئاشووریی بە سەرۆکایەتی مارشەمعۆن دەستیان گرت بەسەر شاری ورمێ‌و دەورووبەری، هەتا سەدان ئافرەتی کورد لە لایەن چەکدارەکانی ئاشوورییەوە لە ناو ورمێ دەستگیرکران، لە کاتی ئامادەکردنی هێزەکانی ئاشووری ناوەندەکانی ئاشووریی لە لەندەن و پاریس دەستیان کردە بانگەشەی پێکهێنانی قەوارەی ئەرمەنیی لە کوردستان "لە هەکاریی و ورمێ"[654].

ئینگلیز مارشەمعۆنی راسپارد هاریکاری کاتیی لەگەل سمکۆدا بکات، بۆ دەرپەڕاندنی پاشماوەی دەسەلاتی هێزەکانی ئێرانیی لە ناوچەی ئازەربایجانی رۆژئاوا، سمکۆ درکی بە مەبەستی ئاشوورییەکان کردبوو، چونکە چەك‌و تەقەمەنیی و پشتگیریی رۆژئاوا، یان مسۆگەرکرد بوو بۆ دامەزراندنی قەوارەی ئاشووریی لەسەر بەشە گرنگەکانی کوردستان، بۆیە سمکۆ بیری لە لەناوبردنی مارشەمعۆن کردەوە، دەیزانی لەناوبردنی مارشەمعۆن دەبێتە هۆی لاوازکردنی هەیبەتی هێزە نانیزامیەکەی، کە لە چەند خێڵی ناتەبا پێکهاتووە. ئینگلیزەکان بە ناردنی هێزێکی سەربازیی بە فەرماندەی ژەنەرال (دوینز) بۆ پشتیوانیی لە ئاشوورییەکان کەوتبوونە هەڵەوە، لە ئازاری (1918ز) سمکۆ بۆ مەسەلەی وتوێژ لەسەر هاوپەیمانییەتی ئاشووریی - کوردیی دژی ئێرانییەکان مارشەمعۆنی بانگ کردە گوندی (کونە شەهر)ی نزیك سەلماس، مار

[653] - League Nations. (Question of Frontier Between Turkey and Iraq.(

[654] - Arfa. P.53

شەمعۆن بە نزیکەی (150) چەکداری ئەرمەنیی و ئاشوورییەوە ئامادە بوو، لەو کاتەی هەردووکیان پێکەوە لە ناو گوندەکە دەڕۆیشتن، سمکۆ چەکی لە یەکێك لە پاسەوانەکانی وەرگرتو خێرا مارشەمعۆنی کوشت، دوایی شەڕ کەوتە ناو پاسەوانەکان، لەو شەوەدا زۆربەی هێزەکانی ئەرمەنیی و ئاشووریی یاوەری مار شەمعۆن، کوژران، ئینجا لە ورمێ شەڕ لە نێوان کورد و ئاشووریی دەستی پێکرد، سەدان کەس لە هەردوولا کوژان، بە هۆی نەمانی سەرکردایەتی ئاشووریی و دواکەوتنی هێزی فریاکەوتنی ژەنەراڵ (دوبین)، شەڕەکە بە بەرژەوەندیی هێزەکانی سمکۆ کۆتایی هات، هێزە تێکشکاوەکەی ئاشووریی بە ئاڕاستەی هەمەدان کشانەوە، لە ڕێگە دەیان گوندیان تالاَن کرد و سوتاندیان، (250) ئافرەتی کوردیان وەکو سەبایە لەگەڵ خۆیان فڕاند، لە دواییدا سەید تەها داوای لە ئینگلیزەکان کرد هاوکاریی بکەن بۆ گەڕاندنەوەی ئەو ئافرەتە کوردانە کە بردبوویانن بۆ عێراق[655].

ئەو شێوازەی مارشەمعۆنی پێ کوژرا نامۆ بووە بە دابونەریتی کوردان، واباوە کە دوژمنی میوان لەسەر خاکی خانەخوێ ئەمین دەبێت، بەلاَم لای سمکۆ و ئەو ژینگەیەی ئەوی تێدا گەورە بووە پڕ بووە لە غەدر و هەموویان لە هەوڵی بەکارهێنانی کورددا بوون، لە ناویاندا مار شەمعۆن، بۆیە بڕیاری لەناوبردنی درا، ئەو بڕیارە سیاسییە میکاڤیلیانە و براگماتیە بارودۆخەکە بەسەری دا سەپاندبوو، سمکۆ بەم کارەی بەشێکی گەورەی کوردستانی رزگار کرد، کە لەوانە بوو بە پشتیوانیی هاوپەیمانەکان بیکەنە قەوارەیەکی ئەرمەنیی، ئەگەر ئەو ماوە مێژووییە بە هێند وەربگرین چی لە فەلەستین روویدا، ئەوە دوور نەبوو خەونی ئاشوورییەکان لە ژێر چاودێریی و پاسەوانییەتی رۆژئاوا بهاتایە دی، لەو کاتەی هێزەکانی ئاشووریی لە عێراق پاڵیان دابوو بە هێزەکانی لێڤی، وازیان لە قەوارەی نەتەوەیی تایبەت بە خۆیان نەهێنا بوو، لە ماوەی سالاَنی (1918-1932ز) داوایان لە ئیدارەی بەریتانی لە عێراق دەکرد قەوارەی نەتەوەییان لە هەرێمی دهۆك بۆ پێکبهێنێ، دواتر ویلایەتی هەکاریی پێوە بلکێنن، ئەم نەخشەیەش لە واقیعدا سەرکەوتوو دەبوو، ئەگەر هۆزەکانی کورد بە سەرۆکایەتی شێخ ئەحمەدی بارزانی و شێخ نورەدینی بامەڕنی و شێخ مەحمودی حەفید بەرەنگاری نەبوونایەوە[656].

---

[655] - F.O. 371\5064, Ofice of Commissioner. Baghdad. Oct. 8.1920.

[656]-- Longing Iraq: 1900-1950

له شوباتی (1919ز) سمکۆ له ئازەربایجانی ڕۆژئاوا کارگێڕییەکی میری پێکهێناو بەرپرسی لەو شارو گوندانە دانا کە سەر بە ئەو بوون، لە ناویاند شاری ورمێ، هەروەها داوای کۆبوونەوەیەکی بەرفراوانی کرد بۆ سەرۆك هۆزو پیاوە دیارەکانی کوردستانی ئێران لەسەر دامەزراندنی (ئەنجومەنی سەرۆك هۆزەکانی کوردستان)، لەو کۆبوونەوەیەدا بە گەرمیی وتووێژ کراوە لەسەر ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردیی، هەتا لەسەر داکۆکیی سەید تەهاو ئامادەبووان ڕاگەیاندنی دەوڵەتیان دواخست، بۆ ئەوەی دیراسەی بکەنو هەڵوێستی دەوڵەتەکانی ئەورووپی دەربکەوێت، سەید تەها پێیوابووە دەوڵەتی کوردیی رابگەیەنن هاوپەیمانییەتی تورکیی ـ ئێرانیی لە دژی کورد پێکدێت، ئەو لەو بڕوایەدا بوو دەوڵەتی کوردیی زەمانەتی پاراستنی بەریتانیی دەوێ، لە مایسی ساڵی (1919ز) سەید تەها بە نوێنەرایەتی سمکۆ چووە بەغدا بۆ وتووێژ لەگەڵ ئینگیز لەسەر دەوڵەتی کوردیی، سەید تەها لە بەغدا ئەم داواکارییەی کوردانی خستە بەردەم بەرپرسانی ئینگلیز:

1– بەریتانیا پشتیوانیی لە دەوڵەتی کوردیی بکات، کە پێك بێت لە ویلایەتە کوردیەکانی تورکیا و ئێران.

2– حکومەتی بەریتانیی پشتیوانیی دارایی و سەربازیی لە دەوڵەتی کوردیی بکات لە بەرانبەردا کورد وەکو ڕژێمی پاشایەتی لەعێراق ڕازی بێت لەژێر ئینتیدابی بەریتانیدا بێت.

3– ئەگەر ئینگلیز ئارەزووی نەبوو پشتیوانیی دارایی و سەربازیی کورد بکات، ئەوە کورد دەیەوێ ئینگلیز کۆسپ نەخاتە بەردەم هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی.

سەید تەها هەوڵی دا ئینگلیزەکان دڵنیا بکات کە دەوڵەتی کوردیی خزمەت بە بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی بەریتانیا دەکات لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دەبێتە بەربەست لە بەردەم خزینی شیوعییەکان بۆ عێراقو داگیرگەکانی بەریتانیی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئینگلیز بە پێشنیازەکانی سەید تەها ڕازی نەبوو، چونکە پێشتر لە ساڵی (1919ز) ڕێکەوتننامەی دۆستایەتیی و هاریکاریی لەگەڵ ئێراندا بەستبوو کە پابەند دەبێت بە پاراستنی حکومەتی ئێرانیی و یەکیەتی خاکەکەی، سەید تەها بە دەست بەتاڵیی گەڕایەوە، هەرچەندە سمکۆ هەوڵیدا بە خۆی پەیوەندیی بکات بە هێزا

(ت. ا. ولْسن)ی یاریدەدەری حاکمی گشتیی بەریتانیی لە بەغدا و داواکاریی کوردانی بۆ دووبارە بکاتەوە، بەڵام بێئاکام بوو.[657]

لەمەڕ کورد ناکۆکیی لە نێوان هەڵوێستی سیاسیی بەرپرسانی ئینگلیز لە عێراق و ئێراندا هەبووە، بەجۆرێ هێژا (م. ج ڕۆژ) ئەفسەری کاروباری سیاسیی لە بەغدا لە یاداشتنامەکەیدا بە ناوی (کورد لە ورمێ و خۆزگەکانی)، داوای لە حکومەتەکەی کردووە پێشنیازی دەوڵەتی کوردیی بکات، چونکە کارێکی گونجاوە و لە ڕاستیدا هەیە، نووسیویەتی: (بێویژدانیی و نادادگەرییە یارمەتی دەسەڵاتی ئێرانی گەندەڵ و خۆسەپێنەر بدەین لە بەرانبەر گەلێك کە رازی نابێت و ئارەزووی ئازادیی و مافی چارەنووسیان هەیە...)

هێژا (برستۆ تۆریس) ئەفسەر بووە لە تەورێز و ناحەزی سمکۆ بووە بە "دەمارگیریی موحەممەدیی" ناوی دێنێ، داوای لە حکومەتی بەریتانیی کردووە مامەڵە لەگەڵ بکوژی کریستاناندا نەکات[658].

سمکۆ لە دوای بێئومێدی لە هاریکاری ئینگلیز، ویستی دەسەڵاتی لە ناوچەکە بەهێز بکات، بە لایەنگرانی، شارەکانی رۆژئاوای ورمێ وەکو (خۆی، سەلماس، ورمێ، لکستان، دیلمان، سەقز، بانە و بۆکان) داگیر کرد، هێزەکانی زاڵبوون بەسەر رێگای گشتیی وشکانیی بە ئاڕاستەی تەورێز، هێندەی نەمابوو تەورێز بگرن، سوپای بەریتانیی و رووسیی هاتنە فریای سوپای تێکشکاوی ئێرانیی، پسپۆڕی رووسی (فلیوف)و پسپۆڕەکانی ئینگلیز لە عێراق و ئازەربایجانی رۆژئاوا، رۆڵی گرنگیان گێڕا لە چەکدارکردنی هێزەکانی جەندرمە و قەوزاق و هێزی نیزامیی ئێرانیی، هەتا هێزەکانی ئێرانیی بە شوێن هێزەکانی کوردەوە بوون بەرەو ناوچە شاخاوییەکان، دوایی سمکۆ لەگەڵ سوپای ئێرانیی گفتوگۆی دەستپێکرد، ئێران ئەوکات لەبەر لاوازیی خۆی دانی نا بە دەسەڵاتی سمکۆ بەسەر زۆربەی ناوچە کوردییەکان، بەو مەرجەی لە دەسەڵاتی کارگێڕیی ناوخۆیی تێنەپەڕێ[659].

---

[657] - Van Bruin Essen, p.386.

[658] - Air, 29 p512, Teleg. Tabriz 7. 1919.

[659] 0 Van Bruin Essen, p.387.

له ساڵی (1920ز) ویلایەتی هەکاریی له هێزەکانی تورکیی رزگار کرا، هۆزە چالاکەکانی ناوچەکە، بەتایبەت هەرکیی و ئەترۆشیی و حەیدەرانلی بە فەرمیی پەیوەندییان بە سمکۆوە کرد، له دوای شەڕێکی خوێناویی، دووبارە هێزەکانی کورد دەستیان گرتەوە بەسەر شارەکانی سابلاخ و سەقز و بانە و سەردەشت، کورد توانی بێجگە له سنە و کرماشان، دەستبگرێ بەسەر کوردستانی ئێران، له پایزی (1922ز) سمکۆ له کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆك هۆزەکانی کورد، دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی راگەیاند، بۆ ئەو مەبەستەش پشتی بەستبوو بە رێکەوتننامەی سیڤەری واژۆ کراوی (1920ز) نێوان دەوڵەتی عوسمانیی و هاوپەیمانەکان له پاریس*، حکومەتی سمکۆ رۆژنامەی (کوردستان)ی دەرکرد، ئاڵای کوردی هەڵدا کە پێکهاتبوو له نەخشەی دوو چیای پتەوی بەرگریی، له دەوری کوردستانی سەربەخۆ[660].

بە لای ئینگلیز و ئێرانییەکانەوە جوڵانەوەی سمکۆ و درووستکردنی دەوڵەتی کوردیی پیلانی تورکیا بووە، بۆ لایەنگیریەتی مستەفا کەمال، هەتا سنوورێك بۆ دەسەڵاتی بەریتانیی دانێت و نەهێڵن هاوپەیمانەکان قەوارەی ئەرمەنیی دابمەزرێنن[661].

سمکۆ لەسەر ئامانجی جوڵانەوەکەی قسە دەکات و دەڵێ: (ئێمەی کورد له دوو لاوە مەینەتیی دەسەڵاتی ئەوانمان چێشتووە، کاتی ئەوە هاتووە گەلی کوردستان له زوڵمی ئەوان رزگاری بێت). هێژا مستەفا پاشا یامولکیی پرسیاری لێکردووە، بۆچی جەختی کردۆتە سەر ئێران، "پرسیار له سمکۆ له وتووێژی ناوبراو"، له کاتێکدا کوردستانی تورکیاش بە دەست زوڵمەوە دەناڵێنێت، سمکۆ دەڵێ: (چونکە حکومەتی ناوەند لێرە

* - پەیمانی سیڤەر سنووری ژێر دەسەڵاتی سمکۆ ناگرێتەوە، چونکە ئەو بەڵێنەی له پەیمانی سیڤەری ساڵی (1920ز)دا هاتووە بۆ دروستکردنی حوکمڕانی کوردیی، بەهیچ شێوەیەك باسی کوردستانی رۆژهەڵات "کوردستانی ئێران"ی تێدا نەبووە. "وەرگێڕ".

[660]- عەبدولعەزیز شەمزینی: جوڵانەوەی رزگاریی نیشتمانیی کوردستان، و/ ئەسەسەرد. ل106-107. لازاریف: ل239.

کتێبەکەی لازاریفم لەبەر دەستدا نەبوو، بەڵام له کتێبەکەی (شەمزینی)، چاپی دووەمم سەیر کرد لەو بەشەی پەیوەندیی بە سمکۆوە هەبوو، ئەو برگەیەی تێدا نییە کە باسی چۆنیەتی ئاڵای کردبێت. "وەرگێڕ".

[661] -لازاریف: المسألە الکردیە: ص239

لاوازەو دەتوانین کوردستانی ئێران بکەینە مەڵبەندی رزگارکردنی ناوچەکانی تر)، لە وەڵامی پرسیارێکی یامولکیی لەسەر پڕوپاگەندەی هاوپەیمانییەتی نێوان ئەو و تورکە ناسیۆنالیستەکانی ئەنقەرە، سمکۆ لەو بارەیەوە دەڵێ: (من تورکە ناسیونالستەکانی ئەنقەرەم خۆش ناوێت، پێموایە لە هەموو کەس دوژمنترن بە کورد، چەند جار هەوڵم داوە سەرنجی حکومەتی ئینگلیز رابکێشم، بۆ ئەو مەبەستە سەید تەهام نارد، دەزانم زۆر پێویستمان بە پشتیوانیی ئەوان هەیە، بەڵام دەرگامان لەسەر داخراوە، ئێستا ئێمە چەك لە ناسیۆنالیستە تورکەکان وەردەگرین، پێویستمان پێیەتی و ناتوانین بەبێ ئەوە درێژە بە شۆڕش بدەین، من ئێستا پەیمان و بەڵێنی هەموو پەیمانێك دەدەم لەگەڵ ئینگلیز کار بکەم، بەو مەرجەی تۆ بچیتە لایانو رازیان بکەی هاوکارییمان بکەن. متمانەمان بە خۆمانە ئەگەر پشتیوانیی ئینگلیزمان دەست بکەوێ شارە کوردییەکانی تریش وەکو ئەرزڕۆم، سیواس، هەکاری و بەدلیس پاك بکەینەوە... دەرسێك بدەین بە تورك هەرگیز لە بیری نەکەن، بە شەرەفم دەتوانین هەتا ئەنقەرەش رزگار بکەین).

هێژا مستەفا یامولکیی پرسیاری لێکردووە: بۆچی ئاشوورییەکانت کوشت، بەتایبەتی مار شەمعۆنی ئاشتیخواز و دۆستی کورد؟ سمکۆ دەڵێ: (مار شەمعون دەیویست بەکارمان بێنێ بۆ لەناوبردنی پاشماوەی هێزەکانی ئێرانیی لە ئازەربایجانی رۆژئاوا بۆ راگەیاندنی دەوڵەتی ئاشووریی، دوایی بابداتەوەو خۆی لە کوردیش رزگار بکات.... ئێمە بە تەواوی لەوە دڵنیایین ئەو لەلایەن ئەفسەرانی رووسیی و هەندێ لە بەرپرسانی ئەورووپی پشتیوانیی لێدەکرێ). لە کۆتاییدا هێژا یامولکیی لێی دەپرسێ: بۆچی لە کاتی رزگارکردنی مهاباد هێزەکانتان هەندێ هاووڵاتیان کوشتووە؟ سمکۆ لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێ: (لەسەر رێنومایی ئێمە نێردراومان چووە لای سەرۆك هۆزەکان هەتا بێنە لامان، کەسیان نەهاتن، هێزەکانی ئێرانیی ناچاری شەڕی ناوشاریان کردین، لەوێ قوربانیی لە هەردولا هەبوو لەگەڵ خەڵکی شار... وەکو دەزانی رەشاشەکان تەقەیان لە هێزەکانی ئەوان کردووە کە تێکەڵاوی شار و هاووڵاتیان بوون، لەو کاتە ناتوانین خۆیان بپارێزن، قوربانیانی خەڵکیی بێتاوان و دیاردەی دزیی و تالآنیی هەبووە)[662].

[662] - F.O. 371\1778. Musta, to Abdu – Aziz Sulaimani. December. 12. 1921 pp.7-11.

لەو چاوپێکەوتنەی سەرەوە بەدیار دەکەوێ کە مامەڵەی سمکۆ لەگەڵ ناسیۆنالیستەکان لەسەر جەمسەری بەرژەوەندیی بووە، کە بە هۆی بارودۆخ و کاریگەریی جوگرافیی و سیاسیی بەسەری دا سەپا بوو، هەر ئەم بارودۆخە و لێکدانەوەیە بووە لە ئێستا و رابردوو سەرکردەکانی کورد ناچار بوون مامەڵە لەگەڵ ئەو هێزە هەرێمییانە بکەن کە لە وڵاتی خۆیان کورد سەرکوت دەکەن. ئەم دیاردەیە وەکو خولانەوە لە ناو بازنەدا حلانەوەی کورد پێدا تێدەپەڕێو بەڵگەیە لەسەر بایەخی بەستنەوەی تێکۆشان بۆ لابردنی زوڵم لەسەر کورد لەگەڵ تێکۆشانی گەلانی دراوسێو هەوڵدان بۆ هێنانە کایەی گۆڕانکاری ریشەیی لە بەغدا و ئەنقەرە لە جیاتی هەڵەبجە و سلێمانی و شەرناخ و دیاربەکر.

سمکۆ لە ڕووی سیاسییەوە وەها سادە نەبووە ئایندەی خۆی بە مستەفا کەمالەوە ببەستێتەوە، بەڵکو هەوڵی داوە دەروازەی پەیوەندیی تر بدۆزێتەوە، لە ساڵی (1921ن) ئەحمەد تەقی پرسیاری راوبۆچوونی سمکۆی کرد لەمەڕ راپەڕین لە ناوچەی رەواندز بە پشتیوانیی تورك، دژی ئینگلیز، سمکۆ ئامۆژگاریی ئەحمەد تەقی کردووە لەبەر دوو هۆ شۆڕشی دژ بە ئینگلیز بە چاك نییە:

یەکەمیان: لەناو عێراق مستەفا کەمال ناچێتە ناو ململانێی سیاسیی و سەربازیی لەگەڵ ئینگلیز.

دووەمیان: ئینگلیزەکان ئامادەی سەرکوتکردنی ئەو شۆڕشەن.

سمکۆ پێشنیازی کرد کە کوردی عێراق هۆکاری یەکەمی هەوڵەکانی بن بۆ دامەزراندنی قەوارەیەك بۆ کورد لە کوردستانی ئێران، سمکۆ ئەحمەد تەقی میوانی ڕاسپارد کارێکی گرنگ ئەنجام بدات، ئەویش بەیەکگەیاندنی سمکۆو رووسیایە، سمکۆ ئەحمەد تەقی نارد بۆ تەورێز هەتا چاوی بە ئەفسەری سیاسیی سۆڤیەتی بکەوێ، داوای پشتیوانیی لێ بکات بۆ کورد، کە وەکو جاران وەڵامی بەرپرسانی سۆڤیەتی خراپ بوو[663].

سمکۆ داوای لە شێخ عەبدولقادری نەهریی کرد لە ئەستەنبوڵ لە لای باڵیۆزی بەریتانیی داوای پشتیوانیی بکات بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی لەسەر سنووری

[663] -خەباتی گەلی کورد لەیاداشتەکانی ئەحمەد تەقی دا، بەغدا، 1970، ل 82.

عێراقیی ـ تورکیی ـ ئێرانیی، هێژا عەبدولقادری نەهریی کە ئەوکات سەرۆکی کۆمەڵەی بەرزیو پێشکەوتن (جمعية الترقي و التقدم) بوو، چەند جار لەگەڵ ئینگلز دووبارەی کردۆتەوە، کە سمکۆ ئامادەیە کار بکات بۆ بەرژەوەندیی هاوبەش، هەوڵیدا بە هەڕەشەی کۆمۆنیستیی بە مەترسیی لەسەر بەرژەوەندییەکانی ئینگلیز بترسێنێ، پێی وتبوون: دەگونجێ ئەو دەوڵەتە بەربەست بێ لەبەردەم خزینی کۆمۆنیستیی، کەچی هەموو هەوڵەکانی بە بادا چوون[664]، هەوڵەکانی سمکۆ لە یەککاتدا نیشانەی لێوەشاوەیی سیاسییی و براگماتیانەی بیرکردنەوەی ئەو بووە، کەچی سەرکردایەتی کورد لەساڵی (1963ز) تا (1975ز) هەموو کارتەکانی خستبووە بەردەمی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا..

هەندێ هەڵەش هەبووە لە تێڕوانینی ناواقیعیی سمکۆ بۆ مەسەلەی هاوسەنگی هێزەکانی نێودەوڵەتیی و هەرێمیی، بۆ نموونە سمکۆ و سەید تەهای نەهریی داوای پشتیوانییان لە بەریتانیا کردووە لە دژی تورکیاو ئێران، ئەمە لە کاتێکدا پێشتر بەریتانیا لەگەڵ وڵاتانی ئیقلیمیی واژۆی کردبوو کە یەکیەتی ئەو دوو دەوڵەتە دەپارێزێ، چونکە ڕاگرتنی هاوسەنگیی هێزی نێودەوڵەتیی ئەو سیاسەتەیە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە بەسەر بەریتانیادا سەپاوە کە بەرژەوەندییە ستراتیژییە ئیمپریالیستیەکانی بریتی بووە لە ڕاگرتنی کۆمۆنیستیی و فراوانخوازیی سۆڤیەتی بەرەو ئاوە گەرمەکان لە کەنداو، بۆیە بەریتانیا ویستویەتی قەوارە ناسیۆنالیستە نیشتیمانییەکان بپارێزێ، هەتا ببنە بەربەستێك لە بەردەم خزینی رووسیا، درووستبوونی دەوڵەتی کوردیی دەبووە سەرهەڵدانی دیاردەی نائارامیی و لەتبوونی قەوارە ناسیۆنالیستەکان کە دەرهاویشتەی ڕێکەوتننامەی (سایکس ـ بیکۆ)ی ساڵی (1916ز)و لۆزانی (1923ز) بوون. رووسەکانیش لای خۆیانەوە دۆستایەتیی سەرکردایەتی عێراق و تورکیا و ئێرانیان پێ چاکتر بووە لە بەدەستهێنانی دۆستایەتیی سەرکردایەتی جوڵانەوەی کورد کە لەسەر بنەمای بەرژەوەندییەکانی خێڵەکیی و ئیقلیمیی بنیات نراوە، هەتا سۆڤیەت گۆڕانکاریی لە بەغدا و ئێران و تورکیا بە ڕێگەی پارتە کۆمۆنیستە کاراکانی ناو ئەو دەوڵەتانە بە باشتر زانیوە، لەوەی پیشت ببەستێ

[664] - F.O 371\1778 Memorandum by Ryan-January. 20.1922.

به پارته کۆمۆنیسته ناکۆکەکانی ناو کورد، کۆمەڵێك گۆڕانکاریی ناوخۆ و دەرەکیی یاریدەدەر بوون بۆ گۆڕانی هاوسەنگیی هێز لە کوردستان لە بەرژەوەندیی هێزەکانی ئێرانیی، لە شوباتی (1921ز) رەزاخان (رەزاشا) کۆدەتای سەربازیی راگەیاند، زیائەدین تەباتەبائی (ضیاء الدين طباطبائي) بووە وەزیری جەنگ، رەزاخان لە سەرەتاوە بۆ یەکخستنی هێزەکانی پشتی بەستبوو بە پسپۆڕانی رووسیی، یان ئینگلیز. لەو بارەیەوە چەند رێککەوتنێکی سەربازیی و بازرگانیی بەست، هەروەها رەزاشا خۆی وا دەرخست کە سەرکردەیەکی نیشتیمانییە و ئێرانی لە لێکهەڵوەشاندنەوە رزگار کردووە، ئێرانییەکانیش لەگەڵ تێڕوانینی جیاواز و ناکۆکییەکانیان، لە دەوری کۆببوونەوە. متمانەی ئێرانییەکان گەیشتە ئەندازەیەك (700) کۆمۆنیست بەسەرۆکایەتی (هال قوربان)ی فەرماندەی شۆرشی سۆڤیەتی لە گەیلان هاتن بۆ کوردستان بۆ شەڕی سمکۆ و جوڵانەوەی کورد، لەو شەڕانەدا (هالۆ قوربان)و زۆربەی لایەنگرانی کوژران[665].

حکومەتی ئێرانیی (ئەمیر دەولە)ی نارده لای مستەفا کەمال، هەردوولا بە نهێنی رێککەوتن لەسەر یەکخستنی هەوڵەکان بۆ دەستبەسەراگرتنی جوڵانەوەی سمکۆ، هەروەها بەرپرسانی ئیدارەی بەریتانیی لە عێراق و ئەفسەرە سیاسییەکانی ئینگلیز پشتیوانیی حکومەتی ئێرانیی بوون بۆ لەناوبردنی جوڵانەوەی سمکۆ[666].

لە هاوینی ساڵی (1922) ئێران نزیکەی سێیەکی هێزە نیزامیەکانی ناردە کوردستان، کە ژەنەراڵ (جیهان بانی) سەرۆکی ئەرکانی هێزەکانی ئێرانیی فەرماندەی چالاکییە سەربازییەکانی دەکرد، نەخشەی دانابوو لە چوار لاوە بدەن لە هێزەکانی کورد، سمکۆ لەلای خۆیەوە نزیکەی (10) هەزار چەکداری لە زۆربەی خێڵەکانی کوردی لایەنگری خۆی کۆکردبۆوە، سەرەڕای سەدان ئەفسەرو سوپای نیزامی کوردستانی تورکیا کە لەگەڵ سمکۆ کاریان دەکرد، شەڕ چەند هەفتەیەك بەردەوام بوو، هەردوولا زیانی گەورەیان لێکەوت، ژمارەیەك کوژراو و بریندار هەبوو، شەڕەکان گەرم بوون، چەکدارە کوردەکان سەدان هێرشیان کرد، ناچار بە چەکی سپی و خەنجەر هێرشیان

[665] -Arfa. P.61.

[666]- لازاريف: المصدر السابق، ص246

بردە سەر ئێرانییەکان، لەبەر ناهاوسەنگیی هێز لە ڕووی چەك و ئامادەباشییەوە هێزەکانی سمکۆ ناچار بەرەو سنووری تورکیا کشانەوە، لەناو سنووری تورکیا بەسەر ئامادەکاریی هێزەکانی تورکیادا کەوتن‌و گەمارۆ دران، کە پێشتر لە باری ئامادەکارییدا بوون بۆ پشتیوانیی لە چالاکییە سەربازییەکانی ئێران. سمکۆ و هاوڕێکانی بە دیل گیران و دوورخرانەوە بۆ ناوچە دوورەکان[667].

لە تشرینی یەکەمی (1922) لەو کاتەی ململانێی سەربازیی و سیاسییی لە نێوان هێزە سنووربەزێنەکانی تورکیا بە سەرۆکایەتی ئۆزدەمیر و ئیدارەی ئینگلیز لە عێراق هەبوو لەسەر دەسەڵاتداریەتی "ویلایەتی موسڵ"، لە ناوچەی ڕەواندزی کوردستانی عێراق، سمکۆ بەدیار کەوت، ئینگلیز پێشتر لە ئەیلولی (1922) شێخ مەحمودی گەڕاندبۆوە بۆ سلێمانی بۆ بەهێزکردنی گیانی نەتەوایەتیی، بۆ ئەوەی بەرەنگاری هەوڵەکانی تورکیا ببێتەوە رازیکردنی کورد لە ژێر پەردەی "برایەتی ئیسلامی"، ئینگلیز دەرپەڕێنن‌و ویلایەتی موسڵ بە تورکیاوە بلکێنن، سمکۆ لە کاتی گرژیی نێوان ئینگلیزو شێخ مەحمود گەیشتە سلێمانی، شێخ هەستی کرد ئینگلیز دەیەوێت وەکو ئامرازێك دژی تورکان بەکاری بهێنن، سەرەڕای ڕاگەیاندنی کانوونی یەکەمی (1922ز) پشتیوانیان لە هەوڵەکانی کردووە بۆ دامەزراندنی حکومەتی کوردیی، ئینگلیز بە سوودوەرگرتن لە پێگەی سمکۆ ویستویەتی شێخ مەحمود لاواز بکات، ریزەکانی کورد تێکبدات، سمکۆ سەرەڕای ڕقی لە تورکان بەو فێڵەی دەزانی، بڕیاریدا لایەنگریی شێخ مەحمود بێت، بۆیە ئامۆژگاریی شێخ مەحمودی کرد ناکۆکیی ئینگلیز و مستەفا کەمال بەکاربهێنێت بۆ بەرژەوەندیی کورد، سەرەڕای ئاگاداری شێخ مەحمود بە هەوڵەکانی ئینگلیز بۆ لەناوبردنی حکومەتەکەی بەو ئامۆژگاریانە ڕازی بوو، لەو ململانێیەدا هەڵوێستی بێلایەنی وەرگرت‌و پەیوەندیی لەگەڵ هەردوولا پاراست.

لە کانوونی دووەمی (1923ز) لە سلێمانی پێشوازییەکی فەرمیی و میللیی گەرم لە سمکۆ کرا، بەو بۆنەوە پشووی فەرمی ڕاگەیەنرا، خوێندکاران و جەماوەر بە مەبەستیی بەخێرهاتن ڕژانە سەر شەقامەکان. ڕۆژنامەی (کوردستان)ی زمانحاڵی حکومەتی

---

[667] - Bruin Essen, pp. 388-389

کوردستان ئاوا باسی ئەو سەردانەی کردووە: (پارێزەری کوردستان بێ هاوتا.. خاوەن شکۆ ئیسماعیل ئاغا سمکۆ)[668].

مەبەستی شێخ مەحمود لە ڕێکخستنی ئەم پێشوازییە گەرمە، بەگەڕخستنی هەستی نەتەوایەتیی کورد بووە، هەروەها دەیویست بەم پێشوازییە گەرمەی، سمکۆ منەتبار بکات بەرانبەر دالّدەدانی خانەوادەکەی لەوکاتەی دوای لەباریەکچوونی جوڵانەوەی ساڵی (1919ز) ئاوارەی کوردستان ببوون، سەرەڕای خیانەتکردنی تورکان، سمکۆ نەیویستووە پەیوەندی لەگەڵیاندا بپچڕێنێت، ئەحمەد تەقی هاوزەمانی سمکۆ رای وایە ئەمە بۆ ئەوە بووە زەمانەتی ئازادکردنی (خەسرەو)ی کوڕی بکات، کە لە ساڵی (1921)وە لای کەمالیەکان دیل بووە[669].

بۆ نیشاندانی سمکۆ وەکو سەرکردەیەکی گەرموگوڕ لەسەر بەرژەوەندیی تاکەکەسیی و خانەوادەیی لەسەر حیسابی بەرژەوەندیی نیشتیمانیی، سمکۆ برەوی بەم بۆچوونانە داوە، بەڵام بڕوای پتەوی بە حکومەتی سەربەخۆ لەوە پتەوتر بووە، هێژا ئەدمۆنسی ئەفسەری سیاسیی ئینگلیز لە کوردستان، دەڵێ: (لە دوای گەیشتنی بە کوردستانی عێراق لە تشرینی یەکەمی (1922)، سمکۆ داوای کردووە پشتیوانیی هەوڵەکانی جوڵانەوەی کوردیی بن لە ئێران بۆ درێژەدان بە شۆڕش، بە تەواوی بێزاریی لە مستەفا کەمال دەربڕیوە)[670].

ئینگلیز لە ساڵی (1923ز) خۆی یەکلاکردەوە بۆ لەناوبردنی حکومەتی کوردیی لە لیوای سلێمانی، یەکەم جار بۆ لاوازکردنی دەسەڵاتی شێخ مەحمود سمکۆی لە سلێمانی دوور خستەوەو ناردیە لای بابەکراغای سەرۆکی هۆزی پشدەری دۆستی خۆی.

لە ساڵی (1924ز) ئینگلیز لە ناوچە سنوورییەکان هەستی بە مەترسیی سمکۆ کرد بۆ سەر پەیوەندیی عێراقیی ـ ئێرانیی، بۆیە داوای بۆ لە حکومەتی ئێرانی کرد لێبوردنی گشتیی بۆ دەربکات، سمکۆ گەڕایەوە ئێرانو ماوەیەك لەناو هۆزەکەی خۆی ژیا،

---

[668] - رۆژنامەی کوردستان. ژ (10) 1923/6/10

[669] - ئەحمەد تەقی: خەباتی گەلی.. ل70

[670] - Edmonds, Kurd, Turk and Arabs, London, Oxford Univ. Press.1957. p.307.

هێندەی نەبرد لە ساڵی (1924ز) جوڵانەوەیەکی بۆ دەرکردنی ئیدارەی ئینگلیز لە عێراق ڕێکخست، بۆیە ئینگلیز هاوکاریی رەزا شای کرد بۆ لەناوبردنی جوڵانەوەی سمکۆ، لەبەر ئەوەی بەناچاری کشایەوە تورکیاو جارێکی تر لە ساڵی (1930ز) هاتەوە ناو خاکی عێراق. ئینگلیز لەگەڵ رەزا شا ڕێککەوتن بۆ لەناوبردنی سمکۆ، دووبارە شا لێبوردنی بۆ دەرکردو سمکۆ گەڕایەوە ئێران، لەدوای چەند هەفتەیەك حاکمی نەغەدە داوای لێکرد بۆ چاوپێکەوتنی لەگەڵ رەزاشا ئامادە بێت، لەکاتی گەیشتنی سمکۆ لەلایەن هێزەکانی حکومەتەوە لەڕووداوێکی نادیاردا تیرۆرکرا[671]. بەمەش لەئێران پەردە بەسەر کێشەی کورددا درا.

هەتا ئێستاش مەسەلەی سمکۆ لەلای توێژەران بەو ئەندازەیە نەهاتۆتە گۆڕێو یەکلایی نەبۆتەوە، ئاشکرایە کە بە قسە و کردەوە خوێن گەرم بووە بۆ بیرۆکەی سەربەخۆیی کوردستان، بەڵام ئەو بیروباوەڕەی سمکۆ هەیبووە بۆ ئایندەی ئیدارەی کوردی پێویستی بە توێژینەوەی زیاتر هەیە.

مستەفا پاشا یامولکی بەپشتبەستن بە راپۆرتی نێردراوەکانی ئینگلیز لەسەر پەیوەندییەکانی سمکۆ بە سوڵتانی عوسمانی جوڵانەوەکە بە"بۆیەکی ئیسلامیی" دادەنێت. ئەو هۆزانەش کە دەوریان دابوو بەو هیوایەی دەروازەیەکە بۆ رزگاربوون لە ڕژێمی ئێرانی دەمارگیر و خوێنڕێژ، زۆربەی لایەنگرانی سمکۆ هێزێك بوون لە بەرەو رووی هێزەکانی ئەوروپی لە بەرانبەر هەوڵی سەپاندنی قەوارەی ئەرمەنیو ئاشووری[672].

پێویستە دەوری سمکۆ لەبازنەی ئەو قۆناغە مێژووییە هەڵبەسنگێنین کە ئەوی تێدا ژیاوە، لەدەیەکانو بیستەکانی سەدەی رابردوو ژمارەیەکی زۆری پیاوماقوڵو سەرۆك هۆزە ناتورکەکان هەستیان کردووە کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی لە ڕێڕەوی عوسمانی لای داوە، لە پێکهاتەی سەڵتەنەتی عوسمانییەوە بۆتە دەوڵەتی ناسیۆنالستی تورکی. کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بە بەرزکردنەوەی دروشمەکانی ئازادیو یەکسانی فێڵیان لە

[671] - Bruin Essen pp.389 Arfa, p.63.

[672] - Air 20\512, R-N. memo (Ismail Agha Simko) February. 1919. Obay\1997. Dr. Othman

گەلانی ناتورك کرد، جوڵانەوەی میر بەدرخانو شێخ عوبێدوڵڵاو سمکۆ دەچنە بازنەی ئەو چوارچێوەیەوە [*].

# بەڵگەنامە

## FO 371

### یاداشتنامەیەك لەسەر سەید عەبدولقادری نەهریو سمکۆ

### نوێنەری باڵای بەریتانی لە ئەستەنبوڵ

### FO 371|7781

گەورەم

یەکەم: شەرەفە بۆ من یاداشتنامەی هێژا "رەیان"تان بۆ بنێرم کە نوێترین گفتوگۆی لەگەڵ هێژا عەبدولقادر تێدایە، کە لەکەسایەتی سەرکردەکانی کوردە لە قوستەنیتینییە "ئەستەنبوڵ".

دووەم: بەبیر بەرێزتان دەخەمەوە لە ڕابردوو هێژا عەبدولقادر لە چەندان بۆنەدا بە ڕێگەی نووسینگەی هیند داوای لە فەخامەتی حکومەتی خاوەن شکۆ کردووە، ئێستا دەتوانین لە کوردستان بە گشتیی و لە ناوچە هاوسنوورەکان لەگەڵ فارس سوود لە دەسەڵاتی ئەو وەرگرین.

سێیەم: ئەو باوەڕی پتەوی بە وەرگرتنی ڕێنومایی هەیە لە بەڕێزتان لەسەر ئەو هەڵوێستەی داوای کردووە ئاسانکاری بۆ کوڕەکەی بکرێ لە ژێر چاودێری حکومەتی

[*] - بزاڤەکانی تری سەرەتای سەدەی بیستەم ئەنجامی ئەو کاردانەوەیە بوون، بەڵام بۆ بزاڤی میر بەدرخانو شێخ عوبێدوڵڵای نەهری، نەخێر!! چونکە بۆ یەکەمیان زیاتر لە شەستساڵو بۆ دووەمیان بە بیستو حەوت ساڵ لە پێش کودەتای تورکە ئیحادییەکان پەیدابوون، هیچ پەیوەندییان بە بزاڤی ناسیۆنالیستی تورکە ئیتیحادییەکانەوە نەبووە، لەکاتێکدا نووسەر خۆی داوامان لێدەکات کە ڕووداوەکان لە قۆناغی مێژوویی خۆی هەڵبسەنگێنین، هەروەها لە کۆتایی ئەم توێژینەوەو لەوەی بەناوی پوختەو ئەنجامگیرییەوەیە، پێم وابووە لەسەر ڕێڕەوی توێژینەوەی مێژوویی دەرچووە، بۆیە هەندێکیمان بە پێویست نەزانی بیکەینە کوردی. بۆ دڵنیابوون لەو بارەیەوە بڕوانە: چاپی دووەمی عەرەبییەکەی لاپەڕە (389-391). "وەرگێڕ"

خاوەن شكۆ بۆ پەیوەندییكردن بە "سمكۆ" و سەرۆك هۆزەكانی تر گەشتی موسڵ بكات.

گەورەم، بۆ من شەرەفە لەگەڵ هەموو رێزم ئەوپەڕی خزمەتكاری گوێڕایەڵو بچووكی ئێوەبم.

هوریس رمبولد

## یاداشتنامەی هێژا رەییان

لە (17)ی مایس سەرلەنوێ كوردی ناسراوو ناودار هێژا عەبدولقادر پەیوەندی پێوەكردم، داوای كرد حكومەتی خاوەن شكۆ رێگەی بدات بەرهەڵستی بەلشەفییەكان بكات، ئەوانە ئێستا بە رێككەوتنی نهێنی لەگەڵ كەمالییەكان كاردەكەن بۆ ئەوەی جێ پێی خۆیان لە باكووری رۆژهەڵاتی كوردستان بكەنەوە.

ئەو بەپرسیاركردن لەمەڕ هەواڵی تازەی ئێمە دەستی پێكرد لەسەر ئیسماعیل ئاغا "سمكۆ". وتم: لەو بارەیەوە دوو راستی بە ئێمە گەیشتوو. یەكەمیان: سمكۆ لەگەڵ حكومەتی فارسیدا دەجەنگێو لەمە دڵنیاین. دووەمیان: بەپێی ئەو بەڵگەنامانەی لای ئێمە هەیە لە ژێر چاودێری ئەنقەرەدا كاردەكات، لەمەش دڵنیان كە راستییە.

هێژا عەبدولقادر لەو بارەیەوە پرسیاری هەڵوێستی حكومەتی خاوەن شكۆی لێ كردم، وتم: چالاكییەكانی سمكۆ لە دەرەوەی ناوچەی ژێردەسەڵاتی نوێنەری ئێمەیە، لە دوورەوە چاودێری رووداوەكانین، راستییەكان هەر ئەوەیە پێشتر باسم كردن، حكومەتی خاوەن شكۆ دەیەوێ بۆچوونی هەریەك لە وڵاتی فارسو رافیدەین بزانێت.

سمكۆ دژی ئێران دەجەنگێو ئێمەش خوازیارین ئەو حكومەتە دەسەڵاتی تەواوی بەسەر خاكی خۆی دا هەبێت. حكومەتی خاوەن شكۆ نایەوێ وڵاتی فارس ببێتە نێچیری بەلشەفییەكان و كاری تێبكەن. هەروەها نامانەوێ تووشی شاڵاوی توركی ببێتەوە. سەبارەت بەوڵاتی رافیدەین، حكومەتی خاوەن شكۆ بایەخ بە جێگیر بوونی ئاسایش دەدات لە چوارچێوەی سنووری عێراق، هەروەها نایەوێ تێكەڵی ئەو مەسەلانەی دەرەوەی ئەو سنوورە بێت، هۆیەكی تر كە حكومەتی بەریتانی وا لێدەكات لەعێراق هەندێ كەسایەتی كوردی (مەبەست لە دەرەوەی عێراقە- "وەرگێڕ") هان نەدات عێراق

بکەنە شوێنی چالاکییەکانی کوردستان. هەر بەو بۆنەوە من ئەو پڕوپاگەندەیە ڕەتدەکەمەوە کە لە وڵاتی فارس بڵاوبۆتەوەو گەیشتۆتە هێژا عەبدولقادر، بەوەی دەسەڵاتدارانی بەریتانی لە بەغدا پشتگیری ئەو چالاکییانەی ئێستای سمکۆ دەکەن.

سەبارەت بەو پڕوپاگەندەی ئێستا کە سمکۆ چۆتە ناو تەوریز یان شاری میرغە (مەبەستی مەراغەیە. "وەرگێڕ")، هێژا عەبدولقادر لەوبارەیەوە وتی: ئەگەر هەواڵی ئەو راپۆرتانە راست بێت، واتە سمکۆ دۆستایەتی ئەو هۆزانەی مسۆگەر کردووە کە پێشتر لە سنووری ئەودابوون، بەبێ پشتیوانی ئەو هۆزانە ناتوانێ ئەو سەرکەوتنە گەورانە بەدەست بهێنێ. ئەوەش لە ڕووی سەربازییەوە پێویستە، چونکە هۆزەکەی سمکۆ بەتەنیا ناتوانێ ئەو چالاکییە بەرفراوانە ئەنجام بدات.

هێژا عەبدولقادر سکاڵای هەبووە کە ئەو هەموو داواکارییانەی داوە بەحکومەتی خاوەن شکۆو هێچ وەڵامی نەدراوەتەوە، نوشستی هێناوە لە وەرگرتنی متمانەی ئێمە. ئەمە چەندان جار رووی داوە، ئەو لەو ئاستەیە پشتگیری بکرێ بۆ دەستبەسەراگرتنی کوردان بەسەر ویلایەتەکانی باکووری رۆژهەڵات، ئەگەر ئەمجارە دەرفەتی چالاکی بدەینێ، بەدڵنیایی متمانە هەیە بتوانێ سمکۆ رازی بکات لە بەرژەوەندیی ئێمە کاربکات، هەروەها دەیوت پشتبەستن بەکەسانی وەکو مستەفا پاشاو ئەوانی تر بێ بەرهەمە و ئەوانە کاریگەری راستەقینەیان لەناو کورددا نییە.

پێموت: لێرەدا مەسەلە متمانەو بێمتمانەیی نییە، بەڵکو مەسەلە سیاسەتی حکومەتی خاوەن شکۆیە، کە نایەوێ دەست لەکاروباری کوردستان وەربدات، بەتەواوی لەگەڵیدا هاوڕا بووم لەسەر کەمبایەخی مستەفا پاشاو ئەو کەسانەی باسمان کرد، حکومەتی خاوەن شکۆ ئەوانە بەکارناهێنن، بەڵکو نەخشەی وایە، هەرگیز کەسێك بەکارنەهێنێت بۆ وروژاندنی کوردان. من پێموت: ئەوانە لە بنەڕەتەوە کۆك نابن، هەر لەو باسانەدا هاتینە سەر لێك تێگەیشتنی سمکۆ لەگەڵ کەمالییەکانو هەڵوێستی سەرۆکە کوردە پەیوەندیدارەکانی وەکو نەوەکانی ئیبراهیم پاشاو عەبدوڕڕەحمان لە شەڕناخ.

هێژا عەبدولقادر لە پێشان سوورتر بوو بەوەی کە دەتوانێ کوردان لەدەوری خۆی کۆبکاتەوەو کار لە سمکۆ بکات، بۆ ئەو مەبەستە حکومەتی خاوەن شکۆ چی بۆ ئەو

دەكات، داواكاری ئەوە بووە دەبێت رێگەی بدرێت كوڕەكەی بنێرێت بۆ موسڵ، یان ئاسانكاری بۆ بكەن، نامە بنێرێ بۆ سمكۆو ئەوانی تر، بۆ ئەوەی ئاگاداریان بكاتەوە بەو هەڵوێستەی حكومەتی خاوەن شكۆ دەیگرێتە بەر. دەیوت: مەترسی بەلشەفی ئێستا لە جاران زیاترە، كورد دەتوانن ببنە دیوارێكی پتەو دژی سنووربەزاندنی بەلشەفی، ئەگەر رێوشوین بەو ئاڕاستەیە نەگیرێتەبەر بەلشەفییەكان بەئاسانی سەردەكەون و دەبنە مایەی دووبەرەكیی، ئەو كارە دوو مانگ یان سێ مانگ دەخایەنێت، ناتوانێ زەمانەت بكات هەتاوەكو بۆ كاریگەری تایبەتی، دەگونجێت ئەمە كاریگەر بێت، ئەگەر دەرفەتی هێزەكانی ركابەری بدرێت لەو ماوەیە بە ئازادی كاربكەن، بە هێژا عەبدولقادرم وت: من دوایی راپۆرتێك دەنووسم لەسەر ئەوەی لە ڕابردوو وتراوە، من دەزانم بەڕێزتان ناتوانن بەبێ رێنومایی حكومەتی خاوەن شكۆ هیچ وەڵامێكی كۆتایی بدەن.

هەمیشە هەست دەكەم كە سەید عەبدولقادر بەهۆی كەسایەتییە ئایینییەكەی لەناو كورددا دەتوانێ لەو بارودۆخە تایبەتییە ببێتە فاكتەرێكی بەسوود لە ناوچەكانی نزیك بەسنووری فارسی، بەڵام بەگومانم لەوەی وەكو خۆی بانگەشەی بۆ دەكات بتوانێ كار لە سمكۆ بكات، ئەو قسەیە بەشێكی راستە كە دەڵێ: سمكۆ پشت بەو هۆزانەی دەبەستێ كە راستەوخۆ ملكەچی دەسەڵاتی "سمكۆ" نین.

# مستەفا پاشا یامولکی لە چاوپێکەوتنێکی مێژووییدا لەگەڵ سمکۆ

سلێمانی (12)ی کانوونی یەکەمی (1921ز)

ژمارەی بەڵگەنامە FO 371/7781

کوڕی پایەدارم عەزیز بەگ

نامەکەتم بەدەست گەیشت کە لە بەرواری (20)ی تشرینی یەکەمی (1921ز) لە وەڵامی نامەکەی منی (31)ی ئەیلولی (1921ز) نووسراوە. پێشترو لە ماوەی گەڕانەوە لەگەشتەکەم بەو ناوچانەی کە لە ژێردەسەڵاتی سمکۆ (ئیسمایل ئاغا) دابوون، دوو نامەی تری تۆم لە بەرواری (15)ی ئەیلول و (6)ی تشرینی دووەمی (1921) بەدەست گەیشتن. دوو نامەکەی دوایی بە ناوی کوڕانی نەقیبەوە هاتبوو لەسەر بارودۆخی رابردوو، کە هەندێ زانیارییان خۆم بەسەریەوە شایەد بووم.

لە کاتژمێر یازدەی رۆژی دووشەممە، رێکەوتی (31)ی تشرینی دووەم سلێمانیم بەجێهێشتو بەناوچەکانی مەنگوڕدا بە "وەزنە" تێپەڕیم. بابەکراغاو عەباس ئاغای برای خانەدانو زیرەکن، بابەکراغا لەلایەن دەسەڵاتدارانی بەریتانییەوە رێزی زۆری لێدەگیرێ و پلەو پایەی زۆر باشیان داوەتێ. ناوچەکەیان نەکەوتۆتە ژێر کاریگەری پارتی ئیتیحادو تەرەقی کە لە ئەنادۆڵ پەیدا بوون، ئاسایشو ئارامی باڵی کێشاوە بەسەر دەڤەری هۆزی بابەکراغا، لە هۆزە بەهێزەکانی ناوچەکەیەو پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ هۆزەکانی تری ناوچەکەدا هەیە، هۆزەکانی مەنگوڕو مامەش و کۆڕك و دێبوکری و بەگزادە لە هۆزە سەلامەتەکانن، هۆزی بەگزادە گەورەترین هۆزە لەناوچەی سەقزو دەورووبەری نیشتەجێن.

هۆزی بابەکراغا پەیوەندی پتەوی لەگەڵ هۆزی "زەرزا" هەیە، کە لە شنۆیە نیشتەجێن، هەروەها پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ هۆزی شوکاکدا هەیە، کە سمکۆ سەرکردەیانەو پێگەی درێژ دەبێتەوە بۆ رۆژئاواو باکووری رۆژئاوای ورمێ.

کۆمەڵە سەردارێکی وریا بۆ کاروباری ناوچەکە سەرۆکایەتی هۆزی نورەدینی دەکەن، هێزێکی خێڵەکییان هەیە دەگاتە نزیکەی (2500 تا 3000) سوارەو نزیکەی (4000) هەزار پیادە.

ئەو سەرۆکانە هوشیارنو باش دەزانن، کە خۆشگوزەرانی و بەختەوەری کورد لە کوردستانی باشوور و باکوور و تەنانەت لەهەموو تورکیاش، بە ڕێگەی ئینگلیزەوە دەبێت لەگەڵ دوورکەوتنەوە لە سیاسەتی وێرانکاری ئیتیحادو تەرەقی، لەبەر ئەوە دانیشتوانی ناوچەی پشدەرو سەردەشتو گوندە سنوورییەکانی ئێران ملکەچی میر ئافیاو میر عەبدوڵلانو بەئاشتیو ئارامی دەژین.

هێزێکی بچووك ماوەتەوە لە ژێر دەسەڵاتی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی لە ڕەواندز، لە ئەنجامی چەند کردەوەیەکی خراپی ئەفسەرێکی پێشوو (سوپای عوسمانی — "وەرگێڕ")و ئەوانەی ناتوانن بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان، خەڵکی رەواندزو ناوچەکە بەدەستیانەوە مەینەتی زۆر دەچێژنو دەگەڕێن بەدوای هۆکارێك لەو ژیانەی تێیدان دەربازیان بێت.

سەرەڕای ئەوەی ژمارەیەك خەڵکی زیرەكو بەتوانا هەیە کە سنوورێك بۆ ئەو کردەوانە دابنێن، لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتدارانی بەریتانی دوودڵن لەو بارەیەوە رێوشوێنی کاریگەر بگرنەبەر، گەرچی ئەو بابەتە بەهێند وەرناگرن.

چاوپێکەوتنم لەگەڵ بایز ئاغای سەرۆکی هۆزی "ئۆجاق کاك" سازدا، کە لەناو هۆزی مامەشو مەنگوڕ ناسراوەو لە "ئەلوەتان" نیشتەجێن.

پارتی ئیتیحادو تەرەقی ئۆباڵی بەرپرسیاریەتی ئەو شەڕەی ئەنادۆڵو شاڵاوی یۆنانی لە ئەستۆدایە، چونکە ئەو پارتە لەکاتی شەڕی یەکەمی جیهانی کوشتنو کوشتاری کردووەو هەندێ جار لە دوای ئاگربەست شاڵاوی بردۆتە سەر دانیشتوانی برووسیاو سمێلنە.

سەردانی دەواری خدر خانی عەزیزم کرد لە ناوچەی "میرغیان"، پێخۆشحاڵی خۆم دەربڕی لە ئاشتی و ئارامی ناوچەکەیان کە نەکەوتۆتە ژێر کاریگەری پڕوپاگەندەی شەڕانگێزانەی کۆمەڵی ئیتیحادو تەرەقی، کە هەموو جۆرەکانی کوشتنی بە کۆمەڵ لە ژێر دروشمی جامیعەی ئیسلامیی ئەنجام داوە.

لە (9)ی تشرینی یەکەم لە مەنگوڕایەتی گەڕامەوەو گەیشتمەوە سابڵاخ، بەچاوی خۆم کۆچی دانیشتوانی سابڵاخم بینی بۆ ناوچەکانی موکری و دێبوکری دراوسێیان، هۆکاری ئەم کۆچەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پڕوپاگەندەیە کە هێزی ئێرانی لە میاندواو

دەخزیٚو هێزەکانی هۆزی شکاکیش لە شوێنی خۆی لە ورمێوە دەهاتن، نەبادا لەناو شاری سابڵاخ شەڕ بەرپا ببێ. هەرچەندە من بەوەی لە توانامدا بوو بۆم روونکردنەوە، کە ئەمە پڕوپاگەندەیە و راست نییە، بەڵام ئەوان گوێیان نەدایەوە بەردەوام بوون لە چۆڵکردنی شار، وادیار بوو تارمایی ناڕەحەتییەکانی شەڕ لەڕابردوو لێیان جیانابێتەوە، بە دووربین تەماشام کرد دیاربوو هێزێکی نزیك بە (300) سوارە بەرەو لای من دەهاتن، دواتر زانیم ئەو هێزە لایەنگرانی مامەش‌و شێخ عەبدوڵڵای نەسر "نوێنەری سمایل ئاغای شوکاك‌و سەید تەها"ن، هاتوون بۆ مەسڵەحەتی هەردوو هۆزی دیبوکری‌و مەنگوڕ.

شەو لە ماڵی شێخ عوبێدوڵڵا مامەوەو لەگەڵ نوێنەری سمکۆو سەید تەها قسەمان زۆر بوو، هەمان شەو بەڕێگەی تەلەفۆن هەواڵی مانەوەم درا، بەسەید تەهاو سمکۆ.

بەرەو براندێز سابڵاخم بەجێهێشت، کە سەید تەها لەوێ دادەنیشێ‌و رۆژێك لەوێ مامەوە، لە دوای ئەوەی برازا نەخۆشەکەم لەوێ بەجێهێشت، من‌و سەید تەهاو نمایندەی سمکۆ "براندێز"مان بەجێهێشت‌و بە ورمێدا تێپەڕین، لەو کاتەی بەڕێوە بووین برووسکەیەکمان بەدەست گەیشت، ئەوەی دەرخست هێزەکانی شکاك خۆیان بۆ هێرشی سوپا (سوپای ئێرانی-"وەرگێڕ") لە ناوچەی نێوان خوی‌و تەورێز ئامادە کردووە.

لەدوای ئەوەی هێزەکانی شکاك لە ساڵی رابردوو شاری ورمێیان گرت، هێڵەکانی تەلەفۆن‌و پەیوەندییکردن لە شوێنی گرنگ دانرابوون.

بەیانی بەسمکۆ گەیشتم‌و لە ماوەی گفتوگۆ ئەم پرسیارانەم لێکرد:

پرسیاری یەکەم: لەو هەموو چالاکییانەی لە ماوەی دوو ساڵی رابردوو لە دژی ئێران دەستت پێکردووە، چ مەبەستێکت هەبووە؟

وەڵام: حکومەتی ئێرانی دوژمنکاری زۆری کورد دەکات، ئێستا هەموو هەوڵی خۆم داوە بۆ رزگاربوون لە دەسەڵاتی ئێرانی، لە ساڵی رابردوو بڕیارمدا دەستبگرم بەسەر شاری ورمێ‌و دەوروبەری، شاری سەلماس، هەروەها ئەم ساڵ شاری سابڵاخمان لە ئێرانییەکان پاك کردەوە.

پرسیاری دووەم: لەوکاتە ئامانجتان بەدیهێنانی رزگاریی، یان سەربەخۆیی کوردە، بۆچی یەکەمجار لە ڕزگارکردنی شارەکانی ئەرزڕۆمو هەکاریو خەربووت دەستان پێنەکرد؟ رزگارکردنی ئەوانە لەم بارودۆخەدا لە دوو لاوە دەچەوسێنرێنەوە، مستەفا کەمال لەلایەك سروشتی دوژمنکارانەی هەیەو لەلایەك داننانێت بەخاوەن شکۆ سوڵتان وەحیدەدین، بەڵکو دژی ئیرادەی ئەوە، بۆچی ئەمە ناکەی هەتا بۆ بێگانەکانی بەدیاربخەی کە بەتەنیا ئامانجتان خوێنڕشتن نییە، مەسەلەی مستەفا کەمال یەکلایی دەبێتەوەو دوایی دەسەڵاتدارانی ئێرانی بدوێنیو چاوەڕێی هەڵوێستیان بیت؟.

وەڵام: وای بەچاك دەزانم لە ئێرانییەکانەوە دەست پێبکەم، بە چاکم نەبینی پەیوەندییمان لەگەڵ تورکیا ببڕین، چونکە ئێستا ئەوان بە چەك و تەقەمەنی هاوکاری شۆڕشەکەمان دەکەن، بەپێویستیشی نابینم پەیام بۆ حکومەتە بێگانەکان بنێرین، من وادەبینم بارودۆخی ئەوروپا ئێستا نائارامەو دەوڵەتە ئەوروپییەکان بەیەکترەوە خەریکن. هەموو هەوڵمان دەخەینە گەڕ هێزەکانی ئێرانی نەگەڕێنەوە سابلاخ، هەتا دوا پیاوی شوکاك دژی هەوڵەکانی ئێرانی دەوەستینو پارێزگاری لەخاکی خۆمان دەکەین.

پرسیاری سێیەم: چ پاڵنەرێك هەبووە لەپشت کوشتنی هەشت سەد جەندرمەی ئێرانی؟ ئەوانەی لە ساڵی رابردوو دیل کرابوون.

وەڵام: لەگەڵ ئەوەی ئێرانییەکان هەموو دەرفەتێکیان بەکارهێنا بۆ دەستگیرکردنی من، بەپێوستم زانی بۆ لێدانی هێزەکانی ئێرانی لە شاری سابلاخەوە دەست پێبکەم.

ئێرانییەکان لە ناوەوە قایمکارییان کرد و قبوڵیان نەکرد شار بەجێبهێڵن، ناچاریان کردین تێك بگیرێین، لە دوای چەند کاتژمێرێکی کەم بەشەڕی رەشاشو تۆپو تفەنگ بەشێك لە هێزەکانی ئێرانی ناچار کران لە شار بکشێنەوە، بەشێکی تر خۆیان بدەن بەدەستەوە، مەلیکزادەش لەناو ئەوانەدا بوو، لە دوای بەدیارکەوتنی ناسنامەی دیلەکان بۆم دەرکەوت زۆربەیان بەشداری شەڕە گەورەکەی نزیك ورمێیان کردبوو، لەکاتی داگیرکردنی رووسی "ورمیٚ" گۆڕا بوو بۆ پێگەیەکی گەورەی سەربازی، داگیرکەران هێزی ئاگرو ئاسنیان تیدا کۆکردبووە و بنکەیەکی تەقەمەنی لەناو شار هەبوو بەناوی "حەیدەر ئاباد"، بۆیە لەوکاتە هێرشمان کردە سەر ورمیٚو دەستمان بەسەر ناوچەکەدا گرت، زۆربەی جەندرمەکانمان بەدیل گرت، لەدوای داڵدەو خواردنو جلوبەرگ پێدان،

بەڵێنمان لێوەرگرتن لە ئاییندە بەشداری شەڕ نەکەن، بەڵام بەشدارییان لە شەڕی سابڵاخدا کرد، ئەمەش پێچەوانەی ئەو بەڵێنە بووە کە دابوویان. ئەو دیلانە سەرلەنوێ پەیوەندییان کردەوە بەهێزەکانی ئێرانیو کەوتنەوە هەوڵی کوشتنی کوردان، لەبەر ئەوە من فەرمانم دا لەسێدارەیان بدەن، کە ژمارەیان نزیکەی (400) کەس بوو.

پرسیاری چوارەم: هۆی ململانێتان لەگەڵ ئاشوورییەکاندا چی بوو؟ دەتوانن پێمان بڵێن بۆچی مارشەمعۆنی سەرۆکی رۆحی ئەوانتان کوشت، کە پیاوێکی ئاشتیخواز و لایەنگری کورد بوو؟.

وەڵام: دەبێت لەوە ئاگاداربین مەینەتیەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی لە لایەن رووس و تورك بابەتێکی درێژەو لێرە کاتمان نییە بە درێژی باسی بکەین، بەڵام هەوڵدەدەم لەسەر مەسەلەی مارشەمعۆن بوەستم.

شاراوە نییە لە کاتی شەڕی جیهانی ناخۆشی لە نێوان تورك و ئەرمەن رووی دا، ئاشوورییش لەگەڵ دابوون، چونکە ئەوان رایانگەیاند لەو شەڕە هەڵوێستیان لەگەڵ ئەرمەنەکانە. لەدوای شۆڕشی رووسی هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەکوردستان کشانەوە، بەڵام پێش ئەوەی سابڵاخو ورمێ بەجێبهێڵن، ئەندازەیەکی زۆری چەكو تەقەمەنی جەنگ لەناویاندا رەشاشی گەورەو تفەنگ هەبوو دایان بە ئاشوورییەکان، لەو بارودۆخە نەخشەیەك هەبوو، ژمارەیەك لە ئەفسەرانی رووسو هەندێ کەسایەتی ئاشووری و هەندێ لە بەرپرسانی دەوڵەتانی ئەوروپی بە ئاڕاستەی قۆستنەوەی دەسەڵاتی مەرکەزی ئێرانی مەبەستیان بوو دەست بگرن بەسەر ئازەربایجان، کوردستانیش ناوچەیەکی هاوتخوبەو کوردی تیایە، کورد لەمێژە هاوسێن لەگەڵ ئاشووری، نەخشەکە وابوو بۆ ماوەیەکی کاتی کورد بە لای خۆیاندا رابکێشن.

لە بارەی دەستبەسەراگرتنی ئێرانو ئازەربایجان بەپێی ئەو نەخشەیە بارودۆخ لەباریەك بەرن بۆ راگەیاندنی دەوڵەتی ئاشووری لە ویلایەتی بەدلیس و هەکاری، لەبەر ئەوە ئاشوورییەکان بەهەر رێگەیەك بێت هەوڵیاندا ئەو مەبەستە بشارنەوەو هەستی دۆستایەتی بەرانبەر کورد بە گشتیی و بەرانبەر شکاك بەتایبەت نیشان بدەن، چونکە هۆزی شکاك خاوەن هێزو دەسەڵات بوون لە ناوچەکەدا. رۆژێکیان مارشەمعۆن بە خۆی و کۆمەڵێك سوارەی ئاشووریو ئەرمەنی هاتنە سەردانم، ئەو بەتەواوی مەبەستی خۆی ئاشکراکرد، کە بەپشتیوانی کورد هێرش دەکاتە سەر ئازەبایجان، داوای لە من کرد

پشتیوانی لەو پرۆژەیە بکەم. پێموت: ئەم بابەتە لەگەڵ سەرۆك هۆزەکانی تر دێنمە گۆڕێ، چەند ڕۆژێکی تر هەوڵێستی کوردانت پێدەڵێم، دەسەڵاتدارانی ئێرانی بە ئامانج و جموجۆڵەکانی مارشەمعۆنیان زانی، نامەیەکی تایبەتیان بۆ من ناردو داوایان لێ کردم لە دژی ئێران نەچمە پاڵ ئاشوورییەکان، هەروەها بەڵێنیان پێ دام، ئەگەر مارشەمعۆن بکوژم، دیاریم پێ دەدەن*، لەبەر چەند هۆیەك رازی بووم بەکوشتنی مارشەمعۆن، کە لەپشت ئێمەوە نەخشەی دانابوو بۆ دەستبەسەراگرتنی کوردستانی باکوور، لەکاتی دیاریکراو کوشتمو بەمەش سنوورێکم بۆ چاوتێبڕینە سیاسییەکانی دانا. لەسەرەتاوە ئێرانییەکان پێی دڵخۆش بوونو حاکمیان بۆ بەڕێوەبردنی ورمێ نارد، دوایی کەوتنە پێشێلکاری کەرامەتمو سازدانی کوشتار لە ناوچەکانی ورمێ.

ورده ورده پەیوەندییمان تێکچوو، ئەمەش بەچەند پێکدادانی سەربازی کۆتایی هات، دوایی بەسەر شاری ورمێو دەوروبەری زاڵ بووینو کاربەدەستمان بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکە دانا.

پرسیاری پێنجەم: ئایا ئاشوورییەکان لە جولەمێرگو هەکاری نەماون؟ بەچاوی خۆم هەزارانم لە ئەوان لە بەغدا بینی خەریکی دابینکردنی هێستر بوون هەتا جارێکی تر بگەڕێنەوە؟

وەڵام: بەڵێ لە حاکمی وان–ەوە کە مستەفا کەمال دایناوە برووسکەیەکم پێگەیشت، داوا لەمیرزای نووسەرم دەکەم دەقی ئەو برووسکەیە بخوێنێتەوە کە نووسراوە:

حکومەتی یۆنانی سەرەڕای وەرگرتنی یارمەتی مادی، بۆ هێرشو راگەیاندنی شەڕ دژی ئێمە یارمەتی تریش وەردەگرێ. داوای لە دەوڵەتانی ئەوروپی کردووە، کە هەولبدەن لەگەڵ ئێمە پێکمان بهێننەوە، ئاگادارتان دەکەین لە هەموو بەرەکان سەرکەوتین، هەروەها بەریتانیا ئێستا ئاشوورییەکانی هەکاری و کوردستان هاندەداتو

---

* -ئەم بڕگەیە (دیاریم پێ بدەن) لەگەڵ گوزارشتەکانی دواتر تێك دەگیرێ، لە پوختەی هەڵسەنگاندنەکانی مستەفا یامولکی بەدیار دەکەوێ، کە ئەم چاوپێکەوتنە وەکو بەشێکی راپۆرتی مستەفا پاشا یامولکی لایەنگری بەریتانیەکان نووسراوە، بۆیە بەدروستی نابینم هەتا ئەگەر بەو شێوەش بووبێت، سمکو ئەو نهێنیە لە بەڵگەنامەیەکی وادا ئاشکرا بکات. "وەرگێڕ".

ئاسانكارییان بۆ دەكات بە ڕێگەی زاخۆو ناوچەی جەزیرە بگەڕێنەوە ناوچەكانی خۆیان، بەڵام ئێمە ڕێوشوێنی گونجاو دەگرینەبەر بۆ چارەسەرێك هەتا سەرنەگرێت، داواتان لێ دەكەین "واتە لەسمكۆ" چارەسەرێك بكەن ئاشوورییەكانی رووسیا و ئێران نەگەڕێنەوە بۆ ناوچەكانی خۆیان لە كوردستانی باكوور.

ئاشوورییەكان دوژمنی منن، كە ئەم هەواڵەم پێگەیشت ڕێگە نادەین بەگەڕانەوەیان بۆ هەكاری، توركەكانیش لەو كارە پشتگیریمان دەكەن.

پرسیاری شەشەم: لە دەڤەرەكەتان لەناو كوردان ڕێكخراوێكی نەتەوەیی هەیە؟ بۆ نموونە ئاڵای تایبەتان هەیە؟ چۆن كاروباری ناوچەكانی ژێردەسەڵاتی خۆتان بەڕێوە دەبەن؟

وەڵام: لێرە ئێستا ڕێكخراوێك نییە و من تاكە دەسەڵاتم لەكوردستان، با یەكەمجار ئەو نیشتیمانە رزگار بێت، لە دوایی لەناوچەكە كێ دەبێتە حاكم گرنگ نییە و من لەو لایەنەوە بێ نیازم. سەبارەت بە ئاڵا بە پێویستی نازانم، بەڵام شكاك دەستیان داوەتە ئاڵای جۆراوجۆر، دەبینن هەموو تیپێك لەجەنگاوەرەكان ئاڵای خۆیان هەیە.

پرسیاری حەوتەم: ئەگەر ئەمە وایە، خۆزگەی نەتەوەییتان هەیەو ئەو خۆزگەیەش كوردە، بۆچی سووتاندنو تاڵانیو كوشتنی بێتاوانی كوردانت لە سابڵاخ ئەنجامدا، بەتایبەتی قازی لەتیف یەكێك بوو لە پیاوماقوڵانی شار، ڕێزێكی زۆری هەبووە؟ كە (سابڵاخ لە ڕۆژهەڵاتی موكری هەڵكەوتووە، هۆزە بەهێزەكانی دیبكریو بلّباسو مەنگوڕو مامەشو پیرانی لێیە، وەكو دەزانن پەیوەندی دۆستایەتی لە نێوان دانیشتوانی شارو ئەو هۆزانەی ناوم بردن نییە)، ناترسن حكومەتی ئێرانی ئەو ناكۆكییە هۆزایەتییە بەكاربهێنێت لە بەرژەوەندی خۆی؟ وەكو زانیومە سەروەتو سامانی حاجی ئێلیخانی سەرۆكی هۆزی دیبوكری تاڵان كراوە، دوور نییە هەوڵەكانی مەنگوڕو بەگزادەكانی كوڕەك دانیشتوانی ناوچەی سەقز لەدژی ئێوە یەكبگرن؟

وەڵام: لەوكاتەی بەرەو سابڵاخ ڕۆیشتین هەواڵمان نارد بۆ هەموو سەرۆكەكانی ناوشار، بەڵام كەس بەپیر داواكەمانەوە نەهات، هەروەها دانیشتوانەكەی نوێنەریان نەنارد بۆ گفتوگۆ لەگەڵماندا، ئێرانییەكانیش سووربوون لەسەر هەڵگیرسانی شەڕ لەناو شار، لەدوای شەڕێكی زۆر شارەكە كەوتە بەردەستی ئێمەو ژمارەیەكی زۆر قوربانی

هەبوو، بەشێك لەوانە شكاك بوون، لەكاتی شەڕ جەنگاوەران تێكەڵاوی یەكتر ببوون، شەڕ لە شەقامەكان بە ڕەشاش دەكرا، لەگەڵ ئەوەدا من دژی زەوتكردن‌و تاڵانییم، بەڵام لە بارودۆخێكی ئاوا ناتوانرێ بەتەواوی قەدەغە بكرێ، هەوڵدەدەم هەستی خەڵكی شار رازی بكەم.

بەڵێ وەكو ئاماژەم پێدا گومانمان هەیە لە مەبەستی مەنگوڕو دیبوكری، بەڵام بایەخیان پێنادەین. هۆزی مامەش دڵسۆزی ئێمەن، هەمزاغای كوڕی خوالێخۆش بوو موحەممەد ئاغا كرایە حاكمی سابڵاخ‌و كەریم ئاغای برای كرایە سەرپەرشتیاری ناوچەی هەمەجان، لە دوای مانگێك لەكەوتنی سابڵاخ خەڵكی بانەو هۆزی كوڕەك ئێرانییەكانیان لە سەقز دەرپەڕاند، حكومەتی ئێرانی (300 تا 400) هێزی جەندرمەی نارده سەقز، توانیان بانەییەكان لە سەقز دەربكەن‌و چوار لە شكاك هەڵاتن * .

پرسیاری هەشتەم: هەندێك وا دەبینن ئامانج لەجوڵانەوەكەتان تایبەتییەو دەتەوێ سوود لەم ڕوداوانەی ئێستا وەربگری بۆ تۆڵەسەندنەوە لە حكومەتی ئێرانی لەسەر كوشتنی براكەت، كە لەلات زۆر خۆشەویست بووەو باپیرت‌و ئەندامانی تری خێزانەكەت، كە پێش ساڵێك كوژراون. بەڕوونی دەڵێن لەوكاتەوە جوڵانەوەكەت دەست پێكردووە لەئاكامی ناردنی نامەیەكی تەقێنراوە براكەت كوژراوە؟

وەڵام: دەزانم، باش ئاگاداری چەند لە باپیرانم كوژراون، كورد چەند مەینەتی چێشتووە، باپیرانم سمایل خان‌و عەلی خان كوژراون‌و هەندێكیان بەشێوازی وەحشیگەرانە لە لایەن حكومەتی ئێرانییەوە لەناوبراون، بەڵام من ئێستا بۆ بەرژەوەندی گەلی كورد كاردەكەم‌و گومانی تیا نییە دەرفەتێكی لەبارە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە حكومەتی ئێرانی.

كوڕی خۆشەویستم ئەمە دەقی ئەو وتووێژە بوو لە نێوان من‌و سمایل خان "سمكۆ"دا بوو لە شەوی (19)ی تشرینی یەكەمی (1921).

بەیانی سەر لەنوێ لەگەڵ سمكۆو سەید تەها بەیەكگەیشتن، بەنهێنی وتووێژمان لەسەر ئەو مەسەلەیە كرد.

---

* - زیاتر دەگونجێت چوارسەد بێت، هەڵە لە وەرگێڕی عەرەبییەكەی بێ، یان هەڵەی چاپ بێت. "وەرگێڕ"

به سمكۆم وت: (له ئێوه شاراوه نییه لەگەڵ ناسیۆنالیستەکانی تورك پەیوەندییتان هەیە، بارودۆخی ئێستا لەگەڵ هی سەردەمی شێخ عوبێدوڵڵا جیاوازە، دەوڵەتەکانی ئەوروپی‌و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له نزیکەوە چاودێری رووداوەکانی کوردستان دەکەن، وەکو دەزانی حکومەتی بەریتانی ئەمڕۆ ئیدارەی سلێمانی و دەورووبەری دەگێڕدرێ، ئەویش له نزیکەوە چاودێری رووداوەکانی کوردستان دەکات، ئەگەر ببینیت سیاسەتێك ناگونجێت لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی بەبێ دوو دڵی هەڵوێستی سیاسییی، یان سەربازی له دژی وەردەگرێت.

ئاشکرایە پەیوەندییتان لەگەڵ ناسیۆنالیستەکانی ئەنادۆڵی تورکیا هەیە، ئەمە له بەرژەوەندیت نییە، چونکە تورك "پارتی ئیتیحادو تەرەقی" له دونیای شارستانی کەسایەتی خۆی لەدەست داوە، وا چاوەڕوان دەکرێ ئەوەی پێی دەڵێن ئامانجی نەتەوەیی دوایی بێت‌و هیچ لایەنێك پشتیوانیتان لێ ناکات، مادام یەك لەحکومەتە گەورەکان بەتایبەتی حکومەتی بەریتانی گەورە پشتیوانی لێ ناکات کە بۆتە دراوسێی ئێمە جوڵانەوە نەتەوەییەکەت سەرکەوتنی له چارە نانووسرێ، هێزە گەورەکان له کوردستان بە جوڵانەوەیەکی یاخی سەیری ئیتیحادو تەرەقی دەکەن، کە دان بەدەسەڵاتی خاوەن شکۆ دا نانێن، ئەمە هۆی خزینی یۆنانییەکانە بەرەو ئەنقەرە، ئێستا ئەو هێزانە خۆ ئامادە دەکەن بۆ هێرشێکی تر، زۆربەی دانیشتوان هەتا له ئەنادۆڵیش بە هێزەکانی یۆنانی خۆشحاڵن، نیگەرانی خۆیان له ناسیۆنالیستەکانی تورك دەردەبڕن‌و بەگەورەترین دوژمنی کوردی دەزانن.

لێتان شاراوه نییه گەلی کورد له ساڵی (1908)وە لەمەینەتی دا دەژی‌و یۆنانییەکان له ناسیۆنالستەکان چاکترن، چونکە ئەمانە شارستانین‌و تورکەکان نەفامن.

ئەگەر دەتوانی پەیوەندیی بە یۆنانییەکانەوە بکە و نەخشەیان لەگەڵ دابنێ بۆ رزگارکردنی کورد لەدەست ناسیۆنالیستە دەمارگیرەکانی تورك. حکومەتی بەریتانی لەمە ئاگاداربکەوەو لێدوانێك بۆ رۆژنامە ئەوروپییەکان بدەو ئەمەی تیا روون بکەرەوە.

نوێنەری بەریتانی، یان هی حکومەتەکانی ئەوروپی له ناوچەکەدا نییه، بۆیه هەوڵبدە بارودۆخەکە پاك رابگرە لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکە، ئەگەر بەو شێوەی داوات لێدەکەم کاربکەی له ئایندە دۆستایەتی حکومەتەکانی ئەوروپات دەست دەکەوێ.

ئەمە وەڵامی سمکۆ بووە بۆ قسەکانم: (ناسیۆنالیستە تورکانم خۆش ناوێ، بڕوام وایە لە ئێرانییەکان زیاتر دوژمنی کوردن، بەڵام لەچەندین بۆنەدا نامەم بۆ حکومەتی بەریتانی ناردووە، دڵنیام کردوون کە نامەوێ لەناوچەکەدا بە ڕووی ئەواندا بوەستم، بە بەردەوامی پشتیوانی بەریتانییم دەوێ، لە بابەت ئامادەییان بۆ هاوکاری کێشەی کورد پێویستم بە پەیمانی ئەوان هەیە، ئەگەر بەتەواوی هاوکارییان کردم بەپێی ئارەزووی ئەوان کاردەکەم، بەڵام بە شێوەی بنەڕەتی ئێمەی کورد پێویستمان بەتەقەمەنییە، ئەگەر دەستمان نەکەوت تووشی گێروگرفتی گەورە دەبین.

بۆ ئەوەی دڵنیا بن لە ئارەزوومەندیی من بۆ هاوکاریی لەگەڵ ئینگلیز سەید تەهام ناردە بەغدا، بەڵام بەداخەوە بێ ئاکام بوو، لەگەڵ سەید تەها بە پیرۆزترین باوەڕمان سوێند دەخۆین ئامادەین لەگەڵ ئینگلیز کاربکەین، ئەگەر ئەوان وەڵامی بانگەوازی ئێمە بدەنەوەو راستەوخۆ لەڕێگەی هۆزەکانی هاوپەیمانی خۆیانەوە لەکوردەکان بە تایبەتی پشدەر، ئەوەی پێویستمانە لە چەك و تەقەمەنیی بۆمان بنێرن و لە ژێر رەحمەتی ئێرانییەکان بەجێمان نەهێڵن، بمانخەنە چوارچێوەی پارێزگاری خۆیانەوە. مەرجەکان بەتۆ دەدەم یان رێککەوتنامەیەك لەنێوان ئێمەو نوێنەرێکی ئەوان بێت قبوڵی دەکەم، ئێمە لە تواناماندا هەیە تورکە ناسیۆنالیستەکان دەربەڕێنین هەتا لە ئەرزڕۆم و سیواس و هەکاری و دیاربەکر. هەروەها ئەوانەی رەواندز (سەرکردە کوردەکانی دۆستی تورك لە ڕەواندز "وەرگێڕ") لەگۆڕدەنێین. تکا دەکەم ئاگاداریان بکەوە ئێمە لەسەر ئەوە سوورین. بەڵێنی شەرەفتان دەدەمێ ئێمە توانای دەرپەڕاندنی ناسیۆنالیستەکانی تورکمان هەیە لە ئەنادۆڵ و دەتوانین هەتا ئەنقەرەش بگرین.

لە دوای کۆتاییهێنان بەم قسانە سمکۆو سەید تەها چوون بۆ بەرەکانی شەڕ، چوونە لای هێزەکانی تۆپخانەو پیادەو سوارە، ئەوان بەرەو سەلماس رۆیشتن‌و منیش بەڕێگەی ورمێ گەڕامەوە سابلاخ.

لە ئازەربایجانی رۆژئاوا سەرۆك هێزێك هەیە بەناوی میر ئەرشەد، دەڵێن خاوەنی (6 تا 7) هەزار چەکداری ئازایە و (40 تا 50) پارچە چەك‌و ژمارەیەکی بەرچاو رەشاشی هەیە. حکومەتی ئێرانی سوپایەکی لە لایەنگرانی ئەرشەد چەکدار کردووەو پارەیەکی زۆری داونەتێ، ئەو هێزە ئێستا لە شوێنێك کۆبوونەتەوە پێی دەڵێن: "شەریف خانە"

کە زاڵە بەسەر کەنارەکانی دەریاچەی ورمێ، پێشەنگی ئەو هێزانە لە تەورێز و خوی دەستیان پێکردووە، هەندێك دەستەیان ناردووە بۆ سنووری سەلماس.

لە هەوڵەکانی بۆ سەرلێشێواندنی سمکۆ، ئەرشەد هێزێکی سەربازی لە سوارە ناردووە بۆ بۆسەنانەوە بۆ هێزەکانی سمکۆ لە ناوچەی "شاکریاکی" لەنێوان سەلماس و خوی.

لەو کاتەی ئێمە دەرچووین سمکۆ سەرکردایەتی هێزێکی دەکرد بۆ هێرشبردنە سەر ئەرشەد، لەدوای گەڕانەوەم پەیوەندییەکی تەلەفۆنییم پێگەیشت کە کۆمەڵێك لە هێزی پیادە لە گردەکانی دەوروبەری خوی شوێنی خۆیان گرتووە، لەوکاتەش بە بەکارهێنانی تۆپخانە سمکۆ هێرشی کردۆتە سەر ناوچەکانی تر، لە شەڕێکی نێوان پێشەنگی هێزەکانی سمکۆو هێزەکانی ئەرشەد لە شەریف خانە گەرچی زیان بەهەردوولا کەوتووە، بەڵام هێزەکانی ئەرشەد پاشەکشەیان کردووە.

هێزەکانی سمکۆ بەدوای هێزە تێکشکاوەکەی ئەرشەد نەکەوتوون، بەڵام لەکاتی پاشەکشە هێزەکانی ئەرشەد سایزو تاج دێنو چەند گوندی تریان سوتاندنو رووخاندیانن، سمکۆ هەندێ لەخەڵکی ئەو گوندانەو لایەنگرانی ئەرشەدییان گرت، ئەوانە وەکو دیلی شەڕ خۆیان دابووە دەست هێزەکانی سمکۆ.

هەر باسێکی ورمێ بکەین دەبێت ئاماژە بەو پێشکەوتنو پەرەسەندنە بکەین کە لەو شارەدا هەبووە پێش شەڕ، بەڵام لەکاتی شەڕ بەشێکی شار گۆڕاوەو بۆتە وێرانە، لەئاکامی ئەو شەڕانەی نێوان شالاوی هێزەکانی تورکیو هێزەکانی ئەرمەنیی و حکومەتی تورکیدا بووە، لەگەڵ ئەو شەڕەی نێوان کوردو حکومەتی ئێرانی باری خراپو زۆر قورسی لەسەر خەڵکی هەژاری ناوچەکە درووستکردووە.

بەرەو سابلاخ لە (16)ی تشرینی دووەم ورمێم بەجێهێشت، بۆ ئەنجامدانی چەند پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لە نێوان ئەوروپا و سابلاخ، ئێستا ناتوانم ئاگاداری رێڕەوی شەڕەکان بم کە لە ڕۆژانی (26و 27)ی تشرینی دووەم لە نێوان هێزەکانی ئەرشەد و سمکۆ رووی داوە.

لەسەر ئارەزووی هەندێ سەرۆك هۆزی گوندی دیبوکری "گوندی عەبدوڵلا ئاغا" دابەزین، لەوێ بەم سەرۆك هۆزانەی خوارەوە گەیشتم، فانی عەلی ئاغا، کۆسەی کەیالی کەریم ئاغا، ژمارەیەکی تر لە پیاوماقولانی هۆزەکان.

کەریم ئاغاو مازن ئاغای برای گەیشتنە گوندەکەو دوا هەواڵی شەڕەکانیان پێدام، لەسەر سووتاندنی شاری سابڵاخ زۆربەی هۆزەکان سەرکۆنەی سمکۆیان کرد و ناڕەزاییان لەجوڵانەوەکەی نیشان دا.

سوتاندنی سابڵاخ کاریگەری لەسەر هۆزەکان هەبووەو پاڵی بەزۆربەیانەوە ناوە دژی بوەستن، حکومەتی ئێرانیش لە پڕوپاگەندە دژی سمکۆ سوودی لەم رووداوە وەرگرتووە، وادیارە کوردەکانیش لەژێر کاریگەری تورکە ناسیۆنالیستەکان "ئیتیحادو تەرەقی" دابوون. لەکاتی کۆبوونەوەم لەگەڵ سەرۆك هۆزەکانی "دیبوکری" هەواڵ هات کە شەڕێکی گەرم لە نێوان هێزی سمکۆ کە لە سێ هەزار سوارەو هێزی ئەرشەد بە چوار تا پێنج هەزار سوارەوە رووی داوە. ئەم شەڕە لە نێوان ناوچەی خوی‌و سەلماس بووە. بەپێی ئەو زانیارانەی لە بەرەکانی شەڕەوە هاتبوو هێزی سمکۆ (300) کوژراو و لایەنەکەی تر زیانی زیاتری لێکەوتووە. لەکۆتایی شەڕ ئەرشەد بەناچاری کشابووە بەرەو تەورێز، شکاك دەستیان گرتبوو بەسەر رەشاشێك‌و ژمارەیەك دیل.

وادیارە دوای دەرچوونم ئەم هەواڵانە گەیشتبوونە شێخ عەبدوڵڵا، بەڕێگەی کەریم ناوێکەوە لەلای خۆی چاوەڕوانی قاسیدی شاری سلێمانی بووم، هەواڵ گەیشت، کە بانەییەکان خۆیان ئامادەکردووە دەست بەسەر سەقزدا بگرن‌و چاوەڕوانی هاوکاری سمکۆ دەکەن.

کوڕی خۆم دەتوانم راستەوخۆ بەڕێگەی دەسەڵاتداران لەبەغدا داواکاری‌و بەڵێنەکانی سمکۆ بگەیەنمە وڵاتانی پەیوەندیدار، بەڵام لێی دوودڵم، ئەوانە بەناراستگۆیی ناسراون.

تکایە سڵاوم بگەیەنە بە فەهیم فەندی، بەداخەوە ئەوەی دەیزانم ناکرێ بینووسم.

بۆیە هۆی پیلانی ناتەندرووست و مامەڵەی خراپی لایەنگرانی پارتی ئیتحادو تەرەقی، سمکۆ ناتوانێ متمانە بە ئەرمەن و ئاشوورییەکان بکات، ئەوەش جێگەی نیگەرانیمە، لە (27)ی شەعبان بۆمبێك دەتەقێتەوە کە ئەرمەنەکانی ناوچەی رەفند ئامادەیان کردبوو، موحەممەد عەلی شا لە جیاتی حوسێن میرزا لەگەڵ بۆمبەکە ناردبووی بۆ موکەڕەم مەلیك و ئەمیش ناردبووی بۆ شوقاق سوڵتان حاکمی خوی، لەوێشەوە بۆ سمکۆ. بۆمبەکەکە لەناو پاکەتێکی شیرینی نرابوو، بە پیاوێکی جێی متمانە سپێردرابوو، هەواڵگر کە زانی ئەم راسپاردەیە مەترسی هەیە، لەگەڵ گەیشتنی

به سەلماس پاکەتەکە دەداتە ماڵی سمکۆو بیانوو دێنێتەوە کە ناتوانی بچێ بۆ ئەوێ، چونکە پەکی کەتووە.

پیاوێکی هەژار پاکەتەکەی دایە دەست پیاوێکی سمکۆ، ئەویش لەکاتی وەرگرتنی گومانی کردو وتی: من دەترسم ئەوە قونبەلەی تیابێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لایەنگرانی سمکۆ لەگەڵیدا سندوقەکە دەکەنەوە، بە ناوەڕۆکی سندوقەکە دەزانێ و فڕێی دەداتە سەر زەوی، یەکسەر سمکۆ گوێی لەدەنگێك دەبێت، بۆمبەکە دەتەقێتەوەو برایەکی سمکۆ دەکوژێ و هەندێ لە لایەنگرانی بە سەختی بریندار دەبن. ئەم ڕووداوە هەموو شکاکی هەژاند، سمکۆ لە هەموو لایەکەوە کەوتە ڕێوشوێنی لێکۆڵینەوە، حکومەتی ئێرانی هەواڵێکی بڵاوکردەوە کە "ریڤان"ی ئەرمەنیو کۆمەڵەکەی بۆمبەکەیان درووست کردووە، بۆیە سمکۆ ڕازی نەبوو هیچ هاوکارییم بکات لەگەڵ ئەرمەن بگاتە ئەنجامێك، لەکاتی ڕووداوەکانی ئەم دواییەی سابڵاخ پیاوێك بەناوی "باسیمۆن" بە هەڵە کوژرا، ئەمە هاوولاتییەکی فەڕەنسی، یان ئەمریکی بوو، هەروەها چوار ئافرەتی ئەمریکی ڕووت کرانەوە، بەڵام هەمزای ئاغای سەرۆکی هۆزی مامەش پاسەوانی بۆ ئەو ئەمریکیانە دابین کردووە.

ئەوەی ڕووی دا لە پێنجی سەفەری (1340ك)و لە حەڤدەی هەمان مانگ ئافرەتە ئەمریکاییەکان لەسایەی پاسەوانەکانی پیاوانی هەمزاغا نێردرابوون بۆ "بوغیان"، هەتا بەسەلامەتی بگەیەنرێنە تەورێز (دەربڕینەکە لێرە ڕۆشن نییە پێدەچێ ناوەکانیان بێت."وەرگێڕ")، بەداخەوە یەکیان خاتوو "ئوغستا" بووە کە پێشتر لەگەڵ نەجمەدین کەرکووکی لە ئەستەنبوڵ لەگرتووخانە بووم سەردانیان کردم، دووەمیان "مس بۆشیحۆن"و سێیەمیان خاتوو "واما سکوت هود"و چوارەمیان خاتوو "ئیلماسهۆن" بووە، ئەو کە بەسەلامەتی گەیشتبووە تەورێز.

تکایە لایەنی پەیوەندیدار ئاگادار بکەوە کە من لە گەشتەکەم بۆ کوردستانی باکوور، (مەبەستی کوردستانی ئێرانە. "وەرگێڕ") (200) لیرەی زێڕم خەرج کردووە، هەروەها پێیان بڵێ من قەرزارم، ئاگاداریان بکەوە کە ئەو کەسانەی دەگەنە بەغدا بەبێ من ناتوانن هیچ بکەن.

ئەوەی شایانی باسە کوردەکانی کوردستانی باکوور بانگەوازی ناسیۆنالیستەکان "لایەنگرانی کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی"یان پێگەیشتووە کە هاوکارییان بکەن، سەرۆك

هۆزەکانی ئەو ناوچەیە خەریك بوو مەیلیان بەلای ئەو بانگەوازەوە بچێت، لە دوای روونکردنەوەی من لەمەڕ هەڵوێستی دوژمنکارانەی ئەوان بەرانبەر خاوەن شکۆ سوڵتان هەڵوێستیان گۆڕا، لێدوانی سوڵتانم لەدژی ئەوانە بۆ ناردن، ئێستا لەجیاتی هاوسۆزی رقیان لە ناسیۆلیستەکان دەبێتەوە، ناسیۆلیستەکان لەو گەشتەی من زۆر نیگەران بوون، هەتا هەزار لیرەیان داناوە بۆ کەسێ بمگرێ یان بمکوژێ.

هەندێ لە ئەفسەرانی سوپا لە بەشەکانی دیاربەکرو وان سزا درابوون لەسەر لێدوان و لایەنگری بۆ من لە ناوچەکە، بەڵام هەتا ئێستا ناسیۆلیستەکان نەیانتوانیوە ئەندامە چالاکەکانمان لەو ناوچەیە دەستگیر بکەن، لە دوای ئەوەی بیستم کۆمەڵێك لە ئیتیحادو تەرەقی گەیشتوونەتە رەواندز، گەشتێکی نهێنییم بە ناوچەکەدا کرد، لەگەڵ هەندێ ئەفسەرو نەوەی وڵاتی خۆم لەسەر رێوشوێنی گونجاو وتووێژمان کرد کە کەوتنی ئەنقەرە نزیك بۆتەوەو دوور، یان نزیك دەبێت ناسیۆنالیستەکان هەڵبێن بۆ ئەوروپا.

من لەو گەشتەم نیگەرانی زۆرم چێشتووە، چونکە زۆربەی خەڵك نەفامن‌و ناتوانن شت وەربگرن، ئەوەی ناچارم دووبارەی بکەمەوە، دەمویست تێیان بگەیەنم، کە باوەڕهێنان بەوان پتەو بوو، چونکە زۆربەیان سووربوون لەسەر ئەوەی باوەڕیان پێیەتی، بەڵام هیچ رێگەیەکی ترمان لەبەردەمدا نییە، بێجگە لەوەی ببینە دەسەڵاتداری کوردستان.

تێبینی: کوری خۆشەویستم ئەو کوردانە نارێکن‌و ناتوانن پێشکەون، بەواتایەکی تر سمکۆ نەفامەو بەهۆی ئەو چەکو تەقەمەنییەی وەریدەگرێ پەیوەندی پتەوی لەگەڵ ناسیۆنالیستە تورکەکاندا هەیە، بەکورتی مەسەلەی سمکۆ کارێکی بێئومێدانەیە.

# ناوەڕۆک

# ژیاننامەی نووسەر



ـ عوسمان عەلی، لەدایکبووی ساڵی (1955)ی گوندی لەیلان، کەرکووک، عێراق، سەر بەهۆزی کافرۆشی کوردییە.

ـ خوێندنی ئامادەیی لە کەرکووک تەواو کردووە، دواتر لە بەشی زمانی ئینگلیزیی کۆلیژی ئادابی زانکۆی موسڵ دەرچووە.

ـ لە زانستی سیاسیی (پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان) لە زانکۆی (جویلف) لە کەنەدا ماستەری تەواو کردووە.

ـ دکتۆرای لە دیراساتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئیسلامیی لە زانکۆی تۆرینتۆی کەنەدا تەواو کردووە.

ـ ئێستا وانەبێژە لە بەشی مێژوو، پەیمانگای (رایرسۆن) لە کەنەدا.

ـ مامۆستا بووە لە بەشی مێژووی کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین.

ـ لە ساڵانی (1995– 1999) مامۆستای مێژوو و مێژووی شارستانییەت بووە لە زانکۆی ئیسلامیی جیهانیی لە مالیزیا.

ـ بە هەردوو زمانی ئینگلزیی و عەرەبیی خاوەنی چەندین توێژینەوەیە لە بابەت مێژوو و کاروباری کورد.

# ژیاننامەی وەرگێڕ



لەدایکبووی ساڵی 1965/ کۆیە

بەکالۆریوسی لەبەشی مێژوو تەواو کردووە.

ماستەری لە مێژووی تازەو هاوچەرخ لە زانکوۆی (سانت کلمینس) بە "المراسله) تەواو کردووە

لەساڵی کۆتایی خوێندکاری ماستەرە، لەمێژووی سەدەکانی ناوەڕاست (ئیسلامی) لەزانکۆی سلێمانی.

بەرهەمەکانی:

1- میرنشینی سوران "لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی،مێژوویی:، لەساڵی 1998

2- فیدراڵیەتی عێراق لەنێوان چەنکی ئیسلامیو رۆژاواییدا، (وەرگێران) سالی 2001

3- چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد. دوو بەرگە، (وەرگێڕان). 2009

4- اتفاقية الجزائر و أبعادها على القضية الكردية، بەهەردوو زمانی عەرەبیو کوردی (ئامادەی چاپە).

5- کۆبەندی چەند بابەتێکی مێژوویی، فیکری، سیاسی، (ئامادەی چاپە)،

6- لەناوەڕاستی نەوەدەکانی سەدەی رابردووە دەیات وتاری مێژوویی، سیاسی، فیکری لەرۆژنامەو گۆڤارەکان بڵاوکردۆتەوە،

7- سەرنووسەرەی گۆڤاری (بابان)ە.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیری سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (1401ك ـ 1981ز) لە ویلایەتە یکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئصیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی ئەویش، لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاراستەکردنی کاروانی ژیاری مرۆڤایەتی و بەرچاورۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

– هاوکاریی هەولو کۆششی زانا توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

– ئاراستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە فیکرو مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبیی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لەڕێگەیانەوە کارو چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند رێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبیو ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش هەیە.